# ئاماژەكانی
# كۆرپەلەزانی
# لە قورئان و سوننەتدا

( دەرخستنی ئیعجازی زانستی قورئان و سوننەت لە بواری زانستی كۆرپەلەزانیدا )




كۆكردنەوە و ئامادەكردنی

**د. كاوە فەرەج سەعدون**

پزیشكی شارەزا لە نەخۆشییەكانی سنگ و كۆئەندامی هەناسەدان



چاپی یەكەم

سعدون، کاوه‌فرج. ۱۹۷۳ - م.
ئامازه‌کانی کورپه له‌زانی له قورئان و سوننه‌تدا... /کو کردنه‌وه و ئاماده کردنی د. کاوه فه ره‌ج سه‌عدون
تهران: احسان، ۱۳۸۷.
۷۳۱ ص.: مصور.
ISBN: 978-964-356-593-0
فیپا.
کردی.
۱ـ جنین انسانی -- جنبه‌های قرآنی. ۲. پزشکی در قرآن. ۳. انسان --آفرینش -- جنبه‌های قرآنی.
۷س۸۸۵ج /۱۰۴ BP ۱۵۹ /۲۹۷
کتابخانه ملی ایران ۱۰۶۰۵۶۱

# ئامازه‌کانی کورپه‌له زانی له قورئان و سوننه‌تدا

✦ نووسه‌ر: د. کاوه فرج سعدون
✦ بلاوکار: نه‌شری ئیحسان
✦ تیراژ: ۱۰۰۰ دانه
✦ چاپی یه‌که‌م: ۲۰۰۸ ز - ۱۴۲۹ک
ژماره سپاردنی (۳۱۰)ی سالی (۲۰۰۷)ی دراوه‌تێ له وه‌زاره‌تی رۆشنبیری

ISBN: 978-964-356-593-0
ژماره‌نیوئه‌ته‌وایه‌تی: ۹۷۸-۹۶۴-۳۵۶-۵۹۳-۰



بسم الله الرحمن الرحيم

﴿مَّا لَكُمْ لَا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَاراً {١٣} وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَاراً {١٤}﴾ (نوح)

﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن سُلَالَةٍ مِّن طِينٍ {١٢} ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ {١٣} ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَاماً فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْماً ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقاً آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ {١٤}﴾ (المؤمنون)

﴿الَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّاكَ فَعَدَلَكَ {٧} فِي أَيِّ صُورَةٍ مَّا شَاء رَكَّبَكَ {٨}﴾ (الإنفطار)

## قۆناغەکانی دروستبوونی کۆرپەلە




﴿بَلْ كَذَّبُواْ بِمَا لَمْ يُحِيطُواْ بِعِلْمِهِ﴾ (يونس: ٣٩)

# راستی ئەوەیە کە زانایان دانی پێدا دەنێن

## ﴿شایەتی پسپۆڕێك و کەسایەتی‌یەکی ناسراوی کۆرپەلەزانی﴾

﴿من ماوەی ٣ساڵ لەگەڵ دەستەی کۆرپەلەزانی زانکۆی (شا عبدالعزیز) لە (جیددە) کارم کرد، کە تێیدا یارمەتیم دەدان لە راڤە کردنی ئەو زانیاری‌یانەی لە قورئان و سوننەتدا دەربارەی دروست بوون و گەشە کردنی کۆرپەلەی مرۆڤ هاتووە.

سەرەتا، زۆر سەرەنجیان راکێشام و مایەی سەرسوڕمانم بوون ئەم دەقانەی کە لە سەدەی حەوتەمی زایینی‌دا نووسراون، ئەویش پێش دامەزرانی زانستی کۆرپەلەزانی، لەگەڵ ئەوەشدا کە من زانیاریم هەبوو لەسەر پێشدەستی زانایانی موسوڵمان و مێژووە زانستی‌یە گەشەدارەکەیان لە سەدەی دەیەمی زایینی‌دا، و بەشداری هەندێکیان لە پێش خستنی زانستی پزیشکی‌دا، بەڵام من هیچ جۆرە زانیاری‌یەکم دەربارەی راستی‌یەکان و باوەڕە ئاینی‌یەکانی ناو قورئان و سوننەت نەبوو.

من بە پێویستی دەزانم بۆ قوتابیانی موسوڵمان و غەیری ئەمانیش کە تێبگەن و شارەزا بن لەو دەقە قورئانی‌یانەی کە دەربارەی گەشە کردنی مرۆڤ هاتوون، ئەویش لەژێر رۆشنایی راستی‌یەکانی زانستی نوێ‌دا﴾.

**پرۆفیسۆر (کیث. ل. مور)* / تورنتۆ- کەنەدا/ ئەیلوول ١٩٨٣ز**

**هەر ئەم زانایە لە کۆنگرەی یەکەمی ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا لە (قاهیرە) لە ساڵی (١٩٨٦ز)دا ووتی:**

﴿من شایەتی لەسەر ئیعجازی خودایی دەدەم لە باس کردنی قۆناغەکانی دروست بوونی کۆرپەلە لە قورئاندا، و باوەڕیشم نی‌یە کە محمد و هەر کەسێکی تر لەو سەردەمەدا لە خۆیەوە ئەوەی رووداوەت لە گەشە کردنی کۆرپەلە زانیبێتی، چونکە ئەم پێشکەوتنە تەنها لە بەشی کۆتایی سەدەی بیستەمدا زانست پێی گەیشت، من دووبارە دەمەوێ ئەوە بچەسپێنم و تەئکیدی لەسەر بکەم کە هەموو شتێك من خوێندمەوە لە قورئانی پیرۆزدا دەربارەی دروست بوون و گەشە کردنی کۆرپەلە لە سکی دایکی‌دا، هەمووی یەکدەگرێتەوە و دەچەسپێت لەگەڵ ئەوانەی من دەیزانم لە بواری کۆرپەلەزانی‌دا وەك زانایەکی ناسراوی ئەم بوارە﴾ ....

---

* دکتۆر (کیث. ل. مور) پرۆفیسۆر و پسپۆڕی بواری توێکاری و کۆرپەلەزانی و زانستی خانە زیندووەکانە لە کۆلیژی پزیشکی زانکۆکانی (تۆرنتۆ) و (مانیتوبا) لە (کەنەدا)، و یەکێکە لە گەورە زانایانی کۆرپەلەزانی لە هەموو جیهاندا.

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

**سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری هەموو جیهان، دروود و رەحمەت بۆ سەر گیانی پاکی پێغەمبەری ئیسلام محمد (ﷺ) .........**

**قورئانی پیرۆز بریتی‌یە لە تاکە شێوازی ووتەی پەروەردگار کە تاوەکو رۆژگاری ئەمڕۆمان پارێزراوە، و بەو شێوازەی کە پێی هاتووەتە خوارەوە ماوەتەوە، ئاشکرایە کە دەبێت جیاواز بێت لە ووتەی مرۆڤەکان و هەرچی لە دوو تویێ‌دایە راستی‌یەکی رەهایە، هەر لە سەرەتای دابەزینی‌یەوە تەحەددای مرۆڤەکانی کردووە کە ناتوانن هاوشێوەی بهێنن، لەبەر ئەوەی پەروەردگار بە شێوەیەك دایڕشتووە و ئەوەندە یاسا و ڕاستی تێدا داناوە کە مرۆڤەکانی دەستەوسان و بێ‌توانا کردووە لە بەرامبەری‌دا.**

**قورئانی پیرۆز بەرنامەی پەروەردگارە بۆ ژیانی مرۆڤەکان و لە هەمان کاتیشدا موعجیزەیە[1] لە هەموو روویەکی‌یەوە، موعجیزەیە لە رووی دەربڕین و رێکخستنی‌یەوە (لەبەر ئەوەی نە شیعرە و نە پەخشانە)، بەڵکو شێوازێکی تایبەتی‌یە لە زمانی عەرەبی‌دا کە دارشتنێکی ناوازە و رێك خستنێکی بێ‌وێنەی هەیە، کە تەنانەت زمان ناسان و رەوانبێژانی عەرەبیش**

(1) (إعجاز) چاووگە و لە کرداری (أعجَزَ- يُعْجِزُ)وە هاتووە بە مانای دەستەوسان کردن و بێ‌توانا کردنی مرۆڤەکان بەرامبەر بە شتێك، معجیزەش بەپێی مانا شەرعی‌یەکەی بریتی‌یە لە: کردەوەیەکی لە رادەبەدەر کە خوای گەورە لەسەر دەستی یەکێك لە پێغەمبەرانی ئەنجامی دەدات، و خەڵکی دەیبینن و دەستەوسانن کە هاوشێوەی بهێنن، ئەمەش بە مەبەستی بەرامبەرکێ لەگەڵ خەڵکی‌دا، و بۆ سەلماندنی راستێتی ناردنی ئەو پێغەمبەرە لەلایەن خوداوە.

پێی نەدەگەیشتنەوە و بەرامبەری دەستەوسان بوون (کە خۆیان لە لوتکەی ڕەوانبێژی و بەلاغەتدا بوون)، و کەسیان نەیانتوانی هاوشێوەی بهێنن.

لێرەوە کە بۆمان دەسەلمێت قورئان وتەی پەروەردگارە، هەروەها بۆشمان روون دەبێتەوە کە هەموو ئەو لایەنانەی قورئان ئاماژەی پێداوە هەموویان حەق و ڕاستین: لایەنی عەقیدە و بیروباوەڕ کە قورئان باسی کردووە و بابەتێکی پەنهانە ڕاستی‌یەکی ڕەهایە، هەروەها دەربارەی پەرستشەکان (کە فەرمانی خودایین)، ڕەووشت و موعامەلات و هەڵس وکەوتەکان هەموویان ڕاستیی ڕەهان، مێژووش سەلماندوویەتی کە مرۆڤ هەمیشە نەیتوانیوە بەرنامەیەکی تێر وتەسەل بۆ هەر یەکێك لەو بابەتانە بۆ خۆی داڕێژێت.

هەروەها لە قورئاندا چەندین ئاماژە هاتووە بۆ گەردوون و پێکهاتەکانی و هەندێك لە شتەکانی و دیاردەکانی، کە بە پێی ئەم یاسا گشتی‌یە ئەمانەش دەبێت ڕاستی ڕەهابن، ئەویش لەبەرئەوەیە کە پەروەردگاری دروستکەر لە هەموو کەس ئاگادارترە بە دروستکراوەکانی، و لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشمانەدا دۆزینەوە زانستی‌یە نوێکان پشتگیری ئەم ڕاستی‌یانەی قورئان دەکەن.

هەروەها لایەنێکی تری موعجیزەی قورئان لە پرۆگرامە پەروەردەیی‌یە ناوازەکەی‌دا خۆی دەبینێتەوە، و هەروەها لە ئاخاوتنی لەگەڵ دەروونی مرۆڤدا و بەرز کردنەوەی بۆ ئاستە بەرزە نوورینەکان، بە شێوەیەك هیچ گوتارێکی تر ئاوا ناتوانێت بەرزی بکاتەوە، هەروەها خۆیشی لە هەواڵدان بە چەند شتێکی شاراوە و غەیبی‌دا دەبینێتەوە کە لە داهاتوودا ئاشکرا بوون و بە بەردەوامیش زیاتری لێ‌ئاشکرا دەبێت بۆ مرۆڤەکان، قورئان بەم لایەنە ناوازانەی تەحەددا و بەرامبەرکێی لەگەڵ هەموو مرۆڤەکان و لەگەڵ جنۆکەکانیشدا کردووە کە پێکەوە بتوانن تەنها یەك سوورەت لە هاوشێوەی بهێنن، مێژوو شایەتە هەموویان دۆڕاوە بوون لەم پێشبڕکێ‌یەدا.

لایەنەکانی ئیعجازی قورئان وەك ئاماژەمان پێدان جۆراوجۆرن، ئەویش بەهۆی جۆراوجۆرێتی ئەو لایەنانەی کە مرۆڤێکی بێلایەن دەتوانێت لە روانگەیانەوە قورئانی پیرۆز ببینێت و هەڵسەنگێنێت، لەو لایەنانە:

١- ئیعجازی زمانەوانی: ووێژەیی، دەربڕین، رەوانبێژیی، رێکخستنی ووشەکانی، و زاراوەکانی و ماناکانی.

٢- ئیعجازی عەقیدەیی (لایەنی بیروباوەڕەکەی).

٣-ئیعجازی پەرستنەکانی.

٤- ئیعجازی رەووشتیی (بەوەی کە گونجاوە لەگەڵ سروشتی مرۆڤ بەبێ زیادڕەوی و کەمتەرخەمی).

٥- ئیعجازی تەشریعی و یاساکانی بۆ ژیان.

٦- ئیعجازی مێژوویی (تەئریخی)، کە دۆزینەوەکانی شوێنەوارناسی بۆ ئەو میللەتانەی کە قورئان ناوی بردوون پشتگیری لێدەکات.

٧- ئیعجازی پەروەردەیی.

٨- ئیعجازی دەروونیی.

٩- ئیعجازی ئابووریی.

١٠- ئیعجازی بەڕێوەبردن.

١١- ئیعجازی پێشبینی کردن.

١٢- ئیعجازی زانستی.

١٣- ئیعجازی تەحەددای مرۆڤ و جنۆکە بەیەکەوە کە بتوانن شتێکی هاوشێوەی ئەو بێنن لە شێواز و ناوەڕۆکیدا، بێئەوەی کەس بتوانێت ئەم کارە ئەنجام بدات.

١٤- ئیعجازی پاراستنی بە هەمان زمانی ناردنی بەدرێژایی زیاتر لە ١٤سەدە، بێئەوەی یەك پیتی لێزیاد و کەم بکرێت، لەگەڵ ئەوەشدا کە هەموو شێوازەکانی پێشتری وەحی خودایی تووشی فەوتان و دەستکاری کردن بوون.

هەربۆیە پەروەردگار خۆی لە چەندین ئایەتدا وەسف و سەنای قورئانی کردووە کە دەفەرموێت:

- ﴿ذَلِكَ الْكِتَابُ لاَ رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ﴾ (البقرة:٢)، واتە: ئەو قورئانە کتێبێکە هیچ گومانێکی تێدا نییە (کە لەلایەن خوای پەروەردگارەوە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) نێردراوە) و مایەی رێنموویی و سەرچاوەی هیدایەتە بۆ خواناسان و پارێزکاران.

- ﴿وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَى عَبْدِنَا فَأْتُواْ بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ وَادْعُواْ شُهَدَاءكُم مِّن دُونِ اللّهِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ﴾ (البقرة: ٢٣)، واتە: جا ئەگەر ئێوە لە دوو دڵیدان و گومانتان (لەم قورئانە پیرۆزە) هەیە کە دامانبەزاندووە بۆ بەندەی خۆمان محمد (ﷺ)، ئەگەر بۆتان دەکرێت ئێوەش هەوڵ بدەن سوورەتێکی وەك ئەو بهێنن، هاوپەیمان و هاوکارەکانیشتان جگە لە خوا (بۆ ئەو مەبەستە) بانگ بکەن ئەگەر ئێوە راست دەکەن.

- ﴿وَهَـذَا كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ مُبَارَكٌ مُّصَدِّقُ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَلِتُنذِرَ أُمَّ الْقُرَى وَمَنْ حَوْلَهَا وَالَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالآخِرَةِ يُؤْمِنُونَ بِهِ وَهُمْ عَلَى صَلاَتِهِمْ يُحَافِظُونَ﴾ (الأنعام:٩٢)، واتە: ئەم قورئانە کتێبێکی پیرۆزە، دامان بەزاندووە، راستی کتێبەکانی پێشوو دەسەلمێنێت، هەروەها ناردوومانە تا شارە دێرینەکە (مەککەی پیرۆز) و هەموو دەوروبەری داچڵەکێنێت و (بانگیان بکات بۆ ئیسلام، کە دانیشتووانی هەموو گۆی زەوی دەگرێتەوە) جا ئەوانەی کە باوەڕ بە رۆژی دوایی دەهێنن، بڕوا بە قورئانیش دەهێنن و لەسەر نوێژەکانیان بەردەوامن و هەمیشە لەکاتی خۆیدا ئەنجامی دەدەن و دەیپارێزن.

- ﴿وَمَا كَانَ هَـذَا الْقُرْآنُ أَن يُفْتَرَى مِن دُونِ اللّهِ وَلَـكِن تَصْدِيقَ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ الْكِتَابِ لاَ رَيْبَ فِيهِ مِن رَّبِّ الْعَالَمِينَ﴾ (یونس: ٣٧)، واتە: وە نەبێت ئەم قورئانە لەلایەن کەسێکەوە داڕێژرا بێت و هەڵبەسترا بێت جگە لە خودا،

بـەڵکو راسـتی و رەوانـی کتێبـە ئاسمانی‌یـەکانی پـێش خۆیشـی دووپـات دەکاتـەوە، هـەروەها روون کـەرەوەی بیروبـاوەڕ و ئەرکەکانـە، بەڕاسـتی هـیچ گومان لەوەدا نی‌یە کە ئەم قورئانە لەلایەن دروستکەر و پەروەردگاری هەموو جیهانەوە رەوانە کراوە.

- ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ﴾ (الحجر:٩)، واتە: بەڕاستی هـەر ئێمـە قورئانمان دابەزاندووە و بێگومان هەر ئێمەش پارێزگاری دەکەین و (نایـەڵین دەسـتی خیانـەتکار هـیچ جـۆرە دەسـتێکی تێبخـات و هـەموو هـەوڵێك بـۆ دەستکاری کردنی نەزۆکە).

- ﴿قُل لَّئِنِ اجْتَمَعَتِ الإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَى أَن يَأْتُواْ بِمِثْلِ هَـذَا الْقُرْآنِ لاَ يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيراً﴾ (الإسراء:٨٨)، واتە: ئـەی محمـد (ﷺ) پـێیـان بڵـێ: سـوێند بـە خـوا ئەگـەر هـەموو ئـادەمیزاد و پەری‌یـەکان کۆببنـەوە و (هـەوڵی بـەردەوام بـدەن تـا) قورئـانێکی وەك ئەمـە دانـێن و بیهێننـە (مەیـدان) نـاتوانن کاری وا بکـەن و نـاتوانن لـە وێنـەی بهێنن، ئەگـەر چـی هـەموو لایـەکیان ببنـە پشتگیر و یارمەتیدەری یەکتر.

- ﴿طه، مَا أَنزَلْنَا عَلَيْكَ الْقُرْآنَ لِتَشْقَى، إِلَّا تَذْكِرَةً لِّمَن يَخْشَى، تَنزِيلاً مِّمَّنْ خَلَـقَ الْأَرْضَ وَالسَّـمَاوَاتِ الْعُلَـى﴾ (طه:١-٤)، واتـە: ئـەی پێغەمبـەر (ﷺ) ئێمـە ئـەو قورئانـەمان دانەبەزانـدووە بـۆ سـەر تـۆ تـا تووشـی خەفـەت و غـەم و پـەژارە ببیت، بەڵکو یادخەرەوەیە بۆ ئەو کەسـەی کە لـە لێپرسینەوەی پـەروەردگار دەترسێت، قورئان، لەلایەن زاتێکەوە بەش بەش دابـەزیوە، کـە زەوی دروست کردووە و ئاسمانە بڵندەکانی بەدی هێناوە.

- ﴿قُلْ أَنزَلَهُ الَّذِي يَعْلَمُ السِّرَّ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِنَّهُ كَانَ غَفُـوراً رَّحِيمـاً﴾ (الفرقـان:٦)، واتـە: تـۆ ئـەی محمـد (ﷺ) بڵـێ: ئـەو زاتـەی ئـەم قورئانـەی دابەزانـدووە بـە هـەموو نهێنی‌یـەك دەزانێـت لـە ئاسمانـەکان و زەوی‌دا، هـەر ئەویش هەمیشە و بەردەوام لێخۆشبوو و میهرەبانە.

- ﴿وَيَرَى الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ الَّذِي أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ الْحَقَّ وَيَهْدِي إِلَى صِرَاطِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ﴾ (سبأ:٦)، واتە: ئەوانەی زانست و زانیاریان پێدراوە (چ زانستی ئایینی (وەك گاور و جوولەكە)، یان ئەوانەی رۆدەچن لە زانستە ماددییەكاندا) چاك دەزانن ئەوەی لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆت رەوانە كراوە هەر ئەوە هەق و راستییە، هیدایەت و رێنموویی بەخشە بۆ رێبازی پەروەردگاری خاوەن دەسەڵات و شایستەی سوپاس و ستایش.

- ﴿أَمْ يَقُولُونَ تَقَوَّلَهُ بَل لَّا يُؤْمِنُونَ، فَلْيَأْتُوا بِحَدِيثٍ مِّثْلِهِ إِن كَانُوا صَادِقِينَ﴾ (الطور: ٣٣-٣٤)، واتە: یان دەڵێن ئەم قورئانە خۆی هەڵیبەستووە و دایڕشتووە، نەخێر ئەوانە هەر ئیمان و باوەڕیان نییە (ئەگینا چۆن وا دەڵێن)، (دەی كەواتە خۆ ئەوانیش قسەزان و لێزانن) دەبا فەرمایشتێكی ئاوا وەك ئەم قورئانە بهێنن، ئەگەر راست دەكەن؟!

لەلایەكی ترەوە ئێمەی موسوڵمان باوەڕمان وایە كە فەرموودەكان و كردەوەكان و دان پێدانانەكان و سیفاتەكانی پێغەمبەر (ﷺ) كە پێیان دەووترێت سوننەت[2]، ئەمانیش تەواوكەری قورئانن و بۆ خۆیان جۆرێكن لە نیگا و وەحی خودایی، چونكە پێغەمبەر (ﷺ) لەخۆیەوەی قسە و كردەوەی نەكردووە ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى، إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى، عَلَّمَهُ شَدِيدُ الْقُوَى﴾ (النجم: ٣-٥)، واتە: قسە و گوفتاری پێغەمبەر (ﷺ) هیچی لە هەوا و هەوەس و ئارەزوو بازییەوە نییە، ئەمەی كە رایدەگەیەنێت تەنها نیگا و وەحی خوداییە، جوبرائیلی فریشتەی خاوەن هێز و توانایی زۆر قورئانی فێر كردووە، پێغەمبەریش خۆی باسی ئەم راستییەی كردووە: لە فەرموودەیەكی ئیمامی (أحمد)دا هاتووە: كە یەكێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) بە ناوی

---

(2) سوننەت لە پێناسەی شەرع زانان و زانایانی فەرموودەدا بریتییە لە: هو ما روي عن رسول الله (ﷺ) من قول أو فعل أو تقرير أو صفة (خلقية أو خلقية).

(عبداللەی کوڕی عەمری کوڕی عاص) کە فەرموودەکانی پێغەمبەری (ﷺ) دەنووسی‌یەوە لێی پرسی: ئەی پێغەمبەری خودا تۆ لە کاتی تووڕەیی و دڵخۆشی‌دا قسە دەکەیت و من دەیبستم، ئایا من لەو کاتانەشدا وتەکانی تۆ هەر بنووسم؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بینووسە، سوێند بە خودا من لەو کاتانەشدا هەر هەق و ڕاستی نەبێت نایڵێم.

هەربۆیە باوەڕمان وایە کە سوننەتی پێغەمبەریش (ﷺ) جۆرێکە لە موعجیزە، و ئەوانەی دەربارەی ئیعجازی قورئان و جۆرەکانی لێی دواین بەسەر سوننەتەکانی پێغەمبەریشدا (ﷺ) جێبەجێ دەبێت، کەواتە سوننەتی پیرۆزیش موعجیزەیە، بە تایبەتی لە رۆژگاری ئەمڕۆدا گەورەیی سوننەت دەرکەوتووە لەو ئاماژانەی کە پێغەمبەر (ﷺ) لە بوارە زانستی‌یە جیاوازەکاندا فەرموویەتی و زانستی نوێ پشتڕاستی کردوونەتەوە، کە ئێستا پێی دەڵێین ئیعجازی زانستی لە سوننەتدا.

لێرەدا حەز دەکەم کەمێك ووردتر دەربارەی ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا بدوێین، کە بریتی‌یە لەو ئاماژەدان و هەواڵدانانەی قورئان و سوننەت دەربارەی هەندێك راستی زانستی کە لە رۆژگاری ئەمڕۆدا زانستی تاقیکاری راستی‌یەکانی سەلماندوون، و هەروەها سەلماوە کە بە هۆکارە ماددی‌یەکانی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) مەحاڵ بووە بزانرێت.

لەبەر ئەوەی کە محمد (ﷺ) کۆتایین پێغەمبەرە خوای گەورە دینەکەی بۆ پاراستووە و لەهەمان کاتدا بە بەڵگەیەکی ئاشکرا و گەورە پشتگیری کردووە کە تا رۆژی دوایی خەڵکی سەرسام دەکات، وەك لە ئایەتی (١٩)ی سوورەتی (الأنعام)دا دەفەرموێت: ﴿قُلْ أَيُّ شَيْءٍ أَكْبَرُ شَهَادةً قُلِ اللهِ شَهِيدٌ بِيْنِي وَبَيْنَكُمْ وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَذَا الْقُرْآنُ لأُنذِرَكُم بِهِ وَمَن بَلَغَ ...﴾، واتە: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بەوانە بڵێ (کە شایەتیان دەوێت لەسەر پێغەمبەرایەتی تۆ) چ شتێك گەورەتر

و راستترە لە شایەتی‌دا؟! هەرخۆت بڵێ: ﷲ راستترین شایەتە کە شایەتی نێوان من و ئێوەیە،،من ئەم قورئانەشم بە وەحی و نیگا بۆ هاتووە تا ئێوە و هەموو ئەوانەی پێیان گەیشتووە ئاگادار و بێدار بکەم.

یەکێك لەلایەنە گەورەکانی موعجیزە و بەڵگەی قورئانیش بریتی‌یە لە ئیعجازی زانستی، چونکە خوای گەورە بە زانستی فراوانی خۆی دەزانێت کە رۆژگارێك دێت مرۆڤایەتی دەگەنە ئاستێکی بەرز لە زانینی نهێنی‌یەکان و سوننەتەکانی گەردوون کە هیچ نەوەیەکی پێشتر پێی نەگەیون، و ئەمە دەبێتە هۆی بوغرا بوونیان بەو پێشکەوتنەی کە پێی گەیوون، و بەرنامەی پەروەردگاریان بیردەچێتەوە.

هەر بۆیە پەروەردگار بۆ ئەوەی بەڵگە و حوججە لەسەر خەڵکی ئەمڕۆ دامەزرێنێت دەبینین لە قورئانەکەی‌دا لە زیاتر لە ١٤٠٠ ئایەتدا ئاماژەی داوە بە بوونەوەر و پێکهاتە و دیاردەکانی بە ووردی‌یەکی زانستی‌یانەی بەرچاوەوە، کە تەنیا زانستی تاقیکاری نوێ بۆ ماوەی دوو سەدە دەچێت نهێنی ئەمانەی بۆ دەرکەوتووە، ئەم دەست پێشخەری‌یەی قورئانی پیرۆزە کە پێی دەڵێین ئیعجازی زانستی، کە بریتی‌یە لە زمانی ئاسانی ئاخاوتن لەگەڵ هەمووانـدا لە رۆژگاری ئەمڕۆدا بۆ دەرخستنی گەورەیی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بەسەر هەموو بیروباوەڕەکانی تردا.

خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿لَّـٰكِنِ اللَّهُ يَشْهَدُ بِمَا أَنزَلَ إِلَيْكَ أَنزَلَهُ بِعِلْمِهِ وَالْمَلَائِكَةُ يَشْهَدُونَ وَكَفَىٰ بِاللَّهِ شَهِيدًا﴾ (النساء:١٦٦)، واتە: (ئەی محمد (ﷺ) هەرچەندە ئەو خەڵکە باوەڕت پێناکەن)، بەڵام خوا خۆی شایەتە لەسەر ئەو قورئانەی کە رەوانەی کردووە بۆت، بە ئاگاداری و زانیاری خۆیشی رەوانەی کردووە (یان زانیاری خودایی تێدایە)، فریشتەکانیش شایەتی دەدەن (لەسەر ئەوە، هەرچەندە) خودا خۆی بەسە بۆ

ئەو شایەتی دانە، ئیمامی راڤەکاری قورئان (إبن کثیر) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێت: ﴿خوای گەورە شایەتی پێغەمبەرایەتیت بۆ دەدات ئەی محمد (ﷺ)، ئەو کەسەی کە کتێبەکەی بۆ ناردوویت کە قورئانی پیرۆزە، هەربۆیە دەفەرمویت: (أَنزَلَهُ بعِلْمِهِ) واتە: ئەم قورئانە زانیاری و زانستی خودایی تێدایە کە وویستوویەتی نیشانی بەندەکانی بدات، کە بریتین لە بەڵگەکان و رێنموویی کەرەکان، و جیاکەرەوەکان لە نێوان کوفر و ئیماندا، ئەوانەی کە خودا پێی خۆشە و ئەوانەش کە پێی ناخۆشە و بەرگریتان لێدەکات، هەروەها زانیاریشی تێدایە بە شتە غەیبی و نەزانراوەکان، لە رابوردوو و داهاتووشدا﴾[3].

دەربارەی ئەو مانایەش کە قورئان زانیاریی شارراوەی خودایی تێدایە زۆرێك لە موفەسیران هەمان بۆچوونیان هەیە وەك: (إبن الجوزي، الزمخشري، أبوحیّان، البیضاوي، النَّسَفي، الخازن، الآلوسي، والشوکاني).

لە ئایەتێکی تردا هاتووە: ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ، وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُ بَعْدَ حِينٍ﴾ (ص: ٨٧-٨٨)، واتە: ئەم قورئانە بە تەئکید یادخەرەوە و ئامۆژگاری‌یە بۆ هەموو خەڵکی جیهان لە هەموو کات و شوێنێکدا،،بەڕاستی لە داهاتوویەکی نزیکدا هەر لە دونیادا هەواڵی راستیی و دروستی ئەم ئایینە دەزانن، لە قیامەتیشدا هەموو شتێك بە تەواوەتی ئاشکرا و روون دەبێت.

لە تەفسیری (حِین) کە لە ئایەتەکەدا هاتووە (الفراء)ی موفەسیر دەڵێت: {مەبەستی لە پێش مردن و دوای مردنە، واتە راستیی ئەو ووتانەی من (مەبەست لە پێغەمبەرە (ﷺ)) دەیڵێم پاش ماوەیەك (لە داهاتوودا) بۆتان دەردەکەوێت}، (الطبري)یش دەڵێت: {راستترین ووتە ئەوەیە کە بڵێین خوای گەورە بێبڕوایانی ئاگادار کردووە بەم قورئانە کە هەواڵەکانی لە داهاتوودا

(3) بڕوانە (تفسیر القرآن العظیم) دانراوی (إبن کثیر)/ ج٢- ٤٣٤.

دەزانن، بەبێ دیاری کردنی کاتێکی دیاریکراو لە داهاتوودا، و خوای گەورە بە ڕەهایی هێڵاوێتی‌یەوە}.

ئایەتێکی تری قورئان دەفەرموێت: ﴿لِّكُلِّ نَبَإٍ مُّسْتَقَرٌّ وَسَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾ (الأنعام:٦٧)، واتە: بۆ هەموو هەواڵێك (کە لە قورئاندا هاتووە) کات و شوێنی بەدیهاتنی خۆی هەیە، لە ئایندەشدا دەزانن، (الطبري) دەڵێت: {دەڵێت: بۆ هەموو هەواڵێك جێگیر بوونێك هەیە، کە لە کۆتایی‌دا لەسەری دەوەستێت و ڕاستی و ناڕاستی‌یەکەی یەکلایی دەکاتەوە، کە لە داهاتوودا بۆتان دەردەکەوێت ئێوە ئەی ئەوانەی هەوڵ دەدەن بەدرۆم بخەنەوە}، ئەمە ڕای زۆربەی ڕاڤەکارانی قورئانە.

قورئانی پیرۆز پڕە لەو هەواڵانەی کە باس لە دیاردەکانی گەردوون و نهێنی‌یەکانی دەکات، و لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا کە زانیاری‌یەکانی ئادەمیزاد تەقیونەتەوە و یەك لەدوای یەك دۆزینەوەی نوێ ئەنجام دەدرێت، کاتی ئەوە هاتووە ڕاستی‌یەکانی زانست کە لە نیگای پەروەردگاردا هاتوونەتە خوارەوە ببینرێن و ئاشکرا ببن.

قورئانی پیرۆز لە سەردەمێکدا دابەزی کە نەزانی و جەهل بڵاوبوو لەسەر زەوی‌دا، خورافات و جادووگەری و فاڵچێتی لە هەموو جیهاندا ڕۆڵی سەرەکی دەبینی بە تایبەتی لەلای عەرەبەکان، کە لە هەموو کەس نەزانتر و نەخوێندەوارتر بوون، وەك دەبینین قورئان ئاماژە بەم ڕاستی‌یە دەدات: ﴿هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الْأُمِّيِّينَ رَسُولاً مِّنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا مِن قَبْلُ لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ﴾ (الجمعة:٢)، واتە: هەر ئەو زاتەیە لەناو خەڵکێکی نەخوێندەواردا پێغەمبەرێکی لەخۆیان ڕەوانە کرد، ئایەتەکانی قورئانەکەی ئەویان بەسەردا دەخوێنێتەوە و دڵ و دەروون و ڕەواڵەت و ئاشکرا و نادیاریان پوختە دەکات، فێری قورئان و دانایی و شەریعەتیان

دەكات، بەڕاستی ئەوانە پێشتر لە گومڕایی و سەر لێشێواویەكی ئاشكرادا گیریان خواردبوو.

قورئان بۆ كەسانێك دابەزی كە زۆر بە توندی بەرامبەری وەستان بە مەبەستی پارێزگاری كردن لە بتەكانیان، و دەستیان گرتبوو بە خورافات و جادووگەریتی‌یان و رەشبینی‌یان بە هەندێك دروستكراوی وەك: مانگ و ئاژەڵ، تەنانەت بەرامبەركێ‌یان دەكرد لەسەر داواكردنی پارێزگاری لە پادشای جنۆكە لە دۆڵ و شیوەكاندا!!! ئەمە بریتی بوو لەو گومڕایی‌یە فیكری و عەقلی‌یەی كە عەرەب لە كاتی هاتنە خوارەوەی قورئاندا لەسەری بوون، لەو سەردەمەدا و بۆ ئەو میللەتە بوو كە قورئانی پیرۆز هاتە خوارەوە، و لە دوو توێ‌ی‌دا نهێنی‌یەكانی دروستكراوەكان و ووردەكاری‌یەكانی دەروون و لەشی مرۆڤی تێدایە، سەرەتاكان دیاری دەكات، و نهێنی‌یەكانی ئێستا و شاراوەكانی داهاتوو وەسف دەكات.

كاتێكیش مرۆڤ گەیشتە سەردەمی دۆزینەوە زانستی‌یەكان و سوپایەكی لە توێژەرەوان و ووردترین ئامێرە زانستی‌یەكان دەست كەوت، چەندین كەس هاتنە مەیدان بۆ گەڕان بەدوای نهێنی‌یەكان لە ئاسمان و زەوی‌دا، و لە بوارە مرۆیی‌یەكاندا، و دەرەنجامەكانیان كۆكردەوە، ئەوەبوو راستی دەركەوت و گەورەترین شتی سەرسوڕهێنەر رووی‌دا بە دەركەوتنی رووناكی وەحی پەروەردگار، و سەلماندنی راستیی ئەو ووتانەی خودا و پێغەمبەرەكەی (كە پێش ١٤٠٠ ساڵ دابەزیون) بەشێوەیەكی ووردی زانستی‌یانە، قورئانی پیرۆز خۆی ئەم هەواڵەی پێ‌داوین كە دەفەرموێت:

﴿قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ اللَّهِ ثُمَّ كَفَرْتُم بِهِ مَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ هُوَ فِي شِقَاقٍ بَعِيدٍ ، سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ (فصلت: ٥٢-٥٣)، واتە: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) پێیان بڵێ: هەواڵم

بدەنێ، باشە ئەگەر ئەم قورئانە لەلایەن خواوە بێت، و پاشان ئێوەش بڕواتان پێی نەبێت! دەزانن چ سەرەنجامێکی سامنك چاوەڕێتانە؟! جا ئیتر کێ هەیە لە ئێوە سەرسەختتر؟! و کێ لاڕێترە لەوەی کە ڕێگەی جیا و دوور لە ڕاستیی گرتبێتەبەر؟! ئێمە لە ئایندەدا بەڵگە و نیشانەی سەرسوڕهێنەریان نیشان دەدەین لە ئاسۆکانی بوونەوەر ولە خودی خۆیشیاندا، ئەمەیش بۆ ئەوەی تا چاك بۆیان روون ببێتەوە و دڵنیا بن کە دەسەڵاتی پەروەردگار و قورئانە نێردراوەکەی حەق و ڕاست و ڕەوایە، ئایا شایەتی پەروەردگارت بەس نی‌یە کە بێگومان ئاگا و زانایە بە هەموو شتێك؟!

(الْآفَاق) مەبەستی لەوەیە کە دەردەکەوێت لە ئاسۆکانی ئاسمان و زەوی‌دا، (الشوكاني) دەربارەی (سَـنُرِيهِمْ آيَاتِنَـا فِـي الْآفَـاق) دەڵێت: ڕاستیی بەڵگە نێردراوەکان لەسەر ڕاستیی قورئان و ئەوەی کە لەلایەن خوداوە هاتووە بۆیان دەردەخەین، ئەویش بە پیشاندانی ئەو بەڵگانە لە خۆیان و لە ئاسۆکاندا[4]، (الزمخشري) دەڵێت: (ئەو ئایەتانەی کە خوای گەورە بەڵێنی داوە دەریبخات دەبێت بە چاوی خۆیان ببینن، کە بەهۆی ئەمانەوە بۆیان روون دەبێتەوە قورئان لەلایەن خوداوە دابەزیوە، ئەو کەسەی کە ئاگاداری هەموو شتێکە و ئەمەش بەڵگەیەکی بەسە لەسەر ڕاستێتی هاتنی لەلایەن خوداوە)، زۆرێك موفەسیری تریش هەمان ڕایان هەیە، دەربارەی (سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَـاق) لە تەفسیری (الجلالين)دا هاتووە: (مەبەست پێی بەشەکان و پێکهاتەکانی ئاسمان و زەوی‌یە لە ئاگر و ڕووەك و درەختەکان)، (وَفِـي أَنفُسِـهِمْ) مەبەست پێی دانایی و ڕەنگینی‌یە لە دروست کردنی مرۆڤدا، لێرەدا ئێمە بەردەوام لە چاوەڕوانی دەرکەوتنی بەڵگەی نوێین لەسەر ڕاستیی

(4) بڕوانە تەفسیری (فتح القدير)/ ج٤–ص٥٩٩، هەروەها (ابن كثير)یش هەمان ڕاڤەی کردووە، بڕوانە (تفسير القرآن العظيم)/ ج٥–ص٤٨٧.

**قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ)، کە بەهۆی ئەمەوە زانیاری وورد و راڤەی تەواوی ئایەتەکان ئاشکرا دەبن، خوای گەورە دەفەرموێت ﴿وَقُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ سَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ فَتَعْرِفُونَهَا﴾ (النمل: ٩٣)، واتە: تۆ بڵێ سوپاس و ستایش بۆ خودا، لە ئایندەیەکی نزیکدا هەموو بەڵگە و نیشانەکانی خۆیتان نیشان دەدات و دەیناسنەوە (کە هەمووی دەستکار و بەدیهێنراوی خودایە)، کە دروستکراوەکانی پەروەردگار جۆرێکن لە ئایەت و نموونەی دەسەڵاتی پەروەردگار، لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە مرۆڤایەتی بەردەوام لە چاوەڕوانی دەرکەوتنی نموونەی نوێن لەسەر گەورەیی دەسەڵاتی پەروەردگار و سەلماندنی راستێتی ئەوەی لە قورئان و سوننەتدا هاتووە.**

**رووەکانی ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا لەم خاڵانەی خوارەوەدا خۆی دەبینێتەوە:**

**١- یەکگرتنەوەی ووردی نێوان ئەوەی لە قورئان و سوننەتدا هاتووە لەگەڵ ئەوەی کە زانایانی گەردوون و مرۆڤ لە بوارە جیاوازەکاندا دۆزیویانەتەوە، و ئەو نهێنی‌یانەی کە پەردەیان لەسەر هەڵماڵیوە، کە مەحاڵ بووە ئەم زانیاری‌یانە لە سەردەمی هاتنە خوارەوەی قورئاندا بزانرێت.**

**٢- راست کردنەوەی قورئان و سوننەت بۆ ئەو بیر وبۆچوونە هەڵە و خورافاتانەی کە لە نێو مرۆڤایەتی‌دا بۆ چەندین سەدە و نەوەی جیاواز بڵاوبووە، بە تایبەتی لە بواری نهێنی‌یەکانی دروست بوونی مرۆڤدا[5]، کە ئەمە تەنها بە زانیاری ئەو پەروەردگارە خاوەن دەسەڵاتە دەبێت کە ئاگاداری هەموو نهێنی‌یەکی ئاسمان و زەمینە.**

---

(5) یەکێك لە نموونەی ئەو بیروبۆچوونە هەڵانە ئەوەبوو کە تا سەدەی ١٧ی زایینیش زانایان وایان دەزانی کە کۆرپەلەی مرۆڤ لە خوێنی مانگانەی ئافرەتەوە دروست دەبێت و تۆوی پیاو رۆڵێکی نی‌یە لەم دروست بوونەدا! (وەك لە داهاتوودا روونی دەکەینەوە).

٣- ئەگەر دەقەکانی قورئان و فەرموودە لە بابەتێکدا کۆبکرێنەوە دەبینین کە تەواوکەری یەکترین، بە هەموویان راستی‌یەکان رۆشن دەکەنەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم دەقانە بە پەرتەوازەیی (لە کات و شوێنی جیاوازدا) دابەزیون، کە ئەمانە تەنها دەبێت لەلایەن خوداوە هاتبێتن، کە ئاگاداری هەموو نهێنی‌یەکانی ئاسمان و زەمینە.

٤- دانانی تەشریعات و یاسا و رێسا پڕ حیکمەت و دانایی‌یەکان، کە حیکمەتەکانیان لەوانەیە شارراوە بێت لە خەڵکی ئاسایی، بە تایبەتی لە کاتی هاتنە خوارەوە قورئاندا، بەڵام دەبینین لە رۆژگاری دۆزینەوە زانستی‌یەکاندا توێژینەوەکان لە بوارە جۆراوجۆرەکاندا نهێنی و حیکمەتەکانی تەشریعاتەکان دەردەخەن.

٥- لە نەبوونی هیچ جۆرە بەرامبەرکێ و پێداکێشانێك لە نێوان دەقە شەرعی‌یە دامەزراوەکان کە وەسفی گەردوون و نهێنی‌یەکانی دەکەن (کە ژمارەیان زۆر زۆرە)؛ لەگەڵ راستی‌یە زانستی‌یە دۆزراوەکاندا (لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆر و وورد و بەربڵاون)، بەڵام دەبینین پێداکێشان و بە هەڵە کردن لە نێوان زانایانی زانستە گەردوونی‌یەکان خۆیاندا هەیە، و لە هەمان کاتیشدا رۆژ لە دوای رۆژ زانیاری نوێ دەدۆزرێنەوە و بیردۆزی نوێ دێنە کایەوە کە بیردۆزە کۆنەکان هەڵدەوەشێننەوە.

بەڵام دەبینین راستی‌یەکانی قورئان و سوننەت هەمیشە یکدەگرێتەوە لەگەڵ زانستدا و هیچ کاتێك پێداکێشان روونادات، لەگەڵ بوونی ئەو ئاینە دەستکاری کراوانەی (وەك ئاینی گاور و جوولەکە) کە بەردەوام دژایەتی زانستیان کردووە و لە پێداکێشاندا بوون لەگەڵ دۆزینەوە زانستی‌یەکاندا، بەڕاستی پەروەردگار جوانی فەرمووە:

﴿وَمَا كُنتَ تَتْلُو مِن قَبْلِهِ مِن كِتَابٍ وَلَا تَخُطُّهُ بِيَمِينِكَ إِذاً لَّارْتَابَ الْمُبْطِلُونَ {٤٨} بَلْ هُوَ آيَاتٌ بَيِّنَاتٌ فِي صُدُورِ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ وَمَا يَجْحَدُ بِآيَاتِنَا إِلَّا الظَّالِمُونَ {٤٩} وَقَالُوا لَوْلَا أُنزِلَ عَلَيْهِ آيَاتٌ مِّن رَّبِّهِ قُلْ إِنَّمَا الْآيَاتُ عِندَ اللَّهِ وَإِنَّمَا أَنَا نَذِيرٌ مُّبِينٌ {٥٠} أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّا أَنزَلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ يُتْلَى عَلَيْهِمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَرَحْمَةً وَذِكْرَى لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ {٥١} قُلْ كَفَى بِاللَّهِ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ شَهِيداً يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَالَّذِينَ آمَنُوا بِالْبَاطِلِ وَكَفَرُوا بِاللَّهِ أُوْلَئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ {٥٢}﴾ (العنكبوت)، **واتە: تۆ ئەی پێغەمبەر (ﷺ) پێش ناردنی ئەم قورئانە هیچ کتێبێکت نەدەخوێندەوە، بەدەستی خۆیشت هیچ شتێکت نەنووسیوە (چونکە نەخوێندەوار بوویت)؟! خۆ ئەگەر شتێکی وات ئەنجام بدایە لەو کاتەدا نەفام و دەم بەتاڵەکان دونیایان پڕدەکرد لە شك و گومان (کە گوایە قورئان لە دانان و داڕشتنی تۆیە)، نەخێر هی تۆنی‌یە، بەڵکو قورئان چەند ئایەتێکی روون و ئاشکران لە سینە و دڵ و دەروونی ئەو کەسانەدا کە عیلم و زانستیان پێبەخشراوە و لەبەریانە، بەڕاستی جگە لە ستەمکاران کەس نکوڵی لە ئایەتەکانی ئێمە نی‌یە، کافران (وا دیارە قورئان بە بەڵگە دانانێن بۆیە) دەڵێن: باشە چی دەبوو ئەگەر نیشانە و بەڵگەی لەلایەن پەروەردگاری‌یەوە بۆ رەوانە بکرایە، تۆش ئەی پێغەمبەر لە وەڵامیاندا بڵێ: موعجیزە و نیشانە و بەڵگە ماددی‌یەکان بەدەست خوا خۆیەتی و من تەنها ئاگادار کەرەوە و بێدارکەرەوەیەکی ئاشکرام بۆتان.**

**ئایا بەس نی‌یە بۆیان کە بەڕاستی ئێمە قورئانمان دابەزاندووە بۆت و بەسەریاندا دەخوێنرێتەوە؟! بێگومان ئا لەو قورئانەدا رەحمەت و یاداوەری ئاشکرا هەیە بۆ ئەو کەسانەی کە ئیمان دەهێنن، (لەوەودوا ئەی پێغەمبەر ﷺ) پێیان بڵێ: تەنها خوا بەسە شایەت بێت لە نێوانماندا (کە من پەیامەکەیم پێراگەیاندوون)، جا هەر ئەو زاتە زانا و ئاگایە بە هەرچی لە**

ئاسمانەکان و زەوی‌دا هەیە، ئەوانەش باوەڕیان بە ناحەق و بەتاڵ هێناوە و باوەڕیـان بـە خـودای (تـاك و تـەنها) نـەهێناوە، ئـا ئەوانـە هـەر خۆیـان خەسارەتمەند و زەرەرمەندن.

لە لایەکی ترەوە پێغەمبەریش (ﷺ) دەربارەی موعجیزەکەی دەفەرموێت: ﴿عَن أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: « مَا مِنَ الأَنْبِيَاءِ نَبِيٌّ إِلاَّ أُعْطِيَ مِنَ الآيَاتِ مَا مِثْلُهُ أُومِنَ – أَوْ آمَنَ – عَلَيْهِ الْبَشَرُ ، وَإِنَّمَا كَانَ الَّذِى أُوتِيتُ وَحْياً أَوْحَاهُ اللَّهُ إِلَيَّ ، فَـأَرْجُو أَنِّي أَكْثَرُهُمْ تَابِعاً يَوْمَ الْقِيَامَةِ »﴾ رواه البخـاري، واتـە : هـەموو پێغەمبـەرێکی گەلانی پێشوو ئەوەنـدەی شـوێن کـەوتوو هـەبووە بـەپێی ئـەو موعجیزەیـەی کە پێـی درابوو وە خەڵکی بینیان، بەڵام موعجیزەکەی من پەیامێکە خوا پێی داوم، و هیوام وایـە زۆرتـرین شـوێن کـەوتووم هـەبێت لـەرۆژی دوایـی‌دا، ئیمـامی (إبـن حجر) لە راڤەی ئەم فەرموودەیەدا دەڵێت:

(مـوعجیزەی قورئـان بەردەوامـە تـا رۆژی دوایـی، و لـە راددە بـەدەرە لـە شێوازەکەی‌دا، و لـە رەوانبێـژی‌دا و لـە هەواڵـدانی بـە شـتە شـارراوەکاندا، کە هیچ سەردەمێك تێناپەڕێت ئیللا شتێك پەیدا دەبێت لەوانەی کە هەواڵی داوە دێنـەدی، کـە خـۆی لـەخۆی‌دا ئەمانـە سـەلمێنەری راسـتی قورئـانن، و بەهۆیانـەوە سـوودی گـەورەی قورئـان بڵاودەبێتـەوە، کە ئامـادەبوو و غائیـب دەگرێتەوە، و ئەوەی کە بوونی هەیە و ئەوەشی لە داهاتوودا دێتە بوون)[6].

## کامەرانیی خودی پێغەمبەر (ﷺ) خۆی بە یەکگرتنەوەی وەحی خودایی لەگەڵ واقیعدا:

ئیمامی (موسلیم) لە (صحیح)ەکەی‌دا بۆمان دەگێڕێتـەوە: ﴿عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتَ قَيْسٍ أُخْتَ الضَّحَّاكِ بْنِ قَيْسٍ وَكَانَتْ مِنَ الْمُهَاجِرَاتِ الأُوَلِ .... فَقَالَتْ: .... سَـمِعْتُ نِدَاءَ الْمُنَادِي مُنَادِي رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) يُنَادِي الصَّلاَةَ جَامِعَةً . فَخَرَجْتُ إِلَى الْمَسْـجِدِ

(6) بڕوانە (فتح الباري شرح صحيح البخاري) دانراوی (إبن حجر العسقلاني)/ ج١٣–ص ٣٠٥.

فَصَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّه (ﷺ) فَكُنْتُ فِي صَفِّ النِّسَاءِ الَّتِي تَلِي ظُهُورَ الْقَوْمِ فَلَمَّا قَضَى رَسُولُ اللَّه (ﷺ) صَلاَتَهُ جَلَسَ عَلَى الْمِنْبَرِ وَهُوَ يَضْحَكُ فَقَالَ: «لِيَلْزَمْ كُلُّ إِنْسَانٍ مُصَلاَّهُ ». ثُمَّ قَالَ: « أَتَدْرُونَ لِمَ جَمَعْتُكُمْ ». قَالُوا اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ . قَالَ « إِنِّي وَاللَّهِ مَا جَمَعْتُكُمْ لِرَغْبَةٍ وَلاَ لِرَهْبَةٍ وَلَكِنْ جَمَعْتُكُمْ لأَنَّ تَمِيماً الدَّارِيَّ كَانَ رَجُلاً نَصْرَانِيًّا فَجَاءَ فَبَايَعَ وَأَسْلَمَ وَحَدَّثَنِي حَدِيثاً وَافَقَ الَّذِي كُنْتُ أُحَدِّثُكُمْ عَنْ مَسِيحِ الدَّجَّالِ ...﴾، واتە: لە (فاطمەی کچی قەیس) دەگێڕنەوە کە ووتوویەتی: رۆژێك گوێم لە بانگ بوو، کە بانگی موسوڵمانانی دەکرد بۆ نوێژ و منیش بەرەو مزگەوت بەڕێ کەوتم، و لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) نوێژمان کرد و من لە ریزی ئافرەتاندا وەستابووم کە دەکەوتە دوای ریزی پیاوانەوە، کاتێك کە پێغەمبەر (ﷺ) لە نوێژ بووەوە چووە سەر مینبەر بە پێکەنینەوە و فەرمووی: با هەموو کەسێك لە شوێنی خۆی دابنیشێت.

پاشان فەرمووی: دەزانن بۆچی کۆم کردوونەتەوە، ووتیان: خوا و پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن، فەرمووی: سوێند بەخوا من نە لە ترسدا و نە لە ئومێددا کۆم کردوونەتەوە، بەڵکو بۆ ئەوە کۆم کردوونەتەوە کە (تەمیمی داری) پیاوێکی گاور بوو، هات و پەیمانی‌دا و موسوڵمان بوو و بابەتێکی بۆ باس کردم کە وەك ئەوەبوو کە من پێشتر بۆم باس دەکردن دەربارەی مەسیحی درۆزن، کە پاشان دەربارەی گەشتەکەی وبینینەکانی بۆیان دوا و دەقاودەق وەك ئەوەبوو کە پێغەمبەر (ﷺ) بۆی باس کردبوون.

بە هەمان شێوەی پێغەمبەریش (ﷺ) موسوڵمانانی ئەمڕۆ دڵخۆش و کامەران دەبن کاتێك کە واقیع و بینینە جۆراو جۆرەکانی ئەمڕۆ یەکدەگرنەوە لەگەڵ دەقەکانی قورئان و سوننەت (کە پێش ١٤٠٠ ساڵ دابەزیون) و راستی‌یەکانیان دەسەلمێنن.

گرنگی توێژینەوەکان دەربارەی ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا و سوودەکانیان لەم خاڵانەی خوارەوەدا خۆیان دەبیننەوە:

**١- نوێ کردنەوەی بەڵگەی پێغەمبەرایەتی لە رۆژگاری دۆزینەوە زانستی‌یەکاندا:**

خەڵکی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) بە چاوی خۆیان چەندین بەڵگەی ئاشکرایان لەسەر راستیی پێغەمبەرایەتی بینی، کە بۆیان دەرکەوت قورئان حەق و راستی‌یە، هەربۆیە لەمرۆدا پەروەردگار موعجیزەیەکی نوێی قورئانی دەرخستووە کە دەگونجێت لەگەڵ رۆحی سەردەمدا و بریتی‌یە لە ئیعجازی زانستی، کە خەڵکی ئەمرۆ بۆ زانست زیاتر لە هەموو شتێك مل دەنێن بە جیاوازی وولات و نەتەوەکانیانەوە، توێژینەوەکانی ئیعجازی زانستی بە وویستی پەروەردگار بەهێزترین و ئاشکراترین بەڵگە نیشان دەدەن بۆ هەر کەسێك کە بەدوای هەق و راستی‌دا بگەڕێت، و لە هەمان کاتدا باوەڕی باوەڕداران بەهێزتر و زیاتر دەکات ﴿وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا﴾ (الأنفال:٢)، واتە: کاتێك ئایەت و فەرمانەکانی ئێمە بەسەر ئیمانداراندا بخوێنرێتەوە ئەوا ئیمان و باوەڕیان زیاد دەکات.

**٢- راست کردنەوەی رێڕەوی زانستی تاقیکاری لە جیهاندا:**

خوای پەروەردگار داوای تێڕوانینی لە دروستکراوەکان (کە زانستی تاقیکاری ئەمڕۆی لەسەر دامەزراوە) کردووە، و بە رێگایەك داینـاوە بۆ ناسینی ئەو و پێغەمبەرەکەی و باوەڕپێهێنانیان، بەڵام خاوەنی ئاینە دەستکاری کراوەکان (گاور و جوولەکە) دژایەتی زانستیان کرد و رێگاکانیان بە پووچەڵ دادەنا و رابەرانی زانستیان تووشی ئەشکەنجە دەکرد، هەربۆیە ئەم زانستە تاقیکاری‌یانە شاڵاوی هێرشیان کردە سەریان و دژایەتی‌یان کردن و درۆ و دەلەسەکانیان بۆ جیهان ئاشکرا کرد، ئیتر مرۆڤایەتی کەوتە گێژاوەوە و سەرگەردان بوو و دەستی کرد بە گەڕان بەدوای ئاینی راستدا، ئەو ئاینەی کە هانی مرۆڤایەتی دەدات بۆ گەڕان بەدوای زانستدا و زانستیش رێنومایی مرۆڤەکان دەکات بۆ لای ئەو.

موسـوڵمانان لـەمڕۆدا دەتـوانن بێنـە پێشـەوە بـۆ راسـتكردنەوەی ڕێـڕەوی زانسـت لـە جیهانـدا و دانـانی لـە شـوێنی راستـی خـۆیدا، كـە بریتـییـە لـە ڕێگایەك بۆ باوەڕهێنان بە پەروەردگار و پێغەمبەرەكەی و سەلماندنی راسـتی قورئـان و بەڵگەیـەك بـۆ ئـاینی پـیرۆزی ئیسـلام و شـایەتێك بـۆ دەسـتكاری كردنی ئاینەكانی تر.

مرۆڤایەتی پێویستی بە ئاینی راست هەیە بۆ ئەوەی رزگاری بكات لەوەی كـە بەسـەریدا هـاتووە لـە خـاڵی بـوونی رۆحـەكان و فـەوتانی هەسـتەكان و ناڕەحەتی ژیان، پێویستی بەو ئاینە هەیە كە ئاین و زانسـت، و مـاددە و رۆح كۆدەكاتـەوە، و یاسا و رەووشت و خۆشـبەختی لـە دونیـادا و پاداشـتی چاك لە پاشەرۆژدا دەستەبەر دەكات، لە هـەمان كاتیشـدا پێویسـتی بـە بەڵگەیـەكی زانستی هەیە كە راستـی ئـەم ئاینـەی بۆ بسەلمێنێت، كـە لـە توێژینـەوەكانی ئیعجازی زانستیدا ئەم وەڵامەی دەست دەكەوێت.

ئەوەی كە دڵخۆشی دەبەخشێت لەڕێی گەیشتن بەم ئەنجامەدا ئەوەیە كە ژمارەیـەكی زۆر لـە زانایـانی گـەردوونیی سەرڕاسـت و دادپـەروەر هـەن، كـە دوودڵی نانوێنن لە دەربڕین و ئاشكرا كردنی ئەوەی كـە قەناعـەتی پێدەكـەن لە راستییەكان، كە ئەمان خاوەتی ووتەی بیستراون لە وولاتـانی خۆیانـدا، و لەوانەشە كە هۆكانی راگەیاندن هۆكارێك بن بۆ گەیاندنی ئیمـان و زانسـت بـۆ خەڵكی ئەو وولاتانە.

۳- تێگەیشتنی باشتر و فراوانتر لە دەقەكانی قورئان و سوننەت:

قورئـان و سـوننەتی پیرۆز بـۆ ئـەوە هـاتوون كـە ئێمـە بـە تـەواوەتی تێیـان بگـەین و كاریـان پێبكـەین، دەقـە گەردوونییـەكانیش ناتوانرێـت بەڕاسـتی و تەواوەتی لە ماناكانیـان تێبگـەین تـەنیا لـە چوارچێوەی زمانـەوانیدا، بـەڵكو پێویست دەكات كە ئـەم زانسـتە تاقیكارییـە نوێیانـە برەخسـێنرێن، و لـەژێر

ڕۆشنایی ڕاستی‌یە زانستی‌یەکاندا دەتوانین بە تەواوەتی لە مانا و مەبەستی دەقە پیرۆزەکان تێبگەین.

**٤- چالاك كردنی موسوڵمانان بۆ ئەنجامدانی دۆزینـەوە گەردوونی‌یـەکان بـەهۆی پاڵنەرە ئیمانی‌یەکەوە:**

بیرکردنـەوە لـە دروسـتکراوەکانی پـەروەردگار جۆرێکـە لـە پەرسـتن، و لـە هەمان کاتدا بیرکردنەوە لە مانای ئایـەت و فەرموودەکانیش هـەر جۆرێکـە لـە پەرستن، و گەیاندنی بە خەڵکی بریتی‌یە لە بانگەواز کردن بۆ لای خـودا، کە ئەمانـە هـەمووی دێنـەدی لـە توێژینـەوەکانی ئیعجـازی زانستی‌دا، کە خـۆی لەخۆی‌دا هاندەرێکە بۆ موسوڵمانان بۆ دۆزینەوەی نهێنی‌یەکانی گەردوون بە پاڵنەرێکی ئیمانی‌یەوە، کە هیواداریـن ببێتە هۆی پەڕینەوەیان لەو سـەردەمی دواکەوتنەی کە ماوەیەکی زۆرە تێ‌ی‌دا دەژین.

بەدڵنیایی‌یـەوە دەڵـێین کـە توێـژەرەوە موسـوڵمانەکان لــە ووتــەکانی پەروەردگاردا دەربارەی نهێنی‌یەکانی دروست کراوەکان بە ئەندازەی ئەوەندە دەدۆزنەوە کە ببێتـە هـۆی ڕێنومایيکـەریان لـە توێژینەوەکانیانـدا و یارمـەتی دەریـان بێـت بـۆ نزیـك بوونـەوە لـە ئامانجـەکانیان و بەفیڕۆنـەدانی هـەوڵ و کۆششیان لە شتی بێ‌سووددا.

**٥- بانگەواز کردن بۆ ئیسلام بەهۆی بەکارهێنانی بابەتەکانی ئیعجازی زانستی:**

بـەکارهێنانی ئیعجـازی زانسـتی لــە قورئــان و سـوننەتدا بریتی‌یـە لـە گونجاوترین ڕێگا بۆ بانگەواز کردن بـۆ بەرنامەکـەی پـەروەردگار لـە ڕۆژگـاری ئەمڕۆماندا کە سەردەمی پێشکەوتنی زانستی‌یە و خـەڵکی بـەهۆی زانسـتەوە فریو دراون و وازیان لە ئاین هێناوە، و هەروەها دەتـوانین بـەهۆی ئـەم زمـانی زانسـتەوە وەڵامـی ئـەو هێرشـەی ڕاگەیانـدنی ڕۆژئـاوا بدەینـەوە کە بـۆ سـەر ئیسلام دەیکەن و بیسەلمێنین کە ئیسـلام کۆتـایین بەرنامـە ئاسمانی‌یەکانـە و

تەنها ئەمە کە لەلایەن پەروەردگارەوە بۆ مرۆڤەکان نێردراوە، ئەویش بە بەڵگەکانی ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا.

یەکێك لە لایەنە گرنگەکانی ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا بریتی‌یە لەو ئاماژە و ئیشاراتانەی بۆ دروست بوون و گەشەکردنی کۆرپەلەی مرۆڤ هاتووە، هەر لە سەرەتای دروست بوونی‌یەوە تاوەکو لەدایك بوون و هاتنەژیانی، کە لەمرۆماندا زانستێکی تایبەت هەیە باس لەو قۆناغانە دەکات کە کۆرپەلەی مرۆڤ پیای‌دا تێدەپەرێت تاوەکو کامڵ بوون و لەدایك بوونی، ئەویش زانستی کۆرپەلەزانی‌یە ﴿علم الأجنة – Embryology﴾، لە قورئان و سوننەتی پیرۆزدا زۆر بەووردی باسی ئەو قۆناغانە کراوە کە کۆرپەلەی مرۆڤی پیٚ‌دا تێدەپەرێت.

سەرەتای گرنگی دانم بەم بابەتە دەگەرێتەوە بۆ زیاتر لە ١٠ساڵ لەمەوپێش، کە دەستم کرد بە خوێندنەوە و کۆکردنەوەی کتێب و بابەتەکان لەم بوارەدا (کە ئێستا لە ٥٠ سەرچاوەی عەرەبی و ئینگلیزی تێپەری کردووە)، کاتێك کە ئەو یەکگرتنەوە وورد و زانستی‌یە سەرسورهێنەرەم بینی لە نێوان ئاماژەکانی قورئان بۆ دروست بوونی مرۆڤ و راستی‌یەکانی کۆرپەلەزانی نوێ‌دا، زۆر بە گرنگم زانی کە رۆشنبیران و خوێنەرانی کورد بەم بابەتە گرنگە ئاشنا بکەم، کە لە ڕاستی‌دا نوقسانی زۆر هەیە لە ناساندنی ئەم موعجیزەیە بە زمانی کوردی.

بۆیە هەر لەو کاتەوە هەوڵمدا لەرێی هۆکارە جۆراوجۆرەکانی راگەیاندنەوە لەسەر ئەم بابەتە بدوێم و روونی بکەمەوە (وەك گرتنی چەندین کۆڕ و سازدانی بەرنامەی تەلەفیزیۆنی و بڵاوکردنەوەی زنجیرە بابەتێك لە گۆڤاری (هەیڤ)دا).

خوێنەری بەڕێز ئەم کتێبەی بەردەستت بریتی‌یە لە پوختە و درێژەی ئەو هەوڵانەم لەم بوارەدا، کە وابزانم شتێکی ناوازەیە و بەم جۆرە لە

کتێبخانەی‌ی کوردی‌دا لەسەر ئەم بابەتە نەنووسراوە، و هیوادارم ببێتە سەرچاوە لەم بوارە گرنگەدا و تینوێتی خوێنەری کورد بۆ ئەم بابەتە بشکێنێت، بە کورتی بەشەکانی ئەم کتێبە پێکهاتوون لە:

- لە بەشی یەکەمدا دەربارەی: (**زانستی کۆرپەلەزانی و کورتەیەکی مێژوویی**) دواوم، بە مەبەستی دەرخستنی بیر وبۆچوونەکان لەم بوارەدا هەر لە کۆنەوە تا ئێستا و ناساندنی ئەو قۆناغانەی کە کۆرپەلەزانی نوێ پیێ‌دا تێپەڕیوە.

- بەشی دووەم بریتی‌یە لە (**چەند پێشەکی‌یەکی گرنگ**) بۆ بابەتەکە کە پێکهاتووە لە: باس کردنی (**سەرەتای دروست بوون**)، هەروەها روون کردنەوەی ئەو راستی‌یەی کە (**دروست بوونی کۆرپەلەی مرۆڤ بەقۆناغە** ) و هەروەها (**مەنهەجی‌یەتی بەکارهێنراو لە کاتی وەسف کردنی قۆناغەکانی گەشە کردنی کۆرپەلە لە قورئان و سوننەتدا**)، و یەکگرتنەوەی ئەم ئاماژانەی قورئان و سوننەت لەگەڵ راستی‌یەکانی کۆرپەلەزانی‌دا.

- بەشی سێیەم کە گرنگترین بەشی ئەم کتێبەیە دەربارەی: {**دروست بوونی کۆرپەلەی مرۆڤ لە قۆناغی سەرەتایی‌دا** (**مرحلە النطفة**)} دواوم، و روونم کردووەتەوە کە چۆن بە ووردی ئەو هەموو ئاماژانەی قورئان و سوننەت لەگەڵ راستی‌یەکانی کۆرپەلەزانی‌دا یەکیانگرتووەتەوە، و ئەو برە زۆرەی زانیاری راست کە لەسەر (نطفة) کە بناغەی یەکەمی دروست بوونی مرۆڤە لە قورئان و سوننەتدا هاتووە یەکێکە لە موعجیزە گەورەکان کە تەنانەت زانایانی کۆرپەلەزانیش شایەتی‌یان بۆ ئەم راستی‌یە داوە.

- بەشی چوارەم بریتی‌یە لە: {**دروست بوونی کۆرپەلەی مرۆڤ لە قۆناغی** (**العلقة**)دا}، کە سەرەتای قۆناغەکانی دروست بوونی کۆرپەلەکەیە.

- بەشی پێنجەم باسی: {**دروست بوونی کۆرپەلەی مرۆڤ لە قۆناغی گۆشتپارە** (**المضغة**)}دا دەکات.

- بەشی شەشەم باسی: {**قۆناغی دروست بوونی (گۆشت و ئێسک- العظام واللحم) لە کۆرپەلەی مرۆڤدا**}دا دەکات، ئەم سێ بەشەی سەرەوە پێکەوە قۆناغی دروست بوون (**مرحلە التخلیق**) پێکدێنن لە روانگەی قورئان و سوننەتەوە، لەم بەشانەشدا خاڵێکی گرنگمان بۆ روون دەبێتەوە ئەویش ئەوەیە کە تەنانەت ئەو ووشە و زاراوانە (مصطلحات)انەی کە لە قورئان و سوننەتدا بۆ وەسف کردنی قۆناغەکان بەکار هاتوون هەموو مەرجێکی زانستی‌یان تێدایە بۆ گرتنەوەی شوێنی ئەو زاراوانەی لەمڕۆدا لە کۆرپەلەزانی‌دا زانایان بەکاریان دێنن.

- بەشی حەوتەم: {**باسی دروست بوونی کۆرپەلەی مرۆڤ لە قۆناغی گەشە کردن (النشأة)**}دا دەکات، کە کۆتایین بەشی سەرەکی کتێبەکەیە و تا دواساتەکانی گەشە کردنی کۆرپەلە لە سکی دایکدا دەخاتە بەر باس و لێکۆڵینەوە.

- بەشی هەشتەم لێکۆڵینەوەیەکە دەربارەی: {**قۆناغەکان و بەشەکانی قۆناغ و رووداوەکانی گەشە کردنی کۆرپەلە کە لە دەقە شەرعی‌یەکاندا هاتووە**} کە بە شێوەیەکی گشتی باسی سەرجەم ئەو ووردەکاری‌یانە دەکات کە دەربارەی قۆناغەکانی گەشە کردنی کۆرپەلە لە دەقە شەرعی‌یەکاندا هاتووە.

- بەشی نۆیەم زیاتر نووسینێکی ووێژەیی‌یە کە بۆ روونکردنەوەی سۆز و بەزەیی و دەسەڵاتی پەروەردگارە لە دروست بوون و گەشە کردنی کۆرپەلەی مرۆڤدا، بە ناونیشانی: {**گەشتی دروست بوونی کۆرپەلەی مرۆڤ لە بۆچوونی ئەدیبێکدا**}.

- دیارە هەموو بابەتێکی لەم جۆرە پێویستی بە: {**ووتەی کۆتایی و دەرەنجامەکانی لێکۆڵینەوەکە**} هەیە، کە کردوومەتە کۆتایی دەقەکانی کتێبەکە و پوختەی پەندە وەرگیراوەکانە لە باسەکەوە.

- کۆتـایی کتێبەکەشـم بـە دوو هاوپێچـێکی گـرنگ هێنـاوە بـۆ روون کردنەوەی زیاتری بابەتـەکان و هـەروەها باس کردنـی هەندێك بابەتی تـر کە پەیوەندی توند و تۆڵیان هەیە بە ناوەڕۆکی کتێبەکەوە، و دواییش ناوی ئەو سەرچاوانەمان هێناوە کە بۆ دەرکردنـی ئـەم کتێبـە بەم جۆرە سوودم لێوە بینیون، ئەویش بۆ ئەوەی هەر کەسێك زانیـاری زیـاتری بوێت بگەڕێتـەوە بۆ ئەو سەرچاوانە.

هـەر لـەناو کتێبەکـەدا دوو هاوپێچـی وێنـەی رەنگاورەنگمـان بـۆ بەشـەکان داناوە بۆ ئەوەی خوێنەری بەڕێز لەڕێیانەوە باشتر لە بابەتـەکان حـاڵی ببێـت و لای روون ببێتــەوە، چـونکە زۆر جـار یـەك وێنـە لـەبری چـەندین لاپـەڕە نووسین مانـا دەدات بەدەسـتەوە، بـەڵام خوێنـەری ئازیز دەبێـت ئاگـای لـەوە بێـت کـە زنجیربەنـدی و ژمـارەی وێنـەکانی ئـەم هاوپێچـانە جیـاوازە لـە زنجیربەندی وێنەکانی ناو بەشەکان خۆیان، و ئەو وێنانەی لەناو بەشەکاندان بـەپێی ژمـارەی بەشـەکان زنجیربەنـد کـراون (بـۆ نموونـە: ١-١، ٣-٢، ٥-٩، ٧-١١ و ..... هتــــد)، بـــەڵام وێنـــەکانی هاوپێچـــە رەنگاوڕەنگـــەکان زنجیربەندی‌یەکی تـری هەیـە بەم شێوەیە: ١/هـ ، ٢/هـ ..... تا ١٦٤/هـ، و لـە هەموو بەشێکدا بەپێی پێویست ئاماژە دراوە بـەو وێنـە رەنگاوڕەنگانـەی کە بابەتەکە روونتر دەکەنەوە، بۆ ئەوەی خوێنەر بۆی بگەڕێتەوە.

هیـوادارم ئـەم کتێبـە ببێتـە مایـەی سـوود و بـەهێز بـوونی بیروبـاوەڕ و رێنمـوویی کردنـی ئـەو کەسـانەی کـە پێویسـتی‌یان پێیـەتی، و داواکـارم لـە خوێنەری بەڕێز کە لە نزای خێر بێبەشمان نەکات ....

خوای گەورە پشت و پەنای هەموو لایەك بێت ......

**نووسەر**

١٨ / ٨ / ٢٠٠٦

سەرەتا ئەگەر پێناسەیەکی وشەی کۆرپەلە (الجنین) بکەین، لە فەرهەنگی زمانەوانی عەرەبی (القاموس المحیط)دا هاتووە: (الجنین: الوَلَد في بَطن أمه) واتە: کۆرپەلە بریتی‌یە لەو منداڵەی لە سکی دایکی‌دایە، بنەڕەتی وشەی (جنین) لە زمانی عەرەبی‌دا لە (جَنَّ)ەوە هاتووە بە مانای (المستور) واتە شارراوە لە سکی دایکی‌دا، لە (القاموس المحیط)دا دەڵێت: (جَنَّ في الرحم: إسْتَتَرَ، وَكُلُّ ما سُتِرَ عَنْكَ فَقَدْ جُنَّ عَنْك)، بۆیە بە عەرەبی پێی ووتراوە (جنین) لەبەرئەوەی کۆرپەلە لە سکی دایکی‌دا شارراوەیە، و عەرەب زۆر نەشارەزا بوون دەربارەی ئەوەی لەناو رەحمدا روودەدات (نەك ئەوان بەڵکو هەموو خەڵکی سەر زەوی لەو کاتەدا هیچی ئەووتۆیان دەربارەی کۆرپەلە نەزانیوە)، گرانی گەیشتن بە جیهانی کۆرپەلە لەناو منالّداندا لای کەس شارراوە نی‌یە.

ووشەی (أجنة) لە قورئاندا لە یەك شوێندا هاتووە کە دەفەرموێت: ﴿هُوَ أَعْلَمُ بِكُمْ إِذْ أَنشَأَكُم مِّنَ الْأَرْضِ وَإِذْ أَنتُمْ أَجِنَّةٌ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ﴾ (النجم:٣٢)، واتە: خوای پەروەردگار زیاتر ئاگادارە بە ئێوە چونکە ئەو سەرەتاتانی لە خۆڵی زەوی‌یەوە دروست کرد، و پاشان هەر ئەویشە ئاگای لێتانە و دروستتان دەکات، کە کاتێك کۆرپەلە بوون لە سکی دایکانتاندا.



پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿مِنْ أَيِّ شَيْءٍ خَلَقَهُ﴾ (عبس:١٨)، واتە: با مرۆڤ بیر بکاتەوە لەوەی لە چی‌یەوە دروست بووە؟

ئەم ئایەتە پیرۆزە پرسیارێکی سەرەکی زانستی بایۆلۆجی‌یە، خۆی لەخۆی‌دا کێشەی زانینی چۆنێتی دروست بوونی مرۆڤ بەشێکی گەورەی تۆمارە زانستی‌یەکانی پڕکردووەتەوە بە درێژایی مێژوو، لەم بەشەدا هەوڵ

دەدەین کە قۆناغە سەرەکی‌یەکانی مێژووی زانستی کۆرپەلەزانی بخەینەروو، کە ئەم مێژووە بە شێوەیەکی پتەو بەستراوەتەوە بە مێژووی زانست بە گشتی و پێکەوەش بە گەشەکردنی بیری فەلسەفی‌یەوە بەند بوون، ئەوەبوو زانایان تا سەردەمێکی نزیکیش پێیان دەووترا -لەلایەن خەڵکانی ترەوە- فەیلەسووفی سرووشت.



نهێنــــی و راســــتی‌یە وورد و دروســتەکانی زانســتی کۆرپەلــەزانی تــەنها لــەکۆتایی ســەدەی نۆزدەیــەم و سەدەی بیستەمدا دۆزرانەوە ئەویش بــەهۆی ئــەو بــەرەو پێشچــوونە گەورەیەی تەکنۆلۆژیاوە بوو کە ئەم دوو سەدەیە بەخۆیانەوە بینی، بەڵام دەبینین پێشتر مرۆڤ تەنها بەخەیاڵ تەصەوری دروست بوونی کۆرپەلەی کردووە و وەسفی کردووە، چونکە لەو کاتانەدا ئەو هۆکارانە نەبوون کە لێکۆڵینەوەی زانستی پێبکات.

دەتوانین مێژووی زانستی کۆرپەلەزانی بکەین بە ٣ قۆناغی سەرەکی‌یەوە:

**١- قۆناغی کۆرپەلەزانی وەسفی:**

ئەم قۆناغە دەگەڕێتەوە بۆ زیاتر لە ٦سەدە پێش زایین و تا سەدەی نۆزدەیەمی زایینی خایاند، لەم ماوەیەدا وەسفی ئەو تێبینی‌یە تایبەتی‌یانە کرا سەبارەت بە دیاردەی گەشە کردنی مرۆڤ بە چەند شێوازێکی جیاواز.

هەندێك تۆماری تایبەتی کە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی سولالەکانی چوارەم و پێنجەم و شەشەمی فیرعەونی لە میسری کۆندا باسی ئەوە دەکات کە بە لایەنی کەمەوە ١٠ کەس نازناوی (هەڵدڕی ووێڵاشی شایانە-فاتح مشیمة

الملك)یان هەڵگرتووە، مەراسیمی کەژاوەی شایانە وای دەخواست کەسێك ئالآیەك هەڵگرێت لەبەردەم کەژاوەکەوە کە تەعبیر لە وویلاشی پاشا بکات (بڕوانە وێنەی ١-١)، ئەویش لەبەرئەوەی باوەڕیان وابوو کە وویلاش (المشیمة) سیفاتی سیحریی هەیە، کە ئەم بۆچوونە تا سەردەمی یۆنانییەکان و دوای ئەوانیش هەر باو بوو و زانست بەسترایەوە بە سیحر و جادووەوە، کۆنترین نووسراویش سەبارەت بە چۆنێتی خۆپاراستن لە سکپڕی (الوقایة من الحمل) بە زمانی هیری (کە زمانی کۆنی میسرییەکان بوو پێش زمانی هیرۆگلیفی) نووسراوە و مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ٢٠٠٠-١٨٠٠ ساڵ پێش زایین، هەروەها میسرییە کۆنەکان نەشارەزا بوون بە ڕۆڵی تۆوی پیاو لە کرداری دروست بوونی کۆرپەلەدا، و باوەڕیان وابوو کە مەنی پیاو لە ناوچەی بڕبڕەی پشتەوە پەیدا دەبێت، کە ئەمە بیروبۆچوونی کاهن و قەشە ئایینییەکانیان بوو، بەڵام میسرییە کۆنەکان بە نزیکەیی ماوەی سکپڕییان دەزانی (دایان نابوو ماوەی ٢٧٥-٢٩٤ ڕۆژ دەخایەنێت).



ئالآیەك کە نیشانەی
(وویلاشی شایانە)ی فیرعەونیکە
(Kleiss 1964)

لە زانستی پزیشکی لای هیندییە کۆنەکاندا نامەیەك بە زمانی سانسکریتی (Sanskrit) دۆزراوەتەوە کە باسی بۆچوونە کۆنەکان دەکات دەربارەی گەشە کردنی کۆرپەلە کە دەڵێت: (لە یەکگرتنی خوێن و مەنییەوە کۆرپەلە پەیدا دەبێت، دوای تێپەڕبوونی حەوت شەو دەبێت بە تۆوێك، دوای

٢هەفتـە کۆرپەلەکـە دەبێـت بـە تۆپـەڵێك و بارسـتەیەکی خـڕ، دوای مانگێـك دەبێت بەبارستەیەکی پتەو، دوای ٢مانگ سەری کۆرپەلەکە دروست دەبێت، دوای ٣مانگ جومگەکانی لەشی پەیدا دەبن)، کە ئاشکرایە ئەم بۆچوونانە چەند لە راستی‌یەوە دوورن، و ئەوە دووپات دەکاتەوە کە لە کۆندا خەیاڵ و تەصەوری بێبناغـە چـەند رۆڵـی هـەبووە لـە تێگەیشـتنی قۆناغـەکانی گەشـە کردنی کۆرپەلەدا؟!.

یۆنانی‌یە کۆنەکان یەکەم کەس بوون کە زانستیان بە مەنتیقەوە گرێدا نــەك بــەهێزە ســیحری‌یەکانەوە، و ئــەوەبوو بــە شــێوەیەکی مــەنتیقی تێبینی‌یـەکانیان لێـك دەدایـەوە، بـەڵام زۆر کـات مـەنتیق لەگـەڵ راسـتی‌یە زانستی‌یەکاندا یەك ناگرێتەوە، یەکەم کەس کە لەم بوارەدا دوا زانای یۆنـانی هیپـوکراتس (Hippocrates) بـوو کـە لـە سـەدەی پێنجـەمی پـێش زایـندا ژیاوە، کە دەڵێت: (٢٠ هێلکە یان زیاتر بێنە و بیانخەرە ژێر دوو مریشك یان زیاترەوە، هـەر رۆژەی هێلکەیـەك بشکێنە و سـەیری بکـە، بە تـەواوەتی ئـەوە دەبینیت کـە بۆمـان روون کردیتـەوە کە لەوانەیە سروشتی مرۆڤ چوونیەکی سروشتی باڵندە بێت).

لـەم سـەردەمەی مێـژووی زانسـتی کۆرپـەلـەزانی‌دا نووسـینەکانی (أرسـطو طالیس) و (جالینۆس) زاڵ بوون لەگەڵ ئەوەشدا کە تەنیا بۆچوون نەبوون لەم بوارەدا، (أرسطو Aristotle) (٣٨٤-٣٢٢ی پێش زایین) بە بۆچوونەکانی دەربـارەی کۆرپـەلـەزانی بـەناوبانگ بـوو کـە وەسـفی گەشـە کردنـی جووجـك و کۆرپەلـەی تـری کـردووە، لێـرەوە بـە دامەزرێنـەری کۆرپـەلـەزانی دادەنرێـت لەگەڵ ئەوەشـدا کـە بیروبۆچـوونەکانی لـە دەوری: (گەشـە کردنـی کۆرپـەلـە لـە خوێنی مانگانـەوە پـاش ئـەوەی کـە لەلایـەن تـۆوی پیـاوەوە چالاك دەکرێـت) دەخولایەوە، (جالینۆس Claudius Galen)یش لە سەدەی دووەمی پێش



وێنەیەکی (لیۆناردۆ دافینشی) کە تێیدا کۆرپەلەیەکی نیشانداوە لە بەشێکی منالدانیدا بە تەواوەتی و پەردەکانی دەوریشی دەرخستووە

وێنەی (١-٢)

زاییندا کتێبێکی دانا لەسەر گەشە و خۆراکی کۆرپەلـە، و دەربـارەی وویڵاشی دەوری کۆرپەلەش دواوە، کـە بۆچـوونەکانی تـەنیا باسـی قۆناغـە کۆتاییـیـەکانی گەشـەی کۆرپەلە دەکات.

لە ساڵی ٢٠٠ی پێش زایینـەوە جـۆرە ئاماژەیــەکی ئــەووتۆ بــۆ زانستی کۆرپەلـەزانی نـەهاتووە لـە کتێبـە زانستییەکانی رۆژئـاوادا، و ئەگەر نووسەر و وەرگێڕە موسوڵمانەکان نەبووایـە ئەوا زۆرێك لـە نووسراوە یۆنانییەکان دەفەوتا، تەنیا ئەو فەرموودانەی قورئـان و سوونەت نـەبێت کە زۆر بـە ووردی باسـی گەشـە کردنـی کۆرپەلـەیان کـردووە، هـیچ کەسـێکی تـر نەچووەتە ووردەکارییەکانی کۆرپەلەزانییەوە، زانـای رۆمـانی (کۆنستەنتین Constantinus Africanus) (١٠٢٠-١٠٨٧ی زایینی) نامەیەکی کورتی نووسیوە بە نـاوی سروشـتی مـرۆڤ (De Humana Natura) کە تێیدا باسی هەندێك قۆناغی گەشە کردنی کۆرپەلەی کردووە و بەستویەتییەوە بە هەسارەکانەوە، ئەمە بۆمان روون دەکاتەوە کە ئـەو بیردۆزانـەی تـەنیا بـەهۆی گومان و خەیاڵەوە دادەنرێن چۆن مـرۆڤ بـەرەو خورافات دەبات، لـە سـەدەی پانزەیەمدا (لیوناردو دافینشـی Leonardo Da Vinci) چەند وێنەیـەکی ناو منالدانی بڵاو کردووەتەوە کە کۆرپەلـە و پـەردەکانی دەوری دەردەخـات، کۆرپەلەکە بە تەواوەتی دەرکەوتووە، ئەمەش بڵاویی بیردۆزی دروست بوونی تەواو دەسەلمێنێت لەو سەردەمانەدا (بڕوانە وێنەی ١-٢).

لەدوای سەدەی شانزەیەمەوە توێژینەوەی زانستی چالاك بوو، بە تایبەتی لە سەدەی (١٧)و(١٨)دا، کارەکانی (فیسالیوس) و (فابریسیوس) و (هارڤی) ڕێخۆشکەر بوون بۆ دەست پێکردنی سەردەمی پشکنینی وردبینی، و سیمینارە زانستییەکان چالاك بوون و پاشان تۆوی پیاو دۆزرایەوە.

بابەتی دروست بوونی پێشتر و دروست بوونی کاملی کۆرپەلە (التكوين السابق والخلق الكامل للجنين Preformation theory) بەسەر بیرو بۆچوونی ئەو سەردەمانەدا زاڵ بوو، کە تاوەکو سەدەی شانزەیەمی زایینیش تەنها ئەم بیروبۆچوونە زاڵ بوو، ئەگەر تێبینی هەندێك وێنە بکەین لە کتێبەکانی مامانی سەدەی شانزەیەمدا (وێنەی ١-٢) دەبینین باسی ئەوە دەکات کە کۆرپەلەی مرۆڤ لە خوێنی مانگانەی ئافرەتەوە (دم الحيض)ەوە دروست دەبێت و بەکاملی لەو خوێنەدایە و لە منداڵدانی ئافرەتدا




چەند وێنەیەکی کتێبی جاکوب رویف (١٥٥٤ز) کە بارستە خوێن و تۆوی کۆرپەلە لە منداڵداندا رووندەکاتەوە بە پێی بۆچوونی (ئەرستۆ تالیس)

تەنها لە قەبارەدا گەورە دەبێت و پاشان لەدایك دەبێت (بەڵگەشیان بۆ ئەمە نەمانی خوێنی عادەی مانگانەی ئافرەتە لە کاتی سکپڕی‌دا کە دەیانووت ئەو خوێنەیە کە کۆدەبێتەوە لەناو منداڵداندا و منداڵەکەی لێوە دروست دەبێت)، واتە تۆوی پیار هیچ رۆڵێکی لەم دروست بوونەدا نییە، ئەم بیروبۆچوونە

هەڵەیە (أرسطو طالیس)ی یۆنانی ووتویەتی لەسەدەی چوارەمی پێش زاییندا و بەدرێژایی سەدەکان تەنها ئەم بیروبۆچوونە باسکراوە.




ئەم وێنانە دروست بوونی مریشك روون دەکاتەوە
(Fabrius Meyer 1939)

لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم بۆچوونە باوبوو لەلای پزیشکان تا دوای دۆزینەوەی ووردبین (میکرۆسکۆب)یش بەڵام موسوڵمانان بە گشتی و زانایانی ئیسلام بە تایبەتی ئەم بۆچوونەیان رەت کردووەتەوە، باوەڕی تەواویان هەبووە کە منداڵ لە هەردوو دایك و باوکەوە دروست دەبێت و زانست بەهەڵە باسی دروست بوونی کۆرپەلەی دەکرد، ئەویش بە پشت بەستن بە ئایەتە قورئانییەکان و فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ)[1]،

---

(1) بڕوانە ووتەی زانایانی موسوڵمان: ﴿ئیب قەییمی جەوزیە﴾ کە لە ساڵی (٧٥١ی کۆچی) کۆچی دوایی کردووە کە دەڵێت: (ومني الرجل وحده لا يتولد منه الولد ما لم يمازجه مادة أخرى من الأنثى) واتە: مەنی پیاو بە تەنیا منداڵی لێوە دروست نابێت ئەگەر بێتو ماددەیەکی تری تێکەڵاو نەبێت لە ئافرەتەوە (بڕوانە کتێبی: التبيان في علوم القرآن/ لاپەڕە ٢٤٤)، هەروەها زانا ﴿ئیبن حەجەری عەسقەلانی﴾ کە لە (١٤٤٩ی زایینی‌دا) کۆچی دوایی کردووە لە کتێبی (فتح الباري شرح صحيح البخاري)دا دەڵێت: (وزعم كثير من أهل التشريح أن مني الرجل لا أثر له في الولد إلا في عقده، وأنه إنما يتكون من دم الحيض، وأحاديث الباب تبطل ذلك) ج١١ ص٤٨٠، دەڵێت: زۆرێك لە زانایانی توێکاری لەم سەردەمەماندا وا تصور دەکەن و دەڵێن کە تۆوی پیاو رۆڵی نییە لە دروست بوونی منداڵدا و کۆرپەلە لەسکی دایکدا تەنها لەخوێنی مانگانەی ئافرەتەوە دروست دەبێت، کە فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ئەم قسەیە رەت دەکەنەوە و ئەم قسەیە راست نییە!.

وەك فەرموودەی پەروەردگار: ﴿أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ يُمْنَى﴾ (القيامة: ٣٧)، کە ئەمەش نموونەیەکی ئاشکرایە لە پێشڕەوی و پێش کەوتنی قورئان و سوننەت بۆ هەموو ئەو زانیاری‌یانەی کە لەلای زانایانی غەیری موسوڵمان بەدرێژایی سەدەکان جێگیربوو بوو.

کارەکانی زانا (فابریسیوس - Hieronymus Fabricius) (١٦٠٤) وێنەیەکی زۆر باش بۆ گەشە کردنی کۆرپەلەی مریشك روون دەکاتەوە (وێنەی ١-٤)، یەکێك لە قوتابیەکانی ئەم زانایە بەناوی (ویلیام هارڤی William Harvey) بە سەرنجەکانی دەربارەی سووڕانی خوێن و گەشە کردنی کۆرپەلە ناوبانگی دەرکرد، ساڵی (١٦٥١ز) هارڤی کتێبێکی بڵاوکردەوە کە ناوی نا (وەچەی حەیوانی De Generatione Animalium) کە تێی‌دا دەڵێت:




(کاتێك تۆوی پیاو دەچێتە ناو منالدانەوە دەبێت بە ماددەیەك بە هاوشێوەی هێلکە کە کۆرپەلەی لێوە دروست دەبێت)، ئەم تێبینی‌یانەی لە لێکۆڵینەوەی جووجکەوە لەلا گەڵاڵە بوو، پاش ماوەیەك زانا (مارسیللو مالپیگی Marcello Malpighi) پەیدابوو کە لە ساڵی ١٦٧٢دا چەند وێنەیەکی کۆرپەلەی مریشکی بڵاوکردەوە کە تۆپەڵە پشتی‌یەکان بە روونی دەردەخات (کە لەمڕۆدا دەزانین ئەم تۆپەڵانەیە کە بەشی گەورەی هەیکەلی ئێسك و ماسولکەکان دروست دەکەن لە کۆرپەلەدا) (وێنەی ١-٥)، لە هەمان کاتدا

کۆمەڵێك وێنەی تر بلاو کرانەوە کە گەشە کردنی کۆرپەلەی مرۆڤی دەردەخست و هەموویان بریتی بوون لە یەك وێنە بەڵام بە قەبارەی جیاواز (وێنەی ١-٦)، کە ئەمەش سەلمێنەری ئەو بیروبۆچوونە بوو




وێنەیەکی کۆنە کە دروست بوونی مرۆڤ روون دەکاتەوە
(Needdham 1959)

کە گەشە کردنی مرۆڤ لە سکی دایکدا تەنها بریتی‌یە لە زیاد بوون لە قەبارەدا بۆ یەك وێنەی دیاری کراو، ئەویش بەهۆی زاڵ بوونی بیردۆزی (دروست بونی تەواو)ی مرۆڤ بەسەر بیروبۆچوونی زانایان لەو کاتانەدا.

ئەم بیروبۆچوونە هەڵەیە هەر بەو شێوەیە مایەوە تاوەکو ووردبین (مایکرۆسکۆپ Microscope) دروست کرا[2]، لە ساڵی ١٦٧٧دا (ڤان لیڤینهوك Leeuwenhoek) بە هاوکاری زانا (هام Hamm) و بەهۆی ووردبینەوە خانەی زاووزێی




وێنەی ووردبینێکی کۆن و چۆنیێتی بەکارهێنانی
(Leeuwenhoek 1673)

نێرینە (تۆو-الحیوانات المنویة SPERMS)یان دۆزی‌یەوە و باوەڕیان وابوو کە مرۆڤێکی تەواوی زۆر بچووکی تێدایە؛ و لە بەرامبەر کۆمەڵەی فەلسەفی شایانەی بەریتانی‌دا ئاشکرایان کرد (وێنەی ١-٧) (هەروەها وێنەکانی: ١/هـ ، ٢/هـ).

---

(2) بۆ یەکەم جار زانای هۆڵەندی (زاخاریاس جانسن) لە ساڵی ١٥٩٠ز میکرۆسکۆبی داهێنا، کە زۆر سەرسوڕهێنەر بوو لەو کاتەدا و لەبارەیەوە دەووترا: بەهۆی ئەم بۆریەیە درێژەوە دەتوانیت کە مێش بە قەبارەی مەڕێك ببینیت!




وێنەیەك لە داناتی (لیڤینهۆك) بۆچوونی (بوفون) دەربارەی تۆوی کەروێشك و سەگ روونده‌کاتەوە
(Leeuwenhoek \ Meyer 1939)

لەو کاتە کۆنەدا گفتوگۆیەکی زۆر گەورە دەربارەی ئەو تێبینییانەی کە تەصەور دەکرا رووی‌دا، بڕوانە (وێنەی ٣/هـ) کە تۆوی سەگ و مرۆڤ (بەپێی بۆچوونی زانا (بوفون **Buffon**) (١٧٤٩زایینی) روون دەکاتەوە، هەروەها بڕوانە (وێنەکانی: ١-٨ ، ١-٩) کە تۆوی کەروێشك و سەگ و مرۆڤ روون دەکاتەوە بەپێی بۆچوونی زانا لیڤینهۆك.

ماوەیەکی زۆر تێنەپەڕی کاتێك زانایان بینییان وردەکارییەکی زۆر لە دروست بوون و شێوەی تۆودایە کە تەعبیر لە رۆحی داهێنان و دروست بوون دەکات لەو سەردەمەدا، بۆیە پاش ماوەیەك ئەو بیرو بۆچوونە پەیدابوو کە لە تۆوی پیاوەوە




تۆو بە پێی بۆچوونی زانا لیڤینهۆك (Leeuwenhoek \ Meyer 1939)

کۆرپەلە دروست دەبێت، زانای ئەڵمانی سوامردام **Jan Swammerdam** (١٦٣٧ – ١٦٨٠ز) یەکێکە لە لایەنگرە دڵگەرمەکانی بیردۆزی (دروست



وێنەی (١-١٠)
وێنەیەك کە (هارتسۆکەر ١٦٩٤) دایناوە بۆ سپێرم کە منالێکی بچووکی تێدایە
(from Meyer 1939)

بوونی کامڵ Preformation theory) بوو و ووتویەتی کە کۆرپەلە بە بچووك کراوەیی لە بەشی پێشەوەی سپێرمی پیاودایە (لە شێوەی قەزەمێکدا) و پاشان لەناو منالّداندا جێگیر دەبێت، گەورە دەبێت و لەدایك دەبێت، ئەو وێنەیەی (هارتسوکر Hartsoeker) لە سالّی ١٦٩٤دا بلاّوی کردەوە سەلمێنەری ئەم ووتەیەن و ڕوونی دەکەنەوە کە مایکرۆسکۆپی ئەو کاتە وردەکاری پێکهاتنی (تۆو)یان دەرنەخستووە و زانایان لەخەیالّی خۆیانەوە ئەو پێکهاتەیەیان باسکردووە ( وێنەی ١-١٠)، ئەمانەش هەمووی سەلمێنەری ئەوە بوو کە زانایانی ئەو سەردەمە نەیاندەزانی کە کۆرپەلە لە سکی دایکدا بە قۆناغی جیاوازدا دەڕوات لە ڕووی پێکهاتە و شێوەوە و تەنها لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەمەوە بەم ڕاستی‌یە گەیشتن، بەلاّم ئەم ڕاستی‌یە قورئان و سوننەتی پیرۆز پێش ١٤٠٠سالّ بۆ یەکەم جار باسیان کردووە و ڕوونیان کردووەتەوە، ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَخْلُقُكُمْ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ خَلْقاً من بَعْد خَلْقٍ في ظُلُمَاتٍ ثَلَاثٍ﴾ (الزمر:٦).

هەروەها زانای فەڕەنسی (دی گراف De Graaf) لەسالّی ١٦٧٢دا چەند بۆشایی‌یەکی لە منالّدانی کەروێشکدا بینی و ئەوەی لا گەلالّە بوو کە منالّدان کۆرپەلە دەرنادات بەڵکو لە ئەندامێکی ترەوە دێت کە ناوی نا هێلکەدان (Ovaries)، هەروەها هێلکەی پێگەیشتووی ئافرەت (حويصلات گراف Graafian follicle)ی دۆزی‌یەوە (کە بەناوی ئەوەوە ناونراوە)، ئەم بە

پێچەوانەوە دەیووت کە کۆرپەلە بە کاملّی لەناو هێلکەدایە، بە هەمان شێوەش زانا (مالپیجی) کە بە باوکی زانستی کۆرپەلەزانی دەناسرێت دەیووت کە هێلکەی مریشکی نەپیتێنراو شێوەیەکی بچووکی لە مریشك تێدایە، ئەویش پاش توێژینەوەکانی لەسەر هێلکەی مریشکی نەپیتێنراو لە ساڵی (١٦٧٥)ی زایینی‌دا، ئەم بیرو بۆچوونە لە ساڵی (١٧٤٥ن)دا بەهێزتر بوو کاتیك کە زانا (بونیە Charles Bonnet) ئەوەی دۆزی‌یەوە کە هێلکەی هەندێك لە مێروو گەشە دەکات بۆ کۆرپەلەی تەواو بەبێ پێویستی بە بوونی نێرینە، کە ئەم دروست بوونە بە دروست بوونی بێ باوك (Parthenogenesis) دەناسرێت.

بەم شێوەیە دەبینین کە بیرۆکەی (دروست بوونی پێشتر و تەواو) بەردەوام زاڵ بووە و زانایان باوەڕیان پێ‌ی بووە، جیاوازی تەنیا لەوەدا بووە کە ئایا کۆرپەلە بە کاملّی لەناو تۆو یان هێلکەدایە؟ ئەم جیاوازی و موناقەشەیە لە نێوان ئەم دوو بیروبۆچوونەدا کۆتایی نەهات تاوەکو زانا سپالانزانی (Spallanzani) لەساڵی ١٧٧٥ی زایینی‌دا سەلماندی کە هەردوو تۆوی پیاو و هێلکەی ئافرەت پێویستن بۆ دروست بوونی کۆرپەلەی مرۆڤ، دوای ئەوەی کە تاقی‌کردنەوەکانی لە پیتاندنی دەستکرددا (واتە لە دەرەوە منالّدان) سەلماندی کە تۆوی پیاو فاکتەری پیتێنەرە بۆ هێلکە.

بەلاّم دەبینین قورئان و سوننەتی پیرۆز پێش زیاتر لە ١٤٠٠ساڵ لەمەوبەر ئەم ڕاستی‌یە زانستی‌یەی زۆر بەووردی باسکردووە و دووبارەی کردووەتەوە، کە وەکو باسمان کرد تەنها دووسەد ساڵ دەبێت زانایان گەیشتوونەتە ئەم ڕاستی‌یانە، و لەمڕۆماندا وەکو موعجیزەیەك سەیری دەکەین، ئێستاش فەرموون ئێوە و هەندێك لەو ئایەت و فەرموودە پیرۆزانە:

- ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى﴾ (الحجرات:١٣). واتە: ئەی خەڵکینە بە

دڵنیایی‌یەوە بزانن کە ئێمە ئێوەمان لە نێر و مێ دروست کردووە (واتە نێر و مێ هەردووکیان پێویستن بۆ دروست بوونی کۆرپەلەی مرۆڤ).

- ﴿إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ﴾ (الدهر:٢). مانای(أمشاج) واتە تێکەڵ، کەواتە مانای ئایەتەکە ئەوەیە کە دەفەرموێت: ئێمە مرۆڤمان لە نطفةیەکی تێکەڵاو دروست کردووە (تێکەڵاو لەتۆوی پیاو و هێلکەی ئافرەت)، کە ئەنجامی یەکگرتنیان لەناو مناڵداندا بریتی‌یە لە دروست بوونی هێلکەی پیتێنراو(Zygot).

- لە فەرموودەیەکی پیرۆزی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە: ﴿مَرَّ يَهُودي بِرَسول الله (ﷺ) وَهُوَ يُحَدِّثُ أَصْحابَهُ، فَقالت قُرَيش: يا يَهودي إِنَّ هَذا يَزْعُم أَنَّهُ نَبيّ، فَقالَ: لَأَسْأَلَنَّه عَن شَيءٍ لا يَعْلَمُهُ إِلاّ نَبيّ، قال: فَجاء حَتَّى جَلس، ثُمَّ قال: يا مُحَمَّد مِمَّ يُخْلَقُ الأنسان؟ فَقال رَسول الله (ﷺ): يَا يَهودي مِن كُلٍّ يُخْلَق: مِن نُطْفَةِ الرَّجُلِ وَنُطْفَةِ المَرْأَة﴾ رواه أحمد بسند صحيح، واتە: ڕۆژێك جوولەکەیەك بەلای پێغەمبەردا ڕۆیشت کە لەو کاتەدا قسەی بۆ هاوەڵە بەڕێزەکانی دەکرد، لەو کاتەدا قورەیشی‌یە بێباوەڕەکان پێیان ووت: ئەی جوولەکە ئەم پیاوەی دەیبینیت وا خۆی پیشان دەدات کە دەڵێت من پێغەمبەرم، جوولەکەکەش ووتی: ئێستا پرسیارێکی لێدەکەم ئەگەر پێغەمبەر نەبێت نایزانێت، ئەوە بوو هات و لەلای پێغەمبەردا دانیشت و پاشان پرسیاری کرد: ئەی موحەممەد مرۆڤ لەچی‌یەوە دروست دەبێت، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ئەی جوولەکە بزانە کە بنچینەی مرۆڤ لە هەردوو نطفةی پیاو و نطفةی ئافرەت بەیەکەوە دروست دەبێت.

### ٢- قۆناغی زانستی کۆرپەلەزانی تاقیگەیی:

لەمەی پێشەوە بۆمان دەردەکەوت کە زانستی کۆرپەلەزانی تاوەکو کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم بەرەوپێش چوونێکی ئەووتۆی بەخۆیەوە نەدی،

لەم کاتەدا تەنها هێلکەی شیردەرەکان دۆزرایەوە و توێژینەوەی لەسەر کرا، لەم کاتە بەدواوە زانستی کۆرپەلەزانی تاقیگەیی (تجريبي) لەسەر دەستی کۆمەڵە زانایەك لە نووسینەکانیاندا پەیدابوو لەوانە: زانایان (ڤۆن بایری ئەڵمانی Von Baer) (١٨٢٧ز)، و (شیلدن و شوان- ١٨٣٩ز)، و (داروینی ئینگلیزی Charles Darwin) (١٨٥٩ز) و (هیگل)، کە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەمەوە تا سەرەتای چلەکانی سەدەی بیستەمی خایاند، (پاندەر Pander) لە ساڵی ١٨١٧ی زایینیدا ئەوەی دۆزییەوە کە لەشی کۆرپەلە لە ٣چین پێك دێت، زانا (ڤۆن بایر) یەکێکە لەوانەی کە هەنگاوێکی گەورەی بە زانستی کۆرپەلەزانیدا ئەویش بەدارشتنەوەی بیروبۆچوون و چەمکەکانی زانستی کۆرپەلەزانی، لەرێی تاقیکردنەوە و سەرنجدانەکانەوە، بەدوای دابەش بوونی هێلکەی پیتێنراودا رۆیشت و لە چینەکانی کۆرپەلەی کۆڵیەوە بە پشت بەستن بە نووسینەکانی (ماڵپێجی و پاندەر)، هەروەها دوو بۆچوونی گرنگی دانا لە کۆرپەلەزانیدا: کە کۆرپەلە بە قۆناغ گەشە دەکات، و پێشکەوتنی سیفاتە گشتییەکان پێش سیفاتە تایبەتییەکان دەبێت، (شیلدن و شوان) لە ساڵی (١٨٣٩ز)دا ئاشکرایان کرد کە لەشی مرۆڤ لە خانە پێك دێت، ئەم بۆچوونە ئەو راستییەی ئاشکرا کرد کە کۆرپەلە لە یەك خانەوە گەشە دەکات کە هێلکەی پیتێنراوە (Zygote).

ساڵی (١٨٦٥ز) زانا (گریگۆر مەندل Gregor Mendel) بنچینەکانی زانستی بۆماوەزانی (Genetics) دانا، کە پزیشکان تا چەند ساڵێکی زۆر لەم بۆچوونانە تێنەدەگەیشتن، ساڵی (١٨٧٥ز) زانا (هێرتویگ Hertwig) تێبینی پیتاندنی هێلکەی کرد لەلایەن تۆوەوە، و سەلماندی کە هەردوو هێلکەی پیتێنراو و تۆو بەشداری دەکەن لە دروست کردنی هێلکەی پیتێنراودا، و یەکەم کەس بوو کە ئەم پیتاندنەی بینی، هەروەها (فرانك

راتری لیلی) لێکۆڵینەوەی دوورودرێژی لەسەر میکانیزمی پیتاندنی هێلکە لەلایەن تۆوەوە دەکرد.

هەروەها ئەم سەردەمە بە گەڕان بەدوای میکانیزمەکاندا جیا دەکرێتەوە کە لەم بوارەدا ناوی زانا (ویلهیلم رۆکس Wilhelm Roux) بەناوبانگە، چەندین زانای بەناوبانگی تریش رۆڵی گرنگیان هەبووە لەم سەردەمەدا لەوانە زانایان (ویلسون، ثیودور، و بوڤیری) کە مەسەلەی زانینی ئەو میکانیزمانەی بەهۆیانەوە خانەکان تایبەتمەند دەبن بیرو بۆچوونیانی سەرقاڵ کردبوو،(فلیمینگ Fleming) لە ساڵی (١٨٧٨ن)دا کرۆمۆسۆمەکانی (Chromosomes) بینی و پێشنیاری ئەوەی کرد کە لە کرداری پیتاندندا رۆڵیان هەیە، زانا (ڤان بندن Van Beneden) لە (١٨٨٣ن)دا وەسفی کەمە دابەش بوونی (Meiosis) کردووە و دەڵێت: ئەو خانانەی لەمەوە پەیدا دەبن ژمارەیەکی کەمتریان لە کرۆمۆسۆم تێدایە، زانا (مۆرگان-١٩١٢) باسی لە رۆڵی جینەکان کردووە لە بۆماوەزانیدا و دەیووت کە ئەم جینانە لەسەر چەند شوێنێکی تایبەتی کرۆمۆسۆمەکانن، (تجیو و لیڤان Tjio & Levan) لە ساڵی (١٩٥٦ن)دا ئاشکرایان کرد کە ژمارەی کرۆمۆسۆمەکان (٤٦) دانەیە، (ستریتەر Streeter) ساڵی (١٩٤٢ن) گەشە کردنی کۆرپەلەی مرۆڤی لە (٢٣) قۆناغدا رێکخست، زانا (هانس سبیمان)یش (١٨٤١-١٩٤١ن)



کرۆمۆسۆمەکانی مرۆڤ: چەقرەی نهێنی دروست بوونن!

میکانیزمـەکانی کارلێکـە شـانەیی‌یەکان لـە کـاتی گەشـەکردنی کۆرپەلـەدا سـەرقاڵی کردبـوو، زانـا (یوهـانس هـولتفرتر) زینـدە کارلێکـەکانی گەشـەی کۆرپەلـەی دیراسـە دەکـرد، هـەروەها زانـای بـەناوبانگی ئـەورووپیش (ئۆتـۆ واربۆرگ Otto Heinrich Warburg) (١٨٨٣-١٩٧٠ز) توێژینـەوەی لەسەر میکانیزمە کیمیایی‌یەکانی دروست بوون دەکرد.

**٣- قۆناغی تەکنەلۆجیا و بەکارهێنانی ئامێرە پێشکەوتووەکان:**

قۆناغی سێیەمی پێشکەوتنی زانستی کۆرپەلـەزانی لـە چلەکانی سەدەی رابووردووەوە دەستی پێکرد کە تا رۆژگاری ئەمڕۆمان بەردەوامە، ئەویش دوای دۆزینـەوە چـەندین ئـامێری زانسـتی پێشـکەوتوو لەوانـە: ووردبینـی ئـەلیکترۆنی[3]، ئـامێری وێنـەگرتنی وورد و پێشـکەوتوو، پێـوانی هێـزی رێژەیی پێکهێنەرەکانی شەپۆلی رووناکی، کۆمپیوتەری پێشکەوتوو، ئامێری دۆزینەوەی پرۆتین و کاربۆهیدرات و ترشە ناووکی‌یەکان و جیاکردنەوەیان لەیـەکتری و لێکۆڵینـەوەیان، کـە ئـەم ئامێرە پێشـکەوتووانە وای لـەزانایانی بایۆلۆجی گەشە کردن (Developmental Biology) کردووە کە چەندین

---

(3) ووردبینی ئەلیکترۆنی ساڵی ١٩٣٢ز بۆ یەکەم جار لەلایەن هەردوو زانای فیزیایی ئەڵمانی (ئێرنست رەسکا و ماکس نۆڵ Ernst A. F. Ruska & Max Knoll)وە دروست کرا، کە لە جۆری ووردبینـی ئـەلیکترۆنی گوێزەرەوە (Transmission Electron Microscope or TEM) بوو، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئامێرێکی سەرەتایی بوو بەڵام توانای گەورە کردنی هەبوو بۆ ٤٠٠جار، لە رۆژگاری ئەمڕۆدا ووردبینی ئەلیکترۆنی دەتوانێت تا نیو ملیۆن جار شت گەورە بکات، کە دەتوانین بەهۆیەوە ماوەی نێوان ٢خاڵ تا بچووکی ٢٠-٤٠ نانۆمیتەر (کە بەشێکە لە ١ملیۆن بەشی میللیمەترێك) ببینین، بەهۆی ووردبینـی ئـەلیکترۆنی رووپێـوەوە (Scanning Electron Microscope or SEM) دەتوانرێـت وێنـەی سێ دووری دروست بکرێـت، کـە ئـەم جۆرەیـان سـاڵی (١٩٥٢ز) لەلایـەن ئەندازیاری ئینگلیزی سێر چارڵس ئۆتلی (Sir Charles Oatley)وە دروست کرا، بەهۆی ووردبینـی ئـەلیکترۆنی گوێزەرەوە (Transmission Electron Microscope or TEM)وە دەتوانرێت خانەکان و بەشەکانی ناوەوەی و ئۆرگانیلەکانی ببینرێت.

تاقیکردنەوەی وا بکەن کە پێشتر خەڵکی بە خەو و خەیاڵی زانستیيان دەزانی و زانستی کۆرپەلەزانی گەورەترین پێشکەوتنی بەخۆیەوە بینی، ئەمڕۆ دەتوانین شیکردنەوەیەکی ووردی رووکاری خانەکان بکەین لە کاتی گەشە کردنیاندا، و دەتوانین ناوکی خانە و سایتۆپلازم و بەشەکانی تری خانە دیراسە بکەین، و دەتوانین چاندن لە دەرەوەی خانە ئەنجام بدەین لەرێی خانە ئامادە کراوەکانەوە و ناوك و ماددەی بۆماوەیی (جینات) لەناو منالدانەدا بچێنین. هەروەها دەتوانین ئێستا بە شێوەیەك سەیری کۆرپەلە بکەین کە مەحاڵ بوو لە سەردەمی زانا (ماڵپێجی)دا تەصەور بکرێت، و دەتوانین ناو بەشەکانی کۆرپەلە بە شێوەیەك ببینین بە مەبەستی جیاکردنەوەی میکانیزمەکانی گەشەی ئاسایی لە گەشەیەکی شاز و نائاسایی (**وێنەی ١-١٢**).

ئێستا دەپرسین: دەتوانین چی بڵێین دەربارەی راستییەکانی قورئان و سوننەت کە مێژوویان دەگەڕێتەوە بۆ ١٤٠٠ ساڵ لەمەوپێش؟

قورئان و سوننەتی پیرۆز لە سەدەی حەوتەمی زایینیدا بە شێوازێکی بەرز و پاراو وەسفی زۆرێك لەم دۆزینەوە زانستییە نوێیە سەرسوڕهێنەرانەی کردووە، کە زانستی نوێ تەنها بەهۆی ئامێرە وورد و ئاڵۆزەکانییەوە پەردەی لەسەر لاداون، دەبینین تەنانەت دۆزینەوەکانی سەدەی نۆزدەیەم و بیستەمیش لە قورئان و فەرموودەدا بەروونی ئاماژەیان بۆ هاتووە، بڕوانە ئەوەی لەم بەشەدا باس کراوە بە بەراورد بەم ئایەتانەی خوارەوە:

- ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى﴾ (الحجرات:١٣).
- ﴿وَأَنَّهُ خَلَقَ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْأُنثَى {٤٥} مِن نُّطْفَةٍ إِذَا تُمْنَى {٤٦}﴾ (النجم).



وێنەیەکی ووردبینی ئەلیکترۆنی
کۆرپەلەیەکی مشك



وێنەیەکی ووردبینی ئەلیکترۆنی
دڵی هەمان کۆرپەلەی مشك



وێنەیەکی ووردتری ووردبینی ئەلیکترۆنی
بەشێکی دڵی هەمان کۆرپەلەی مشك کە
دروست بوونی ناوپۆشەکەی روون دەکاتەوە

وێنەی (١-١٢)
ئەم وێنانە بۆمان رووندەکەنەوە کە چۆن
دەتوانین بەهۆی بەکارهێنانی تەکنەلۆجیای
نوێوە تەرکیز بخەینە سەر ئەندامێك
لە ئەندامەکانی کۆرپەلەکە و بە روونی سەیری بکەین تەنانەت ئەگەر لەناو بەشێکیشیدا بێت.

قورئانی پیرۆز روونی کردووەتەوە کە کۆرپەلە لە تێکەڵاویکەوە لە دەردراوەکانی هەردوو پیاو و ئافرەتەوە دروست دەبێت، و ئەو زیندەوەرەی کە بەهۆی ئەم پیتاندنەوە دروست دەبێت لەناو منالدانا بەشێوەی تۆوێك دەچێنرێت، و پاش تێپەڕبوونی بە چەندین قۆناغدا کە قورئانی پیرۆز بە زنجیرەندی راستی خۆی هێناویێتی زیندەوەرێکی نوێی لێوە دروست دەبێت، لەگەڵ بوونی وردەکاری‌یەکی بێ‌وێنەدا و یەکگرتنەوەی ئەم دەقانە لەگەڵ راستی‌یە نوێکانی کۆرپەلەزانی‌دا ئیعجازە گەورەکەی قورئان و سوننەت بە ئاشکرا دەردەکەوێت.

ئەوەی ئەم بۆچوونە بەهێز دەکات نەبوونی هیچ جۆرە زانیاری‌یەکی باوەڕپێکراوی ئەووتۆیە دەربارەی زانستی کۆرپەلەزانی لەو رۆژگارەی مێژووی دێرینی عەرەبەکاندا، کە تاریکیی و نەخوێندەواری و نەزانیی نەك نیوەدورگەی عەرەب بەڵکو زۆرێك لە میللەتان و نەتەوەکان و وڵاتانی سەر زەوی داپۆشیبوو، ئەوانەشی کە کەمێك زانیاری‌یان لەلا هەبوو بە رێگەی هەڵەدا رۆیشتبوون لەبەر نەبوونی ئامێر و هۆکاری لێکۆڵینەوەی زانستی، و تەنها بەهۆی خەیاڵ و لێکدانەوەی خۆیان و بەچاو بینینیان دیاردەکانیان راڤە و شی‌دەکردەوە.

ئەم کۆمەڵە کەمەی زانایانیش هیچ جۆرە پشتیوانی‌یەکیان نەبوو لە کارەکان و بۆچوونەکانیاندا، بەڵکو دووچاری چەندین تەنگ وچەڵەمە و گرفت دەبوونەوە لەسەر ئەو بۆچوونانەیان و تووشی راوەدوونان و زۆر جار کوشتن و لەناوبردن دەبوون، بۆیە باس کردنی ئەم راستی‌یانە لەلایەن پێغەمبەرەوە (ﷺ) لەو رۆژگارەدا و لەناو خەڵکی ئەو سەردەمەدا ئیعجازەکە بەهێزتر دەکات و بواری گومان ناهێڵێتەوە لە بەرزیی سەرچاوەیان و باڵایی‌یان بۆ زانیاری‌یەکانی مرۆڤ لەو سەردەمەدا.

لەمانەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو راستییانەی کۆرپەلەزانی کە لە قورئان و سوننەتدا هاتووە هەردەبێت وەحی بێت و لەلایەن دروست کەری مرۆۋ و کۆرپەلەکەشییەوە بێت چونکە وەك ووتمان هیچ مرۆڤێك و هیچ زانستێك ئەم راستییانەی لەپێش ١٤٠٠سالّ لەمەوبەر نەزانیوە.

## سەرەتای دروست بوون:

**سەرەتای پەیدا بوونی مرۆڤایەتی لەسەر زەوی بە دروست کردنی ئادەم (علیه السلام) دەست پێ‌دەکات، خوای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا باسی چۆنێتی دروست بوونی ئادەممان بۆ دەکات و وەسفی ئەو ماددانەمان بۆ دەکات کە لێوەی دروست بووە:**

### یەکەم: ئاو:

**هەموو زیندەوەرێك لەم سەر زەوی‌یە لە ئاو دروست بووە و ئاو فاکتەری بەردەوام بوونی ژیانێتی: ﴿وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ﴾ (الأنبياء:٣٠)، واتە: لە ئاو هەموو شتێکی زیندوومان فەراهەم هێناوە (ئاو زۆربەی پێکهاتەی لەشی ئادەمیزاد و زیندەوەران و رووەك پێکدەهێنێت)، ئایا ئەوانە هەر باوەڕناهێنن (بەو راستی‌یانە و بەو دەسەڵاتە بێ‌سنوورەی ئێمە)، هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ﴿كُلُّ شَيءٍ خُلِقَ مِن مَاءٍ﴾ حدیث صحیح أخرجه أحمد، واتە: هەموو شتێك لە ئاو دروست بووە[1]، کەواتە پێکهێنەری یەکەمی لەشی زیندەوەرەکان بە مرۆڤیشەوە بریتی‌یە لە ئاو.**

---

((١) ئەم فەرموودە پیرۆزانە باسی راستی‌یەکی گەردوونی دەکەن کە کەم کەس دەیزانێت و زۆر تازە دۆزراوەتەوە، کە ئەویش بریتی‌یە لەوەی کە لەشی زۆربەی زیندەوەرەکان لە ئاو پێکهاتووە و ئاو زۆر پێویستە بۆ بەردەوام بوونی ژیانیان، ئەم راستی‌یە زانستی نوێ بۆی سەلماندووین کە باسی پێکهاتەی لەشی زیندەوەرەکانمان بۆ دەکات، بە گشتی ئاو ٥٠-٩٠٪ی لەشی هەموو زیندەوەرەکانی سەر زەوی پێکدێنێت (بەڕێژەی جیاواز)، پرۆتۆپلازمی خانەکان (کە پێکهێنەری سەرەکی خانە زیندووەکانە) بە زۆری لە ئاو پێکهاتووە، خوێن لە ئاژەڵاندا و شلەی لەشی رووەکەکان بە زۆری ئاو پێکهێنەریتی کە ئەم شلەمەنی‌یانە میدیای گواستنەوەی خۆراك و ئۆکسجینن بۆ خانە زیندووەکان، کەواتە ئاو پێکهێنەری سەرەکی خانە زیندووەکانی زیندەوەرەکانی سەر زەوی‌یە، ئەگەر هەندێك زیندەوەر بە نموونە بهێنینەوە: دەبینین لە بچووکترین زیندەوەرەوە وەك بەکتریا ٩٠٪ی پێکهاتەکەی بریتی‌یە لە ئاو، ماسی ٧٠٪ی لەشی بریتی‌یە لە ئاو، مرۆڤیش ٦٥٪ی لەشی لە ئاو پێکهاتووە.

**دووەم: خۆڵ:**

هەروەك لە ئایەتەدا هاتووە: ﴿فَإِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن تُرَابٍ ...﴾(الحج:٥)، واتە: ئێمە سەرەتا ئێوەمان لە خاك و خۆڵ دروست كردووە، و لە فەرموودەی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە: ﴿إنَّ اللهَ خَلَقَ آدَمَ من قَبْضَة قَبَضَها من جَميع الأَرض ....﴾ رواه أحمد والترمذي وقال: حديث حسن صحيح. واتە: خوای گەورە ئادەمی باوكی مرۆڤەكانی لە مشتێك خۆڵی (گڵی) هەموو زەوی دروست كرد، كەواتە دەفەرموێت هەمان پێكهاتەكانی هەموو خۆڵی زەوی لە لەشی مرۆڤیشدا هەیە.

كاتێك كە ئەم خۆڵ و ئاوە كۆدەبنەوە و یەكدەگرن (قوڕ)ی لێوە دروست دەبێت، ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَبَدَأَ خَلْقَ الْإِنسَانِ مِن طِينٍ﴾السجدة:٧، واتە: لە سەرەتاوە ئادەمیزادی لە قوڕ دروست كردووە، كە سەرەتا ئەم قوڕە نەرم و لینج بووە: ﴿إِنَّا خَلَقْنَاهُم مِّن طِينٍ لَّازِبٍ﴾(الصافات:١١)، واتە: بێگومان ئێمە ئەوانمان لە قوڕێكی نەرم و لینجەوە دروست كردووە، (طەبەری)ی موفەسیر دەڵێت: لەبەرئەوە بە (لَّازِبٍ) ناوی بردووە چونكە خۆڵێكی تێكەڵاو بە ئاوە.

هەروەها لە سیفەتەكانی ئەم قوڕە ئەوەیە كە ڕەشە، ئەویش لەبەرئەوەیە كە گۆڕانكاری بەسەردا دێت تاوەكو ڕەشباو دەبێت، هەروەك خوای گەورە ئاماژەی پێداوە: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الإِنسَانَ مِن صَلْصَالٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ﴾ (الحجر:٢٦)، واتە: سوێند بەخوا ئێمە سەرەتا ئینسانمان لە قوڕێكی ووشك دروست كرد كە پێشتر قوڕێكی ڕەشباو و ترشاو بوو، (حَمَــإٍ) وەك لە فەرهەنگی (تاج العروس)دا هاتووە: بریتی‌یە لە قوڕی ڕەشی گۆڕاو، (قورتوبی) موفەسیریش دەڵێت: (حَمَإٍ) قوڕی ڕەشە و (مَسْنُونٍ) بە مانای گۆڕاو یان بۆگەن و ترشاو دێت، و مانایەكی تری (مَسْــــنُونٍ) بریتی‌یە لە (المَصقول) واتە: شێوەی وەرگرتووە وەك لە فەرهەنگی (لسان العرب)دا هاتووە، كەواتە ئەم قوڕە ئەوەندە نەرم بووە كە بە ئاسانی دەتوانرێت بخرێتە سەر شێوەی مرۆڤ، پاشان ئەم قوڕە گەرم كرا تاوەكو ووشك بووەوە و وەك سیرامیك (قاپ و قاچاخی لە قوڕ دروست بوو)ی لێهات: ﴿خَلَقَ الْإِنسَانَ مِن صَلْصَالٍ كَالْفَخَّـــارِ﴾

**(الرحمن:١٤)، واتە: ئادەمیزادی دروست کردووە لە قوڕێکی ووشکەوە بوو، هەروەك فەخفوری.**

**لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە ئاماژە بە کردارێکی تر دەدات لە دروست بوونی ئادەمی باوکی مرۆڤەکاندا کە دەفەرموێت: ﴿وَاللَّهُ أَنبَتَكُم مِّنَ الْأَرْضِ نَبَاتًا﴾ (نوح:١٧)، واتە: هەر خودا خۆی ئێوەی وەك رووەك لە خاکی زەوی بەدیهێناوە و پێی گەیاندوون، کەواتە مرۆڤ وەك چۆن رووەك و بەهۆی چی‌یەوە لە زەوی‌یەوە دەردەچێت بەهاوشێوەی ئەو دروست کراوە، کە لێرەدا دەتوانین بڵێین کە خوای گەورە مەبەستی لە کرداری رۆشنە پێکهاتنە (التمثیل الضوئي Photosynthesis) کە رووەك بەهۆیەوە لە زەوی‌یەوە دەڕوێت و گەشە دەکات، لە رووەکدا ماددەیەك هەیە پێی دەووترێت ماددەی سەوز یان کلۆرۆفیل (Chlorophyll) کە دەکەوێتە ناو ماددەیەکی ترەوە کە ئەویش هەر سەوزە و پێی دەووترێت کلۆرۆپلاست (Chloroplast).[2]**

---

[2] لەم ئایەتەی قورئاندا ئاماژە بۆ ئەم ماددە سەوزە کراوە؛ خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ الَّذِيَ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ نَبَاتَ كُلِّ شَيْءٍ فَأَخْرَجْنَا مِنْهُ خَضِرًا نُّخْرِجُ مِنْهُ حَبًّا مُّتَرَاكِبًا﴾ (**الأنعام:٩٩**)، ووشەی (خَضِرًا) لە ئایەتەکەدا موفەسیرەکانی قورئان دەڵێن: بریتی‌یە لە شتێکی (ماددەیەکی) سەوز پێی دەووترێت (أخضر)، ئەمە ووتەی (ابن الجوزي، الزمخشري، الخازن، البیضاوي، القرطبي و چەندین موفەسیری تری قورئانن)، (إبن الجوزي) لە مانای ﴿فَأَخْرَجْنَا مِنْهُ خَضِرًا نُّخْرِجُ مِنْهُ حَبًّا مُّتَرَاكِبًا﴾دا دەڵێت: خوای گەورە دەفەرموێت: ئێمە لەو رووەکەوە ماددەیەکی سەوز دروست دەکەین، ﴿نُّخْرِجُ مِنْهُ حَبًّا مُّتَرَاكِبًا﴾ ئەو (هـ)ـائە لە (مِنْهُ)دایە دەگەڕێتەوە بۆ ماددە سەوزەکە، واتە ئێمە لەم ماددە سەوزەوە دەنکی کۆوەبوو (دانەوێڵە) دروست دەکەین و دەردەکەین، بەهەمان شێوە موفەسیرەکانی تریش وەك (الزمخشري، الخازن، النسفي، أبوالسعود)یش وادەڵێن، جا خوێنەری بەڕێز تێبڕوانە لە ووتەی ئەم موفەسیرە بەڕێزانەی قورئان کە پێش سەدان ساڵ لەمەو پێش ژیاون، کە هیچ کەسێك لەو کاتەدا نەیدەزانی کە ماددەی سەوز یان (کلۆرۆفیل **Chlorophyll**) چی‌یە و نەدۆزرابووەوە، بەڵام بەپشت بەستن بە ئایەتەکانی قورئان ئەم قسەیەیان کردووە و ووتوویانە کە ئەو ماددە سەوزەیە دانەوێڵە و بەرووبوومەکانی تری لێوە پەیدا دەبێت، کە راستی ئەم فەرموودەیە پاش سەدان ساڵ زانرا، باشە کێ محمد (ﷺ)ی نەخوێندەواری فێری ئەم ڕاستی‌یە زانستی‌یانە کردووە مەگەر خوای گەورە و بەدەسەلات نەبێت.

بەهۆی ئەم ماددەیەوە رووەك ووزەی تیشکی خۆر دەمژێت و بەهۆیەوە هایدرۆجینی ئاو و دووەم ئۆکسیدی کاربۆن پێکەوە گرێ دەدات بۆ دروست کردنی شەکر، کە ئەمە کرداری رۆشنە پێکهاتنە، و پاشانیش ئەم شەکرە دەگۆڕێت بۆ ماددەی ئەندامی، هەروەها کلۆرۆپلاستیش پرۆتینی رووەکی لێوە دروست دەکات، کە ئەم کردارەیە کە زۆر سەرەکی و زیندەگی‌یە بۆ دروست بوونی هەموو زیندەوەرەکان و گەشە کردنیان (بە مرۆڤیشەوە).

بەڵگەشمان لەسەر ئەوەی کە ئایەتی: ﴿وَاللَّهُ أَنبَتَكُم مِّنَ الْأَرْضِ نَبَاتاً﴾ باسی کرداری رۆشنە پێکهاتن دەکات ئەو ئایەتەی پێشترە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ الَّذِيَ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ نَبَاتَ كُلِّ شَيْءٍ فَأَخْرَجْنَا مِنْهُ خَضِراً نُّخْرِجُ مِنْهُ حَبّاً مُّتَرَاكِباً﴾ (الأنعام:٩٩)، واتە: ئەو خودایە زاتێکە کە لە ئاسمانەوە باران دەبارێنێت کە بەهۆیەوە چرۆ و چەکەرەی هەموو شتێکی پێ‌دەردەهێنین، پاشان لەم رووەکانەوە ماددەی سەوزی لێ‌پەیدا دەبێت کە زنجیرە دانی سەفتەکراوی لێ‌دروست دەکەین (وەك: گوڵە گەنم و چەڵتووك و گەنمەشامی و ... هتد).

ئەم ئایەتە پیرۆزە ئاماژە بەوە دەدات کە بەهۆی ماددەی سەوزەوە (کلۆرۆفیل) رووەکەکە لەرێی کرداری رۆشنە پێکهاتنەوە پێکهێنەرەکانی خۆی و هەروەها دانەوێڵە و بەرهەمی رووەکیش دروست دەبێت، کە خۆی لەخۆی‌دا ئاماژەدان بەم ماددە سەوزە موعجیزەیەکی گەورەیە، چونکە ماددەیەکی نەبینراوە بەچاو کە درێژی‌یەکەی ٦مایکرۆن و پانی‌یەکەی ٢مایکرۆن دەبێت (مایکرۆن یان مایکرۆمیتەر بریتی‌یە لە ١بەش لە ١ملیۆن بەشی مەترێك)، و تەنها لە سەدەی نۆزدەیەمدا لەسەر دەستی هەردوو زانا (هیوگۆ ڤۆن موهل Hugo Von Mohl) و زانا (یۆلیۆس ڤۆن ساش Julius Von sachs) دۆزرایەوە، واتە دوای زیاتر لە ١٢٠٠ ساڵ!!!

هەروەها ئایەتی ﴿وَاللَّهُ أَنبَتَكُم مِّنَ الْأَرْضِ نَبَاتًا﴾ ئاماژەی تێدایە بۆ ئەوەی کە رووەك زۆر گرنگ و پێویستە بۆ بەردەوام بوونی ژیان و گەشە کردنی مرۆڤەکان، ئەویش وەك باسمان کرد لەرێی کرداری رۆشنە پێکهاتنەوەیە رووەك خۆراکی خۆی دروست دەکات، پاشان ئاژەڵانیش لەسەر ئەو خۆراکەی رووەك دەژین و مرۆڤیش لەسەر هەردوو رووەك و ئاژەڵ دەژی.

لەمانەی سەرەوە دەگەینە ئەوەی کە دروست بوونی ئادەمی باوکی بەشەر (عليه السلام) لە بۆچوونی قورئانی‌دا پێویستی بەمانە بوو:

١- ئاو.

٢- خۆڵ.

٣- تێکەڵاو بوونی ئاو و خۆڵەکە بۆ دروست کردنی قوڕێکی نەرم.

٤- گۆڕانی قوڕەکە و مەیلەو رەش بوونی.

٥- گونجانی قوڕەکە بۆ شێوە وەرگرتن (صقل).

٦- دووچاربوونی قوڕەکە بۆ گەرمی‌یەکی زۆر.

٧- کرداری رۆشنە پێکهاتن بۆ دروست بوونی ماددەی زیندوو و خانەکانە و شانەکان.

هەموو ئەم راستی‌یانەی کە قورئانی پیرۆز ئاماژەی پێداون زانستی نوێ راستی‌یەکەی بۆ سەلماندووین، زانایانی کیمیا دەربارەی پێکهاتەی کیمیایی لەشی مرۆڤەوە دەڵێن: بێجگە لە ئاو (کە ٦٥٪ی لەشی مرۆڤ پێکدێنێت) لەشی مرۆڤ بە زۆری لە ٢٤ توخم پێك هاتووە، کە رێژەکانیان جیاوازە و زۆر بە ووردی دابەش بوون، بەم شێوەیەی خوارەوە:

- بە پلەی یەکەم: توخمەکانی: ئۆکسجین، هایدرۆجین، کاربۆن، و نایترۆجینە، کە ماددە ئەندامی‌یەکانی لەشیان پێناوە، وەك: پرۆتینەکان، چەوری‌یەکان، شەکرەکان، ڤیتامینەکان، ئەنزیمەکان، هۆرمۆنەکان و .... تاد.

- بـە پلـەی دووەم: توخمـەکانی: کلـۆر، کالیسـیۆم، صـۆدیۆم، پۆتاسـیۆم، مەگنیسیۆم، و گۆگرد و فۆسفۆرن.

- بـە پلـەی سـێیەم: ٧ تـوخمی تـری تێدایـە، وەك: ئاسـن، مـس، یـۆد، مەنگەنیز، کۆباڵت، خارسین (تەنەکە)، و مۆلبیدیۆم.

- ٦ توخمی تر زۆر بە کـەمی هـەن کـە ئەمانـەن: ئەلـەمنیۆم، فلـۆر، بۆرۆن، سیلینیۆم، کادمیۆم، و کرۆم.

ئەم ماددانە دەقاودەق ئەو توخمانەن کە پێکهێنەری گڵن لە سروشتدا، کـە ئەمە دەیسەلمێنێت مرۆڤ بریتی‌یە لـە پوختەیـەکی خـۆڵی سـەر زەوی، زۆرێك لە زانایانی بایۆلۆجی و ئیکۆلۆجی یان ژینگەزانی (علم البیئة Ecology) لە رۆژگـاری ئـەمڕۆدا گەیشـتوونەتە ئـەو راسـتی‌یەی کـە سـەرەتا ژیـان لـە گڵ و خاکی نزیك دەریاکانەوە پەیدا بووە (واتە کۆبوونەوەی گڵ و ئاو پەیـدابوونی ژیانی لێوە سەرهەڵدا).

دوو زانـای ئـەمریکی لـە سـەدەی بیسـتەمدا لێکۆڵینـەوەیان لەسـەر ئـەو ماددانـە کـرد کـە بـوار و هـەلی پەیـدابوونی ژیانیـان تێ‌دایـە، یـەکێك لـەو زانایانەی کە شایەتی خۆی لەم بوارەدا تۆمار کردووە و رای ئەو زانایانەی بۆ نـەقڵ کـردووین، زانـای کۆرپەلـەزانی ئـەمریکی (مارشـال جونسـون)ە کـە سەرۆکی بەشی توێکاری و کۆرپەلەزانی و بەڕێوەبـەری پـەیمانگای (دانیـال)ە لـە زانکـۆی (تۆمـاس جیفەرسـۆن) لـە (فیلادلفیا)ی ویلایەتـە یـەکگرتووەکانی ئەمریکا، لە یەکێك لـە کۆنگرە زانستی‌یەکاندا (کـە کـۆنگرەی جیهـانی یەکـەم بـوو دەربـارەی ئیعجـازی زانسـتی لـە قورئـان و سـوننەتدا لـە ئیسـلام ئابـادی وولاّتـی پاکسـتان) ووتـی: (چـەندین زانـای کیمیـا لـەم بابەتـەیان کۆڵی‌یـەوە و بۆیان دەرکەوت کـە گڵ نـزیکترین ماددەیـە لـەپێکهاتنی لەشـی مـرۆڤ، و تـەنها گونجاوترین ماددەشە بۆ پەیدابوونی ژیان لێ‌یەوە).

دەبێت بزانین کە مرۆڤ لە لەش و رۆح پێك هاتووە، بۆشمان دەرکەوت کە لاشەی زیندوو پێك هاتووە لە گەردیلەکانی توخمەکان و پێکهاتەکانی زەوی، لە خۆڵ و ئاو و هەواکەی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مِنْهَا خَلَقْنَاكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَى﴾ (طه:٥٥)، واتە: ئێمە ئێوەمان لە گڵ دروست کردووە، کە دەمرن بۆ ئەو زەوی‌یە دەگەڕێنەوە، و لە دوارۆژیشدا هەر لەو زەوی‌یەوە زیندووتان دەکەینەوە.

ئەو گەردیلانەی باسمان کردن پێکهاتەی گەردەکانی ئەو مادده ئەندامی و نائەندامی‌یانەن کە خانەکانی لەشی هەموو زیندەوەرێك پێکدێنن، خوای پەروەردگاریش رووەك و ئاژەڵانی وەك خۆراکێك بۆ مرۆڤ رەخساندووە کە سەرچاوەی ئەو توخم و پێکهاتانەن بۆ لەشی مرۆڤ، بۆ ئەوەی بتوانێت ژیانی لەسەر ئەم زەوی‌یە (کە کراوە بە جێ‌نشین تێ‌ی‌دا) درێژە پێ‌بدات.



## دروست بوونی کۆرپەلەی مرۆڤ بەقۆناغە:

ئەو راستی‌یە زانستی‌یەی کە مرۆڤ بە قۆناغ دروست دەبێت لە سکی دایکی‌دا و لەناو مناڵداندا (Uterus) لە دوای ئەو پێش کەوتنە گەورەیەی تەکنۆلۆژیاوە دۆزرایەوە لە چلەکانی سەدەی بیستەمەوە، ئەویش بە هەوڵ و کۆششی بەردەوامی کۆمەڵێك زانای ناسراوی زانستی کۆرپەلەزانی و بەهۆی ئەنجام دانی چەندین تاقی‌کردنەوەی زانستی‌یەوە هەستی پێکرا، ئەویش لەبەر ئاڵۆزی کرداری دروست بوونی کۆرپەلەی مرۆڤ، و هەروەها ئاڵۆزی پێکهاتەی بایۆلۆجی ئەندامەکانی لەشە، پزیشکان و زانایانی پێشوو بۆچوونیان بە هیچ شێوەیەك بەلای ئەوەدا نەدەچوو کە کۆرپەلەی مرۆڤ بە قۆناغ دروست دەبێت، لە کۆتایی سەدەی شانزەیەمی زایینی‌دا ووردبین دۆزرایەوە و پاشان تۆوی پیاو بینرا، بەدوای ئە دۆزینەوەیەدا ئەو بۆچوونە پەیدا بوو کە سپێرم بە بچووك کراوەیی مرۆڤێکی کامڵی هەڵگرتووە (وەك لە بەشی پێشوودا ئاماژەمان پێ‌دا)، پاشان زانا (ماڵپێجی) -کە بە باوکی کۆرپەلەزانی دادەنرێت- لە ساڵی (١٦٧٥ز)دا وای دانا کە هێلکەی نەپیتێنراوی مریشك کۆرپەلەیەکی کامڵی تێدایە بە بچووك کراوەیی پاش لێکۆڵینەوە زۆرەکانی لەسەر هێلکەی مریشك.

کەواتە ئەو بیرو بۆچوونە باو بوو لەلای زانایان کە هێلکە یان تۆو مرۆڤێکی کامڵی بە بچووك کراوەیی تێدایە و پرۆسەی گەشە کردنی کۆرپەلە تەنها بریتی‌یە لە کردارێکی زیاد بوون لە قەبارەدا بۆ وێنەیەکی جێگیر کە بە تێپەڕبوونی کات دووری‌یەکانی زیاد دەکات.

لە ڕاستی‌دا زۆر بێ‌ئاگا بوون لەو حەقیقەتەی کە دروست بوونی مرۆڤ بە چەندین قۆناغی جیاوازدا دەڕوات، ئەم جەدەل و گفتوگۆیەی نێوان زانایان کۆتایی نەهات تاوەکو زانای زیندەوەرزانی ئیتاڵی لازارۆ سپالانزانی

(Lazzaro Spallanzani)[٣] لە ساڵی (١٧٧٥ن)دا گرنگی هەردوو تۆو و هێلکەی سەلماند لە کرداری دروست بوونی کۆرپەلەدا.

ئەم رووداوە سەرەتایەکی نوێ بوو بۆ بۆچوونەکان دەربارەی دروست بوونی پەردەکانی کۆرپەلە کە (ڤۆن بایەر Von Baer) بناغەکەی دانابوو لە ساڵی (١٨٢٧ن)دا و تێی‌دا ئاماژەی داوە بە قۆناغەکانی دروست بوونی کۆرپەلە، بەڵام یەکەم هەوڵی راستەقینە بۆ وەسف کردنی قۆناغەکانی گەشە کردنی کۆرپەلە لە ساڵی (١٩١٤ن)دا بوو لەسەر دەستی زانا (موول Mool)، ئیتر لێرەوە وەسفی قۆناغەکانی گەشە کردنی کۆرپەلە رۆژ لەدوای رۆژ بەرەو پێش دەچوو لەسەر دەستی زانایانی وەك (ستریتەر Streeter) و (ئۆرایلی Oreilly) و چەندین زانای تر، کە لە رۆژگاری ئەمرۆماندا زانایانی کۆرپەلەزانی قۆناغەکانی گەشە کردنی کۆرپەلە بەهۆی هێما و ژمارەوە دەردەبڕن، ئەمە وای کردووە پۆلێن کردنی ئەم قۆناغانە زۆر ئاڵۆز بێت.

بەڵام قورئان و سوننەتی پیرۆز (وەك باسمان کرد) پێش ١٤٠٠ساڵ لەمەوبەر ئەو راستی‌یەی باس کردووە کە کۆرپەلەی مرۆڤ بە قۆناغی جیاوازدا دەڕوات لە کاتی گەشە کردنی لە سکی دایکیدا و زانایانی ئیسلام باوەڕی تەواویان پێی هەبووە کە موعجیزەیەکی گەورەیە و هەموو زانایەکی راستەقینە سەرسام دەکات، چونکە ئەم راستی‌یە تاوەکو کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم نەزانرابوو، لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە سەرداری مرۆڤایەتی محمد (ﷺ) پێشدەست بوو لەم بوارەدا بەهۆی ئەو نیگایەی کە لەلایەن پەروەردگارەوە بۆی رەوانە کراوە.

---

(٣) زانای ئیتاڵی لازارۆ سپالانزانی (Lazzaro Spallanzani) (١٧٢٩-١٧٩٩ن) یەکێکە لە پێشەوایانی زانستی بایۆلۆجی تاقیکەیی (Experimental Biology)، زوربەی تەمەنی خۆی بۆ ئزلیەتی کردنی بیرۆکەی دروست بوون لە خۆوە (Spontaneous Generation) تەرخان کرد، هەروەها لێکۆڵینەوەی تری لەسەر پیتاندن و پیتاندنی دەستکرد (Artificial Insemination) لە ئاژەڵانا ئەنجامدا لەگەڵ ئەوەشدا کە بە تەواوەتی لە رۆڵی سپێرمەکان تێنەگەیشبوو و وەك مشەخۆرێك دەهاتنە پێش چاوی.

خشتەی زەمەنی گەشەکردنی کۆرپەلەی مرۆڤ (١-٦ هەفتە)




15
first missed menstrual period
primitive streak
16 Stage 7 begins
noto-chordal process
17 intra-embryonic mesoderm
trilaminar embryo
18 Stage 8 begins
neural plate
primitive streak
length 1.5 mm
19
neural fold
notochord
embryonic coelom
20 Stage 9 begins
brain
neural groove
somite
Thyroid begins to develop
21
neural groove
somite
Heart tubes begin to fuse
22 Stage 10 begins
Heart begins to beat
Neural folds fusing
23
rostral neuropore
primordia of eye and ear present
caudal neuropore
24 Stage 11 begins
heart bulge
rostral neuropore closes
2 pairs of branchial arches
25
otic pit
3 pairs of branchial arches
26 Stage 12 begins
arm bud
indicates actual size
27
4 pairs of branchial arches, arm & leg buds present
C R = crown-rump length
28 Stage 13 begins
C R 4.0 mm
29
C R 5.0 mm
30
Lens pits, optic cups, nasal pits forming
31
developing eye
nasal pit
primitive mouth
32 Stage 14
Hand plates (paddle-shaped)
Lens pits and optic cups formed
33 Stage 15 begins
hand plate
C R 7.0 mm
34
Head much larger relative to trunk
cerebral vesicles distinct
leg buds (paddle-shaped)
35
C R 8.0 mm
36
Oral & nasal cavities confluent
37 Stage 16 begins
foot plate
C R: 9.0 mm
38
Upper lip formed
39
C R 10.0 mm
40
Arms bent at elbow
Finger rays and auricular hillocks distinct
Palate developing
41 Stage 17 begins
finger rays
ventral view
42
C R 13.0 mm

## خشتەی زەمەنی گەشەکردنی کۆرپەلەی مرۆڤ (۷-۳۸ هەفتە)

**TIMETABLE OF HUMAN PRENATAL DEVELOPMENT**
**7 to 38 weeks**

| AGE (weeks) | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 7 | 43 CR: 16.0 mm. | 44 Stage 18 begins; Eyelids beginning | 45 Tip of nose distinct. Toe rays appear. Ossification may begin. CR: 17.0 mm | 46 Loss of villi. Smooth chorion forms. | 47 genital tubercle; urogenital membrane; anal membrane; ♀ or ♂ | 48 Stage 19 begins. Trunk elongating and straightening | 49 CR: 18 mm |
| 8 | 50 Upper limbs longer & bent at elbows. Fingers distinct | 51 Anal membrane perforated. Urogenital membrane degenerating. Testes and ovaries distinguishable | 52 Stage 21 begins | 53 Stage 21. External genitalia still in sexless state but have begun to differentiate. | 54 Stage 22 begins; genital tubercle; urethral groove; anus; ♀ or ♂ | 55 Beginnings of all essential external & and internal structures are present. | 56 Stage 23. CR: 30 mm |
| 9 | 57 beginning of fetal period | 58 | 59 Genitalia show some ♀ characteristics but still easily confused with ♂. | 60 phallus; urogenital fold; labioscrotal fold; perineum; ♀ | 61 Genitalia show fusion of urethral folds. Urethral groove extends into phallus | 62 phallus; urogenital fold; labioscrotal fold; perineum; ♂ | 63 CR: 50 mm |
| 10 | 64 Face has human profile. Note growth of chin compared to day 44. | 65 | 66 Face has human appearance | 67 clitoris; labium minus; urogenital groove; labium majus; ♀ | 68 Genitalia have ♀ or ♂ characteristics but still not fully formed | 69 glans penis; urethral groove; scrotum; ♂ | 70 CR: 61 mm |



خوای پەروەردگار لەقورئاندا زۆر بە روونی باسی ئەوەمان بۆ دەکات کە کۆرپەلە لەسکی دایکدا بەچەند قۆناغێکدا دەڕوات و بەقۆناغ دروست دەبێت وەکو دەفەرموێت: ﴿مَّا لَكُمْ لَا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَارًا، وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا﴾ (نوح: ١٣-١٤)، واتە: ئەی مرۆڤەکان بۆ ئێوە بە تەواوەتی خودا بە گەورە نازانن و نایپەرستن، ئەی ئێوە نازانن کە خودا ئێوەی بە قۆناغ دروست کردووە، (الطَّوْر) لە زمانی عەرەبی‌دا بریتی‌یە لە بارێك یان شێوازێکی دیاری کراو[٤]، لێرەوە مانای ئایەتە ئەوەیە: کە پەروەردگار لەسەر چەند شێوازێك و چەند بارێك دروستتان دەکات، و لەبەر ئەوەی (الطَّوْر) بە کۆ هاتووە (أَطْوَارًا) مانای ئەوەیە کە ئەم بارانە جیاوازن.

هەروەها لەئایەتێکی تردا ئەم بۆچوونە جێگیر دەبێت کە پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿يَخْلُقُكُمْ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ خَلْقًا مِن بَعْدِ خَلْقٍ فِي ظُلُمَاتٍ ثَلَاثٍ ذَلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ الْمُلْكُ﴾ (الزمر:٦)، واتە: پەروەردگار ئێوە لەناو سکی دایکانتاندا دروست دەکات، لە دروست بوونێکەوە بۆ دروست بوونێکی تر لەناو سێ تاریکایی‌دا (واتە بەقۆناغ)، ئەو دروست کەرە پەروەردگارتانە کە خاوەنی موڵکداریێتی بوونەوەرە، زاراوەی (خَلْقًا مِن بَعْدِ خَلْقٍ) ئەوە دەگەیەنێت کە دروست بوونێکی نوێ بەدوای یەکدا زیاد دەبێت بۆ دروست بوونەکەی پێشتر، یان بۆ بار و حاڵەتەکەی پێشتر، لە تەفسیری (الآلوسي)دا ئەم مانایە زۆر جوان باسکراوە کە لە راڤەی ئەم ئایەتەدا دەڵێت: ﴿خَلْقًا مِن بَعْدِ خَلْقٍ﴾ واتە ئێوە دروست دەکات بە شێوەیەکی پلە پلە و بەدوای یەکدا، کە دەبنە ئێسقان کە بە گۆشت داپۆشراوە، کە پێشتر ئێسکی رووت بوون، پێش ئەمەش گۆشتپارە بوون، پێشتر عەلەقە بوون، و لە سەرەتای هەموویەوە تنۆکێك ئاو بوون، کە بە (نطفة) ناوی بردووە.

---

(٤) بڕوانە فەرهەنگی (المعجم الوسیط)/ ماددەی (طار).

هەندێك لە زانایانی هاوەڵەکان کە تەفسیری قورئانیان دەکرد لەمانای ئەم ئایەتانە تێگەیشتبوون، ئەوەتا لە راڤەی ووشەی (أَطْــوَارًا) لە تەفسیری (القرطبي)دا هاتووە: (ئیبن عەبباس) دەڵێت: (أَطْوَارًا) بە مانای ئەوەی (نطفة و علقة و پاشان مضغة) بووە، کە بەمە ئاماژە دەدات بە قۆناغەکانی گەشە کردنی کۆرپەلە کە لە ئایەتەکانی ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ من سُلَالَةٍ مِّن طِــينٍ، ثُــمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ، ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا الْمُضْــغَةَ عِظَامًا فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّـــهُ أَحْسَـــنُ الْخَــالِقِينَ﴾دا هاتووە و لە داهاتوودا بە درێژی باسیان دەکەین، هەروەها هەر لە تەفسیری (القرطبي)دا لە راڤەی دەستەواژەی (خَلْقًا مِن بَعْدِ خَلْــقٍ)دا هاتووە: (قەتادە و السدِّي) دەڵێن: واتە (نطفة) پاشان دەبێت بە (علقة) دوایی بە (مضغة) و پاشان (عظام) و دواییش (لحم)، کەواتە مەبەستیان لەوە بووە کە کۆرپەلە بەم قۆناغانەدا دەڕوات لە کاتی گەشە کردنی‌دا.

زۆرێك لە زانایانی سەردەم کە کاتێك ئەم راستی‌یەیان لە قورئانی پیرۆزدا بینیوە سەرسوڕمانی خۆیان دەربڕیوە و شایەتی‌یان داوە لەسەر ئەوەی کە ئەم ووتانە قسەی بەشەر نی‌یە، یەکێك لەو زانایانە (پرۆفیسۆر ج. س. جۆرنجەر)ە کە مامۆستای توێکاری و کۆرپەلەزانی‌یە لە زانکۆی (جۆرج تاون) لە (واشنتۆن) لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، لە گفتووگۆیەکی نێوان زانایەکی موسوڵمان کە (پرۆفیسۆر عبدالمجید الزندانی) سەرۆکی زانکۆی (الإیمان)ە لە ووڵاتی یەمەن لەگەڵ ئەم زانایەی رۆژئاوادا، باسێك سەبارەت بە قۆناغەکانی دروست بوونی کۆرپەلە لە قورئاندا کرا، کاتێك (زیندانی) لە (د.جۆرنجەر)ی پرسی: ئایا تا ئێستا لە مێژووی کۆرپەلەزانی‌دا سەلماوە کە کەس هەبووە پێش سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) یان لە کاتی ئەودا یان لەدوای ئەویش بە چەندین سەدە باسی ئەوەی کردبێت کە کۆرپەلە بە قۆناغ لەسکی دایکیدا دروست دەبێت؟ تەنها لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەمدا نەبێت؟!

ئـەویش لـە وەڵامـدا ووتــی: لـەلای یۆنانی‌یـەکان گوێـدانێك هـەبووە بـە لێکۆڵینـەوەی گەشـە کردنـی کۆرپەلـە، و هەنـدێکیان هـەوڵی ئـەوەیان داوە وەسفی ئەو بارودۆخانە بکات کە بەسەر کۆرپەلەدا دێت، (زینـدانی) ووتـی: بـەڵێ ئێمـەش ئاگـادارین کـە کەسـانی وەك (ئەرسـتۆ) بیردۆزیـان لـەم بـارەوە داناوە، بەڵام من دەپرسم: کە کەس هەبووە باسـی قۆنـاغ بکـات؟ چونکە ئێمـە دەزانین کە تەنیا لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم و سەدەی بیستەمدا سـەلما کـە کۆرپەلە بە قۆناغی جیاوازدا دەڕوات لە گەشە کردنی‌دا.

ئەویش ووتی: **نەخێر، لە مێژووی کۆندا تەنها یۆنانی‌یەکان کەمێك گرنگی‌یـان داوە بـە بـاس کردنـی دروسـت بـوونی کۆرپەلـە، بـەڵام بـاس کردنـی زانستی‌یانەی کۆرپەلە و جیاکردنـەوەی رووداوەکـانی دروسـت بـوونی بـۆ چـەند قۆنـاغێکی جیـاواز تەنها لە ناوەڕاستی سـەدەی نۆزدەیەمـەوە دەسـتی پـێ‌کرد.** پاشـان (زینـدانی) ئـەو فەرموودانـەی قورئـان و سـوونەتی بـۆ ئـەم زانایـە بـاس کـرد کـە لـەبارەی قۆناغەکانی دروست بوونی کۆرپەلەوە دەدوێت، و ئـەو زاراوانـەی کـە قورئـان بۆ قۆناغەکانی کۆرپەلە بەکاری هێناوە پـێش ١٤٠٠سـاڵ بـۆی روون کـردەوە، ئـەوەبوو پـاش گفتوگۆیـەکی دوور ودرێـژ قەناعـەتی بـۆ دروسـت بـوو بـەم راستی‌یانە و هـەر (د.جۆرنجـەر) خـۆی بابـەتێکی ئامـادە کـرد سـەبارەت بـەو قۆناغانەی لە قورئانـدا هـاتووە دەربـارەی کۆرپەلـە و نـەزانینی مرۆڤـەکان لـەم بارەیـەوە لـەو کاتانـەدا، و هـەروەها ووردی و گشـتگیری ئـەم زاراوانـەی کـە قورئـان بـەکاری هێنـاون بـۆ قۆنـاغـە جیاوازەکـانی گەشـە کردنـی کۆرپەلـە کـە تەعبیر لە زانیاری‌یەکی هەمەلایەن دەکات، ئەوەبوو ئەم بابەتـەی لـە یـەکێك لـە کۆنگرە پزیشکی‌یەکاندا پێشکەش کرد.

(د.جۆرنجەر) رای خۆی لەم بارەیەوە دەردەبڕێت و دەڵێت: **ئەمـەی قورئـان باسی کردووە بریتی‌یە لـە وەسـف کردنێکـی زۆر وورد و هەمەلایـەن بـۆ قۆنـاغـەکانی**

دروست بوونی کۆرپەلەی مرۆڤ هەر لە تێکەڵاو بوونی ئاوەکان تاوەکو دروست بوونی ئەندامەکان و بارستە لەشی‌یەکان، ئەم وەسف و روونکردنەوەیە گشتگیر و هەمەلایەنە بۆ قۆناغەکانی گەشە کردنی کۆرپەلە، کە دیارە دەگەڕێتەوە بۆ چەندین سەدە لەمەوپێش، پێش تۆمار کردنی زانستی‌یانەی ئەم قۆناغە لەلایەن زانایانی کۆرپەلەزانی‌یەوە.

ئەمەش وویستی پەروەردگارە کە پێشکەوتنی زانستی و تەکنەلۆجی بەڵگەیەك بێت بۆ دەرخستنی ئەو راستی‌یانەی کە قورئانی پیرۆز هێناونی، و بە بەرەو پێش چوونی کات و پێشکەوتنی هۆکارە زانستی‌یەکان ئایەتەکانی قورئان زیاتر رۆشن دەبنەوە و بۆ گەورە زانایانی رۆژگارمان و داهاتووش لە هەموو بوارە زانستی‌یەکاندا راستی‌یەکانیان دەردەکەوێت.

ئەمە دەیسەلمێنێت کە ئەم ووتانە هی مرۆڤ نی‌یە بەڵکو هی دروستکەری مرۆڤە. (بۆ زیاتر تێگەیشتن لە قۆناغەکان و بارەکان بڕوانە وێنەکانی: ٥/٥ ، ٥/٦)




*Figure 31-7. Changes in the body size of the embryo and fetus during development in the uterus (all figures natural size)*

## مەنهەجی‌یەتی بەکارهێنراو لەکاتی وەسف کردنی قۆناغەکانی گەشە کردنی کۆرپەلە لە قورئان و سوننەتدا :

زانایانی کۆرپەلەزانی لە سەرەتای هەوڵەکانیادا بۆ وەسفی گەشە کردنی کۆرپەلە پیتیان داناوە بۆ هەر قۆناغێك کە کۆرپەلە لە سکی دایکی پێ‌ی‌دا تێدەپەڕێت، کە پاشان ئەم پیتانە گۆڕدران بۆ ژمارە، پاشان زانایان هەوڵیاندا کە ناوی تایبەت لەم قۆناغانە بنێن بەڵام قورسی‌یەکی زۆر دەبینن بۆ دۆزینەوەی ووشەی گونجاو بۆ ئەم قۆناغانە، چونکە دەبێت ئەو ناوانەی کە بەکاردەهێنرێن چەند سیفاتێکی تیّ‌دا بێت، وەك: وەسف کردنی ووردی ئەو گۆڕانکاری‌یانەی کە بەسەر شکڵی کۆرپەلەکەدا دێت و ئەو کردارانەی لەناو لەشی‌دا ڕوودەدەن، هەروەها بۆ ئەوەی تێکەڵاو بوون ڕوونەدات لە نێوان قۆناغەکاندا دەبێت ئەو ووشە و زاراوانەی کە بەکاردێن وەسفی شکڵی دەرەوەی کۆرپەلەکەش بکات لەهەر قۆناغێکدا.

بۆیە لێرەوە دەبینین کە ئەو ووشە و زاراوانەی لە قورئانی پیرۆزدا بەکار هاتوون زۆر گونجاون (وەك لە داهاتووشدا زیاتر ڕوونی دەکەینەوە)، چونکە ئاسان و گشتگیرن، و زۆر بە کورتی ئەندازەیەکی گەورەیان لە زانیاری تێدایە، لەهەمان کاتیشدا لەگەڵ کۆرپەلەزانی ئێستادا زۆر گونجاوە چونکە تەعبیر لە گۆڕانکاری‌یەکانی ناو کۆرپەلەکە دەکات و وەسفیشە بۆ سیفاتە دەرەکی‌یەکانی کۆرپەلە.

لەگەڵ بوونی چەندین ئایەت کە گەشە کردنی کۆرپەلەی مرۆڤی باس کردووە، بەڵام چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆز زۆر بە ووردی قۆناغەکانی دروست بوونی کۆرپەلەی مرۆڤی کۆکردووەتەوە و بە ڕیزبەندی باسی کردوون کە دەفەرموێت:

﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ من سُلَالَة مِّن طِين، ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَّكِين، ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عظَامًا فَكَسَوْنَا الْعظَامَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالقِينَ﴾

**المؤمنون/١٢-١٤**

**ئێمەش بە پشتیوانی پەروەردگار باسی ئەو قۆناغانە بەم شێوەیە دەکەین و دەیسەلمێنین کە زانستی نوێی ئەمڕۆش هەمان ریزبەندی بۆ ئەو قۆناغانە داناوە، کە بەم شێوەیەی خوارەوەیە:**

**- باسی دروست بوونی کۆرپەلەی مرۆڤ لە قۆناغی سەرەتایی‌دا کە بە (النطفة) ناوی لێنراوە.**

**- باسی دروست بوونی کۆرپەلەی مرۆڤ لە قۆناغی (العلقة) دا.**

**- باسی دروست بوونی کۆرپەلەی مرۆڤ لە قۆناغی (المضغة) دا.**

**- باسی دروست بوونی کۆرپەلەی مرۆڤ لە قۆناغی دروست بوونی ئێسقان و گۆشت (العظام واللحم) دا.**

**- باسی دروست بوونی کۆرپەلەی مرۆڤ لە قۆناغی (النشأة) دا.**

**بە یارمەتی پەروەردگار و بەووردی باسی ئەم قۆناغانە دەکەین و ڕاستی‌یە زانستی‌یە سەلمێنەرەکانیشی لە چەند کتێبێك و نووسراو و بابەتی زانستی کۆرپەلەزانی باوەڕپێکراوی چەند زانایەکی ناسراوی ئەم زانستە لە جیهاندا لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا وەردەگرین و دەیسەلمێنین کە قورئان چ پێشدەستی‌یەکی هەبووە لە باس کردنی گەشە کردنی کۆرپەلەدا، لەو زانا بەناوبانگە جیهانی‌یانە:**

١- پرۆفیسۆر (د. کیث. ل. مور) پرۆفیسۆر و پسپۆڕی بواری توێکاری و کۆرپەلەزانی و زانستی خانە زیندووەکانە لە کۆلیژی پزیشکی زانکۆکانی (تۆرنتۆ) و (مانیتوبا) لە (کەنەدا)، کە کتێبی (مرۆڤی گەشەکردوو یان گەشەکردنی مرۆۆ - The Developing Human)ی داناوە، کە بریتی‌یە لە سەرچاوەیەکی سەرەکی کۆرپەلەزانی لە هەموو جیهاندا و بۆ ٨ زمانی جۆراوجۆر وەرگێڕدراوە.

٢- پرۆفیسۆر (د. أ. مارشال جونسون) سەرۆکی بەشی توێکاری و کۆرپەلەزانی و بەڕێوەبەری پەیمانگای (دانیال) لە زانکۆی (تۆماس جیفەرسۆن) لە (فیلادلفیا)ی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

٣- پرۆفیسۆر (د. ت. ف. برسود) مامۆستا و سەرۆکی بەشی توێکاری لە زانکۆی (مانیتوبا) لە کەنەدا.

٤- پرۆفیسۆر (د. ج. س. جورنجەر) مامۆستای توێکاری و کۆرپەلەزانی لە زانکۆی (جۆرج تاون) لە (واشنتۆن)ی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

٥- پرۆفیسۆر (د. جولی سمسون) مامۆستای نەخۆشی‌یەکانی ژنان و منداڵبوون لە زانکۆی (نۆرث وێست) لە (شیکاگۆ)ی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و پسپۆڕی کۆرپەلەزانی‌یە.

٦- پرۆفیسۆر (ت. و. سادلەر) مامۆستا لە بەشی توێکاری زانکۆی (نۆرث کارۆلاینا) لە ئەمریکا، کە خاوەنی کتێبی کۆرپەلەزانی پزیشکی‌یە (Medical Embryology) کە بریتی‌یە لە پرۆگرامی خوێندنی کۆرپەلەزانی لە زانکۆکانی عێراقدا.

ئێستاش با دەست بکەین بە باس کردنی قۆناغەکان و بچینە ناوەڕۆك و درێژەی بابەتەکەمانەوە:



# دروست بوونی کۆرپەلەی مرۆڤ
# لە قۆناغی سەرەتاییدا
# (مرحله النطفة)

دۆزینەوەی قۆناغە جیاوازەکان و بەدوایەکەکانی گەشەکردنی کۆرپەلە یەکێکە لە بابەتە ئاڵۆزەکانی مێژووی زانستی کۆرپەلەزانی، هۆی ئەم ئاڵۆزییەش بریتییە لە قەبارەی زۆر بچووکی کۆرپەلە لە قۆناغە سەرەتاییەکانیدا بە تایبەتی لە چەند هەفتەی یەکەمی سکپڕیدا کە بەهۆی چەند هۆکارێکی تەکنەلۆژی زۆر پێشکەوتوو نەبێت درکی پێناکرێت، بە هەمووی تەنها بۆ ۳۰۰ ساڵ دەبێت (واتە لە سەدەی حەڤدەیەمی زایینییەوە بوو) کە ئەم زانستە پێشکەوتنێکی راستەقینەی بەخۆیەوە بینی، ئەویش پاش دۆزینەوەی وردبین (مایکرۆسکۆپ)، بەڵام دەبینین قورئانی پیرۆز کە مێژووی دابەزاندنی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی حەوتەمی زایینی یەکەم سەرچاوەیە لەبەر دەستماندا بۆ دیاریکردنی قۆناغەکانی گەشەکردنی کۆرپەلە، قورئان چەند ناوێك دەنێت لەم قۆناغانە کە بە وردی باسی شکڵی دەرەوە و گرنگترین کردارەکانی ناوخۆی کۆرپەلەکە دەکات، کە دەبینین ئەم ناو و (مصطلحاة)انە بە وردییەکی زۆرەوە هەموو شەرتێکی تێدایە بۆ ناولێنانی زانستی قۆناغەکان، وەك لەو ئایەتە پیرۆزانەی پێشتردا هاتووە: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن سُلَالَةٍ مِّن طِينٍ، ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ، ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ﴾ (المؤمنون).

هەروەها لە فەرموودەیەکی پیرۆزی پێغەمبەریشدا (ﷺ) هەمان ئەم ناوانە هاتوون: **عن عبدالله بن مسعود (رضي الله عنه) قال: حدثنا رسول الله (ﷺ) وهو الصادق المصدوق قال:** ﴿إنَّ أَحَدَكُم يُجْمَع خَلْقُه في بَطْنِ أُمِّه أَربَعين يَوماً، ثُمَّ يَكون في ذَلك عَلَقَةً مثْلَ ذَلك، ثُمَّ يَكون في ذلك مُضْغَةً مثْلَ ذَلك، ثُمَّ يُرْسل المَلَك فَيَنْفُخ فيه الرُّوح وَيُؤْمَرُ بِأَرْبَعِ كَلمات بِكَتْب رِزْقه وَأَجَله وَعَمَله وَشَقيٌّ أَو سَعيد﴾ **رواه البخاري و مسلم وابو داود والترمذي وابن ماجة وإدراج لفظ (نطفة) في (إن أحدكم يجمع خلقه في بطن أمه أربعين يوما نطفة) لا**

أصل لـه في جميع الروايـات، واتـه: هـەر کەسـێك لـه ئێـوه دروسـت بـوونی لـه سـکی دایکیدا له چل رۆژدا تەواو دەبێت، هەر لەو چل رۆژەدا (علقة) دەبێت، هـەر لەو چل رۆژەدا (مضغة) دەبێت، پاشان فریشتەیەك دەنێردرێت لە دوای چل رۆژ کە رۆح بکات بە بەری کۆرپەلەکەدا، و فەرمانی بە چوار شت پێدەکرێت: بـه نووسـینی رۆزییەکـەی لـه دونیـادا و ئەجەلەکـەی و کردارەکـانی و ئایـا خۆش بەختە یان سەرگەردانە.

**قۆناغی یەکەم وەك لە ئایەتەکەدا باس کراوە بریتییە لە قۆناغی (نطفة):**

لـەزمانی عـەرەبیدا (نطفـة) بـە ئـاوێکی کـەم دەووترێـت بـە ئەنـدازەی یـەك تنـۆك (القليـل مـن المـاء والـذي يعـدل قطـرة)، وەك لـه فەرهەنگـەکانی زمـانی عـەرەبیدا هـاتووە، (إبـن منظـور) لـه فەرهـەنگی (لسـان العـرب)دا دەڵێـت: (النطفة) قطرة الماء، واته (نطفة) بریتییه له تنۆکێك ئاو، (الزبيـدي)یش لـه (تـاج العـروس)دا دەڵێـت: (ونطفـت آذان الماشـية وتنطفـت: ابتلـت بالمـاء فقطـرت)، لـەو فەرموودەیـەی پێغەمبەریشـدا (ﷺ) ئامـاژە بـۆ (نطفـة) کـراوە: ﴿مَرَّ يَهُوديّ بِرَسولِ الله (ﷺ) وَهُوَ يُحَدِّثُ أَصْحابَهُ، فَقالت قُرَيش: يا يَهودي إنَّ هَـذا يَزْعُم أَنَّهُ نَبيّ، فَقالَ: لَأَسْأَلَنَّه عَن شَيءٍ لا يَعْلَمُهُ إلاّ نَبيّ، قال: فَجاء حَتَّى جَلس، ثُمَّ قال: يا مُحَمَّد مِمَّ يُخْلَقُ الأنسان؟ فَقال رَسول الله (ﷺ): يَا يَهُودِيّ مِن كُلٍّ يُخْلَق: مِن نُطْفَة الرَّجُل وَنُطْفَة المَرْأَة﴾ رواه أحمد بسند صحيح.

قۆناغی (نطفة)ی کۆرپەلە لە رووی زانستییەوە لە دروست بوونی تۆو لە پیاودا و هێلکە لە ئافرەتدا دەست پێدەکات و بە چوونە ناوەوەی کۆرپەلە بۆ ناو دیواری منداڵدان (Uterus) لە ئافرەتدا کۆتایی دێت.

**کورتەیەکی زانستی دەربارەی دەردراوەکانی زاووزێی پیاو و ئافرەت:**

بۆ ئەوەی ئـەم بابەتـە لای خوێنـەر ئاشـکرا بێـت دەڵێین ئـەو دەردراوەی لـه ئەندامی زاووزێی پیاوەوە دەردەچێت و پەیوەندی بە زاووزێوە هەیـه پـێی

دەووترێت شلەی تۆواو (السائل المنوي Semen or Seminal fluid) کە شلەیەکی سپی زەردباوە و پێکهاتووە لە تۆوەکان یان سپێرمەکان (الحیوانات المنویة Sperms) کە شێوەیەکی درێژکۆلەیان هەیە (لە کلکێك و سەرێك پێکهاتووە کە کلکەکەی ١٠جار لە سەرەکەی درێژترە، کلکەکەی درێژییەکەی ٥٠مایکرۆنە و سەرەکەی تەنها ٥ مایکرۆن درێژە) (وێنەی ٣-١)، لەگەڵ شلەمەنییەك کە لە پرۆستات و لە توورەکە کۆکەرەوەکانی سپێرمەوە (Seminal Vesicles) دەردەدرێن، ئەندامی زاووزێ لە پیاودا بریتین لە گونەکان (الخصیتین Testis) کە تۆو یان سپێرم دروست دەکەن، هەریەکەیان پێکهاتووە لە زیاتر لە ١٠٠٠ ووردە لوولەی پێچاوپێچ کە ناوپۆش کراون بەو خانانەی کە لە کۆتایی گەشە کردنیاندا سپێرمەکان دروست دەکەن (وێنەی ٣-٢).



وێنەی (٣-١)
پێکهاتەی تۆوێك
( سپێرمێك ) روون دەکاتەوە

لە ئافرەتیشدا ئەندامی سەرەکی زاووزێ بریتین لە هێلکەدانەکان (Ovaries) کە ٢دانەن




وێنەی (٣-٢)
پێکهاتەی توێکاری گون لە پیاودا روون دەکاتەوە

و دەکەونــە ئــەملاولای منالّدانـــەوە و بـــەهۆی بۆرییـــەکانی منالّدانـــەوە (Fallopian or Uterine Tubes) پێوەی بەستراونەتەوە (وێنـەی ٣-٣)، هێلکەدانــەکان لــە ٢ چـین پێکهـاتوون: تــوێکڵ کــە ژمارەیــەکی بێشـوماری لــە هێلکــەی پێگەیشــتوو و پێنەگەیشـتووی تێدایــە و پێ‌یـــــان دەووترێـــــت تووڕەکـــەکانی گـــراف (Graafian Follicles)، و چینی ناوەوە کە هۆرمۆنە مێینەکان دروست دەکات (وێنـەی ٣-٤)، هێلکەدانەکان خانەی زاووزێی مێینە دروست دەکەن کــە بـــریتین لـــە هێلکـــەی پێگەیشتوو (Ovum).



وێنەی (٣-٢)

کۆئەندامی زاووزێی مێینە

لــە قورئـانی پـیرۆزدا ئـامـاژە هاتووە بۆ ئەو دەردراوانەی پیاو و ئـافرەت کـە کۆرپەلـەی لێـوە دروست دەبێت:



وێنەی (٣-٤)

پێکهاتەی هێلکەدان لە ئافرەتدا

- ﴿فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ مِمَّ خُلِقَ {٥} خُلِقَ مِن مَّاء دَافِقٍ {٦} يَخْرُجُ مِن بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ {٧}﴾ (الطـــارق). واتـــە: کەواتـــە بـــا ئـادەمیزاد تەماشـا بکـات و ســەرنج بـدات کـە لـە چـی دروسـتکراوە؟! دروسـتکراوە لـە ئـاوێکی هـەڵقوڵاو و دەرپـەڕیو (کە مـەنی پیـاو و هێلکۆکـەی

ئافرەتە، هەردووکیان هەڵدەقوڵێن بۆ پێکهێنانی ئادەمیزاد بە ویستی خوا)، لەنێوان بڕبڕەکانی پشت و ئێسکەکانی سینەدا دەردەچێت.

- ﴿الَّذِي أَحْسَنَ كُلَّ شَيْءٍ خَلَقَهُ وَبَدَأَ خَلْقَ الْإِنسَانِ مِن طِينٍ، ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُ مِن سُلَالَةٍ مِّن مَّاءٍ مَّهِينٍ﴾ (السجدة: ٧،٨)، واتە: ئەو خوایە زاتێکە هەموو شتێکی بە چاکی و ڕێکوپێکی بەدیهێناوە، لە سەرەتاوە ئادەمیزادی لە قوڕ دروستکرد، پاشان زنجیرەی نەوەکانی ئەم ئادەمیزادەی لە پوختەی (سلالة)ی ئاوێکی سادە و بێنرخ بەدیهێناوە.

- ﴿أَيَحْسَبُ الْإِنسَانُ أَن يُتْرَكَ سُدًى، أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ يُمْنَى﴾ (القيامة: ٣٦-٣٧)، واتە: ئایا ئادەمیزاد وادەزانێت هەروا وازی لێدەهێنرێت بەخۆڕایی (لێپرسینەوەی نابێت)؟! باشە، ئایا کاتی خۆی نوتفەیەك نەبووە لە بەشێکی مەنییەوە کە دەڕژێنرایە شوێنی خۆی (کە منداڵدانی دایکە).

وێنەی (٢-٥)

دروستبوونی سپێرم و هێلکە لەناو گون و هێلکەداندا

لە زوربەی ئایەتەکاندا باس لەوە دەکات کە کۆرپەلەی مرۆڤ لە ئاوی پیاو و ئافرەتەوە دروست دەبێت، وەك بینیشمان زانستی نوێ دانی بەو ڕاستییەدا ناوە کە دەردراوەکانی زاووزێی پیاو و ئافرەت شلەمەنییەکە کە زوربەی لە ئاو پێکهاتووە و هەر بە ئاویش ناوی دەبات (بۆ زیاتر ڕوون بوونەوەی چۆنێتی دروست بوونی خانەکانی زاووزێی پیاو و ئافرەت بڕوانە وێنە ڕەنگاوڕەنگەکانی: ٧/هـ ، ٨/هـ ، ٩/هـ ، ١٠/هـ ، ١١/هـ ، ١٢/هـ).

## شوێنی جێگیر بوون و هەڵگرتن:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ الَّذِيَ أَنشَأَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ فَمُسْتَقَرٌّ وَمُسْتَوْدَعٌ قَدْ فَصَّلْنَا الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَفْقَهُونَ﴾ (الأنعام:٩٨)، واتە: هەر ئەو زاتە ئێوەی بەدیهێناوە لە تاکە کەسێك، سەرەدەمێك بنچینەی ئێوەی لە شوێنێکی تایبەتیدا نیشتەجێ کردبوو و هەڵگرتبوو، (کە گوێزرانەوە بۆ ناو سکی دایکتان)، ئەو شوێنەی کە ئێوەی گرتەخۆ (تا تیایدا نەش ونما بکەن، یاخود بۆ ماوەیەك ئێوەی لەسەر رووکاری زەوی دانا، دوایی لە تویێدا شاردنییەوە تا قیامەت)، بەڕاستی ئێمە نیشانە و بەڵگەی زۆرمان (لەسەر دروستکردنی ئێوە و دروستکاری خۆمان هێناوەتەوە) بۆ کەسانێك کە تێفکرن و ووردبینبن، لە فەرهەنگی (لسان العرب)دا هاتووە: (المستودع: المكان الذي تجعل فيه الوديعة، يقال استودعته وديعة إذا استحفظته عليه)، واتە: (مُسْتَوْدَع: بە مانای عەمبار دێت کە بریتییە لەو شوێنی شتی تێدا هەڵدەگیرێت، بە مەبەستی هەڵگرتن و پاراستنی)، لێرەوە ئەوە حاڵی دەبین (مُسْتَوْدَع) بریتییە لەو شوێنەی کە شتی تێدا هەڵدەگیرێت بە کاتی، تا ئەو کاتەی کە لێوەی دەردەهێنرێتەوە، دەبێت ئەو شتەی کە بە ئەمانەت و بە کاتی هەڵدەگیرێت و دوایی وەردەگیرێتەوە چی بێت؟!

لێرەدا خوای گەورە باسی دروست بوونی مرۆڤ دەکات (وَهُوَ الَّذِيَ أَنشَأَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ)، کەواتە دەبێت ئەو شتەی کە هەڵگیراوە پەیوەندی بە دروست بوونییەوە هەبێت، کە وەك ووتمان یەکەم قۆناغی دروست بوونی کۆرپەلە بریتییە لە (نطفة) واتە تنۆکێك ئاو، کە لە پیاو و ئافرەتەوە دەبێت، کەواتە لێرەوە ئەوە تێدەگەین مەبەستی پەروەردگار بریتییە لە (نطفة)ی مرۆڤ کە بنچینەی دروست بوونی مرۆڤە، و ئەم نوتفەیەیە کە بە کاتی لە شوێنێکی جێگیردا هەڵدەگیرێت!

ئەگەر بڕوانینە ئایەتێکی تر کە پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿هَلْ أَتَى عَلَى الْإِنسَانِ حِينٌ مِّنَ الدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْئاً مَّذْكُوراً﴾ (الإنسان:١)، واتە: بەڕاستی ماوەیەکی زۆر لە ڕۆژگار بەسەر ئادەمیزاددا هات کە شتێکی وانەبوو ناو ببرێت، لێرەدا مەبەستی پەروەردگار هەموو ڕەگەزی مرۆڤایەتییە لە نەوەی ئادەم وەك (القرطبي) لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت، (حِينٌ مِّنَ الدَّهْرِ) وەك (الآلوسي) موفەسیر دەڵێت: بریتییە لە کاتێکی دیاری کراوی کەم و نزیك، کەواتە مانای ووردی ئایەتەکە ئەمەیە: هەموو مرۆڤێك کاتێکی زەمەنی نزیکی بەسەردا دەڕوات کە شتێکی باسکراو نەبووە، لێرەدا دەپرسین: ئایا مرۆڤ پێشتر شتێك بووە پێش ئەوەی کە دوایی مرۆڤێکی لێدەرچێت؟

دەڵێین: بەڵێ، پێشتر (نطفة) بووە پێش ئەوەی کە دروست ببێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ يُمْنَى﴾ (القيامة:٣٧)، واتە: ئایا کاتی خۆی نوتفەیەك نەبووە لە بەشێکی مەنییەوە کە دەڕژێنرایە شوێنی خۆی (واتە ئایا ئەو لەسەرەتاوە کە دروستمان کرد بەشێکی تنۆکێك ئاو نەبووە)، (القرطبي)یش دەڵێت: (لَمْ يَكُن شَيْئاً: أي كان شيئاً ولَم يَكن مَذكورا) بە مانای ئەوەی کە پێشتر شتێك بووە بەڵام باسکراو نەبووە و ناوی نەبووە (کە نطفة بووە)، لە تەفسیری (الكشّاف)دا هاتووە: (أي كان شيئاً منسياً غَيْر مذكور، نطفة في الأصلاب) واتە: مەبەستی ئەوەیە کە مرۆڤ پێشتر شتێکی لەبیرکراو و باس نەکراو بوو، کە نوتفە بووە لە پشتەکاندا، ئەویش لەبەر ئەوەیە بنچینەی مرۆڤ کە نوتفەی پیاو و ئافرەتە لەبەر بچووکی و نادیاریی باس ناکرێت و تەقدیر ناکرێت.

ئەم مانایە بەهێز دەبێت بە ئایەتی ﴿ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُ مِن سُلَالَةٍ مِّن مَّاء مَّهِينٍ﴾ (السجدة:٨)، واتە: پاشان زنجیرەی نەوەکانی لە پوختەی ئاوێکی سادە و

بێنرخەوە بەدیهێناوە، کە ئاماژە دەدات بەوەی بنچینەی مرۆڤ لە ئاوێکی کەم و لاواز و بێگرنگییەوەیە.

هەروەها ریزبەندی ئایەتەکانیش ئەم بۆچوون و مانایە بەهێز دەکات، چونکە دوای ئایەتی ﴿هَلْ أَتَى عَلَى الْإِنسَانِ حِينٌ مِّنَ الدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْئاً مَّذْكُوراً﴾، یەکسەر دەڵێت: ﴿إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعاً بَصِيراً﴾ (الإنسان:٢) واتە: ئێمە مرۆڤمان لە تنۆکێك ئاوی تێکەڵا (نطفة أمشاج) دروست کردووە، بە مەبەستی تاقی کردنەوەی و کردوومانە بە بیسەر و بینەر، کەواتە لێرەوە دەگەینە ئەو راستییەی مرۆڤ پێشتر (نطفة) بووە پێش ئەوەی کە دروست ببێت، و تێدەگەین کە هەڵگیراوە وەك ئەمانەتێك بۆ کاتێکی دیاری کراو پێش ئەوەی کە خوای گەورە دروستی بکات، کە ئەمە لە عەمبارەکەدا روونادات تاوەکو لێوەی دەرنەچێت.

ئەگەر بێتو مانای هەردوو ئایەتەکە ﴿هَلْ أَتَى عَلَى الْإِنسَانِ حِينٌ مِّنَ الدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْئاً مَّذْكُوراً﴾ و ﴿وَهُوَ الَّذِيَ أَنشَأَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ فَمُسْتَقَرٌّ وَمُسْتَوْدَعٌ قَدْ فَصَّلْنَا الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَفْقَهُونَ﴾ کۆبکەینەوە بەم شێوەیەی لێدێت: بەسەر مرۆڤدا کاتێکی کەم رۆیوە کە شتێکی زۆر لەبیرکرا بووە لەبەر بچووکی و بێنرخییەکەی، کە نطفة بووە و لە عەمبارێکی جێگیردا هەڵگیراوە پێش ئەوەی کە خوای گەورە بیکات بە ئادەمیزادێك (موفەسیرەکان کۆکن لەسەرئەوەی کە نوتفەی مرۆڤ لە عەمبارێکدا هەڵدەگیرێت بەڵام لە دیاری کردنی شوێنی ئەم عەمبارەدا جیاوازن)، هەروەها لە ئایەتەکانەوە ئەوە تێدەگەین کە خوای گەورە نوتفەکان دروست دەکات بە ماوەیەکی کەم پێش لە دەرچوونیان و پیتاندنیان (بڕوانە وێنەکانی ٣-٦ ، ٣-٧) ، (هەروەها وێنە رەنگاورەنگەکانی: ١٤/ هـ ، ١٥/ هـ).




وێنەی (٣-٦) : شوێنی دروست کردن و عەمبار کردنی سپێرمەکان لە پیاودا کە گونەکانن لەگەڵ پێکهاتەی توێکارییاندا




وێنەی (٣-٧)

An ovary containing follicles at different stages of development. An atretic follicle is one that is dying by apoptosis. It will eventually become a corpus albicans.

شوێنی دروست کردن و عەمبار کردنی هێلکۆکەکان لە ئافرەتدا کە هێلکەدانەکانن

لێرەدا دەڵێین ئاماژەدان بەم راستییانە لە ئایەتە پیرۆزەکاندا هاتووە زۆر گرانە کە هەموو کەسێك بیزانێت (تەنانەت ئەوانەشی لە کۆرپەلەزانیدا شارەزان)، چونکە ئەگەر بشزانین کە مرۆڤ نوتفەی هەیە، ئەمە ئەوە ناسەلمێنێت کە پێش دەرچوونی بە ماوەیەك دروست ببێت، یان ئەوە روون بکاتەوە کە لە شوێنێکدا هەڵدەگیرێن تا کاتی دەرچوونیان، کەواتە ئاماژەدان بەبوونی ئەم عەمبارانە خۆی لەخۆیدا شتێکی زۆر سەرسوڕهێنەرە، چونکە ئەم عەمبارانە نادیار و شارراوەن لەناو لەشی مرۆڤدا، و پێویست دەکات کە لەش توێکاری بکەین بۆ ئەوەی بوونیان بدۆزینەوە.

زانستی توێکاری نوێ دەربارەی ئەم عەمبارانە لە لەشی مرۆڤدا دواوە و بە ووردی پێکهاتەکانی بۆ روون کردووینەتەوە، کە ئەم شوێنانەن:

١- **لە پیاودا:** گونەکان بریتین لەم عەمبارە کە نوتفەی پیاو (سپێرمەکان) و خانە پێکهێنەرەکانی لەخۆگرتووە، گونەکان درێژییان ٥سم و ئەستوورییان ٢,٥ سانتیمەترە، و دەکرێن بە چەند پلێکەوە (کە ژمارەیان نزیکەی ٤٠٠ پلە)، و پێکهاتوون لە چەندین لوولەی پێچاوپێچ (ژمارەیان لە ١٠٠٠دانە زیاترە)، درێژی هەر لوولەیەك لەمانە ئەگەر پێچاوپێچییەکەی بکرێتەوە دەگاتە مەترێك! لەگەڵ پێگەیشتن (بالغ بوون)دا سپێرمەکان لە خانە ناوپۆشەکانی ئەم لوولانەوە دروست دەبن، و دوای تەواو بوونی دروست بوونیان سپێرمەکان بە شەپۆل بە مەلەکردن دەڕۆن بۆ شوێنی هەڵگرتنیان لە بەشێکی گوندا کە زۆر پێچاوپێچە و پێی دەووترێت (البربخ Epididymis) کە ئەگەر ئەمیش پێچاوپێچییەکەی بکرێتەوە درێژی دەگاتی ٦مەترا! کەواتە گونەکان شوێنی هەڵگرتنی نوتفەی پیاون (سپێرمەکانن) بە گشتی (وێنەی ٣-٦).

٢- **لە ئافرەتدا:** هێلکەدانەکان ئەم عەمبارەن، لە کۆرپەلەی ٥هەفتەدا ژمارەی هێلکۆکەکانی ناو هێلکەدانەکانی نزیکەی (٥ ملیۆنە)، بەڵام لە کاتی گەشە کردن و گەورە بووندا زوربەی ئەم نوتفانە لەناو دەچن، کە کاتێك

دەگاتە تەمەنی ١٢ ساڵ ئەم هێلکۆکانە تەنیا نزیکەی ٤٠٠,٠٠٠ دانەیان لێدەمێنێتەوە، و لەم ژمارەیەش تەنیا ٤٠٠-٥٠٠ دانەیان بەدرێژایی تەمەنی ئافرەتەکە لە هێلکەدانەکانەوە دەردەچن و کەمێکیان چانسی ئەوەیان هەیە کە بپیتێنرێن، ئەم هێلکۆکانە لەناو چەند توورەکەیەکدا دەبن لەناو هێلکەدانەکاندا، کە گەشە دەکەن و تا لە کۆتاییدا لە هێلکەدانەوە دەردەچن و سەرەتای بۆری منالْدان دەیانگرێتەوە، کەواتە بۆمان دەرکەوت کە عەمباری نوتفەی ئافرەت بەشێوەیەکی گشتی بریتین لە هێلکەدانەکان (وێنەی ٣-٧).

لەم ووتانەوە تێدەگەین کە هەڵبژاردنی ووشەی (مستودع: عەمبار) بریتییە لە ئیعجازێکی زانستی، کە زانینی پێغەمبەر (ﷺ) ئاشکرا دەبێت دەربارەی ئەوەی کە نوتفە پێش دەرچوونی بە ماوەیەك دروست دەکرێت، و پاشان لە شوێنێکی پارێزراوی شاراوەدا هەڵدەگیرێت، کە لەگەڵ شلەی سپێرمیدا لە فەوتان دەپارێزرێن تا کاتی دەرچوونیان، هەروەها ئەو زاراوەیەی بەکارهاتووە (مُسْــــتَوْدَع) زۆر گشتگیرە و هەردوو گونەکان و هێلکەدانەکان دەگرێتەوە، و هەروەها ئاماژەش بەوە دەدات کە نوتفەکان لە شوێنێکی پارێزراودا هەڵدەگیرێن وەك ئەمانەتێك بۆ ماوەیەکی دیاری کراو، کە پاشان لە کۆتاییدا لەم شوێنانەوە دێنە دەرەوە، بەڵام ئەوەی لە زانستی ئەمڕۆدا بەکاردێت کە بریتین لە ووشەی (هێلکەدان Ovary) لە ئافرەتدا و (گون Testicle) لە پیاودا، ئاشکرایە کە تەنیا مەبەست پێیان ئەوەیە کە ئەم دوو ئەندامە نوتفەیان تێدایە، پاك و بێگەردی بۆ ئەو پەروەردگارەی کە مرۆڤی فێری جوانترین دەربڕین و رەوانبێژی کردووە ﴿الـرَّحْمَنُ {١} عَلَّـمَ الْقُرْآنَ {٢} خَلَــقَ الْإِنسَــانَ {٣} عَلَّمَــهُ الْبَيَــانَ {٤}﴾ (الرحمن)، واتە: خوای میهرەبان، کانگای سۆز و رەحمەت، قورئانی فێری ئادەمیزاد کردووە، هەر خودا مرۆڤی دروست کردووە،هەر ئەویش فێری دەربڕین و رەوانبێژی و گوفتار و ئاخاوتنی کردووە.




وێنەی ( ٣-٨ )

چەند هێڵکاری‌یەك کە گەشەی سپێرم لە خانە سەرەتایی‌یەکەیەوە روون دەکاتەوە



وێنەی ( ٣-٩ )
ملیۆنەها سپێرم لەناو تۆواودا مەلە دەکەن!!



وێنەی ( ٣-١٠ )

دوو وێنەی راستەقینەی هێلکۆکەی پێگەیشتووی مرۆڤ

## لە ئاوێکی دەرپەڕیووەوە (من مَّاء دَافِقٍ):

قورئانی پیرۆز دەفەرموێت مرۆڤ لە بەشێکی ئاوێکی دەرپەڕیووەوە دروست بووە: ﴿فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ مِمَّ خُلِقَ، خُلِقَ مِن مَّاء دَافِقٍ، يَخْرُجُ مِن بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ﴾ (الطارق: ٥-٧)، لێرەدا ئەوەی سەرسوڕهێنەرە ئەوەیە کە قورئانی پیرۆز کرداری دەرچوون و دەرپەڕاندن دەداتە پاڵ ئاوەکە خۆی و دەیکات بە بکەر و دروستکەری جووڵە؛ واتە ئەو ئاوە خۆی هێزی جووڵان و دەرپەڕانی تێدایە، هەموومان دەزانین کاتی دەرچوونی ئاو لەپیاودا بەشێوەی دەرپەڕاندن دەردەچێت بەهۆی گرژبوونی دیواری توورەکەکانی سپێرم و گرژ بوونی ماسولکەکانی دەوری، کە ڕۆڵی سەرەکی لەم کردارەدا بۆ کۆئەندامی دەماری خۆنەوویست (Autonomic Nervous System) دەبێت (بە هەردوو بەشییەوە: Sympathetic & Parasympathetic)، هەروەها زانستی نوێی ئەمڕۆ بۆی سەلماندووین کە لە ئاوی پیاودا تۆو (سپێرم Sperms) هەیە کە پێویستە ئەم سپێرمانەش جووڵاو و زیندوو بن بۆ ئەوەی پیتاندن ڕووبدات (**وێنەکانی**: ٣-٨ ، ٣-٩ ، ٣-١١).

هەروەها کۆرپەلەزانی نوێ دەڵێت: دەردراوی هێلکەدانیش کە ئاوی ئافرەتە و هێلکەکەی تێدایە (مەبەستمان لەو ئاوە نییە کە لە کاتی جووت بووندا دێتە دەرەوە) بە شێوەی دەرپەڕاندن دەردەچێت و لە هێلکەدانەوە بەهۆی تەقینی توورەکەی گرافەوە هێلکۆکەکە دەردەپەڕێتە ناو بۆشایی سکەوە، ئەمەش بەهۆی ئەوەوەیە کە توورەکەی گراف شلەمەنییەکی تێدایە کە وورده وورده پەستانەکەی بەرز دەبێتەوە تا دەگاتە (٢٠ملم جیوە)، ئیتر لێرەدا توورەکەی هێلکەکە لە تەنکترین شوێنیدا دەتەقێت و ئەم ئاوە و هێلکەکە فڕێ دەداتە ناو بۆشایی سکەوە، لەم کاتەدا پلەی گەرمی لەشی ئافرەتەکە بەرز دەبێتەوە و ئەم ئاوە لەلایەن گەندەپێکانی کۆتایی بۆری منالدانەوە (Fimbriae) دەگیرێتەوە و دەخرێتە ناو سەرەتای بۆری منالدانەوە.



## وێنەی ( ٣-١١ )

هەزاران سپێرم دەردەخات کە بە چالاکییەکی زۆرەوە پاش دەرپەڕانیان مەلە دەکەن بۆ گەیشتن بە هێلکۆکە.

الأمشاج

النطفة

بطانة الرحم

عنق الرحم

المهبل

هێلکۆکە دوای دەرپەڕینی لە منداڵدانەوە

Granulosa cells

Oocyte covered by zona pellucida

A

Ovulation site

Oocyte surrounded by granulosa cells

Surface of ovary

B

(A) Scanning electron micrograph of the ovulation process

ئەمە وێنەی بورکان نییە بەڵکو شوێنی دەرپەڕینی هێلکۆکەیە لە هێلکەدانەوە

وێنەی ( ٣-١٢ ) چەند وێنەیەکی راستەقینەی هێلکۆکەکەیە لە پاش دەرپەڕینی لە هێلکەدانەوە لەگەڵ شوێنی دەرپەڕینەکە.

ئەگەر ئەم پەستانە نەبووایە بە هیچ شێوەیەك هێلکەکە نەیدەتوانی لە هێلکەدانەوە بێتە دەرەوە و خۆی هەڵداتە سەرەتای بۆری مناڵدانەوە، و ئەم پەستانە دەیسەلمێنێت کە ئاوی ئافرەتیش هەروەك ئاوی پیاو دەرپەڕیو و جووڵاوە (وێنەی ٣-١٢)، و یەکدەگرێتەوە لەگەڵ دەربڕینە قورئانییەکەی کە بە گشتی باسی ئەو ئاوەی کردووە کە مرۆڤی لێوە دروست دەبێت (جا ئاوی پیاو یان ئافرەت بێت) کە پێویستە دەرپەڕیو و جووڵاو بێت، هەروەها دەبێت هێلکەکە خۆشی جولاو و دەرپەڕیو و زیندوو بێت بۆ ئەوەی پیتاندن بە سەرکەوتوویی ڕووبدات (هەروەها بڕوانە وێنە ڕەنگاوڕەنگەکانی: ١٦/ هـ ، ١٧/ هـ ، ١٨/ هـ).

هەروەها زانراوە کە ئاوی پیاو لەگەڵ ئەوەی کە سپێرمی تێدایە، لە پێش سەری سپێرمەکانەوە چەند پارچە مایتۆکۆندریایەك (**Mitochondria**) ڕیز بوون (بڕوانە وێنەی: ١٩/ هـ) و ئەم مایتۆکۆندریایانەن بە ماڵە ووزە (**Power houses**) ناسراون و پڕن لە ئاوێتەی ئەدینۆسینی سێ فۆسفاتی (**ATP**)، کە بەخشەری سەرەکی ووزەن و وا لە سپێرمەکان دەکەن کە چالاك و جووڵاوبن بە بەردەوامی بۆ چەندین سەعات، هەروەها ئەم ئاوە هەندێك ماددەی تریشی تێدایە کە یارمەتی پیتاندن دەدەن، یەکێك لەوانە ماددەی پرۆستاگلاندینە (**Prostaglandin**) کە دەبێتە هۆی گرژبوونی مناڵدان لە ئافرەتدا و یارمەتی گەیشتنی تۆوەکان دەدات بۆ شوێنی هێلکەکە لە سەرەتای بۆری مناڵداندا، کەواتە ئەم ماددەیەی لە ئاوەکەدایە هۆکاری دروست بوونی جووڵەیە.

هەروەها لەئاوی ئافرەتیشدا (جگە لە هێلکەکە) چەندین ماددەی تر هەیە کە یارمەتی پیتاندن دەدەن، لەوانە هەندێك ئەنزیم کە ناوپۆشی مناڵدان و بۆرییەکەی دەری دەدەن و وا لە تۆو دەکات کە توانای پیتاندنی هەبێت بە لابردنی بەرگی بەشی پێشەوەی تۆوەکە (واتە بەرگی سەرەکەی کە لە

پرۆتینی شەکردار پێکهاتووە)، لەهەمان کاتدا ئەم ئەنزیمانە هەڵدەستن بە لابردنی ئەو خانانەی کە دەوری هێلکەکەیان داوە لەگەڵ لابردنی رووپۆشە پارێزەرەکەی لە بەرامبەر سپێرمەکاندا، بە مەبەستی ئاسان کردنی کرداری پیتاندن، کەواتە ئاوی ئافرەتیش پڕە لە جووڵە و جووڵە دروست دەکات.

پێشتر باسمان کرد کە مانای (نطفة) بریتی‌یە لە ئاوێکی کەم بە ئەندازەی تنۆکێك کە ئەم ووشەیە پڕاوپڕ سەرەتای دروست بوونی کۆرپەلە دەگرێتەوە، هەروەها ئاوێکە پڕە لە دەرپەڕان و جموجووڵ لە هەردوو ئاوی پیاو و ئافرەتدا و سەلمێنەری زانستی ئەو راستی‌یەیە کە لە ئایەتەکەی قورئاندا هاتووە و خۆی لەخۆی‌دا موعجیزەیەکی گەورەیە.

## ئاوی ئافرەت رەنگی زەردە:

لە فەرمووەدەیەکی پێغەمبەردا (ﷺ) ئاماژەیەکی سەرسوڕهێنەر دراوە کە دەفەرموێت: ﴿ماءُ الرَّجُلِ أَبْيَض وَماءُ المَرْأَة أَصْفَر ... ﴾ رواه مسلم، واتە: ئاوی پیاو سپی‌یە و ئاوی ئافرەت رەنگی زەردە، ئاشکرایە کە رەنگی تۆواو (مەنی)ی پیاو سپی‌یە و بریتی‌یە لەو دەردراوی زاووزێی پیاو کە لێرەدا پێغەمبەر (ﷺ) ئاماژەی پێداوە، دەبێت مەبەست لە ئاوی ئافرەت کە لە فەرمووەدەکەدا هاتووە دەردراوی زاووزێی ئافرەت بێت، کە وەك ووتمان بریتی‌یە لە هێلکە و شلەکانی دەوروبەری کە بە چاو نابینرێت، ئەگەر بڕوانینە (وێنەی: ٢٠/ هـ) کە بە ووردبینی ئەلیکترۆنی گیراوە بە ئاشکرا وێنەی هێلکۆکەیەکی ئافرەت دەبینین کە رەنگەکەی زەردە، لەهەمان کاتدا کۆرپەلەزانی نوێ بۆی روون کردووینەتەوە کە کاتێك هێلکۆکە و شلەکانی دەتەقێتە ناو بۆشایی سکەوە لە پاش خۆی لەناو هێلکەداندا پاشماوەکەی دەبێت بە تەنی زەرد (الجسم الأصفر Corpus Luteum) کە ئەمیش رەنگی زەردە (وێنەی: ٢١/ هـ)، دیارە وەك ووتمان ئەم ئاو و تەنانە و رەنگەکانیان بەچاو نابینرێن و تەنها

دوای دۆزینەوەی ووردبینە پێشکەوتووەکان لە سەدەی بیستەمدا پەردەیان لەسەر لابرا، کە ئاماژەدانی پێغەمبەر (ﷺ) پێیان یەکێکە لە موعجیزەکانی.

**لە نێوان دوو بەشدا (من بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ):**

هەر لەو ئایەتە پیرۆزەی پێشتردا هاتووە: ﴿خُلِقَ مِن مَّاء دَافِقٍ، يَخْرُجُ مِن بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ﴾، (التَّرَائِبِ) لە زمانی عەرەبیدا بە شتێکی تەخت دەووترێت وەك زەوی تەخت، لە فەرهەنگی (لسان العرب)دا هاتووە: (ورَجلٌ تَرِبٌ: لازق بالتراب (ما تستوي حاله مع التراب))، کە مەبەست پێی لە ئایەتەکەدا ئێسکەکانی قەفەسی سنگە (پەراسووەکان)، هەر لە فەرهەنگی (لسان العرب)دا هاتووە: (الترائب عظام الصدر: ما بين الترقوة الى الثندوة)، دەربارەی (الصُّلْبِ) لە زمانی عەرەبیدا بە مانای بڕبڕەی پشت دێت، لە فەرهەنگی (لسان العرب)دا هاتووە: (الصُّلب: عَظْم من لدن الكاهل الى العجب)، لەبارەی واتای ئەم ئایەتە پیرۆزەوە (کە دەفەرموێت: لە نێوان بڕبڕەی پشت و قەفەسی سنگ دەردەچێت) زانایانی ڕاڤە دوو ڕایان هەیە، هەندێکیان دەڵێن کە ئەو شتەی لەم نێوانەوە دەردەچێت مەبەست پێی مرۆڤە بە گشتی کە لە نێوان (الصلب والترائب)دا دروست دەبێت، هەندێکی تریان دەڵێن کە مەبەستی ئەو ئاوەیە کە مرۆڤی لێوە دروست دەبێت، بەم پێیە لەم ئایەتە پیرۆزەدا موعجیزەیەکی تر هەیە کە دەفەرموێت: مرۆڤ لە بەشێك ئاوی دەرپەڕیوەوە دروست دەبێت کە ئەم ئاوە لە چەند ئەندامێکەوە دەردەچێت، و ئەم ئەندامانە سەرەتا لە نێوان بڕبڕەی پشت و پەراسووەکان (الصلب و الترائب)دا دروست دەبن.

وەك ئاماژەمان پێدا لە فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبیدا (الصلب) بە مانای بڕبڕەی پشت(العمود الفقري) دێت، و (الترائب) واتە: ئێسکەکانی پێشەوەی سنگی مرۆڤ (عظام الصدر الأمامي مما يلي الترقوتين) واتە پەراسووەکان.

کەواتە ئەوەی تێدەگەین لە ئایەتە پیرۆزەکەوە وەك ئیعجازێکی نوێ و تەحەددایەك ئەوەیە کە دەفەرموێت کۆئەندامی زاووزێی پیاو و ئافرەت سەرەتا لە کۆرپەلەدا لە نێوان بڕبڕەی پشت و ئێسکەکانی سنگدا دروست دەبن لە پشتدا، زانستی ئەمڕۆ دۆزیویەتەوە کە لە کۆرپەلەدا ئەو خانانەی هێلکەدانەکان لەئافرەتدا و گون لەپیاودا دروست دەکەن لەگەڵ ئەو خانانەی کە گورچیلەکان دروست دەکەن لە داهاتوودا سەرەتا لە ناوچەی چینی ناوەڕاست (Mesoderm)وە لە کۆرپەلەدا جیا دەبنەوە و دروست دەبن، کە دەکەونە نێوان چینی سەرەوە یان دەرەوە (Ectoderm) کە ئەمەیان بڕبڕەی پشت و دەمارە پەتك دروست دەکات لە داهاتوودا، و چینی خوارەوە یان ناوەوە (Endoderm) کە لە داهاتوودا ئێسکەکانی قەفەزی سنگ (پەراسووەکان) دروست دەکات (بڕوانە وێنەی رەنگاوڕەنگی: ٢٢- A/ هـ)، ئەم چینە (چینی ناوەڕاست) تەنێکی لێوە دروست دەبێت کە پێکهێنەری گورچیلەکان و گونەکان یان هێلکەدانەکان دەبێت و دەکەوێتە ئەملاولای بڕبڕەی پشتی سەرەتاییەوە، لەگەڵ بەرەو پێش چوونی دروست بوونی کۆرپەلەدا ئەندامەکانی زاووزێی مرۆڤ (هێلکەدانەکان لە ئافرەتدا و گونەکان لەپیاودا) کە وەك ووتمان سەرەتا لەگەڵ گورچیلەکانن لە نزیکی پشتی مرۆڤدا، و پاشان دێنەخوارەوە بۆ شوێنی ئاسایی خۆیان.

ئەوەی ئەم راستییەمان بۆ دەسەلمێنێت ئەوەیە کە هێلکەدانەکان و گونەکان و گورچیلەکانیش راستەوخۆ لە لایەن خوێنبەری گەورە یان شاخوێنبەرەوە (Aortic Artery) خوێنیان بۆ دەچێت لە شوێنێکی نێوان هەردوو گورچیلەکانەوە، هەروەها لەلایەن دەماری دەیەمی سنگ (کە لە دڕکە پەتکی پشتەوە لە نێوان بڕبڕەی دەیەم و یانزەیەمەوە دەردەچێت) لە مێشکەوە دەماریان بۆ دەچێت، کە هەموو ئەم دەمار و خوێنبەرانە لەناوچەی ناوەڕاست لەنێوان بڕبڕەی پشت و قەفەزی سنگدا شوێنی خۆیان وەردەگرن (بڕوانە وێنەی ٣-١٣) و هەروەها (وێنەی رەنگاورەنگی: ٢٢- B/ هـ ).

معجزة الماء الدافق والصلب والترائب

بالعلم تسطع الآيات

قال الطبري: ( اختلف أهل التأويل في معنى الترائب. فقال بعضهم:
الترائب: موضع القلادة من صدر المرأة. وقال آخرون: الترائب: ما بين المنكبين والصدر. وقال آخرون: هو اليدان والرجلان والعينان. وقال آخرون: يخرج من بين صلب الرجل ونحره. وقال آخرون: هي الاضلاع التي أسفل الصلب. وقال آخرون: هي عصارة القلب ).
وما إن اخترعت المجاهر حتى بدت معجزة كبرى في كتاب الله تعالى، إن الماء الدافق سواء في الرجل او في المرأة انما يخرج متخلصا بالاستعانة بالعروق المغذية للمبيض والخصية، النازلة معهما من ( بين الصلب والترائب أمكان الكليتين ) بالتدريج أثناء فترة الحمل حتى تستقر الخصيتان والمبايض في مكانهما الجديد أسفل البطن. إنه العلم البليغ الذي لم يكن أحد يدري عنه شيئا قبل مائة عام عددا، سلوهم: من الذي أعلم محمدا صلى الله عليه وسلم في الزمن الأول.




صورة توضح مسار الدماء الممتدة من أعلى زاوية التقاء الصلب ( العمود الفقري ) والترائب ( الضلوع ) حتى تصل إلى مقر تكوين ماء الرجل ( الخصيتين ).

يقول الله تعالى:



وێنەی ( ٢-١٢ ): وێنەیەکی تۆێکاری ئەو خوێنبەر و خوێنهێنەرەی کە خوێن دەبەن بۆ گونەکان، دەبینین ڕاستەوخۆ لە خوێنبەر و خوێنهێنەری گەورەوە وەرگیراون کە دەکەونە نێوان برِبرِەی پشت و پەراسووەکانەوە

لە ئایەتێکی تریشدا ئاماژەیەك بۆ ئەم ڕاستییە هاتووە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِن بَنِي آدَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنفُسِهِمْ أَلَسْتَ بِرَبِّكُمْ قَالُواْ بَلَى شَهِدْنَا أَن تَقُولُواْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَذَا غَافِلِينَ﴾ (الاعراف:١٧٢).
واتە: پەروەردگار پێشتر پێش دروست کردنی مرۆڤەکان لەپشتی باوکیان (واتە پێش دروست بوونی مرۆڤەکان بەگشتی کە پاشان لەپشتی باوك و دایکەوە دروست دەبن) پەیمانی لێوەرگرتن کە دان بەوەدا بنێن کە (الله) پەروەردگاریانە، ئەوانیش بەگشتی وتیان بەڵێ پەیمان و شایەتی دەدەین.... کە وابزانم ئاماژەیەکی ڕوونی تێدایە بۆ ئەوەی لەپشتەوە بنچینەی مرۆڤ و خانەکانی زاووزێیەتی.

هەروەها لە فەرموودەیەکی پێغەمبەریشدا (ﷺ) ئاماژە بۆ ئەمە کراوە: ﴿عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ (رضيَ الله عنها) قَالَتْ: دُعِيَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) إِلَى جَنَازَةِ صَبِيٍّ مِنَ الأَنْصَارِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ طُوبَى لِهَذَا عُصْفُورٌ مِنْ عَصَافِيرِ الْجَنَّةِ لَمْ يَعْمَلِ

السُّوءَ وَلَمْ يُدْرِكْهُ، قَالَ: « أَوَغَيْرَ ذَلِكَ يَا عَائِشَةُ! إِنَّ اللَّهَ خَلَقَ لِلْجَنَّةِ أَهْلاً خَلَقَهُمْ لَهَا وَهُمْ فِي أَصْلاَبِ آبَائِهِمْ »﴾ رواه مسلم، واتە: عائیشەی دایکی ئیمانداران دەڵێت: (پێغەمبەر (ﷺ) بانگکرا بۆ ناشتنی منداڵێکی پشتیوانان، منیش ووتم: ئەی پێغەمبەری خودا خۆش بەختی بۆ ئەم منداڵە کە چۆلەکەیەکی بەهەشتە، نە خراپەی کردووە و نە خراپەی دیوە، ئەویش فەرمووی: هەر ئەوەیە ئەی عائیشە، خوای گەورە بڕیاری داوە کە کێ خەڵکی بەهەشتە بۆ هەموو کەسێك هەر لەو کاتەی کە لە پشتی باوکیاندان.

کەواتە لە کۆتایی‌دا دەگەینە راڤەی دروستی ئایەتە پیرۆزەکە کە مەبەست پێی ئەوەیە: بنچینەی مرۆڤ لە شوێنێکەوە دەردەچێت کە دەکەوێتە نێوان بڕبڕەی پشت و پەراسووەکانەوە، و دوایی لەرێی ئاوێکی دەرپەڕیوەوە کە لە گونەکان و هێلکەدانەکانەوە دەردەپەڕێت دروست دەبێت.

بەراستی ئاماژەیەکی سەرسوڕهێنەر و پڕ لە ئیعجازە، چونکە کێ لەو سەردەمەی پێغەمبەردا (ﷺ) بە خەیاڵیشیدا ئەم شتانە دەهاتن کە گونەکان و هێلکەدانەکان لە پشتەوە دێنە خوارەوە و خۆراك و پێویستی‌یەکانیشیان هەر لە هەمان شوێنەوە بۆ دێت، کە لە گەورەدا وەك بۆ هەمووان ئاشکرایە لە خوارەوەن و دوور لە پەراسوو و بڕبڕەی پشتن؟!

بەم شێوەیە راستی‌یە زانستی‌یەکان و ئایەتەکانی قورئان یەك دەگرنەوە، کە هیچ سەیر نی‌یە چونکە دروست کەری ئەم راستی‌یانە هەرئەوە کە قورئانی پیرۆزیشی بۆ ناردووین بە پێغەمبەردا (ﷺ): ﴿أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ﴾ (الملك:١٤).

## لێکدانەوەیەکی نوێ بۆ ئایەتی (يَخْرُجُ من بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِب ):

(د. داود سلمان السعدي) لە کتێبی (أسرار خلق الإنسان–العجائب في الصلب الترائب)دا بۆچوونێکی تری هێناوە دەربارەی ئەم ئایەتە کە پێم بۆچوونێکی جوانە و دەتوانین زیادی بکەین بۆ بۆچوونەکانی پێشتر لەسەر مانای ئەم ئایەتە، (د. السعدي) دەڵێت:

زانایانی تەفسیری پێشین هەموویان وتوویانە کە (الصلب) مەبەست پێی چەند بڕبڕەیەکی پشتە و (الترائب) چەند پەراسوویەکی سنگە، دەڵێن کە ئەوەی لێرەوە دەردەچێت بریتییە لە ئاوە دەرپەڕیوەکە و ئەم دوو شوێنە سەرچاوەی ئاوەکەن؟! بەڵام زانستی نوێ ئەم تەفسیرە رەت دەداتەوە و شوێنی دەرچوونی ئاوی پیاو و ئافرەتی بۆ روون کردووینەتەوە، هەربۆیە (شێخ محمد مصطفى المراغي) لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: ئایەتی (الصلب والترائب) زۆرێك لە زانایان و موفەسیرانی سەرسام کردووە و چەندین لێکدانەوەیان بۆ کردووە (هەر کەسەو بەپێی زانیاری خۆی)، کە زۆرێك لەو رایانە دوورە لە تێگەیشتنی راست و رایەکی دامەزراو.

(د. السعدي) بەردەوام دەبێت لە قسەکانیدا و دەڵێت: لە سەردەمی ئەمڕۆشماندا پزیشکە موسوڵمانە بەڕێزەکان زۆر هەوڵیانداوە بۆ راڤەکردنی ئایەتی (الصلب والترائب) بە پشت بەستن بە ڕاستییەکانی زانستی نوێ، ئەوەبوو زۆریان گەیشتنە ئەو ڕایەی کە ئەم دەرچوونی ئاوە لە (الصلب والترائب)ەوە مەبەست پێی لە کۆرپەلەدایە، کە سەلماوە لە کۆرپەلەدا سەرەتا ئەندامەکانی زاووزێ (گونەکان و هێلکەدانەکان) لە پشتدا و لە شوێنێکی نێوان بڕبڕەی پشت و پەراسووەکاندا دروست دەبن، هەروەها هەندێکی تریان بەوە راڤەیان کردووە کە مەبەستی ئایەتەکە بریتییە لە مرۆڤ بە گشتی کە کۆرپەلەکەی لە نێوان بڕبڕەی پشت و پەراسووەکاندا دێتە دەرەوە و لەدایك دەبێت (بڕوانە وێنەی ٣-١٤).




کۆرپەلەی مرۆڤ لە نێوان بڕبڕەی پشت و پەراسووەکاندا (الصلب والترائب)ەوە دێتە دەرەوە و لەدایك دەبێت.

من رام وایە کە ووشەکانی (الصلب والترائب) بە حەقیقی هاتوون و مەبەستی ئایەتەکە ئەوەیە کە سەرچاوەی مرۆڤ لە بەشێکی ئەم بڕبڕەی پشت و پەراسووانەوەیە، چونکە دەبینین خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا ئەمەی تەئکید کردووە کە دەفەرموێت: ﴿وَحَلاَئِلُ أَبْنَائِكُمُ الَّذِينَ مِنْ أَصْلاَبِكُمْ ...﴾ (النساء:٢٣)، واتە: لەسەرتان حەرام کراوە خێزانەکانی ئەو کوڕانەی کە لە پشتی خۆتانن... کە ئاماژەیەکی ئاشکرایە بۆ ئەوەی نەوەکانتان لە پشتتانەوە (صلب) دروست دەبن، ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ نموونەی تر لە قورئاندا بۆمان دەردەکەوێت کە مانای (من بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ) مەبەست پێی مانا حەرفی‌یەکە نی‌یە کە لە نێوان ئەو دووانەوە دەردەچێت بەڵکو مەبەست پێی ئەوەیە کە لەو دووانە پالفتە و پوختە دەکرێت.

ئەوەتا خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ لَكُمْ فِي الأَنْعَامِ لَعِبْرَةً نُسْقِيكُم مِّمَّا فِي بُطُونِهِ مِن بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَّبَنًا خَالِصًا ...﴾ (النحل:٦٦)، واتە: بەڕاستی لە بوونی ماڵات و (زیندەوەرانی جۆراوجۆردا) پەند و ئامۆژگاری هەیە بۆتان و جێگەی سەرنج و تێڕامانە، لە نێوان گژوگیای هەرس کراو و

خوێندا (واتە لە پوختەی ئەم دووانەوە) شیرێکی پاك و بێگەرد و خۆش و بەتام بەرهەم دەهێنین ..... کەواتە مەبەستی ئایەتەکە ئەوەیە کە لە پێکهێنەرەکانی خوێن و کۆئەندامی هەرسی‌یەوە ئەم شیرە پوختە دەردەهێنرێت و پاڵفتە دەکرێت، نەك لە ناوچەیەکی نێوانیانەوە کە ئەمە مانایەکی راست نی‌یە و زانستی سەلمێنراو رەتی دەکاتەوە، هەروەها لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿أَأُنزِلَ عَلَيْهِ الذِّكْرُ مِن بَيْنِنَا ....﴾ (ص:٨)، واتە: بێباوەڕان پێیان ناخۆش بوو کە پێغەمبەر (ﷺ) لەنێو ئەواندا هەڵبژێردراوە بۆ پێغەمبەرایەتی، نەك بە مانا حەرفی‌یەکەی کە ئەوەیان پێ‌ناخۆش بێت کە لە شوێنێکی نێوان ئەواندا وەحی بۆ هاتبێت؟!

هەروەها لە فەرموودەی پێغەمبەریشدا (ﷺ) نموونەمان هەیە کە پشگیری ئەوە بکات کە لە پوختەی پشتی مرۆڤەوە کۆرپەلەکەی دروست دەبێت، وەك ئەو فەرموودە بەناوبانگەی کە دەربارەی بێباوەڕانی مەککە کە ئازاریان دەدا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ﴿بَل أَرْجُو أَن يُخْرِجَ اللهُ مِن أَصْلابِهِم مَن يَعْبُدُ اللهَ وَحْدَهُ لا يُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا﴾ متفق عليه، واتە: من ئومێدم وەهایە کە لە پشتی ئەمانەوە خوای گەورە نەوەیەك دروست بکات و دەربهێنێت کە پەروەردگار بپەرستن و هاوەڵی بۆ دانەنێن.

کەواتە پوختەی ئەم رایانە دەگەینە ئەوەی کە (الصلب والترائب) وەك سەرچاوەیەکی حەقیقی دیاری کراوە بۆ ئەو ئاوەی کە کۆرپەلەی مرۆڤی لێوە دروست دەبێت، و لە پوختەیەکی ئەم دووانەوەیە کە ئاوەکە دروست دەبێت، ئەمە رای زۆرێك لە موفەسیرە پێشینەکانە وەك لە (الحسن البصري)یەوە دەگێڕنەوە (کە القرطبي لە تەفسیرەکەی‌دا ئەم رایەی هێناوە) وتوویەتی: ئەم ئاوە لە پشت و پەراسووی پیاو و پشت و پەراسووی ئافرەتەوە دەردەچێت..... کە (الآلوسي)یش لە تەفسیرەکەی‌دا هەمان رای هەیە.

لێرەدا تووشی کێشەیەکی تر دەبینەوە کە ئێمە ئەمڕۆ دەزانین و زانستی نوێ بۆی سەلماندووین کە ئاوی پیاو لە گونەکانەوە، و ئاوی ئافرەتیش لە هێلکەدانەکانەوە دروست دەبن، نەك ئەوەی لە (الصلب والترائب)ەوە دەربهێنرێن و پوختە بکرێن، کەواتە دەبێت هەردوو ووشەی (الصلب والترائب) وەك نموونە و نوێنەرێك (کِنایة) هێنرابێنەوە بۆ شتێکی گەورەتر کە هەموو مرۆڤ خۆیەتی، واتە لەبری لەشی ئادەمیزاد هەمووی.

ئەمەش رایەکە کە هەندێك لە زانایان و موفەسیران بە ووردبینی و دووربینی خۆیان پێی گەیشتوون، لەوانە (شێخ محمد عەبدە) لە (تەفسیری جزمی عمّ)دا دەڵێت: {(الصلب) وەك نموونە هێنراوەتەوە و مەبەست پێی پیاوە، و (الترائب)یش مەبەست پێی ئافرەتە} واتە هەموو مرۆڤەکەیە، هەروەها (شێخ حەسەنێن مەخلوف) لە تەفسیرەکەیدا (صفوة البيان لمعاني القرآن) دەڵێت: (الصلب والترائب) لەبری هەموو لەش بەکارهێنراوە، و دەرچوونی ئاوی دەرپەڕیو لەنێوان پشت و پەراسووی هەریەك لە ئافرەت و پیاو مەبەست پێی ئەوەیە کە ئەندامەکان و هێزەکانی لەشی هەردووکیان بەشداری دەکەن و هاوکاری دەکەن لە دروست کردنی ئەو ئاوەی کە سەرچاوەی زاووزێی مرۆڤە.

لەلایەکی ترەوە ئێمە ئێستا دەزانین کە نهێنی دروست بوونی مرۆڤ و شیفرەی پێکهاتنی لە ماددەی بۆماوەیی و جینەکانی سەر کرۆمۆسۆمەکاندایە، کەواتە دەتوانین بڵێین: کرۆمۆسۆمەکان تەعبیر لە هەموو لەشی مرۆڤەکان (بە پیاو و ئافرەتەوە) دەکەن، و مەبەستی ئایەتە پیرۆزەکە لە (الصلب والترائب)دا بریتی‌یە لە (کرۆمۆسۆمەکان)، کەواتە مانای ئایەتەکە بەم جۆرەی لێدێت: مرۆڤ لە ئاوێکەوە دروست دەبێت (لە پیاو و ئافرەتدا) کە پوختە دەکرێت و دەردەهێنرێت لە کرۆمۆسۆمەکانی‌یەوە (بڕوانە وێنەی: ٢٣/هـ).




وێنەی (٣-١٥)

کرۆمۆسۆمەکان کە شیفرەی پێکهێنانی هەموو ئەندامەکانی مرۆڤی تێدایە، ئەگەر یەکێکیان بکەینەوە دەبینین لە دوو شریتی (DNA) پێچاوپێچ و خولخواردووی بەدەوری یەکدا پێکدێن

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە: ئەگەر مەبەستی پەروەردگار لە (الصلب والترائب) ئەمە بووایە ئەی بۆ بە ئاشکرا ئەمەی نەفەرمووە خۆ پەروەرگار ئاگادار و زانایە بە هەموو شتێك؟! ئێمەش دەڵێین لە زەمانی هاتنە خوارەوەی قورئاندا ماددەی بۆماوەیی و کرۆمۆسۆمەکان بە هیچ شێوەیەك نەبیسترابوون و نەزانرابوون، و قورئان بە شێوەیەك هاتۆتە خوارەوە کە هەموو کەسێك لێی تێبگات، بۆیە هێنانی زاراوەی وەك (کرۆمۆسۆمەکان) شتێکی بەجێ نەبووە بۆ ئەو سەردەمە، و خەڵکی ئامادە نەبوون بۆ زانینی یاساکانی زاووزێ و بۆماوەزانی کە پاشان پەردە لەسەریان هەڵماڵرا.

نموونە لەسەر بەکارهێنانی لەبری (کنایة) لە قورئاندا زۆرە، ئەوەتا خوای گەورە هەر لە ئایەتەکانی کۆرپەلەزانیدا چەندین ناوی تری هێناوە بۆ ناساندنی قۆناغەکانی گەشە کردنی کۆرپەلە وەك (نطفة: کە بریتییە لە تنۆکێك ئاو کە وەسفی سەرەتای کۆرپەلەی پێکراوە، علقة: واتە پارچەیەك خوێنی هەڵواسراو و ناوی کرمێکیشە کە وەسفی قۆناغێکی تری پێکراوە، لە هەمووی دیارتر بریتییە لە ووشەی (مضغة) کە پێشتر لە زمانی عەرەبیدا نەزانراوە و بە مانای پارچەیەك گۆشتی جووراو دێت کە ئەمیش قۆناغێکی تایبەتی گەشەی کۆرپەلەی پێوەسف کراوە ....)، دەتوانین بڵێین هەردوو ووشەی (الصلب والترائب)یش بەکارهێنراون بۆ ناونانی شتێك کە پێشتر نەزانراوە (واتە کرۆمۆسۆمەکان) و ناوی هاوشێوەی نەبووە.

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبیش لە مانای (الصلب)دا پشتگیریمان دەست دەکەوێت بۆ ئەم بۆچوونە، یەکێك لە خوێندنەوەکانی ووشەی (الصُلْبْ) لە قورئاندا بریتییە لە (الصُلُب) کە بریتییە لە خاچەکان کە کۆی (خاچ)ە یان هەر شتێك کە لە دوو هێڵی یەکتربڕی ئەستوون پێك بێت (†)،

کە ئەگەر بڕوانینە وێنە کرۆمۆسۆمەکان دەبینین بە تەواوەتی لە شێوەی (الصُلب)دان واتە لە دوو هێڵی یەکتربڕ پێکهاتوون (**بڕوانە وێنەی ٣-١٥**)، هەروەها ووشەی (الصُّلْب) لە زمانی عەرەبیدا مەبەست پێی بنچینە و بنەڕەتی شتێکە (الأصل واللب والجوهر)، وەك عەرەب دەڵێن (لندخل في صلب الموضوع) واتە: بابچینە بنچ و بنەوانی بابەتەکەوە، بنچینە و بنچ وبنەوانی مرۆڤیش لەناو کرۆمۆسۆمەکاندایە.

کەواتە بە کورتی رای (د. داود سلمان السعدي) ئەوەیە کە مەبەستی پەروەردگار لە ئایەتی (يَخْرُجُ مِن بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ) ئەوەیە کە بنچینەی مرۆڤ لە پاڵفتەیەکی پشت و پەراسووەکانەوە دەردەچێت و مەبەست لە ووشەکانی (الصُّلْبِ وَالتَّرَائِب) کە وەك (کنایە) بەکارهاتوون بریتییە لە کرۆمۆسۆمەکان، کەواتە ئەو ئاوەی کە دەردەچێت و بنچینەی مرۆڤە بە هۆی کرۆمۆسۆمەکانەوە دەرچووە.

کرۆمۆسۆمەکانیش بریتین لەو دروستکراوە سەمەرە و عەجیبانەی کە نهێنی دروست بوونی مرۆڤ و هەموو سیفاتەکانی تێدایە، و لە چەند یەکەیەکی بۆماوەیی پێکهاتوون کە پێیان دەووترێت جینەکان، و لە هەموو ٤٦ کرۆمۆسۆمەکەی پێکهێنەری خانەکانی لەشدا نزیکەی ٣ ملیار جین هەیە کە هەر یەکەیان تایبەتە بە سیفەتێك و ووردەکارییەکی لەش یان نەخۆشییەکی دیاری کراو، وەك ووتمان لە هەموو خانەیەکی لەشدا ٤٦ کرۆمۆسۆم هەیە، زانایان دەڵێن ئەگەر بێتو پێچاوپێچی و لوول خواردنی ئەم کرۆمۆسۆمانەی هەموو خانەکانی لەش بکەینەوە و بیاندەین لەیەك، ئەوا درێژییەکەیان دەگاتە ٦ × ١,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠ مەتر، کە دەکاتە ماوەی ٨,٠٠٠ جار چوون و هاتن لە نێوان زەوی و مانگدا!!.

**لەهەموو ئاوەکەوە ( نطفة )کەوە کۆرپەلە دروست نابێت :**

- خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن سُلَالَةٍ مِّن طِينٍ﴾ (المؤمنون)، **السلالة: بمعنى الخلاصة المستخلصة**. واتە: ئێمە مرۆڤمان لە پوختەیەکی پاڵفتە کراوەوە دروست کردووە کە سەرچاوەی سەرەکی یەکەم جاری لە گڵەوە بووە، هەروەها لە ئایەتێکی پیرۆزی تریشدا دەفەرموێت: ﴿الَّذِي أَحْسَنَ كُلَّ شَيْءٍ خَلَقَهُ وَبَدَأَ خَلْقَ الْإِنسَانِ مِن طِينٍ، ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُ مِن سُلَالَةٍ مِّن مَّاءٍ مَّهِينٍ﴾ (السجدة:٧-٨)، واتە: ئەو پەروەردگارە هەموو شتێکی بە ووردەکاری تەواوەوە دروست کردووە و مرۆڤیشی یەکەم جار (**واتە ئادەمی باوکی مرۆڤەکان**) لە سەرەتاوە لە گڵ دروست کرد و پاشانیش نەوەکانی لە پوختەیەکی ئاوێکی کەمەوە دروست دەکات (کە مەبەستی ئاوی پیاو و ئافرەتە)، ئەو پیتی (مِّن)ەی لە ئایەتەکەدا هەیە زانایانی زمانەوانی دەڵێن بۆ (تبعیض)ە واتە بۆ بەش کردنە کەواتە مەبەستی دەستەواژەی (مِّن مَّاءٍ مَّهِينٍ) ئەوەیە: (لە بەشێکی ئاوە کەمەکەوە دروست دەبێت).



وێنەی (٢-١٦)
ئەم هێڵکارییە گەشە کردنی سپێرم بە پێی تەمەن لە نێرینەدا روون دەکاتەوە

بەهۆی یەکگرتنی تۆوی پیاو و هێلکەی پێگەیشتووی ئافرەتەوە هێلکەی پیتێنراو (زایگۆت Zygote) یان کۆرپەلە دروست دەبێت، بەڵام با باش بزانین تەنها لە یەك تۆوی پیاو

(یەك سپێرم) و یەك هێلکۆکەی ئافرەتەوە ئەو کۆرپەلەیە دروست دەبێت، ئەمە راستی‌یەکی زانستی سەلمێنراوە لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا، کە دەبینین پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرموودەیەکی پیرۆزی‌دا هەمان راستی دووپات کردووەتەوە کە دەفەرموێت: ﴿مَا مِنْ كُلِّ الْمَاءِ يَكُـونُ الوَلَـدُ﴾ (رواه مسلم ٢-١٠٦٤). واتە: لە هەموو ئاوی پیاوەوە منداڵ دروست نابێت (کەواتە لە بەشێکی ئاوەکەوە کۆرپەلە دروست دەبێت).

گون

بەشێکی لوولەی تۆو (سپێرم)

The seminiferous tubules. (a) A sagittal section of a testis and (b) a transverse section of a seminiferous tubule

وێنەی (٣-١٧)
لەم کارگە بێووچانەدا رۆژانە بە ملیۆنەها سپێرم بەرهەم دێت!!

لەناو ٥ ملیۆن لەم سپێرمانەدا تەنها یەك دانە چانسی ئەوەی هەیە لەگەڵ هێلکۆکەکەدا یەکبگرێت و زایگۆت دروست بکەن!!

پاك و بێگەردی بۆ پەروەردگار و پێغەمبەرە بەڕێزە راستگۆ و دەست پاکەکەی، زانستی نوێ سەلماندوویەتی کە لەهەموو ١سم٣ لە ئاوی پیاودا نزیکەی ٨٠-١٢٠ملیۆن تۆو(سپێرم)هەیە، واتە هەموو پیاوێك لەکاتی کارێکی جنسیدا نزیکەی ٥٠٠ملیۆن تۆوی دەبێت، کە لەناو ئەم هەمووەدا تەنها یەك دانەیان هەلی هەیە بۆ ئەوەی کە لەگەڵ هێلکەکەدا یەکبگرێت و هێلکەی پیتێنراو (Zygote) دروست بکات، کە ئەم پیتاندنە لە سەرەتای بۆری هێلکەدان (Fallopian Tube)دا روودەدات (**وێنەکانی ژمارەی ٣-١٦ ، ٣-١٧**)، کەواتە لە هەموو ئاوی پیاوەکەوە کۆرپەلە دروست نابێت.

هەروەها لە ئافرەتیشدا هەموو مانگێك هەزاران هێلکۆکە چالاك دەبن لە هەردوو هێلکەدانی ئافرەتدا و لەناو هەموویاندا تەنها یەك دانەیان پێدەگات و هێلکەی پێگەیشتووی لێدروست دەبێت (**وێنەی ٣-١٨**)، ئەوانی تر دەپووکێنەوە و ئەم هێلکە پێگەیشتووە دەتەقێتە ناو بۆشایی سك، و پاشان دەچێتە ناو سەرەتای بۆری

هێلکەدانەکان لە ئافرەتدا

Cervix
Vagina
Endometrium
Germinal epithelium
Primordial follicle
Interstitial cell mass
Antral follicle
Theca externa
Theca interna
Granulosa
Follicular fluid
Ovarian stroma
Mature follicle
Antrum
Blood vessels
Corpus albicans
Corpus hemorrhagicum
Ovulated oocyte
Regressing corpus luteum
Mature corpus luteum
Young corpus luteum
Atretic follicle

**وێنەی (٣-١٨)**

لەناو هەزاران هێلکۆکە کە هەموو مانگێك چالاك دەبن تەنها یەك دانەیان چانسی ئەوەی هەیە پێبگات و دەرپەڕێتە سەرەتای بۆری مناڵدان

منالـّدان، و بـە بـوونی تـۆو یـەکگرتن لـە نێوانیانـدا روودەدات و هێلکـەی پیتێنـراو، پاشانیش کۆرپەلـە دروسـت دەبێـت، کـە تـەنها یـەك تـۆو بـۆ ئـەم کرداره پێویستە، دوایـی کۆرپەلەکـە دەچێتە نـاو منالّـدان و جێگیر دەبێـت، بەڕاسـتی پێغەمبـەری خـودا راسـتی فـەرمووه کـە: لـە بەشـێکی ئـاوی پیـاو هەروەها بەشێکی ئاوی ئافرەتیش منداڵ دروست دەبێت.

- ئایـەتێکی پـیرۆزی قورئـانیش هـەمان راسـتی بـاس کـردووە کـە دەفەرموێت: ﴿أَيَحْسَبُ الْإِنسَانُ أَن يُتْرَكَ سُدًى، أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ يُمْنَى، ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّى، فَجَعَلَ مِنْهُ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْأُنثَى، أَلَيْسَ ذَلِكَ بِقَادِرٍ عَلَى أَن يُحْيِيَ الْمَـــــوْتَى﴾ (القيامـة: ٣٦-٤٠)، واتـە: ئایـا ئـادەمیزاد وادەزانێـت هـەروا وازی لێدەهێنرێت بەخۆڕایی (واته لێپرسینەوەی نابێت)؟! باشـە، ئایا کـاتی خـۆی نوتفەیەك نـەبووه لـە بەشـێکی مەنی‌یـەوه کـە دەڕژێنرایـە شـوێنی خـۆی (واتـە ئایا ئـەو لەسـەرەتاوه کـە دروسـتمان کـرد بەشـێکی تنۆکێـك ئـاو نـەبووه)، کـە ئەندازەمان بۆ داناو تقدیر مان کرد، لەم ئایەتە پیرۆزەدا سیّ موعجیزه هەیە کە یەکەمیان وەکو باسمان کرد دەفەرموێت (نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ) واتە نوتفەیەك بووه کـە لـە بەشـێکی تـۆو(مـەنی)یـەوه دروسـت دەبێـت، هـەروەك پێشـتر ئامـاژەمـان پێدا ئەو پیتـی (مِّـــنْ)ەی لـە ئایەتەکەدا هەیـە زانایانی زمانـەوانی دەڵێن بـۆ (تبعيض)ە واتە بۆ بەش کردنە، کەواتە لە بەشێکی مەنی‌یەکەوه دەبێت.

ووشـەی (مَنِيّ) وەك لـە فەرهەنگـەکانی زمـانی عـەرەبی‌دا هـاتووه بـە مانـای (القَدر) واتە ئەندازه هاتووه، (تَمَنَّيْت الشَّيء أي قَدَّرْته، واستَمْنَى أي استدعى خروج المني) واتە (تَمَنَّيْت) بەمانای: ئەندازەم بۆ دانا دێت هەروەها بە مانای دەرهێنانیش دێت[1]، کەواتە مانای ووشەی (يُمْنَى) لە ئایەتەکەدا دەبێتە: (تُقَـدَّر)، واتـە بنچینەی مـرۆڤ لـە بەشـێکی تنۆکێـك ئـاوەوه دەبێـت کـە کاتێـك دەردەچێـت ئەندازەی بۆ دادەنرێت (بۆ روونکردنەوه بڕوانە وێنە رەنگاورەنگەکانی: ٢٤/ ﻫ ، ٢٥/ ﻫ).

---

[1] بڕوانە فەرهەنگی (لسان العرب)، لەژێر بابەتی (مني).

ئیعجازی دووەم هەروەك پێشتریش باسمان کرد دەفەرموێت منداڵ بەرهەمی هەردوو دایك و باوکە، ئیعجازی سێیەم لەئایەتی (٣٩)دایە کە دەفەرموێت: ﴿فَجَعَلَ مِنْهُ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْأُنثَى﴾، دەفەرموێت ئێمە هەر لەو تۆوەی پیاوەوە نێر و مێی کۆرپەلەکە دیاری دەکەین، کە ئەو هائەی لەووشەی (منه)دایە دەگەڕێتەوە بۆ ووشەی (مني) واتە بە دڵنیاییەوە بزانن کە: نێر و مێی کۆرپەلە بەهۆی (مەنی) واتە تۆوی پیاوەوە (سپێرمەکانەوە) دیاری دەکرێت.

ئەم راستییە زانستییە زۆر نوێیە و زانستی کۆرپەلەزانی بۆی دەرکەوتووە کە لە مرۆڤدا دوو جۆر کرۆمۆسۆمی جنسی هەیە (کرۆمۆسۆمەکان بریتین لەو تەنۆلکانەی کە هەموو سیفاتەکانی بۆماوەیی مرۆڤیان تێدایە و لەهەموو خانەکانی لەشدا هەن لەناو ناووکی خانەکەدا، و دوو جۆریان هەیە: (کرۆمۆسۆمی لەشیی و کرۆمۆسۆمی جینسی))، لە هەموو خانەیەکی ئاسایی لەشدا ژمارەی ئەم کرۆمۆسۆمانە بریتییە لە ٤٦دانە، یان ٢٣جووت، کە ٢٢جووتیان کرۆمۆسۆمی لەشین و یەك جووتیان بریتین لە کرۆمۆسۆمی جینسی.

لە کاتی دروست بوون و جیابوونەوەی خانەکانی زاووزێدا (کە بریتین لە تۆوەکان لە گوندا لەپیاودا، و هیلکۆکەکان لە هێلکەدانەکانی ئافرەتدا) بینراوە خانەکانی زاووزێی پیاو کە لە گوندا دابەش دەبن و جیادەبنەوە، و سەرەنجام تۆو(سپێرم) دروست دەکەن، لە کاتی ئەم کردارەدا جۆرە دابەش بوونێکی تایبەت تێیاندا روودەدات کە پێی دەووترێت کەمە دابەش بوون (Meiosis) کە لەم پرۆسەیەدا ژمارەی کرۆمۆسۆمەکان دەبێت بە نیوەی ژمارەی ئاسایی (واتە ٢٣دانە)، و لەبەر ئەوەی خانەی ئاسایی لە پیاودا دوو جۆر کرۆمۆسۆمی جنسی تێدایە (X,Y)، بەهۆی کەمە دابەش بوونەوە ئەم

جووتە کرۆمۆسۆمە جنسییەش جیادەبنەوە و هەر سپێرمێك یەك دانەیان وەردەگرێت، واتە لە گوندا دووجۆر تۆو(سپێرم) دروست دەبێت جۆرێکیان کرۆمۆسۆمی (Y)ی تێدایە و جۆرەکەی تریان کرۆمۆسۆمی (X)ی تێدایە.

بەڵام لە ئافرەتدا تەنها یەك جۆر کرۆمۆسۆمی جنسی هەیە، کە لە خانە ئاساییەکانیدا جووتە کرۆمۆسۆمە جنسییەکەیان بریتییە لە (XX)، کەواتە ئەو هێلکۆکانەی لە هێلکەدانەکاندا بەهۆی کەمە دابەش بوونەوە دروست دەبن تەنها لە جۆری (X) کرۆمۆسۆمی جنسییان هەیە، چونکە هەر دانەیەکیان دەچێت بۆ خانەیەك (بڕوانە وێنەی ٢-١٩)، واتە ئەو هێلکۆکانەی لەناو هێلکەدانەکاندا دروست دەبن تەنها لە جۆری (X) کرۆمۆسۆمی جنسییان هەیە.

هەربۆیە کاتێك سپێرمێك کە هەڵگری کرۆمۆسۆمی (Y) بێت لەگەڵ هێلکەیەکدا کە تەنها هەڵگری کرۆمۆسۆمی (X)ن یەکبگرێت ئەوا ئەو هێلکە پیتێنراوە و پاشانیش کۆرپەلەکە

وێنەی (٢-١٩)

هێلکە و سپێرم لە کاتی گەشە کردنیاندا تووشی کەمە دابەش بوون دەبن و نیوەی ژمارەی کرۆمـۆ سۆمەکانی مرۆڤ هەڵدەگرن دوو جۆر سپێرم دروست دەبێت: سپێرمی هەڵگری کرۆمۆسۆمی نێرینە (Y) و هەڵگری کرۆمۆسۆمی مێینە (X)، یەك جۆر هێلکۆکە دروست دەبێت کە هەمیشە هەڵگری کرۆمۆسۆمی مێینەیە (X).

نێر دەردەچێت (XY)، لە هەمان کاتیشدا ئەگەر سپێرمێك کە کرۆمۆسۆمی (X)ی هەڵگرتووە لەگەڵ هێلکەیەکدا کە هەڵگری (X) بێت یەکبگرێت ئەوا کۆرپەلەکە مێینە دەردەچێت (XX). (**بڕوانە وێنەی ڕەنگاوڕەنگی: ٢٦/ هـ**)

-ئەم ڕاستییە زانستییە لە ئایەتێکی تری قورئاندا هاتووە کە دەفەرموێت: ﴿وَأَنَّهُ خَلَقَ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْأُنثَى، مِن نُّطْفَةٍ إِذَا تُمْنَى﴾ (سورة النجم: ٤٥-٤٦). واتە: هەر ئەو زاتەیە کە دوو جۆری دروست کردووە کە نێر و مێیە، لەو نوتفەیەی (مەنییەی) کە دەردەچێت و لە شوێنی خۆی دادەنرێت، مانای (تُمْنَى): لە ئایەتەکەدا (وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا) لە فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبیدا بریتییە لە (تَخْرُج). کەواتە مانای دروستی ئایەتەکە وای لێدێت: پەروەردگار نێرو مێی مرۆڤ دیاری دەکات لە (مني) واتە لە تۆوی پیاوەوە لە کاتێکدا کە دەردەچێت لە پیاوەوە، ئەمەش دەقاودەق ئەوەیە کە کۆرپەلەزانی ئەمڕۆ لە سەدەی بیستەمدا گەیشتوویەتێ، ئا لێرەدا زیاتر بۆمان دەردەکەوێت کە قورئان و زانستی نوێ هەمیشە یەکدەگرنەوە و بەردەوام هاوئاهەنگی یەکترین.

-هەروەها لە ئایەتێکی تریشدا دەفەرموێت: ﴿مِن نُّطْفَةٍ خَلَقَهُ فَقَدَّرَهُ﴾ (عبس:١٩)، واتە: پەروەردگار مرۆڤی لە (نطفة)وە دروست کردووە و ئەندازەی هەموو شتێکی بۆ دیاری کردووە، کە ئەمانەش هەر لە دیاری کردنی ڕەگەزی کۆرپەلەکەوە دەست پێدەکات، پاشان ئەندازە بۆدانان و دیاری کردنی ڕەنگی قژ، ڕەنگی پێست، درێژی بالای، جۆری خوێن، زیرەکی، هەموو سیفەتەکانی تریش هەر لە تۆی پیاو و هێلکەی ئافرەتەکەوە (کە ئەو نطفةیە و پاشانیش کۆرپەلەکە دروست دەکەن) بۆ منداڵەکە دەگوێزرێتەوە، بەهۆی کرۆمۆسۆمەکانەوە، کە وەك باسمان کرد ئەم کرۆمۆسۆمانە و جینەکانی سەریان بەهۆی ترشەلۆکە ناووکییەکانەوە (DNA) (کە شیفرەی دروست

کردنـی ئـەو سـیفاتانەیان تێدایـە)، لـە دواڕۆژدا ئـەو سیفاتانە بۆ منداڵەکـە دروست دەکەن.

پـاك و بێگــەردی بـۆ ئـەو خودایــەی کـە بەدیهێنــەر و راگــری ئـەم ووردەکاری‌یەیە لە دروست بوونی مرۆڤدا.

## هۆکاری نێرینەیی یان مێینەیی کۆرپەلەکە:

دەربـارەی هۆکـاری دەرچـوونی رەگـەزی کۆرپەلەکە کە ئایا نێـر یـان مـێ دەبێت، و رۆڵی ئاوی پیـاو و ئـافرەت لـەم کردارەدا فەرموودەیـەکی پێغەمبـەر (ﷺ) هەیـە کـە دەفـەرموێت: ﴿عَنْ أَبُو أَسْمَاءَ الرَّحَبِيُّ أَنَّ ثَوْبَانَ مَوْلَى رَسُـــولِ اللَّـــهِ (ﷺ) حَدَّثَهُ قَالَ: كُنْتُ قَائماً عِنْدَ رَسُولِ اللَّه (ﷺ) فَجَاءَ حَبْرٌ مِنْ أَحْبَارِ الْيَهُودِ فَقَـــالَ السَّلاَمُ عَلَيْكَ يَا مُحَمَّدُ .... قَالَ: وَجِئْتُ أَسْأَلُكَ عَنْ شَيْءٍ لاَ يَعْلَمُهُ أَحَدٌ مِنْ أَهْلِ الأَرْضِ إلاَّ نَبِيٌّ أَوْ رَجُلٌ أَوْ رَجُلاَنِ . قَالَ: « يَنْفَعُكَ إِنْ حَدَّثْتُكَ ». قَالَ: أَسْمَعُ بِأُذُنَيَّ . قَـــالَ: جِئْتُ أَسْأَلُكَ عَنِ الْوَلَدِ، قَالَ: «مَاءُ الرَّجُلِ أَبْيَضُ وَمَاءُ الْمَرْأَةِ أَصْفَرُ فَإِذَا اجْتَمَعَا فَعَلاَ مَنِيُّ الرَّجُلِ مَنِيَّ الْمَرْأَةِ أَذْكَرَا بِإِذْنِ اللَّهِ وَإِذَا عَلاَ مَنِيُّ الْمَرْأَةِ مَنِيَّ الرَّجُلِ آنَثَا بِـــإِذْنِ اللَّـــهِ». قَالَ: الْيَهُودِيُّ لَقَدْ صَدَقْتَ وَإِنَّكَ لَنَبِيٌّ ثُمَّ انْصَرَفَ فَذَهَبَ . فَقَالَ: رَسُولُ اللَّـــهِ (ﷺ): «لَقَدْ سَأَلَنِى هَذَا عَنِ الَّذِى سَأَلَنِى عَنْهُ وَمَا لِى عِلْمٌ بِشَىْءٍ مِنْهُ حَتَّى أَتَانِيَ اللَّهُ بِهِ»﴾ رواه مسلم، واتە: رۆژێك یەکێك لە زاناکانی جوولەکە هات بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) و ووتی: سەلامی خوات لێبێت ئەی محمد..... دوایی ووتی: هاتووم پرسیاری شتێکت لێبکـەم کـە هـیچ کەسـێکی سـەر زەوی (لـەو رۆژگـارەدا) نایزانێـت مەگـەر پێغەمبەر بێت یان یـەك دوو کەسـێکی تـر بیـزانن! پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: ئایـا تـۆ سـوودی لێدەبینیـت کـە مـن وەلامـت بدەمـەوە؟ ئـەویش ووتـی: بـەڵێ ئەگەر بە گوێی خۆم بیبیستم، پاشان ووتی: هاتووم پرسیاری منداڵت لێبکەم (لەسکی دایکی‌دا)، پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمووی: ئاوی پیـاو رەنگـی سپی‌یە و ئاوی ئافرەت رەنگی زەردە هەرکاتێك کە کۆ بوونەوە و ئاوی پیـاو سـەرکەوت

بەسەر ئاوی ئافرەتەکەدا ئەوا منالەکە نێرینە دەردەچێت، هەرکاتێکیش ئاوی ئافرەتەکە زاڵ بوو و سەرکەوت ئەوا منالەکە مێینە دەردەچێت، دوای ئەمە جوولەکەکە ووتی: بەڕاستی تۆ تەواو راستت ووت و من شایەتی دەدەم کە تۆ پێغەمبەری و ئیتر رۆی، پاشان پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەم کەسە کە ئەو پرسیارەی لێکردم من هیچ زانیاریەکەم نەبوو دەربارەی ئەو پرسیارەی، کە یەکسەر خوای گەورە ئەو زانیاری‌یەی پێدام و فێری کردم.

ئەو کردارە سەرەکی‌یەی لە فەرموودەکەدا راڤە و باسی دەرچوونی نێرینەیی یان مێینەیی کۆرپەلەکە دەکات بریتی‌یە لە ووشەی (عَلاَ)، کە ئەم کردارە چەند مانایەکی هەیە لەوانە:

١- بەمانای زاڵ بوو یان سەرکەوت (غَلَبَ)، لە فەرهەنگی (تاج العروس)دا هاتووە: (عَلَوتُ الرَّجُلَ: غَلَبْتُهُ) واتە بەسەر ئەو کەسەدا زاڵ بووم.

٢- بەمانای ئەوەی شتێك بچێتە سەر شتێکی تر و بەسەریدا سەرکەوێت، هەر لە ((تاج العروس)دا هاتووە: (وَعَلاهُ: ... (صَعِدَهُ) جَبَلاً كانَ أو دابّة) بەسەریدا سەرکەوت جا شاخ بێت یان ووڵاخ.

کەواتە ئەو مانایەی لە فەرموودەکەوە تێدەگەین بریتی‌یە لەوەی کە یەکێك لەم ئاوانە دەچێتە سەر ئەوی تر و زاڵ دەبێت، ئێستا بابزانین زانستی نوێ لەم بارەیەوە چی دەڵێت:

گۆڤاری زانستی (Zygote) لە ژمارەی مانگی ٢ی ساڵی ١٩٩٩دا بابەتێکی بۆ توێژەرەوە گیتیرێزا (Guitierreza) و هاوەڵەکانی بڵاو کردەوە کە تێیدا: سەلماندی توانای ئەو سپێرمانەی کە کرۆمۆسۆمی نێرینە (Y) یان کرۆمۆسۆمی مێینە (X)یان هەڵگرتووە بۆ پیتاندنی هێلکەکە پشت دەبەستێت بە کاتی دەرچوونی (ئاوەکە) مەنی‌یەکە، و کاتی دەرچوون و پێگەیشتنی هێلکەکە، و هەروەها بە فاکتەرە فیسیۆلۆجی‌یە ناوخۆیی‌یە

جۆراوجۆرەکان و فاکتەرە ژینگەیی‌یەکان، کە یەکگرتنی جۆرێکیان لەگەڵ هێلکەکەدا زاڵ دەکات، بۆ نموونە گۆڤاری زانستیی (New Scientest) لە ژمارەی رۆژی (١٩٩٩/٧/٢٤)دا باسی ئەوە دەکات کە جووت بوون لە رۆژی گەرمدا بە زۆری کۆرپەلەی نێرینەی لێدەکەوێتەوە، بەڵام لە کاتی سەرمادا مێینەی لێدەکەوێتەوە، کە بەوەی لێکداوەتەوە سپێرمە نێرینەکان زیاتر بەرگەی گەرمی دەگرن، هەربۆیە بینراوە دوای شەپۆلە ساردە زۆرەکان زیاتر کۆرپەلەی مێینە لەدایك دەبێت {ئەم ئەنجامانە بە پشت بەستن بە توێژینەوەیەکی تازە لەدایك بووان لە وڵاتی ئەڵمانیا لە نێوان ساڵەکانی (١٩٦٤-١٩٩٥)دا دەرهێنرا}.

لەلایەکی ترەوە زانراوە کە دەردراوی رێڕەوی زاووزێی ئافرەت سیفەتی ترشی هەیە، ئەویش بەهۆی بوونی ترشی لاکتیك (Lactic Acid) تێیدا، کە لە خانەکانی رێڕەوی زاووزێوە دەڕێژرێن کە دەوڵەمەندن بە ماددەی گلایکۆجین (Glycogen)، ئەم ترشی‌یە زۆر گرنگە ئەویش بۆ پاراستنی ئافرەت لە هێرشی میکرۆب و هەوکردن، بەڵام لە هەمان کاتدا ئەم ترشی‌یە زۆرێك لەو سپێرمانەی کە هەڵگری کرۆمۆسۆمی نێرینە (Y)ن دەکوژێت یان لاواز دەکات، ئەویش بەهۆی بچووکی قەبارەیانەوە بە بەراورد لەگەڵ ئەو سپێرمانەی کە هەڵگری کرۆمۆسۆمی مێینە (X)ن و دەتوانن بەرەنگاری ئەو ترشی‌یە ببنەوە.

ئەوەی کە یارمەتی سپێرمەکانی (Y) دەدات بۆ رزگار بوون لەم بارە ناهەموارە ڕژانی دەردراوی زاووزێی ئافرەتە لە مناڵدان و ملی مناڵدانەوە کە ئەم ئاوە تفتە و دەبێتە هۆی هاوسەنگ کردنی ترشی‌یەکەی رێڕەوی زاووزێ، و بەهۆی ئەمەوە سپێرمەکانی (Y) رزگاریان دەبێت و دەگەنە ناو مناڵدان و بۆری مناڵدان، ئەم ئاوەش بەهۆی وورووژانی جنسی ئافرەتەوە دەردەدرێت.

لێرەوە بینراوە کە ئەگەر پیاو لەگەڵ خێزانەکەی جووت ببێت پێش ئەوەی کە بە تەواوەتی لەرووی جنسییەوە ئامادە بێت و ئەو ئاوەی ئافرەت برژێت، ئەوا ئاوی پیاو کە دەچێتە ناو ڕێڕەوی زاووزێی ئافرەتەوە تووشی ئەو دەوروبەرە ترشە دەبێت و زوربەی سپێرمەکانی (Y) لەناو دەچن و لێرەوە چانسی دروست بوونی کۆرپەلەیەکی نێرینە زۆر لاواز دەبێت، کە پاش ئەم لەناوچوونەی سپێرمەکانی (Y) ئینجا ئاوی ئافرەت دەڕێژرێت بەسەر سپێرمەکاندا و لێرەوە ئاوی ئافرەت زاڵ دەبێت و کۆرپەلەکە بەزۆریی مێینە دەردەچێت، کەواتە لەم حاڵەتەدا یەکەم جار ئاوی پیاو دەڕێژرێت و پاشان ئاوی ئافرەت بەسەریدا دەڕێژرێت و زاڵ دەبێت و ئەمە دەبێتە هۆی دروست بوونی کۆرپەلەی مێینە.




لە حاڵەتە پێچەوانەکەشدا ئەگەر بێتو ئافرەتەکە پێشتر بورووژێنرێت لەڕوی جنسییەوە و ببێتە هۆی ڕژانی ئاوی ئافرەت لە مناڵدان و ملی مناڵدانەوە ئەمە دەبێتە هۆی هاوسەنگ بوونی ڕێڕەوی زاووزێی ئافرەت، کە ئەگەر دوای ئەمە ئاو پیاوەکە بڕژێتە ناو ڕێڕەوی مناڵبوونی ئافرەتەکەوە ئەوا زوربەی سپێرمەکانی (Y) ڕزگاریان دەبێت و لەناو ناچن و دەتوانن گەشتەکەیان تەواو بکەن بۆ گەیشتن بە هێلکەکە و پیتاندنی، کەواتە لەم حاڵەتەدا ئاوی پیاو زاڵ دەبێت چونکە پێشتر ئاوی ئافرەت دەڕێژرێت و

دواتر ئاوی پیاو بەسەریدا دەڕێژرێت، هەربۆیە چانسی منالەکە بۆ ئەوەی نێرینە دەرچێت بەهێزتر دەبێت چونکە ژمارەیەکی زۆر لە سپێرمەکانی هەلگری کرۆمۆسۆمی نێرینە (Y) رزگاریان دەبێت، و لەبەر ئەوەی ئەم سپێرمانە بچووکترن لە هەلگرەکانی (X) و لەوانیش خێراترن ئەوا چانسیان زیاترە بۆ ئەوەی زووتر بگەن بە هێلکەکە و کۆرپەلەکە نێرینە دەردەچێت.

لەم سالانەی دواییشدا روونکردنەوەیەکی نوێ و فاکتەرێکی یارمەتیدەر بۆ ئەم بابەتە پەیدا بوو کاتێك کە زانایان تاقی کردنەوەیان لەسەر دەردراوەکانی زاووزێ لە ئاژەلدا دەکرد، بینییان لە زۆرێك لە ئاژەلاندا دەردراوی زاووزێی مێینە سیفەتی ترشی هەیە و دەردراوی نێرینە سیفەتی تفتیی هەیە، هەرکاتێك ئەم دوو ئاوە بەیەك بگەن و سیفەتی ئاوی مێینە (کە ترشییە) زال ببێت ئەوا زوربەی تۆوەکانی هەلگری (Y) لەناودەچن بەهۆی کەمیی بەرگرتنیانەوە بۆ ترشی و سپێرمەکانی (X) دەمێننەوە و هێلکەکە دەپیتێنن و کۆرپەلەکە مێینە دەردەچێت.

بە پێچەوانەشەوە ئەگەر ئاوی پیاو زال ببێت کە سیفەتی تفتیی هەیە ئەوا سپێرمەکانی هەلگری (Y) رزگاریان دەبێت و بەهۆی زۆریی چالاکییانەوە ئەمانن کە هێلکەکە دەپیتێنن و کۆرپەلەکە نێرینە دەردەچێت، ئەم تاقی کردنەوەیە لەسەر مانگا کرا لە فەرەنسا و بینییان کە ٧٠٪ سەرکەوتنی بەدەست هێنا بۆ دروست کردنی نێرینە و مێینە.

ئێستا لە جیهاندا رابەری ئەم جۆرە توێژینەوانە پرۆفیسۆرێکی موسولمانی میسرییە بەناوی (د. سعد حافظ) لە ئەمریکا، کە بە دامەزرێنەری زانستێکی نوێ دەناسرێت بەناوی (زانستی نەزۆکی لە پیاواندا Male Infertility)، هەروەها سەرۆکی دوو گۆڤاری زانستییە لە ئەمریکا و خاوەنی ٣٤ کتێبی چاپکراوە، ئەم دکتۆرە ماوەی ١٠سال خەریکی تاقی

کردنەوە و لێکۆڵینەوە بوو لەسەر پەیوەندی نێوان ئاوی پیاو و ئاوی ئافرەت بە بەکارهێنانی ووردبینی ئەلیکترۆنی و کۆمپیوتەر.

ئەوەبوو لە سەرەنجامی هەموو ئەم توێژینەوانەدا گەیشتە سەلماندنی ئەو راستی‌یەی لە فەرموودەکەی سەرەوەدا هاتووە کە ١٠٠٪ راستە، چونکە بۆی دەرکەوت کە ئاوی پیاو تفتە و ئاوی ئافرەت ترشە، هەرکاتێك ئەم دوو ئاوە بگەن بە یەکتری وئاوی ئافرەت زاڵ بێت بەسەر ئاوی پیاودا و ناوەندەکە ببێت بە ترش، ئەوا ئەو سپێرمانەی کە هەڵگری سیفاتی نێرینەن لاواز دەبن، و سپێرمە مێینەیی‌یەکان سەرکەوتوو دەبن لە پیتاندنی هێلکەکەدا و کۆرپەلەکە مێینە دەردەچێت، و بە پێچەوانەشەوە.

ئەم دوو روونکردنەوە زانستی‌یە و فاکتەرانەی کە باسمان کرد و ئێستا لەلایەن زانایانەوە بە تەواوەتی ناسراوە، سەلمێنەرێکی تەواون بۆ ئەو لێکدانەوەیەی کە پێغەمبەر (ﷺ) کردوویەتی بۆ چۆنێتی دەرچوونی کۆرپەلەکە (کە ئایا نێرینە یان مێینە دەبێت)، دوور نی‌یە لە داهاتوودا چەندین فاکتەری تریش بدۆزرێنەوە کە هەموویان گەورەیی و ئیعجازی ووتارەکەی پێغەمبەر (ﷺ) دەردەخەن.

## لە (سلالة)یەکەوە دروست دەبێت:

لە چەند ئایەتێکی قورئاندا باسی (سلالة) کراوە لە کاتی باس کردنی دروست بوونی مرۆڤدا، وەك دەبینین لەم ئایەتانەدا:

- ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن سُلَالَةٍ مِّن طِينٍ﴾ (المؤمنون)، واتە: ئێمە مرۆڤمان لە (سلالة)یەکەوە (پوختەیەکەوە) دروست کردووە کە سەرچاوەی سەرەکی یەکەم جاری لە گڵەوە بووە.

- هەروەها لە ئایەتێکی پیرۆزی تریشدا دەفەرموێت: ﴿الَّذِي أَحْسَنَ كُلَّ شَيْءٍ خَلَقَهُ وَبَدَأَ خَلْقَ الْإِنسَانِ مِن طِينٍ، ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُ مِن سُلَالَةٍ مِّن مَّاءٍ مَّهِينٍ﴾

(السجدة:٧-٨)، واتە: ئەو پەروەردگارە هەموو شتێکی بە چاکی و ووردەکاری تەواوەوە دروست کردووە، و مرۆڤیشی یەکەم جار (واتە ئادەمی باوکی مرۆڤەکان) لە سەرەتاوە لە گڵ دروست کرد، پاشانیش نەوەکانی لە (سلالة)یەکی (پوختەیەکی) ئاوێکی کەمەوە دروست دەکات (کە مەبەستی ئاوی پیاو و ئافرەتە).

ووشەی سلالة لە فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبیدا بە چەند مانایەك هاتووە لەوانە: ١-بمعنى الخلاصة المستخلصة. ٢-إنتزاع الشيء وإخراجه في رفق. ٣-السمكة الطويلة. ٤-الماء القليل. ٥-الخروج من الزحام. ٦-الخروج من مضيق. ٧-السير السريع والسباق.[2]

واتاکانیان: ١- بەمانای پوختەیەکی پاڵفتەکراو. ٢- بەمانای دەرپەڕاندن و دەرهێنانی شتێك بەهێمنی. ٣-بەمانای ماسییەکی درێژ. ٤-ئاوێکی کەم. ٥-دەرچوون لە قەرەباڵغییەوە. ٦-دەرچوون لە شوێنێکی تەسکەوە. ٧-ڕۆیشتن بە خێرایی و پێشبڕکێ کردن، (الماء المهين) کە لێرەدا هاتووە (واتە لە قۆناغی سلالةدا) مانای ئاوی پیاو دەگەیەنێت.

ئەگەر لە ڕووی زانستییەوە سەیری بکەین مانای یەکەمی سلالة کە بریتییە لە پوختەیەك: وەك لە سەرەوە باسمان کرد کە چۆن کۆرپەلەی مرۆڤ لە پوختەیەکی سیفاتەکانی دایك و باوکییەوە دروست دەبێت، زانستی نوێی ئەمڕۆمان سەلماندوویەتی کە لەناو خانەکانی زاووزێی مرۆڤدا (کە بریتین لە تۆوی پیاو و هێلکەی ئافرەت) کرۆمۆسۆم هەیە کە هەڵگری هەموو سیفاتە بۆماوەییەکانن و لە کۆرپەلەکەدا دروستی دەکەن، واتە دەتوانین بڵێین کە ئەو هێلکە پیتێنراوەی لەو دووانەوە دروست دەبێت پوختەیەکی

[2] بڕوانە فەرهەنگەکانی: (لسان العرب)، (القاموس المحيط)، (الصحاح)، (تاج العروس)، لەژێر بابەتی (سَلَّ، سلل).

مرۆڤ و هەموو سیفاتەکانی تێدایە، ئەو هێلکە پیتێنراوە (٤٦) کرۆمۆسۆمی تێدایە (ژمارەی ئاسایی کرۆمۆسۆمەکانی هەموو خانەکانی لەش بریتییە لە ٤٦)، کە بە نیوەیی لە دایك و باوکەوە وەریدەگرێت (هەموو تۆوێك (سپێرمێك)ی پیاو و هێلکەیەکی ئافرەت تەنها ٢٣ کرۆمۆسۆم هەڵدەگرن)، و بە یەکگرتنی ئەو دووانە ژمارەی ئاسایی کرۆمۆسۆمەکانی لەشی ئادەمیزاد دروست دەبێت (واتە ٤٦).

ئەگەر کرۆمۆسۆمێك جیابکەینەوە و بەهۆی ووردبینی ئەلیکترۆنییەوە سەیری بکەین دەبینین شێوەیەکی لوولپێچی هەیە (وێنەی ٢-٢٠)، ئەگەر ئەو شێوە لوولپێچییە بکەینەوە بە شێوەیەکی درێژ دەیبینین کە وەکو پەیژە وایە، کە هەر پلیکانەیەکی ئەم پەیژەیە هەڵگری سیفەتێکی بۆماوەیی تایبەتییە، ئەو خاڵەی کە بەلای رووەمەتتەوەیە و لەدایك و باوکتەوە بۆت ماوەتەوە بزانە کە بەهۆی ئەو کرۆمۆسۆمانەوە بۆت ماوەتەوە، ئا لێرەوە گەیشتینە ئەو راستییەی کە مرۆڤ لە پوختەیەکی ئەو ئاوە (نطفةیە)وە دروست دەبێت، ئەمەش پڕاوپڕی ئەو فەرموودە پیرۆزانەیە کە لە سەرەوە باسکران.

وێنەی (٢-٢٠)
ئەگەر پێچاوپێچی کرۆمۆسۆمێك بکەینەوە دەبینین لە پەیژەیەکی پێچاوپێچ پێکهاتووە (لە دوو ریزی ترشەلۆکی ناووکی)

**مانای دووەم و سێیەم:** وەك باسمان کرد بە تایبەتی ئاوی پیاو دەگرێتەوە، کە لەناو ئاوی پیاودا سپێرم هەیە و بە تەواوەتی ئەم مانایانەی بەسەردا دەچەسپێت، ئەگەر سەیری تۆو(سپێرم)ی پیاو بکەین دەبینین کاتێك کە بە

جووڵەی خۆی لە منالّدانی ئافرەتەوە دەچێتە ناو بۆری منالّدان بۆ ئەوەی لەگەلّ هێلکەکەدا یەکبگرێت، سەرەتا ئەم سپێرمە دەردەهێنرێت بە هێمنی لەناو ئاوی پیاوەکەوە، و بەرگ و ڕووپۆشە پارێزەرەکەی لێدەبێتەوە، و تەنها ناوکی سپێرمەکە دەردەپەڕێتە ناو هێلکەکەوە (**بڕوانە وێنەی ڕەنگاوڕەنگی: ٢٨/ هـ**)، لەهەمان کاتدا سپێرمەکان لەناو چواردەورێکی ئاویدا مەلە دەکەن ئەویش بە یارمەتی کلکە درێژەکەی (هەروەك ماسی ناو رووبار و دەریاکان)، ئەگەر سەیری شکلّی دەرەوەی سپێرمەکە بکەین دەبینین درێژییەکەی زۆر زیاترە لە پانییەکەی، کە درێژییەکەی ٦٪ی میللیمەترێك دەبێت، و درێژی سەرە گەورەکەی تەنیا ٥مایکرۆنە، بەلاّم بەشەکانی تری (بەشی ناوەڕاست و کلکەکەی) بە لاکێشەیی درێژ دەبنەوە و زوربەی درێژی سپێرمەکە پێکدێنن، کەواتە سپێرم کە دەیبینیت بە تەواوەتی نەك تەنها لە ماسی دەچێت بەلّکو پڕاوپڕ لە ماسییەکی درێژ دەچێت (**بڕوانە وێنەی ٣-٢١**) (**هەروەها وێنەی: ٢٩/ هـ**).

هەروەها کرداری دەرهێنان بە هێمنی لە هێلکەی ئافرەتیشدا ڕوودەدات چونکە وەك ووتمان هێلکۆکەکە لە هێلکەداندا لەناو توورەکەیەکدایە کە پڕە لە شلەمەنی، و بەهۆی زیادبوونی پەستانی ئەم شلەیەوە دەردەپەڕێت و لەم بەرگەی دەردەهێنرێت.

**مانای چوارەم:** ئاوێکی کەم: مەبەستیش پێی سپێرم و هێلکۆکەی ئافرەتە، پیتی (مِن) لە ئایەتەکەدا بۆ بەش کردنە، کەواتە مانای ئایەتەکە وای لێدێت: لە بەشێکی ئاوێکی کەمەوە دروست دەبێت، هەمووشمان دەزانین کە بڕی ئاوەکە چەند کەمە، بەلاّم ئەگەر ووردتریش لێی بکۆلّینەوە ئاماژە پڕ لە ئیعجاز و سەرسوڕهێنەرەکەی قورئانمان بۆ دەردەکەوێت، چونکە قەبارەی سپێرم ١\١٠٠ی میللیمەترێکە کە بە ڕاستی زۆر بچووك و کەمە، هەروەها بابزانین زاراوەی (سلالة) مەبەستی لە ئاوی پیاو و ئافرەتیشە.



Figure 1-12. Schematic representation of spermatogenesis in man

## وێنەی ( ٣-٢١ )

ئەم وێنەیە گەشە کردنی سپێرمێك دەردەخات
کە سەرەتا شێوەکەی خڕە و ووردە ووردە درێژ
دەبێتەوە تا دەچێتە سەر شێوەی ماسی‌یەکی
درێژ کە خاوەنی کلکێکی درێژە

سپێرم

کە ئەم وێنانە دەبینین دیمەنێکی
ژێر دەریامان بیر دەکەوێتەوە،
بەلام لەڕاستیدا ئەمانە [illegible]
[illegible]

چونکە ئاشکرایە کە هەردووکیان زەروورن بۆ دروست بوونی کۆرپەلە وەك ئایەتەکانی تر روونیان کردووەتەوە، هەربۆیە ئەم مانایەی (سلالة) زۆر روونتر لە ئاوی ئافرەتدا دەردەکەوێت کە بە ڕاستی زۆر کەمە و نەبینراویشە، کە تیرەی ئەو هێلکەیەی لە هێلکەدانەوە دەردەپەڕێت تەنها ۰,۱۳ی میللیمەترێکە و بڕی ئەو ئاوەی لەگەڵیدا دەردەپەڕێت تەنها ۱۰-۱۵ میللیلیترە، کە ئاشکرایە چەند بڕێکی کەمە، زانینی ئەم راستییە دەربارەی ئاوی ئافرەت لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) مەحاڵ بووە، چونکە تەنها بەهۆی ئامێرە زانستییە پێشکەوتووەکانەوە دەبینرێت و دەپێورێت کە هەزاران ساڵ دوای سەردەمی پێغەمبەر دۆزرانەوە، دیارە تەنها لەرێی نیگای خوداییەوە ئەمە دەزانرێت، کە مەبەستی بووە ئاشکرای بکات کە ئاگادارە لە قەبارەی بچووکی سپێرم و هێلکۆکەکان.

**مانای پێنجەم:** کە بریتییە لە دەرچوون لە قەرەباڵغییەوە، زۆر بە روونی لە ئاوی پیاودا دەردەکەوێت، چونکە وەك پێشتر باسمان کرد بڕی ئاوی پیاو بریتییە لە ۳,۵ میللیلیتر، کە زیاتر لە ۵۰۰ملیۆن سپێرمی تێدایە لەم قەبارە بچووکەدا، کەواتە ئاوەکە زۆر قەرەباڵغە بە سپێرم، هەروەها کاتێك کە سپێرمەکان بەناو ملی منداڵداندا دەڕۆن کە شوێنێکی زۆر تەسکە قەرەباڵغییەکی زۆر روو دەدات لەم سپێرمانە و تەنها کەمێکیان دەتوانن تێپەڕن و بەناو منداڵداندا سەرکەون و بگەنە شوێنی بەیەك گەشتنی منداڵدان و بۆری منداڵدان و سەرکەوتوو ببن لەوەی ئێرە ببڕن و بگەنە بۆری منداڵدان و




وێنەی (۲-۲۲)

دەرچوونی سپێرمەکان لە قەرەباڵغییەوە

پاشانیش تەنها ٥٠٠ دانە دەتوانن گەشتەکە تەواو بکەن و بگەنە هێلکۆکەکە لە سەرەتای بۆری منالْداندا، کە لێرەشدا هەر قەرەبالغی دروست دەکەن چونکە تەنها رێگە بە یەك سپێرم دەدرێت کە بچێتە ناو هێلکۆکەکەوە و بیپیتێنێت (**وێنەی ٣-٢٢**) (**هەروەها وێنەی رەنگاورەنگی: ٣٠/ هـ**).

سەبارەت بە **مانای شەشەم**: کە بریتی‌یە لە: دەرچوون لە شوێنێکی تەسکەوە، ئەمیش لە گەشتی سپێرمەکاندا زۆر بە ئاشکرا دەردەکەوێت، چونکە دەبێت ناوچەی ملی منالْدان (عنق الرحم Cervix) ببڕن کە زۆر تەسکە و درێژی‌یەکەی ٢-٥ میللیمەتر دەبێت، لەژێر کاریگەریی هۆرمۆنی ئیسترۆجین (Estrogen) ئەم ناوچەیە پڕدەبێت لە ماددەیەکی لینج بۆ ئەوەی یارمەتی سپێرمەکان بدات بۆ دەرچوون بەناو ئەم ملەدا، ئالێرەوە قورسی گەشتی سپێرمەکانمان بۆ دەردەکەوێت کە دەبێت بەناو ئەم رێڕەوە تەسکەدا بڕۆن، هەربۆیە زۆریان سەرکەوتوو نابن لە تەواو کردنی گەشتەکەیاندا و لەو پێناوەدا خۆیان بەخت دەکەن (**بڕوانە وێنەی: ٣١/هـ**).

**مانای حەوتەم و کۆتایی**: رۆیشتن بە خێرایی و پێشبڕکێ کردن: هەر لە گەشتی سپێرمەکاندا دەردەکەوێت، چونکە ئەو ماوەیەی کە سپێرمەکان دەیبڕن دەگاتە ١٥-١٨سم تا دەگەنە هێلکۆکەکە، کە بە شێوەیەکی گشتی و لە باری ئاسایی‌دا ئەم گەشتە بە چەند سەعاتێك تەواو دەکەن، بەلاّم بینراوە کە هەندێك سپێرم ئەم گەشتە بە تەنها ٣٠ دەقیقە تەواو دەکەن، کە ئەمە ئەوە دەگەیەنێت خێرایی هەندێك لە سپێرمەکان دەگاتە ٣ملم لە دەقیقەیەکدا، کە ئەم ماوەیە لە درێژی خۆی ٥٠جار زیاترە و تەنها بە یەك دەقیقە دەیبڕێت!!! (**وێنەی ٣-٢٣**).

لێرەدا بڕی خێرایی و پێشبڕکێکەمان بۆ دەردەکەوێت لە نێوان سپێرمەکاندا بۆ ئەوەی دەرکەوێت کە کامەیان چالاکتر و خێراتر بێت هەر ئەوەشیانە کە شەرەفی یەکگرتنی پێدەبەخشرێت لەگەڵ هێلکەکەدا،



پێشبڕکێی خێرای سپێرمەکان دەردەخات بۆ گەیشتن بە هێلکە

لێرەشدا جارێکی تر بە ڕوونی ئیعجازی زانستیمان لە ووشەی (سلالة)دا بۆ دەردەکەوێت کە بە مانای پێشبڕکێ و تیژ ڕۆیشتن دێت.

لێرەدا بە تەواوەتی مانای ووشەی (سُلَالَةٍ) و ئایەتەکەی ﴿ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُ مِن سُلَالَةٍ مِّن مَّاءٍ مَّهِينٍ﴾ دەردەکەوێت و مانای (سُلَالَةٍ) تەواو روون دەبێتەوە کە مەبەست پێی ئەو (نطفەیە)یە کە مرۆڤی لێوە دروست دەبێت و زۆر بە کورتی ئەم (نطفة)یە بەشێکی کەمی ئەو ئاوەیە کە لە پیاو و ئافرەتەوە دەردەچێت، و لە شێوەی ماسی‌یەکی درێژدایە، بە شێوەیەکی هێمنانە مەلە دەکات و دوایی دەردەهێنرێت لە رووپۆشەکەی، و قەڕەباڵغی دروست دەکات لە ملی منداڵداندا و لە شوێنێکی تەسکەوە دەردەچێت و بە خێرایی‌یەکی زۆر دەڕوات بە مەبەستی هەستان بە کرداری پیتاندن.

لەمانەوە ئیعجاز و ووردی مانای ئایەتەکەی قورئان و ئەو سیفاتانەی داویەتی‌یە پاڵ ئاوی پیاو و ئافرەت (بە تایبەتی سپێرمی پیاو) کە لە پێش ١٤٠٠ساڵ باسکراوە بە تەواوەتی لە ڕووی زانستی‌یەوە دەردەکەوێت، و هیچ بەرامبەرکێ‌یەك لە نێوان ئایەتەکانی قورئان و زانستی نوێدا نی‌یە، با ئەو زانیاری‌یە هەڵانەشمان لەیاد نەچێت کە هەموو دونیا وەریاندەگرت لە سەدەکانی حەڤدە و هەژدەدا، شایەتیشمان بۆ ئەمە ئەو ووتەیەی پزیشکی بەریتانی (هارڤی)یە کە لە ساڵی (١٦٥١ز)دا نووسیویەتی: (کۆرپەلە منداڵدانی

ئافرەت دەری دەدات و دروستی دەکات؟!)، ئەوە بوو لە سەدەی بیستەمدا بە تەواوەتی راستی‌یەکان دەرکەوتن و بۆچوونە هەڵەکان پووچەڵ بوونەوە، و گەورەیی و ئیعجازی فەرموودەکانی قورئان و سوننەت وەك رۆژی رووناك بۆ هەموو جیهان دەرکەوتن.







**وێنەی ( ٣-٢٤ )**

چەند وێنەیەکی راستەقینەی ووردبینی ئەلیکترۆنی دروست بوونی زایگۆت :
١: کۆبوونەوەی سپێرمەکان لە دەوری هێلکۆکەکە
٢: بەرگەوتنی سەری سپێرمێك لەگەڵ دیواری هێلکەکەدا
٣: بڕینی دیواری هێلکەکە و چوونە ناوەوەی سەری سپێرمەکە و بە جێمانی کلکەکەی.

لە کاتی کرداری پیتاندندا (وەك پێشتر باسکرا) کاتێك سپێرمەکانی پیاو کە ژمارەیان بەسەدان ملیۆنە دەجوڵێن بەناو مناڵدان (Uterus) و بۆری مناڵداندا (Fallopian tube) لە کۆتایی‌دا دەگەن بە هێلکەکە لە سەرەتای بۆری مناڵداندا، تەنها ژمارەیەکی کەمیان ئەم سەفەرە زۆر دوور و درێژە تەواو دەکەن، و لە کۆتایی ئەم سیناریۆیەدا تەنها یەك تۆو شەرەفی ئەوەی

دەبێت کە لە رووپۆشی خۆی دەربهێنرێت و بچێتە ناو هێلکەکەوە، و پاشان ئەم دووانە یەکبگرن و هێلکەی پیتێنراو (زایگۆت Zygote) دروست بکەن کە یەکەم قۆناغی کۆرپەلەیە (وێنەی ژمارە ٣-٢٤).

راستەوخۆ پاش چوونە ناوەوەی ئەم تەنها سپێرمە دیواری رووپۆشی هێلکەکە چەند گۆڕانکارییەکی وای بەسەردا دێت کە دەبێتە هۆی رێگری کردن لە سپێرمەکانی تر کە بچنە ناو هێلکەکەوە و هەموویان دەمرن بۆ ئەوەی نەبنە هۆی تێکدانی ئەم وردەکارییە سەرسوڕهێنەرە، ئەم راستییە لەو فەرموودە پیرۆزەی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە کە دەفەرموێت: لە هەموو ئاوی پیاوەکەوە کۆرپەلە دروست نابێت بەڵکو تەنها لە بەشێکییەوە دەبێت، و راستییە زانستییەکان بۆیان سەلماندین کە ئەم کردارە بریتییە لە هەڵبژاردنێکی تایبەتی و وەسفەکەی پێغەمبەر (ﷺ) زۆر بەووردی ئەم راستییەی باس کردووە: ﴿مَا مِنْ كُلِّ المَاءِ يَكُونُ الوَلَدُ﴾ رواه مسلم، پاك و بێگەردی بۆ پەروەردگاری راگری ئەم وردەکارییە.

**(نطفة)ی تێکەڵاو (النطفة الأمشاج):**

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعاً بَصِيراً﴾ (الدهر:٢)، واتە: ئێمە مرۆڤمان لە تنۆکێك ئاوی تێکەڵاو (نطفة أمشاج) دروست کردووە، بە مەبەستی تاقی کردنەوەی و کردوومانە بە بیسەر و بینەر، مانای (نطفة) وەکو پێشتر باسمان کرد بریتییە لە ئاوێکی کەم بەقەد تنۆکێك، و مانای (أمشاج) وەکو لە فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبیدا هاتووە بریتییە لە: (قطرة مختلطة من مائين)، واتە: تنۆکێك کە تێکەڵاوە لە دوو ئاو، لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا (إبن عباس) دەڵێت: (من ماء الرجل وماء المرأة حين يَختَلِطان)، واتە: (نطفة أمشاج) بریتییە لە ئاوی پیاو و ئاوی ئافرەت کاتێك کە تێکەڵاو دەبن، (الزجّاج)ی موفەسیریش دەڵێت: (أَمشاج:

أَخلاط ماء الرَّجل وَالمَرأة)، واتە: (أمشاج) بریتییە لە تێکەڵاوێکی ئاوی پیاو و ئافرەت، (حەسەنی بەصریش) دەڵێت: (مَشَج) واتە تێکەڵاوی کرد، و (نطفة أمشاج) بریتییە لەو نوتفەیەی لە تێکەڵاو بوونی ئاوی پیاو و خێزانەکەیەوە دروست دەبێت.

زانستی ئەمڕۆ ئەم ڕاستییە و مانای ئایەتەکەی بە ئاشکرا بۆ سەلماندووین کە لە تێکەڵاو بوونی ئەم دوو ئاوە، و پاشان یەکگرتنی تۆوێك لە ئاوی پیاودا و هێلکۆکەیەك لە ئاوی ئافرەتدا هێلکەی پیتێنراو، و پاشان کۆرپەلەکە دروست دەبێت، ئەمەش کاتێك سپێرمەکە خۆی دەکێشێت بە دیواری هێلکۆکەکەدا و پاشان چاڵی دەکات و ڕێیەك بۆ خۆی دەکاتەوە بۆ ئەوەی ناوکەکەی لێوە دەرپەڕێت و لەگەڵ ناوکی هێلکەکەدا یەکبگرن و ببن بەیەك، بینراوە کە هێلکەی پیتێنراویش لەگەڵ ئاو و خانەکانی دەوریدا سەرەتا شکڵی لە تنۆکێك ئاو دەچێت کە سەلمێنەری مانای ووشەی (نطفة)یە.

بەڵام لێرەدا خاڵێکی گرنگی تر کە باسی بکەین ئەوەیە: ووشەی نطفة ناوێکی تاکە (أسم مفرد) بەڵام ووشەی (أمشاج) کە ئاوەڵناوە (صفة)یە ووشەیەکی کۆیە (أسم جمع)، کە هەمووومان دەزانین لە ڕێزمانی زمانی عەرەبیدا پێویستە ئاوەڵناو(صفة) وەکو ووشەی وەسف کراو (موصوف)بێت لە حاڵەتی تاك و کۆدا، وەك ڕێزمان زانەکان دەڵێن: (الصفه تابعة للموصوف في الإفراد والجمع) کە لێرەدا ووشەی (نطفة)کە وەسف کراوەکەیە، زانایانی ڕاڤە (تفسیر) پێشتر بۆ ڕوون کردنەوەی ئەم حاڵەتە دەیانووت: لەگەڵ ئەوەدا کە (نطفة) تاکە بەڵام لە مانای کۆدایە (في معنی الجمع)، بەڵام دەبینین لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا و لەگەڵ پێشکەوتنی زانستیدا بە تەواوەتی بۆمان دەرکەوتووە کە ئەم ووتەیەی پێشتر ووتراوە زۆر ڕاستە چونکە ئەو (نطفة)یە یەك زیندەوەرە، بەڵام لە تێکەڵاوێك لە خانەکانی زاووزێی پیاو و ئافرەت

پێك هاتووه، و هەروەها هەڵگری کۆمەڵێك سیفاتی جیاوازە لە هەردوو دایك و باوکەکەیەوە (وێنەی ٣-٢٥) (هەروەها وێنەی رەنگاورەنگی: ٣٢/ هـ ، ٣٣/ هـ ، ٣٤/ هـ).




چەند د یمەنێکی یەکگرتنی سپێرمی پیاو و هێلکۆکەی ئافرەت و دروست بوونی نوتفەی تێکەڵاو {یان هێلکەی پیتێنراو (زایگۆت)}

١: هێلکۆکە لە سەرەتای بۆری مناڵداندا چاوەڕێی سپێرم دەکات ٢: سپێرمەکان کە دەگەنە لای هێلکۆکەکە هەوڵی چوونە ناوەوەی دەدەن
٣: کاتێك یەکێك لە سپێرمەکان سەرکەوتوو دەبێت لە برینی هێلکەکە سەری لە کلکەکەی جیادەبێتەوە و بە تەنها دەچێتە ژووردوە
٤: لەم کاتەدا هێلکە پیتێنراوەکە بەردەوام دەبێت لەسەر جووڵە و بە یارمەتی گەندەپێکان بەرەو مناڵدان پاڵدەنرێت
٥: نزیك بوونەوەی ماددەی بۆماوەیی لە دایك و باوکەوە لە یەکتری ٦: یەکگرتنی ماددەی بۆماوەیی دایك و باوکەکە

پاش یەکگرتنی تۆ و هێلکۆکەکە و دروست بوونی زایگۆت، ئەم کۆرپەلە سەرەتایی‌یە بەردەوام لە گەشەکردن و دابەش بووندا دەبێت، و دوای چوار رۆژ تۆپەڵێك خانەی بازنەیی دروست دەکات کە لە توو دەچێت و پێی دەووترێت (Morula) ( وێنەی ٣-٢٦ ) ( هەروەها وێنەی رەنگاورەنگی: ٣٥/ هـ ، ٣٦/ هـ ).



وێنەی ( ٣-٢٦ )

**Figure 2-8.** Schematic representation of the development of the zygote from the 2-cell stage to the late morula stage. The 2-cell stage is reached approximately 30 hours after fertilization; the 4-cell stage at approximately 40 hours; the 12- and 16-cell stage at approximately 3 days; and the late morula stage at approximately 4 days. During this period the blastomeres are surrounded by the zona pellucida, which disappears at the end of the fourth day.

دابەش بوونی هێلکەی پیتێندراو ( زایگۆت ) تا دروست بوونی تۆپەڵێك خانە یان تووێك ( Morula )

دوای پێنج رۆژ دەبێت بە (Blastocyst)، ئەویش کاتێك کە ئەم تووە دەبێت بە دوو بەش خانەوە، لەگەڵ هەموو ئەم گۆڕانکاری‌یەدا کۆرپەلەکە بەردەوام پارێزگاری لە شێوەی دەرەوەی دەکات (کە لە شێوەی تنۆکێك ئاودایە)، ئەویش بەهۆی رووپۆشێکی ئەستوورەوە کە دەوری ئەم خانانەی داوە ( بڕوانەوە وێنەی ٣-٢٦ )، هەروەها لەم قۆناغەشدا هەر ئەو زاراوەی (نطفة أمشاج) بە تەواوەتی بەسەر کۆرپەلەدا دەچەسپێت، چونکە تا ئەم کاتەش هەر بەشێکە لە ئاوی پیاو و ئافرەت و هەر لە شێوەی تنۆکێك ئاودایە، و هەروەها بەردەوام هەر (یەك) زیندەوەرە بەڵام لە چەند پێکهاتێکی جیاواز پێك هاتووە، کە بەراستی ئەم زاراوەیە (نُطْفَة أَمْشَاج) جوانترین و گونجاوترین ناوە بۆ وەسف کردنی شکڵی دەروەی کۆرپەلەکە و هەروەها پێکهاتە

ووردەکەیشی لەو کاتەدا، بەڵام زاراوەی لە توو چوو (Morula) کە لە کۆرپەلەزانیدا بەکاردێت ئەم سیفاتانەی تێدانییە، و ئەم مانایانەی لێوە وەرناگیرێن، بەهەمان شێوە ئەو ژمارانەش کە ئێستا بەکاردێن بۆ وەسف کردنی ئەم قۆناغانەی گەشە کردنی کۆرپەلە.

دەتوانین لە ئایەتێکی تری قورئانەوە هەمان ئەم مانایە وەربگرین کە پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ مِنَ الْمَاءِ بَشَراً فَجَعَلَهُ نَسَباً وَصِهْراً وَكَانَ رَبُّكَ قَدِيراً﴾ (الفرقان: ٥٤)، واتە: هەر ئەو زاتەیە کە لە ئاوی (نوتفەی) بەشەر کۆرپەلە دروست دەکات (لەوەودواش زۆربەی پێکهاتەی لەشی هەر ئاوە)، و کردوویەتی بەهۆی خزمایەتی و یەکگرتن و تێکەڵاوی (لە رێگەی پیاوەوە کۆمەڵێك خزم دروست دەبێت هەروەها لە رێگەی ئافرەتیشەوە کۆمەڵێك)، بێگومان پەروەردگاری تۆ بەردەوام دەسەڵاتی بێسنوورە (لە هەموو بوارێکدا)، هەندێك لە زانایان دەڵێن کە ووشەی (صِهْراً)ی ئایەتەکە چاووگە و لە (صَهَرَ)وە هاتووە بە مانای تێکەڵاو بوون و توانەوە، هەروەك لە تەفسیری (القرطبي)دا دەڵێت: (واشتقاق الصهر من صَهَرْتَ الشَّيء إذا خَلَطْتَه)، ئەو ئاوەشی لێرەدا هاتووە مەبەست پێی (نطفة)کەیە، (القرطبي) دەڵێت: (أي خلَق من النطفة إنساناً ....) واتە لە (نطفة)کەوە مرۆڤێکی دروست کرد.

کەواتە مانایەکی ئایەتەکە وای لێدێت: ئەو ئاوە (نطفة)یەی کە مرۆڤی لێوە دروست دەبێت تێکەڵاوە و پاشان دەتوێتەوە بۆ ئەوەی مرۆڤێکی نوێی لێوە دروست ببێت، کە ئەمە دەرخەری گەورەیی دەسەڵاتی پەروەردگارە، وەك ووتمان کۆرپەلەزانی بۆمان باس دەکات کە (نطفة) لە سپێرمی پیاو و هێلکۆکەی ئافرەتەوە دروست دەبێت، کاتێك کە ناوکی سپێرمەکە دەچێتە ناو هێلکۆکەکەوە، نزیك دەبێتەوە لە ناوکی هێلکەکە و بەرگی هەردوو ناوکەکە دەتوێنەوە و پاشان بەهێزێکی زۆر بۆ لای یەکتری رادەکێشرێن و

پاشان یەکدەگرن و دەتوێنەوە لە یەکتریدا و پیتاندن (**Fertilization**) روو دەدات و زایگۆت دروست دەکەن (وێنەی ٣-٢٧) (هەروەها وێنەی رەنگاورەنگی: ٢٧/ هـ).

دەتوانین ئەم مانایە لە ئایەتی (١٣)ی سوورەتی (المؤمنون)یشدا وەربگرین کە پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ﴾، لە فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبیدا مانای (جَعْل) فراوانترە لە مانای دروست کردن (خَلْق) و بریتییە لە کۆکردنەوەی چەند شتێکی دروستکراو بە پەرش و بڵاوەیی، کەواتە مانای ئایەتەکە وای لێدێت: ئێمە مرۆڤمان سەرەتا لە نوتفەوە پەیدا کرد (کە ئەم نوتفەیە پێشتر پەرش و بڵاوبووە لە پیاو و ئافرەتدا)،

بسم الله الرحمن الرحيم

هَلْ أَتَىٰ عَلَى الْإِنسَانِ حِينٌ مِّنَ الدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْئًا مَّذْكُورًا ① إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعًا بَصِيرًا ②




نواة الحيوان المنوي بعد أن استقرت في البويضة، وسرعان ما تتحد النواتان في غاية القوة وبعد الجذب الشديد بينهما لتكوين الإنسان الجديد من حاصل مورثات الأب والأم باتحاد رأس المنوي مع نواة البويضة. إنها هنا في طور النطفة الأمشاج أي القطرة الواحدة المليئة بالمورثات المختلطة ، وقال المفسرون : الأمشاج أي الأخلاط الكثيرة . وێنەی (٣-٢٧)

ئەم وێنانە نزیکبوونەوە و یەکگرتنی ماددەی بۆماوەیی پیاو و ئافرەت لە زایگۆتدا روون دەکاتەوە.

پاشان ئێمە ئەم سپێرم و هێلکەیەمان کۆکردنەوە و تێکەڵومان کردن بۆ دروست کردنی نوتفە)، لێرەدا حیکمەتی ووتەی پەروەردگارمان بۆ دەردەکەوێت کە دەفەرموێت: (ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً) و نافەرموێت: (ثُمَّ خَلَقْنَاهُ نُطْفَةً)، چونکە ووشەی یەکەم ماناکەی ووردترە و دەرخەرێکی ئیعجازێکی زانستی تری ئایەتەکەیە.

**دەرەنجامەکانی دروست بوونی (نطفة )ی تێکەڵاو ( النطفة الأمشاج ):**

**١-دروست بوون (الخلق): ئەم قۆناغە بریتی‌یە لە سەرەتای راستەقینەی پەیدابوونی مرۆڤ، چونکە لە ئەنجامی یەکگرتنی تۆوی پیاو کە ٢٣کرۆمۆسۆمی تێدایە و هێلکەی ئافرەت کە ئەویش ٢٣کرۆمۆسۆمی تێدایە ژمارەی تەواوی کرمۆسۆمەکانی لەشی مرۆڤ دروست دەبێت، کە بریتی‌یە لە ٤٦کرۆمۆسۆم، و هەموو هەنگاوەکانی گەشەکردنی کۆرپەلە لە داهاتوودا لەسەر ئەم بناغە راستە سەرچاوە دەگرێت، کەواتە ئەم کردارە بریتی‌یە لە هەنگاوی یەکەم بۆ پەیدابوونی زیندەوەرێکی نوێ و ناوازە (وێنەی ٣-٢٨).**

وێنەی (٣-٢٨): یەکگرتنی تۆو و هێلکۆکە و دروست بوونی مرۆڤێکی نوێ.

**٢-ئەندازە بۆدانان (التقدير و البرمجة الجينية)**: دوای چەند سەعاتێکی کەم لە دروست بوونی خانەی یەکەمی کۆرپەلە کردارێکی تر دەست پێدەکات کە سەرەنجامەکەی بریتی‌یە لە ئەندازە بۆدانان و دیاری کردنی سیفاتی داهاتووی کۆرپەلەکە کە بریتی‌یە لە: دەرکەوتنی سیفاتە بەهێز و زاڵەکان (Dominant Characters)، و دەرنەکەوتن یان شاردنەوەی سیفاتە لاواز و بەزیوەکان (Recessive Characters)، کەواتە لێرەوە ئەندازە بۆ سیفاتەکانی کۆرپەلەکە دیاری دەکرێت.

قورئانی پیرۆز ئاماژەی بۆ ئەم ئەندازە دانانە کردووە کە دەفەرموێت: ﴿قُتِلَ الْإِنسَانُ مَا أَكْفَرَهُ، مِنْ أَيِّ شَيْءٍ خَلَقَهُ، مِن نُّطْفَةٍ خَلَقَهُ فَقَدَّرَهُ﴾ (عبس: ١٧-١٩)، واتە: تیا چوون بۆ مرۆڤ بێت کە ئەوەندە بێباوەڕی دەکات!، ئەی باشە بۆ سەیر ناکات کە لەچی‌یەوە دروست بووە، ئەو سەرەتا لە تنۆکێك ئاوەوە دروستمان کرد کە یەکسەر ئەندازەمان بۆ دانا.

بە گەڕانەوە بۆ ڕاستی‌یە زانستی‌یەکان بە تایبەتی ڕاستی‌یەکانی زانستی کۆرپەلەزانی و بە تایبەتی تر بۆماوەزانی (علم الوراثة Genetics)، ئەم بابەتەمان زیاتر بۆ ڕوون دەبێتەوە کە ئەم زانستە بۆی سەلماندووین لە زیندەوەرەکاندا دوو جۆر سیفاتی بۆماوەیی هەیە: ١- سیفەتی زاڵ (Dominant): ئەوەیە کە ئەگەر تەنها لە یەکێك لە باوانەوە (دایك یان باوکی زیندەوەرەکەوە) بۆی بمێنێتەوە ئەوا بەمسۆگەری لە داهاتوودا لە کۆرپەلەکەدا دەردەکەوێت، بەڵام ٢- سیفەتی بەزیوو (Recessive): ئەوەیە کە ئەگەر لە دایك یان لە باوکی‌یەوە بە تەنها بۆی بمێنێتەوە، ئەوا لە کۆرپەلەکەدا ئەو سیفەتە دەرناکەوێت، بەڵکو پێویستە ئەو سیفەتە بەزیوە لە هەردوو دایك و باوکەکەدا هەبێت و بۆ منداڵەکە بگوێزرێتەوە بۆ ئەوەی لە داهاتوودا لە کۆرپەلەکەدا بە مسۆگەری دەرکەوێت.



وێنەی ( ٣ - ٢٩ )

**قۆناغی نوتفەی تێکەڵاو و دیاری کردنی سیفاتی مرۆڤە نوێیەکە**

پاك و بێگەردی بۆ پەروەردگار و پێغەمبەرە بەرێزەکەی، دەبینین ئەم ڕاستی‌یە لە چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەردا (ﷺ) ئاماژەی پێدراوە، ئەوەتا دەبینین کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) لە پەروەردگار دەپاڕایەوە، لە یەکێك لە نزاکانی‌دا دەیفەرموو: ﴿مَتِّعْنا اللّهم بِأَسْماعِنا وَأَبْصارنا وَقُوَّتنا أَبَداً ما أَحْيَيْتَنا، وَاجْعَلْهُ الوارِثَ مِنّا﴾ حديث حسن رواه الترمذي و النسائي، واتە: ئەی پەروەردگار خۆشیمان پێ ببەخشە بە گوێکانمان و بە چاوەکانمان، و بە هێز و قووەتمان هەتا لە ژیاندا ماوین، و کە مردین ئەمە بکە بە سیفەتێکی زاڵ بۆ نەوەکانی پاش خۆمان، بەڕاستی سەرسوڕهێنەرە کە دەفەرموێت: (وَاجْعَلْهُ الـوارِثَ مِنّـا) کە بە (إسم فاعل) هێناویەتی، واتە مەبەستی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەیە: ئەو سیفەتانە خۆیان بکەر(فاعل) بن و سیفاتەکان لە نەوەکانی داهاتوودا بە دڵنیایی‌یەوە دروست بکەن، کە وەك ووتمان ئەم بۆچوونە بە ووشەی زانستی بۆماوەزانی ئەمڕۆ پێی دەڵێن سیفاتی زاڵ.

هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە: ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه): أَنَّ أَعْرَابِيًّا أَتَى رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ امْرَأَتِي وَلَدَتْ غُلاَماً أَسْوَدَ وَإِنِّي أَنْكَرْتُهُ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ (ﷺ): « هَلْ لَكَ مِنْ إِبِلٍ »، قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: «مَا أَلْوَانُهَا»، قَالَ: حُمْرٌ، قَالَ: « فَهَلْ فِيهَا مِنْ أَوْرَقَ »، قَالَ: نَعَمْ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): « فَأَنَّى هُوَ »، قَالَ: لَعَلَّهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ يَكُونُ نَزَعَهُ عِرْقٌ لَهُ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ (ﷺ): « وَهَذَا لَعَلَّهُ يَكُونُ نَزَعَهُ عِرْقٌ لَهُ»﴾ رواه مسلم، واتە: پیاوێکی دەشتەکی هات بۆلای پێغەمبەر و پێی ووت: خێزانەکەم منداڵێکی ڕەشی بووە کە من ڕەش نیم و لە من ناچێت! پێغەمبەر(ﷺ) (بۆ ئەوەی تێگەیشتنی ئەم بابەتەی لا ئاسان بکات) لێی پرسی: تۆ ووشترت هەیە؟ ئەویش ووتی: بەڵێ، پاشان پێی ووت: ڕەنگیان چۆنە؟ ئەویش ووتی: سوورن، ووتی: باشە سپی ڕەنگیان تێدا نی‌یە؟ ووتی: بەڵێ سپی تێدایە، پێغەمبەر (ﷺ) پێی ووت: ئەوە تۆ چۆن دەیبینیت (ئاوا ووشترێکی سپی لە نێوان ئەو ووشترە سوورانەدا لەدایك بووە)؟ کابرا ووتی: لەوانەیە ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە ڕەگێکی پێشتر بێت و بۆماوەیە بۆ ئەم، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: دەبزانە لەوانەیە ڕەنگی منداڵەکەشت هەر بریتی بێت لە ڕەگێکی بۆماوەیی پێشترتان و بۆ ئەم ماوەتەوە.

ئەم فەرموودە پیرۆزە دوو ئاماژەی بۆماوەیی گرنگی تێدایە کە زۆر تازە دۆزراونەتەوە لەم ڕۆژگارەدا، ئەوانیش ئەوەیە کە: ١- زۆر سیفەت هەیە بەزیوە، ٢- زۆر سیفەتی تریش هەیە کە لە وەچەیەکدا دەردەکەوێت بەڵام پاشان چەند وەچەیەکی تر دەپەڕێنێت و لە وەچەکانی داهاتوودا دەردەکەوێت، ئەمە دەیسەلمێنێت کە بەڕاستی پێغەمبەر (ﷺ) لەخۆیەوە قسەی نەکردووە: ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى، إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى﴾ (النجم).

هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا هەمان ئەو بۆچوونە هاتووە کە زۆر سیفەت هەیە لە باوك و دایکەوە بۆ نەوەکانیان دەگوێزرێنەوە کە دەفەرموێت:

﴿تَخَيَّرُوا لِنُطَفِكُم فَإنَّ العِرْقَ دَسَّاس ...﴾، واتە: بزانن کە کێ هەڵدەبژێرن ببێت بە هاوسەرتان و شوێنی نوتفەکانتان لەبەر ئەوەی کە رەگی خراپ هەروەك رەگی چاك بۆ نەوەکان دەگوێزرێتەوە، کەواتە ئەو سیفاتانەی کە مرۆڤ هەیەتی زۆری بەهۆی بۆماوەوە لە باو و باپیرانی‌یەوە بۆی دەگوێزرێتەوە بەهۆی جینەکانی سەر کرۆمۆسۆمەکان (**بڕوانە وێنەی رەنگاورەنگی: ٣٨/ هـ**).

باشترین بەڵگەیەك کە بیهێنینەوە بۆ سەلماندنی راستی ئەم فەرموودە پیرۆزە بریتی‌یە لە مێژووی دوو خێزانی ئەمریکی کە لەلایەن کۆمەڵەی زیندانەکانی ئەمریکی‌یەوە بە درێژایی چەندین ساڵ بەدواداچوونیان بۆ ئەنجامدرا، خێزانی یەکەم بە درێژایی سێ نەوە چاودێری کران لە ساڵی (١٨٧٤ز) بۆ (١٩٤٩ز)، ناویان خێزانی (جوکسن)ی تاوانبار بوو کە سەرۆکی خێزانەکە پیاوێکی مەیخۆری تاوانبار و شکست خواردوو بوو، لە شاری (نیویۆرك)ەوە هەڵات و کۆچی کرد بۆ ناوچەیەکی چۆڵ و دوور لە ئاوەدانی لە دێیەکی دوورە دەستدا، و لەگەڵ خۆی‌دا هاوەڵێکی ئافرەتی برد کە داوێنپیس بوو، لەدوای ئەمان چەندین هاوەڵی خراپی تریان چوون بۆلایان و پێکەوە کۆلۆنی‌یەکی جیاکراوەیان بۆ خۆیان دروست کرد و زاووزێیەکی زۆر لە نێوانیاندا رووی‌دا.

زوربەی نەوەکانی ئەم کەسانە ئەمانە بوون: ٢٠٠ کەسی کەم ژیری، ٣٠٠ سواڵکەر و بێلانە، نزیکەی ٣٠٠ ئافرەتی داوێنپیس، ١٤٠ کەسی موجریم و تاوانبار کە زۆریان خوێنرێژ بوون، لە سەرجەمی ٢٠٠٠ کەسی ئەم کۆمەڵەیە تەنها ٢٠ کەسیان فێری کارێکی بەسوود بوون کە ئەمانیش لە زینداندا فێری ئەم کارانە بوون، و بڕی ئەو پارەیەی کە ئەم خێزانە وەك زەرەر گەیاندیان بە حکومەتی ئەمریکی لەو کاتەدا زیاتر لە ١,٥ ملیۆن دۆلار بوو!.

خێزانی دووەم بە خێزانی (کالیکوك) ناسرا بوو، کە ناوەکەی لە (مارتین کالیکۆك)ەوە وەرگرتووە کە پێش شەڕی ناوخۆی ئەمریکی منداڵێکی زۆڵی

بوو لە کچێکی گێلەوە، ئەوانەی کە توانران بەدوادا چوونیان بۆ بکرێت لە نەوەکانی بریتی بوون لە ٤٨٠ کەس، کە لە نێوانیاندا ئەمانە هەبوون: ١٤٣ گێل، و ٣٦ منداڵی زۆڵ، ٣٤ کەسی خووگرتوو بە مەی‌یەوە کە تووشی فێ (پەرکەم) بوون، ١١ تاوانبار و ٣٣ ڕەووشت نزم، ٨٣ منداڵیش لە کاتی شیرەخۆری‌دا مردوون، ساڵی ١٩٣٨ کۆتایین نەوەی ئەم خێزانە کچێکی گێل و کەم ژیریی بوو بەناوی (دیبۆرا کالیکوك) کە تەمەنی ٢٤ ساڵ بوو بەڵام ڕاددەی ژیری‌یەکەی هی کچێکی تەمەن حەوت ساڵ بوو!!

لەمەی پێشترەوە گەیشتینە ئەو ڕاستی‌یەی کە ئەندازە بۆدانان لە کاتی ئەم قۆناغی نطفەی تێکەڵاوەدا ڕوودەدات، دەبینین ئەم حەقیقەتە بە ئاشکرا ڕاستی فەرموودەکەی قورئان دەسەلمێنێت کە دەفەرموێت: ﴿قُتِلَ الْإِنسَانُ مَا أَكْفَرَهُ، مِنْ أَيِّ شَيْءٍ خَلَقَهُ، مِن نُّطْفَةٍ خَلَقَهُ فَقَدَّرَهُ﴾ (عبس: ١٧-١٩).




وێنەی (٢-٢٠): ژمارەی کرۆمۆسۆمەکان و پێکهاتەیان دەردەخات کە هەڵگری هەموو سیفاتەکانی لەشی مرۆڤن.

**٣-دیاری کردنی ڕەگەزی کۆرپەلەکە (تحدید الجنس):** ئەمەش هەر بەشێکە لە ئەندازە بۆدانان کە لە قۆناغی (نطفة)ی تێکەڵاودا ڕوودەدات، ئەوەتا لە قورئاندا هاتووە: ﴿وَأَنَّهُ خَلَقَ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْأُنثَى، مِن نُّطْفَةٍ إِذَا تُمْنَى﴾ (النجم: ٤٥-٤٦)، واتە: پەروەردگار نێر و مێ لە (نطفة)ی پیاوەوە دروست دەکات، کاتێك کە دەردەچێت، و ئەندازەی بۆ دیاری دەکرێت ((إِذَا تُمْنَى) بمعنی: حین تخرج أو حین تقدر)، کە زانستی نوێی ئەمڕۆ ئەم ڕاستی‌یەی بۆ سەلماندووین کە دیاری کردنی ڕەگەزی کۆرپەلە بەهۆی تۆوی پیاوەوە دەبێت کە پێشتر بەدرێژی باسی ئەو بابەتەمان کرد.

**دووکەرت بوونی ( نطفة )کە و دیاردەی جووتیی ( الزوجية ) لە دروست بووندا :**

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ فَالِقُ الْحَبِّ وَالنَّوَى يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَمُخْرِجُ الْمَيِّتِ مِنَ الْحَيِّ ذَلِكُمُ اللَّهُ فَأَنَّى تُؤْفَكُونَ﴾ (الأنعام: ٩٥)، واتە: بەڕاستی پەروەردگار لەتکەری دەنك و تۆ و دانەوێڵەیە بۆ ئەوەی بیپشکوێنێت و بڕوێت، زیندووش لە مردوو دەردەهێنێت و و دەرهێنەری مردووشە لە زیندوو، ئا ئەوەیە خوای پەروەردگارتان جا ئیتر ئێوە بۆ کوێ لا دەدرێن و بۆ کوێ وێڵ دەکرێن!.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَمِن كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾ (الذاريات:٤٩)، واتە: لە هەموو شتێك ئێمە جووتمان دروست کردووە (لە جیهانی ئادەمیزاد و گیاندار و ڕووەك و بێگیانیشدا، لە هەموو شتێکی ماددی و مەعنەویدا)، ئەمەش بۆ ئەوەی بیربکەنەوە و یاداوەری وەربگرن.

لە ئایەتێکی تردا هاتووە: ﴿سُبْحَانَ الَّذِي خَلَقَ الْأَزْوَاجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنبِتُ الْأَرْضُ وَمِنْ أَنفُسِهِمْ وَمِمَّا لَا يَعْلَمُونَ﴾ (یس:٣٦)، واتە: پاك و بێگەردی بۆ ئەو زاتەی هەر هەموو بەدیهێنراوەکانی بە جووت دروست کردووە، لەوەی لە زەویدا دەڕوێت و لە خۆشیان و لەو شتانەش کە نایزانن (کە لە سەردەمی عیلم و

زانیـاریدا روون بۆتــەوە کــە هــەموو بــەدیهێنراوان —مـاددی و مەعنــەوی— جووتن)، لێرەدا ئەم ئایەتانە چەند ئیعجازێکی زانستییان لـەخۆ گرتـووە کـە بە یارمەتی پەروەردگار دەیانخەینە روو.

سـەبارەت بـە ئایـەتی یەکـەم لـە فەرهەنگـەکانی زمـانی عـەرەبیدا هـاتووە: (الحَبَّـة مـن الشـيء، القطعـة منـه)[3]، واتـە: (حَبَّـة) بریتـییـە لـە پارچـەیەکی بچووکی هەر شتێك[4]، (القرطبي) موفەسیریش دەربارەی ئـەم ئایەتـە دەڵێـت: (يُخرج البَشَر الحَيّ من النُّطفة الميّتة، والنُّطفـة الميّتـة مـن البَشَـر الحـيّ ...)، واتە: مرۆڤی زیندوو لە نوتفەی مردووەوە دروست دەکات و نوتفـەی مـردوو لە مرۆڤی زیندووەوە دروست دەکات.

کەواتە ئەگەر ئێمە سەرجەمی ووتـەی موفەسـیرەکان دەربـارەی ئـەم ئایەتـە وەرگرین ماناکـەی بـەم جـۆرەی لێدێـت: خـوای پـەروەردگار لەتکـەری پارچـە بچـووکەکانی لەشـی مرۆڤـە لەگـەڵ ناوکەکانیانـدا (کـە مەبەسـت پـێی تـۆوی مرۆڤە یان نوتفە)، و مرۆڤی زیندوو لـە نوتفـەی مـردووەوە دروسـت دەکـات و نوتفەی مردوو لە مرۆڤی زیندووەوە دروست دەکات.

لێـرەدا سەرسـوڕمان دامـان دەگرێـت چـونکە لـەتبوون و دابـەش بـوون سـیفەتێکی گـەردوونی گشـتییە لـە جیهـانی رووەك و ئـاژەڵ و مرۆڤـدا، کـە

(3) بڕوانە فەرهەنگی (لسان العرب)/ ماددەی (حبب).

(4) لێرەدا دەتوانین بڵێین ئەو پارچە بچووکەی کە پەروەردگار باسی کردووە و نـاوی هێنـاوە بـە (حَبّـة) بریتییە لە خانەکانی لەشـی زینـدەوەرەکان کـە بچـووکترین پێکهێنەریانـە، هـەروەها یـەکێك لـە ماناکـانی مەبەست پێی نوتفەیە کە لە یەکگرتنی تۆو و هێلکۆکەوە دروست دەبێت، چونکە ئەگەر سەیری ئایـەتێکی تر بکەین کە دەفەرموێت: ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ﴾ (البقرة: ٢٢٣)، واتـە: ئافرەتانتـان شوێنی چاندنی ئێوەن، دیارە هەموو ئێمەش لـە نوتفـەوە دروسـت بـووین، کەواتـە مەبەسـتی ئـەم ئایەتـە ئەوەیە کە ئافرەتان شوێنی چاندنی نوتفەی ئێوەیە، ئاشکراشە کە ئەوەی لە زەویدا دەچێنرێت دانەوێڵـە یان تۆوی رووەکەکانە کە بە عەرەبی پێی دەووترێت (حَبّة)، کەواتە نوتفەش جۆرێکە لە (الْحَبِّ).

لەتبوون سیفەتێکی گشتی هەموو خانەکانیانە (خانەی لەشی بێت یان سێکسی) وەك زانستی بایۆلۆجی بۆمان باس دەکات، و هەروەها لە داڕشتنی ئایەتەکەشەوە ئەم مانای لەتبوونە گشتی‌یە تێ‌دەگەین، کە تایبەت نی‌یە بە جۆرێکی تایبەتی‌یەوە چونکە دەستەواژەی ئایەتەکە ڕەهایە.

کۆرپەلەزانی بۆمان باس دەکات کە هێلکەی پیتێنراو یان زایگۆت (لە یەکگرتنی تۆو و هێلکە) یەکسەر دوای پێکهاتنی کەرت دەبێت و دابەش دەبێت بۆ دوو بەش (إِنَّ اللَّهَ فَالِقُ الْحَبِّ)، کە ئەم دابەشبوونە ناوکی زایگۆتەکەش دەگرێتەوە (إِنَّ اللَّهَ فَالِقُ الْحَبِّ وَالنَّوَى) و دەبێت بە دوو خانەی جیاواز (**وێنەی ٣-٣١**) (**هەروەها بڕوانە وێنەی ڕەنگاوڕەنگی: ٣٨/ هـ**)، ئەم کرداری کەرت بوون و دابەشبوونەیە کە سەرەنجام دەبێتە هۆی دروست بوونی دروست کراوێکی زیندوو هەروەك لە ئایەتە پیرۆزەکەدا هاتووە: (يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ ...)[5]، کە ئەگەر ئەم کردارە ڕووی نەدایە لەدوایی‌دا ئەو کۆرپەلەیە گەشەی نەدەکرد.

لێرەوە دەگەینە ئەو ڕاستی‌یەی کە نیگای پەروەردگار پێش هەردوو زانا (پریڤۆست و دوماس Prevost & Dumas) (١٨٢٤ز) کەوتووە لە وەسف کردنی دیاردەی کەرتبوونی هێلکەی پیتێنراو (Cleavage)، هەروەها پێش زانا وۆلف (Wolf)یش (١٧٥٩ز) کەوتووە کە باسی ئەوەی کردووە کە کۆرپەلە چەندین جار دوولەت دەبێت بۆ دروست کردنی چەند چینێك خانە بۆ دروست کردنی ئەندامەکانی کۆرپەلەکە، هەروەها پێش زانا (ڤۆن بندن Von Beneden)یش (١٨٨٣ز) کەوتووە کە وەسفی لەت بوونی ناوکی زایگۆتی کردووە (**وێنەی ٣-٣٢**).

---

(5) وەك ووتمان موفەسیران (القرطبي) و (إبن كثير) بەم شێوەیە ڕاڤەی ئایەتەکەیان کردووە.




وێنەی ( ٣-٣١ ) دوو وێنەی راستەقینەی دووکەرت بوون و لەت بوونی زایگۆت بۆ دوو خانە.

**وێنەی ( ٣-٣٢ ): چەند دیمەنێکی راستەقینە کە بە ووردبین گیراوە بۆ دابەش بوونی خانەی یەکەمی کۆرپەلە ( هێلکەی پیتێنراو یان زایگۆت )**

سەبارەت بە دوو ئایەتەکەی تریش دەڵێین: ئەگەر تێبینی گەشەی نوتفە و پێکهێنەرەکانی بکەین دەتوانین ئەم خاڵانە تۆمار بکەین دەربارەی دیاردەی جووتیی لە دروست بووندا:



سپێرم لە کاتی گەشە کردنی لە گوندا بەردەوام دوو لەت دەبێت.

١- سپێرمی پیاو لە کاتی گەشە کردنیان لەناو گوندا لە خانە سەرەتاییەکانی توێکڵەوە بۆ ناوەوە، کەرت دەبن بۆ دوو دانە بە بەردەوامی (واتە هەر خانەیەك دەبێت بە جووتێك) تا دروست کردنی سپێرمەکان (وێنەی ٢-٣٣).

٢- خانەکانی هاوپێچ لەگەڵ هێلکەکەدا پێش پیتاندن دەبن بە دوو بەشەوە کە بەشێکیان لە دەوری هێلکەکەوە دەمێننەوە و بەشەکەی تر جەمسەرە تەن (Polar Body) دروست دەکەن (بڕوانە وێنەی ٢-٣٤) (هەروەها وێنەی رەنگاورەنگی: ٤٠/هـ).

٣- کاتێك کە ناوکی سپێرم دەچێتە ناو هێلکەکەوە، ناوکی هێلکۆکەکە پێش ئەوەی لەگەڵ ناوکی سپێرمەکەدا تێکەڵاو ببێت و یەکبگرێت، کەرت دەبێت بۆ دوو بەش کە بەشێکی لەگەڵ سپێرمەکەدا یەکدەگرێت و بەشەکەی تر لە سووچێکی هێلکەکەدا کەنار دەگرێت و دەبێت بە جەمسەرە تەنی دووەم (Second Polar Body). (وێنەی ٢-٣٥) (وێنەی: ٤١/هـ).




٤- پاش یەکگرتنی ناوکی سپێرم و هێلکۆکەکە و دروست بوونی زایگۆت (النطفة الأمشاج)، زایگۆتەکە دەست دەکات بە

دابەشبوون بۆ دوو خانە، کە هەر یەکێکیان دەبێت بە دووانی تر، و ئەمانیش دەبن بە دووان و بەم شێوەیە بەردەوام دەبێت، لە قۆناغی ٨ خانەییدا کۆرپەلەکە پێی دەووترێت تووشێوە (Morula)، و دوایی دەبێت بە تۆپەڵێك خانە یان



وێنەی (٣-٣٥)

بە زاراوەی کۆرپەلەزانی پێی دەووترێت (Blastocyst). (بڕوانە وێنەی ٣-٣٦) (هەروەها وێنە رەنگاوڕەنگەکانی: ٤٢/ هـ ، ٤٣/ هـ ، ٤٤/ هـ).

٥- کاتێك کە کۆرپەلەکە دەچێتە ناو مناڵدانەوە، خانەکانی دروست بوو لەم دابەش بوونانەوە، دەبن بە دوو گرووپەوە: کۆمەڵێکیان جیاواز دەبن بۆ دروست کردنی کۆرپەلەکە کە پێیان دەووترێت بارستە خانەی ناوەوە (Inner Cell Mass)، کۆمەڵەی دووەم رۆڵی دروست کردنی ووێڵاش و پەردەکانی دەوری کۆرپەلە دەبینن و پێیان دەووترێت بارستە خانەی دەرەوە (Outer Cell Mass) (وێنەی ٣-٣٧) (وێنەی: ٤٥/ هـ).



وێنەی (٣-٣٧)

ئەم ٥ خاڵەی سەرەوە سەلمێنەری ئەو راستییەن کە پەروەردگار پێش زیاتر لە ١٤سەدە پێی راگەیاندووین کە ناووك و تۆوی مرۆڤ دوولەت دەکات و هەموو ئەم کردارانە بە جووت دەبێت، هەروەها ئایەتی سێیەمیش تەئکید لەسەر ئەم بابەتە دەکاتەوە (سُبْحَانَ الَّذِي خَلَقَ الْأَزْوَاجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنبِتُ الْأَرْضُ وَمِنْ أَنفُسِهِمْ وَمِمَّا لَا يَعْلَمُونَ)، کە ئەم ئایەتە ماناکەی گشتگیرترە و راستی زیاتر دەگرێتەوە و دەردەخات، کە هەموو شتێك لەم گەردوونەدا بە جووتیی هەیە، جا ئەگەر دوولەت ببێت یان نا.

- ئەوەتا مرۆڤ لە نێر و مێ پێکهاتووە.
- نوتفەی مرۆڤ لە سپێرمی پیاو و هێلکۆکەی ئافرەت دروست دەبێت.
- سپێرمی پیاو لە ئەنجامی دوو لەت بوونەوە دروست دەبێت، بە هەمان شێوە هێلکەی ئافرەتیش، نوتفەی تێکەڵاو (زایگۆت)یش دەبێت بە دوو خانە کە هەریەکێکیان دەبێت بە دوو خانەی تر و بەم شێوەیە ... سەرەنجام کۆی ئەو خانانەی کە کۆرپەلە دروست دەکەن دەبن بە دوو کۆمەڵەوە پاش ئەوەی کە ئەم تۆپەڵە خانەیە دەچێتە ناو منداڵدانەوە.
- ناوکی خانەی ئاسایی (چ لە پیاو و چ لە ئافرەتدا) پێکهاتووە لە ٢٣ جووت کرۆمۆسۆم، کە هەر جووتێك پێکەوە نووساون (وێنەی ٣-٣٨) (هەروەها وێنەی: ٤٥/هـ).




کرۆمۆسۆمەکان پێکهاتەیەکی پەیژەیی حەلەزۆنی پێچاوپێچیان هەیە (دوو لوولپێچن).

گرووپە کرۆمۆسۆمییەکانی مرۆڤ روون دەکاتەوە کە سەرسەم ٢٣جووت و حەوت گرووپن.

– هەر کرۆمۆسۆمێك گەر پێکهاتەکەی هەڵوەشێنین (کە لە ترشی ناووکی DNA پێکهاتووە)، دەبینین لە دوو شریت یان زنجیرە پێکهاتووە وەك پەیژەیەکی حەلەزۆنی پێچاوپێچ (بڕوانە وێنەی ٣-٣٩) (هەروەها وێنەی: ٤٦/ هـ).

– هەر یەکێك لە دوو زنجیرەکەی (DNA) پێکهاتووە لە کۆمەڵێك گەردی تایبەتی، کە هەر گرووپێکی زنجیرەی یەکەم بەستراوەتەوە بە گرووپێکی زنجیرەی دووەمەوە بەشێوەی جووت جووت.

ئەمانەی باسمان کرد سەلمێنەری راستی بە جووت بوونی هەموو دروستکراوەکانە وەك لە ئایەتەکەدا هاتووە: (سُبْحَانَ الَّذِي خَلَقَ الْأَزْوَاجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنبِتُ الْأَرْضُ وَمِنْ أَنفُسِهِمْ وَمِمَّا لَا يَعْلَمُونَ)، کە بە تایبەتی ئاماژەی بە مرۆڤ خۆی داوە (وَمِنْ أَنفُسِهِمْ) کە جووتیی لە هەموو پێکهاتەکانیدایە، هەروەها دەفەرموێت (وَمِمَّا لَا يَعْلَمُونَ) کە ئاماژەیە بۆ ئەوەی زۆرێکی نەدۆزراوەتەوە، و نازانین زانست لە داهاتوودا چی تر لەم بارەوە دەدۆزێتەوە، ئەوەشمان بیرنەچێت کە ئایەتەکە جووتیی تەنیا بە مرۆڤەوە نەبەستووەتەوە، زانستی نوێ هەمان راستی دەرخستووە کە رووەك و ئاژەڵان و پێکهاتەکانیان و تەنانەت تەنە نازیندووەکانیش هەموویان بە جووت هەن.

– ئەگەر بەردەوام بین لەسەر ئەم باسە دەبینین: زنجیرەکانی (DNA) لە چوار جۆر ترشەڵۆکی نایترۆجینی (Nuclear acids) پێکهاتوون، کە ئەمانەن: ئەدینین (Adenine)، گوانین (Guanine)، سایتۆسین (Cytosine)، و ثایمین (Thymine)، کە ئەم ترشەڵۆکانە لە زنجیرەکانی (DNA)دا بە جووتیی هەن.

هەروەها بینراوە کە ئەدینین هەمیشە لەگەڵ ثایمیندا جووت دەبێت، و گوانین هەمیشە لەگەڵ سایتۆسیندا جووت دەبێت، و هەرگیز ناگونجێت کە ئەدینین و گوانین یان گوانین و ثایمین یان سایتۆسین لەگەڵ ئەدینین یان ثایمین لەگەڵ سایتۆسیندا یەکبگرێت (بڕوانە وێنەی رەنگاوڕەنگی: ٤٧/ هـ).

- هەروەها هەریەکێك لەم چوار ترشەلۆکانە بەستراوەتەوە بە شەکرێکی کەم ئۆکسجینەوە (Deoxy Ribose) کە ئەمیش بەستراوەتەوە بە گەردێکی فۆسفاتەوە و لەگەڵیدا جووتێك دروست دەکات کە لێی جیانابێتەوە، بۆ روونکردنەوەی ئەمە (**بڕوانەوە وێنەی رەنگاوڕەنگی: ٤٧/هـ**).

ئیتر دوای ئەمانە ئەوەش بزانین کە دیاردەی جووتیی لە هەموو دروستکراوەکانی تری گەردووندا هەیە هەر لە گەردیلەوە (بەرامبەر پرۆتۆنی موجەب ئەلیکترۆنی سالب هەیە و ... هتد) تاوەکو گەلەستێرەکان، و بەناو دروستکراوەکانیشدا هەر لە رووەك (کە نێر و مێی هەیە)، و ئاژەڵەکان، و شتە نازیندووەکانیش هەموویان بە جووتی هەن (کارەبا سارد و گەرمی هەیە، موگناتیس جەمسەری باکور و باشووری هەیە و ....هتد).

ئەم راستییە زانستییانە سەلمێنەری حەقیقەتە قورئانییەکەیە کە دەفەرموێت: ﴿وَمِن كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾ (الذاريات:٤٩)، واتە: لە هەموو شتێك ئێمە جووتمان دروست کردووە (لە جیهانی ئادەمیزاد و گیاندار و رووەك و بێگیانیشدا، لە هەموو شتێکی ماددی و مەعنەویدا)... بەڵام لەمە سەیرتر و سەرسوڕهێنەتر ئەو ئایەتەیە کە دەفەرموێت: ﴿سُبْحَانَ الَّذِي خَلَقَ الْأَزْوَاجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنبِتُ الْأَرْضُ وَمِنْ أَنفُسِهِمْ وَمِمَّا لَا يَعْلَمُونَ﴾ (يس:٣٦)، واتە: پاك و بێگەردی بۆ ئەو زاتەی هەر هەموو بەدیهێنراوەکانی بە جووت دروست کردووە لەوەی لە زەویدا دەڕوێت و لە لەشی خۆشیان و لەو شتانەش کە نایزانن.

لە سەردەمی عیلم و زانیاریدا ئەو راستییە روون بۆتەوە کە هەموو بەدیهێنراوان - ماددی ومەعنەوی- جووتن، و زۆرێك دروستکراوی جووت دۆزراونەتەوە و زانراون کە لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) بە هیچ شێوەیەك نەزانراوە، کەواتە ئەم ئایەتە پیرۆزە ئیعجازێکی هەواڵدانی تێدایە کە لە

داهاتوودا دیاردەی جووتیی لە چەندین دروستکراودا دەدۆزرێتەوە کە پێشتر کەس نەیزانیوە و بە خەیاڵیدا نەهاتووە؟!

**(نطفة)کە دەکەوێتە ناو مناڵدانەوە:**

لە فەرموودەیەکدا ئاماژەیەکی سەیر هاتووە: ﴿عن عبدالله بن مسعود (ﷺ) قال: إذَا وَقَعَت النُّطْفة فِي الرَّحِم، بَعَثَ اللهُ مَلَكاً فَقال: يا ربّ مُخَلَّقة أو غير مُخَلَّقة؟ فَإن قال: غَيْر مُخَلَّقة، مَجَّتْها الأَرْحامُ دَماً، وَإن قال: مُخَلَّقة، قالَ: يا رَبّ فَما صِفَة هَذه النُّطْفة؟ أَذَكَرٌ أَم أُنثى؟ مَا رِزْقُها؟ ما أَجَلُها؟ أَشَقيٌّ أَم سَعيد؟ قَال: فَيُقالُ لَه: انْطَلق إلى أُمّ الكتاب فاسْتَنْسِخ مِنْه صِفَة هَذه النُّطْفَة، قالَ: فَيَنْطَلق المَلَك فَيَنْسَخُها، فَلا تَزال حَتّى يَأْتِيَ عَلى آخِر صِفاتِها﴾[6]، واتە: کاتێك کە نوتفەکە (کۆرپەلەکە) دەکەوێتە ناو مناڵدانەوە، خوای گەورە فریشتەیەکی بۆ دەنێرێت، فریشتەکە پرسیار دەکات: پەروەردگار دروست دەبێت یان دروست نابێت؟ ئەگەر بفەرموێت دروست نابێت، ئەوا مناڵدان لەگەڵ خوێندا فڕێی دەداتە دەرەوە، و ئەگەر بفەرموێت دروست دەبێت، فریشتەکە پرسیار دەکات: ئەی پەروەردگار سیفاتەکانی ئەم کۆرپەلەیە چییە؟ ئایا نێرە یان مێیە؟ رزق و رۆزی چی دەبێت؟ و ئەجەل و کاتی مردنی کەی دەبێت؟ و ئایا خۆشبەخت یان سەرگەردان دەبێت؟ ووتی: لەو کاتەدا بە فریشتەکە دەووترێت: دەبچۆ بۆ لای دایکی کتێبەکان (اللوح المحفوظ) لەوێ هەموو سیفاتەکانی هەیە، لەوێ وێنەیەکی سیفاتی ئەم نوتفەیەی لەبەر بگرەوە، لەو کاتەدا فریشتەکە دەردەچێت و کۆپی دەکات، بەردەوام دەبێت لەو کۆپی کردنەکە تاوەکو دوایین سیفاتی کۆپی دەکات.

---

(6) رواه الطبري والطبراني بإسناد صحيح، قال العيني في (عمدة القاري شرح صحيح البخاري): (وهو موقوف لفظاً، مرفوع حكماً، لأن الإخبار عن شيء لا يدركه العقل محمول على السّماع)، إن هذا الخبر لا يقال من قبل الرأي، ولا سبيل الى معرفة هذا إلا عن طريق النبوّة، لذا وَجَب أن يقول هذا الحديث استناداً الى شيء عنده عن طريق الرسول (ﷺ).

**ئـەم فەرموودەیـە دوو ئاماژەی سەرسـوڕهێنەری تـری تێدایـە دەربـارەی چـەند کردارێـك کـە لـە کـاتی گەشـەی کۆرپەلەکـەدا روودەدەن، یـەکێکیان ئەوەیـە[7] کـە وەك کۆرپەلـەزانی نـوێ بۆمـان بـاس دەکـات دوای ئـەوەی کـە کۆرپەلـە سـەرەتایی‌یەکە دابـەش بـوون بەسـەریدا روودەدات و لـە تۆپـەڵێك خانە پێك هاتووە.**

**پاشان دەست دەکات بە جووڵان لـە سـەرەتای بۆری مناڵدانـەوە بۆ ئـەوەی خۆی بگەیەنێتە ناو مناڵدان (کە ئامادە کراوە بۆ پێشوازی کردنـی) (وێنـەی: ٤٨/ هـ)، هەر کە دەگاتە شوێنی بە یەك گەشتنی بۆری مناڵدان لەگەڵ مناڵدان خۆیدا بە خێرایی کۆرپەلەکە دەکەوێتـە نـاو مناڵدانـەوە -کە ئـەم کـردارە لـە چەند دەقیقەیەکدا روودەدات- و قەبارەی ئەم تۆپەڵە خانەیە (Blastocyst) زیاتر نی‌یە لە ٠,٧ میللیمەتر (بڕوانە وێنەی رەنگاوڕەنگی: ٤٩/ هـ).**

**فەرموودەکـە زۆر بـە ئاشـکرا دەفـەرموێت کـە نوتفەکـە دەکەوێتـە نـاو مناڵدانـەوە (إِذَا وَقَعَت النُّطْفَـةُ فِـي الـرَّحِم ...)، کە بە تـەواوەتی ئەمەیـە کە**

---

(7) ئامـاژەی دووەم کـە لـە فەرموودەکـەوە وەریـدەگرین بریتی‌یـە لـە دیـاردەی رووداني لەبارچـووني سەرەتایی (لە کاتێکی زۆر زووی سکپڕیدا): (فَإِن قال: غَيْر مُخَلَّقة، مَجَّتْها الأَرْحامُ دَماً)، کە ئـەم دیاردەیـە زۆر نوێ دۆزراوەتەوە، ئەویش لەبەر قورسیی زانینـی سـکپڕی لـەو کاتـە سـەرەتاییانەدا، ئـەویش لەبـەر ئەوەیە کە کۆرپەلەکە یەکسەر دوای کەوتنە ناو مناڵدانەوە یان دوای خۆچاندنی لـە دیوارەکـەیدا مناڵدان فڕێی دەداتە دەرەوە (کە هۆکاری ئەم دیاردەیە زۆر و جۆراوجۆرن)، ئەم کاتە نزیکە لە کاتی حـەیزەوە و ئافرەتەکە هیچ پێی نازانێت کـە سـکپڕ بـووە، کـە لەوانەیـە تـەنیا چـەند رۆژێك عادەکـەی دوابکـەوێت و وابزانێت ئاسایی‌یە، دوایی یەکسەر خوێن دێت و هەست ناکات کە سکپڕی بووە، بینراوە لەو ٤٥٪ی حاڵاتی لەبارچوون کـە روودەدەن (واتـە بەگشـتی ٤٥٪ی حـاڵاتی سـکپڕی بـە لەبارچـوون کۆتـایی دێـت و ٥٥٪ی سکپڕی‌یەکان سەرکەوتوو دەبێت) تـەنها ١٥٪ی ئافرەتەکـە پـێی دەزانێت و ٣٠٪ی تـری هـەر هەستیشـی پێناکات کە سکپڕی بووە و بە دواکەوتنی عادە لێکی دەداتەوە، لەڕاستیدا ئەم ئاماژەیـە بۆ لەبارچووني سەرەتایی خۆی لەخۆیدا ئیعجازێکی زانستی گەورەیە، چـونکە لـە سـەردەمێکدا ووتـراوە کـە هـیچ جـۆرە هۆکارێك نەبووە بۆ زانینی سکپڕی لە سەرەتای دروست بوونی کۆرپەلەدا!.

روودەدات لە کاتی چوونە ناوەوەی کۆرپەلەکە بۆ ناو منداڵدان[8]، ئەمەش ئیعجازێکی زانستی گەورەیە لەم فەرموودەیەدا، چونکە زۆر قورسە پێشبینی ئەم دیاردەیە بکرێت، مەگەر کەسێك نەبێت کە بەهۆی ووردبینی ئەلیکترۆنی‌یەوە چاودێری ووردی ئەم کردارانەی ناو منداڵدان بکات و ئەمە ببینێ، لەوانەیە زۆرێك (تەنانەت شارەزایانی کۆرپەلەزانیش) بە بیری خۆیان وابزانن کە کۆرپەلەکە لە کاتی چونە ناوەوەی بۆ منداڵدان بە هێمنی وەکو تۆپێك خوول دەخوات تا دەچێتە ناوی، هەربۆیە لایەنە ئیعجازی‌یەکەی لەم خاڵەدا دەردەکەوێت.

**رۆچوون و وون بوون لە منداڵدانەکاندا (غیض الأرحام):**

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿اللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَحْمِلُ كُلُّ أُنثَى وَمَا تَغِيضُ الأَرْحَامُ وَمَا تَزْدَادُ وَكُلُّ شَيْءٍ عِندَهُ بِمِقْدَارٍ﴾ (الرعد:٨)، واتە: تەنیا پەروەردگار خۆی دەزانێت کە ئافرەت لەکاتی سکپڕی‌دا چی هەڵگرتووە، و ئەوانەش کە لە منداڵدانەکاندا ڕۆدەچن، وون دەبن و تیا دەچن چین، یان زیاد بوونی منداڵدانەکان چی‌یە؟ و هەموو شتێك لای ئەو بە ئەندازەیە و قەدەری ووردی خۆی بۆ دانراوە.

هەروەها لە فەرموودەیەکی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە کە فەرموویەتی: ﴿وَلا يَعْلَمُ مَا تَغِيضُ الأَرْحَام إلاّ الله ...﴾ رواه البخاري، واتە: تەنها خودا خۆی دەزانێت ئەوانەی لە منداڵدانەکاندا ڕۆدەچن، وون دەبن و تیا دەچن چین؟!

---

(8) لە هەمان کاتدا ئەم فەرموودەیە ئاماژەیەکی ئیعجازی تری تێدایە کە: کۆرپەلە بەرهەمی منداڵدان خۆی نی‌یە و لە دەرەوەی منداڵداندا دروست دەبێت و دوایی دێتە ناوی (دەکەوێتە ناوی)، کە وەك پێشتر باسمان کرد تا سەدەی حەڤدەیەمیش زۆرێك لە زانایان وایان دەزانی کە کۆرپەلە یان دروست کراوێکی منداڵدان خۆیەتی و خۆی دەری دەدات، یان ئەوەیە کە لە خوێنی مانگانەوە دروست دەبێت، بەڵام فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) زۆر بەجوانی ئاماژە بەوە دەدات کە نوتفەی کۆرپەلەکە لە دەرەوەی منداڵدان دروست دەبێت و پاشان بەرەو ناو منداڵدان دەجووڵێت تاوەکو دەکەوێتە ناوی.

تۆ بڵێی ئەوانەی لەناو مناڵدانەکاندا ڕۆدەچن و وون دەبن یان زیاد دەکەن چی بن؟! ئایەتە پیرۆزەکە باسی دوو کردار دەکات کە لە مناڵدانددا روودەدەن و بریتین لە: ١- غیض الأرحام (کە بەم مانایانە دێت: چوونە ناوەوە یان ڕۆچوون یان ونبوون یان تیاچوون). ٢- إزدیاد الأرحام (واتە: زیاد بوون لە قەبارە یان بارستەدا).

لێرەدا باسی کرداری یەکەم دەکەین کە بریتییە لە: (غیض الأرحام)، سەرەتا با بزانین لە فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبیدا (غیض) بەمانای چی هاتووە؟ بەگشتی ئەم مانایانەی هەیە: ١-الغور خلال شيء أو نفوذ السائل الى الأعماق وذهابه وغيابه، كغوران الماء في الأراضي وابتلاعها. ٢- النقصان[9]. واتە: ١- چوونە ناوەوە یان ڕۆچوون بەناو شتێکدا، یان ڕۆچوونی شلەمەنی بەناو قووڵاییەکاندا و دیار نەمانی، وەکو ڕۆچوونی ئاو بەناو زەویدا و قووتدانی*. ٢-کەم بوون. سەبارەت بە تەفسیری ئایەتەکە (القرطبي) دەڵێت: (الغَيض: ما تُنقصه الأرحام من الدم والزيادة ما تزداد منه، وقيل: الغيض والزيادة يرجعان الى الولد)، واتە: (غیض) بریتییە لە کەمکردنی خوێن لە مناڵدانەکانەوە و زیادبوونیش لە قەبارەکەیدایە، و وتراوە (کەمبوون و زیادبوون) دەگەڕێتەوە بۆ بوونی منداڵەکە، لەگەڵ ئەوەشدا کە تەفسیرێکی زۆر جوانە و یەکدەگرێتەوە لەگەڵ زانیارییە نوێکانی کۆرپەلەزانیدا، بەڵام با ئاگاداربین کە کەم بوون و زیاد بوون تەنها بۆ خوێن ناگەڕێتەوە، ئەویش لەبەر ئەوەی کە دەستەواژەی ئایەتەکە ڕەهایە، هەربۆیە شتی تریش دەگرێتەوە.

---

(9) بڕوانە فەرهەنگەکانی (لسان العرب) و (المعجم الوسیط) لەژێر ماددەی (غیض)، هەروەها (معجم البلدان)/ باب الغین والیاء وما یلیهما.

* نموونەی ئەم مانایە لەو ئایەتە پیرۆزەدا دەبینین کە دەفەرموێت: ﴿وَقِيلَ يَا أَرْضُ ابْلَعِي مَاءَكِ وَيَا سَمَاءُ أَقْلِعِي وَغِيضَ الْمَاءُ﴾ (هود:٤٤)، واتە: پاشان فەرماندرا بە زەوی: ئاوەکەت با ڕۆبچێت بە ناختدا، ئەی ئاسمان: تۆش با بەس بێت و باران مەبارێنە، ئیتر ئاوەکە ڕۆچوو بەناو زەویدا.

ئەم فەرموودە پیرۆزانە قۆناغێکی پێشکەوتووی دروست بوونی کۆرپەلە باس دەکات هەر لەکاتی چوونە ژوورەوەی تۆو بۆ ناو منداڵدان تاوەکو ڕۆچوون و چوونە ناوەوەی نطفەی تێکەڵاو (النطفة الأمشاج)، ئایەتەکە باسی ڕۆچوون و کەمبوونەوە یان زیادبوونی شتێك یان هەردووکیان دەکات لەناو منداڵدانەکاندا کە زانیاری ئەم شتانە تەنها تایبەتە بە پەروەردگارەوە، و کاتێك هەردوو مانای (غیض) ببەستین بەیەکەوە بە ڕوونی مەبەستی فەرموودە پیرۆزەکان دەردەکەون، هەر لە سەرەتای دروست بوونی تۆو و هێلکەوە تاوەکو چاندنی نوتفەکە لەناو منداڵداندا (**وێنەی ڕەنگاوڕەنگی: ٥٠/ هـ**).

با بزانین زانستی نوێی کۆرپەلەزانی لەمڕۆدا چی دەڵێت لە بارەی ئەم شتانەوە: سەلمێنراوە کە لە هەر کارێکی جنسی‌دا پیاو زیاد لە ٥٠٠ ملیۆن تۆوی دەبێت کە تەنها یەك دانەیان هەلی ئەوەی هەیە کە ڕۆبچێت بەناو منداڵداندا و سەربکەوێت و سەفەرەکە تەواو بکات تا دەگاتە هێلکەکە، و ئەو تۆوانەی تر کە دەمێننەوە تیادەچن و وون دەبن لەناو منداڵدان و بۆری‌یەکەی‌دا، کە تەنها خودای ڕاگری ئەم ووردەکاری‌یە نەبێت کەسی تر نازانێت کە کام دانە لەم ٥٠٠ ملیۆن تۆوە ئەو هەلەی دەبێت (**وێنەی ٣-٤٠**)، تا ئێستا و لەداهاتوودا و هیچ کاتێکیش پێشکەوتنی زانستی ناگاتە ئەوەی ئەو دانەیە دیاری بکات کە لەناو منداڵداندا تیاناچێت، و دەگاتە هێلکەکە، مەگەر تەنها ئەم کردارە دەستی تێوەربدرێت و لە دەرەوەی منداڵدان بەیەك تۆو و هێلکەیەکی دیار کراو ئەنجام


وێنەی (٣-٤٠)

بدرێت، بەڵام زانینی ئەو تۆوە دیاری کراوە لەو ژمارە بێشومارە بە رێگەی ئاسایی هیچ کەسێك هەرگیز ناتوانێت بیزانێت، کەواتە لێرەوە بۆمان دەرکەوت کە هەردوو مانای غیض الأرحام لە تۆوی پیاودا چی‌یە.

لە ئافرەتیشدا ئەو هێلکەیەی کە هەڵی ئەم پیتاندنەی هەیە یەکێکە لە سەدان هەزار هێلکۆکە کە مانگانە لە هێلکەدانەکانەوە چالاك دەبن، و تەنها یەکێك لە توورەکەکانی گراف (Graafian Follicles) لەوانی تر زیاتر گەشە دەکات و سەرەنجام دەتەقێتە سەرەتای بۆری منالْدان، و سەردەکەوێت، و هەلی ئەوەی دەبێت کە لەگەلْ تۆوێکدا یەکبگرێت و هێلکەکانی تر دەپووکێنەوە و تیادەچن لەناو هێلکەدانەکاندا، هیچ کەسێك وهیچ تەکنۆلۆژیایەك ناتوانێت ئەو هێلکەیە دیاری بکات کە دەردەدەپەڕێت و تەنها پەروەردگار دەزانێت کە کامەیانە کاندیدی ئەم کردارەیە، ئەگەر لە سەرەتای بۆری منالْداندا تۆو نەبێت یان تۆوەکان چالاك و زیندوو نەبن و نەتوانن بگەنە شوێنی هێلکەکە، ئەوا ئەو هێلکەیەش وون دەبێت و تیادەچێت و بەناو منالْداندا ڕۆدەچێتە خوارەوە بۆ دەرەوە، کە لێرەشدا تەنها خوای گەورە نەبێت کەسی تر پیْی نازانێت، ئەمەش بریتی‌یە لە (غیض) لە هێلکەی ئافرەتدا ( وێنەی ٣-٤١ ).



دەبێت ئەم هێلکۆکەیە کامە بێت لەو هەزاران هێلکەیەی لە هێلکەدانەدا چالاك دەبن؟!

لە لایەکی ترەوە لەوانەیە پیتاندن رووبدات و هێلکەی پیتێنراو (Zygote) دروست ببێت، بەلام ئەم کۆرپەلەیە شکست بێنێت لەوەی کە خۆی بچێنێتە ناو دیواری منالدانەوە (Implantation)، کە ئەم حالەتە هۆکاری زۆری هەیە و کەمێکی زانستی ئەمڕۆ زانیویەتی و زۆری تەنها پەروەردگار دەیزانێت، کە سەرەنجام ئەو کۆرپەلەیە وون دەبێت و تیادەچێت و بەمنالداندا ڕۆدەچێتە خوارەوە، هەروەها لەوانەیە ئەو کۆرپەلەیە خۆی بچێنێتە ناو دیواری منالدانەوە ( وێنەی ٣-٤٢ ) ( **هەروەها وێنەی رەنگاورەنگی: ٥١/ هـ**)، و لە قەبارەشدا گەورە ببێت بەلام لە قۆناغێکی داهاتوودا تووشی لەبارچوون (Abortion) ببێت، و بەناو منالداندا رۆبچێتە دەرەوە.

تتجه الحويصلة التي تحمل البويضة من اعماق المبيض نحو السطح في مراحل متتالية حتى تنفجر على سطح المبيض نافرة الى قناة فالوب التي تلتقطها بالأهداب الإسبعية التي بها وتحتضنها متوجهة بها بسرعة في اتجاه الرحم حيث يتم تخصيبها وما هي الا أيام قلائل حتى تنغرس في جدار الرحم، وإذا هي علقة فمضغة فسلسلة معجزة من التطورات الى ان تصير بشرا سويا.

وێنەی ( ٣-٤٢ )

قۆناغەکانی کۆرپەلە لە پیتاندنەوە تا چوونە ناو دیواری منالدان.

سەبارەت بە لێکدانەوەی (غیض) بە لەبارچوون زۆرێک لە موفەسیران ئەم رایەیان هەیە: ئەوەتا لە کتێبی (المفردات في غريب القرآن للأصفهاني)دا هاتووە: (وَمَا تَغِيضُ الأَرْحَامُ: أي ما تفسده الأرحام فتجعله كالماء الذي تبتلعه الأرض) واتە: بە مانای ئەوە دێت کە منالدانەکان لەناوی دەبەن و خراپی دەکەن هەروەك چۆن زەوی ئاو قووت دەدات و لەناوی دەبات، (ئیبن عەباس و قەتادە) دەلێن: (وَمَا تَغِيضُ الأَرْحَامُ: السَّقْطُ) واتە: بریتی‌یە لە لەبارچوون، هەروەها (الضحاك) دەلێت: (أن تُسقِط المَرأة الوَلَد)، یان (حەسەنی بەسری) دەلێت: (الذي يَكون سقطا لغير تمام) یان دەلێت: (السَّقْط الناقص).

کەواتە پوختەی رای ئەم موفەسیرانە دەڵێت: (غیض) بریتی‌یە لەو کۆرپەلەیەی کە لە سکی دایکی دەکەوێتە خوارەوە پێش تەواو بوونی دروست بوونی، یان بریتی‌یە لەو کۆرپەلەیەی کە لەناو مناڵداندا لەناو دەچێت و شی‌دەبێتەوە و مناڵدان قووتی دەدات و شوێنەواری نامێنێت، بابزانین زانستی کۆرپەلەزانیش لەگەڵ ئەم رایەدایە؟

بێگومان بەڵێ، چونکە کۆرپەلە کە لە ٨ هەفتەی یەکەمی تەمەنی‌دا لەناودەچێت یان ئەوەیە فڕێ دەدرێتە دەرەوە، یان شی‌دەبێتەوە و بە تەواوەتی لەناو مناڵداندا نامێنێت.

زانایانی کۆرپەلەزانی ئەم دوو لەناوچوونە بە لەبارچوونی خۆیی سەرەتایی (Early Spontaneous Abortion) ناودەبەن، کە بە تەواوەتی لەگەڵ ووتەکانی ئەو زانایانەی تەفسیر و زمانەوانی‌دا یەکدەگرێتەوە، لەبارچوونی خۆیی بە هەموو ئەو حاڵەتانەی لەبارچوون دەووترێت کە پێش ٢٠ هەفتەی تەمەنی کۆرپەلەکە روودەدەن، کە زوربەی ئەم حاڵەتانە لە ٨ هەفتەی یەکەمدا روودەدەن، ئەم حاڵەتە زۆر باوە و زۆر جار ئافرەتەکە هەست بە روودانی ناکات، بەزۆری ئەو ژنانەی کە سوورەکەیان هەفتەیەك یان دوو هەفتە دوادەکەوێت و دوایی بە رێژەیەکی زۆر خوێنیان دەبێت، ئەمانە بە حاڵەتی لەبارچوونی خۆیی دادەنرێن.

رێژەی ئەم لەبارچوونە پێش ٤ هەفتە دەگاتە ٤٠٪ی سکپڕی‌یەکان، دوای ٤ هەفتەش دەگاتە ١٥-٢٠٪، ئیدمۆندز (Edmonds) و هاوڕێکانی لە ساڵی (١٩٨٢)دا هەستان بە توێژینەوەیەك، ئەویش بە پشکنینی میز بۆ سەلماندنی سکپڕی لە ١٩٨ ئافرەتی تەندروستی ئامادە بۆ سکپڕی‌دا، بینی‌یان کە (١١٨)یان دووگیانن، ئەوەبوو لەدوایی‌دا (٦٧)یان لەباریانچوو بەبێ ئەوەی خۆیان بزانن کە سکپڕی‌یان هەیە (ئەم رێژەیە زۆرجار دەگاتە

٦٠٪)، لە زۆرێك لە توێژینەوەی تر لەسەر لەبارچوونی خۆیی بینرا کە کۆرپەلەکە لەناو کیسەکەیدا نەماوە و شیبۆتەوە، نەبوونی کۆرپەلەکەش لە کیسەکەیدا پێی دەووترێت توورەکەی بەتاڵی سکپڕی (وێنەی ٣-٤٣)، ئەمە بەتایبەتی لە حاڵەتی نەمانی دووانە (Vanishing Twin Syndrome)دا بینراوە، لەوانەشە کۆرپەلە لەناوچووەکە نەکەوێتە خوارەوە و بۆ ماوەیەکی زۆر لە منالْداندا بمێنێتەوە، کە ئەم حاڵەتە پێی دەووترێت لەبارچوونی لەبیرچوو (Missed Abortion) کە قەبارەی منالْدان بچووك دەبێتەوە و شلەی ئەمینیۆنی دەمژرێتەوە و لە کۆتاییدا ئەمیش بە کەوتنە خوارەوە دوایی دێت (وێنەی ٣-٤٤)، لە هەندێك حاڵەتی دەگمەندا کۆرپەلەکە بە تەواوەتی نامێنێت، سەرچاوە پزیشکییەکان دەڵێن: تا ئێستا وەڵامی تەواوی ئەو پرسیارە نەزانراوە: بۆ هەندێك کۆرپەلە دوای مردنیان دەکەونە خوارەوە و هەندێکی تریان ناکەونە خوارەوە.




وێنەی سکپڕییەك لە هەفتەی شەشەمدا کە بە ئامێری سۆنەر گیراوە، و کیسی سکپڕی دەردەخات بەبێ بوونی کۆرپەلەکە. ئەمە حاڵەتێکی نەمانی کۆرپەلەکەیە لەناوسکدا.

وێنەی پرکەیەکی منالْدان کە بە سۆنەر گیراوە و سکپڕییەکی دووانە دەردەخات کە یەکێکیان کۆرپەلەی تێدایە و ئەوی تریان نەماوە و خاڵییە. پاش ماوەیەکی تر ئەم کیسە خاڵییەش نامێنێت.

لە توێژینەوەیەکی هەردوو زانا هێرتیج و شیلْدۆن (Hertig & Sheldon)دا کە لە ساڵی ١٩٤٣ لەسەر ١٠٠٠ حاڵەتی لەبارچوونی خۆیی ئەنجامیاندابوو، بینییان کە کۆرپەلەکە لە ٤٩٪ی حاڵەتەکاندا شیبۆتەوە و نەمابوو، حاڵەتێکی تر کە ئێستا بڵاوییەکەی دەرکەوتووە بریتییە لە حاڵەتی نەمانی

دووانە (Vanishing Twin Syndrome) کە بینراوە یەکێك لە دوو کۆرپەلە دووانەکە نامێنێت و لەناو دەچێت لە منالدانداو هیچ شوێنەوارێکی نامێنێت لە سەرەتای سکپڕیدا، ئەمە بە یارمەتی ئامێری سۆنەر (Ultrasound) دۆزراوەتەوە، هەردوو زانا (رۆبنسۆن و جانیس) لە ساڵی ١٩٧٧دا بەدواداچوونیان کرد بە ئامێری سۆنەر بۆ ٣٠ ئافرەتی دووگیان کە سکەکەیان دووانە بوو لە ٣ مانگی یەکەمی سکپڕیدا، ئەنجامەکان بەم شێوەیە بوون:




وێنەیەکی سۆنەریی کیسێکی سکپڕی لە هەفتەی شەشەمدا، کە کیسەکە بە بەتاڵی دەبینرێت بەبێ بوونی هیچ کۆرپەلەیەك یان هاوپێچەکانی، کە رۆچووە و لەناوچووە، ئەمەش حاڵەتێکی لەبارچوونی لەبیرچووە.

(١٤)یان دووانەیان بوو، (١١)یان تەنها یەکی یەك منالیان بوو، یەکێکیان توورەکەی سکپڕییەکەی خاڵی بوو، و چوارەکەی تر هیچیان نەبوو (کە کۆرپەلەکان لەلایەن منالدانەوە شیبوو بوونەوە و هەڵمژرا بوون).

زانایانی موسوڵمان لە چەندین سەدە لە پێش زانستی نوێوە ئاماژەیان داوە بە کۆرپەلە لەناوچووەکانی ناو منالدانەکان، ئەوەتا زانا (إبن عطیة الأندلسي)یش دەڵێت: (غیض) بریتییە لە لەناوچوون و نەمانی شتێك لە منالدانەکاندا، خوا پاداشتی خێری (شێخ عبدالرحمن بن ناصر السعدي) بداتەوە کە لە تەفسیری (تیسیر الکریم الرحمن في تفسیر کلام المنان)دا وەك ئەوەی بڵێیت کە توێژینەوەی لەسەر کۆرپەلە لەناو چووەکان کردبێت یان لە نوێترین سەرچاوەی پزیشکیدا خوێندبێتییەوە کە دەڵێت: (وَمَا تَغِيضُ الأَرْحَامُ) واتە: کەم دەکات لەناویدا، بەوەی کە یان سکپڕییەکە لەناو دەچێت (کە وەك ووتمان ئەمە ئەو کۆرپەلانەیە کە منالدان فڕێیان دەدەنە دەرەوە)، یان

**بچووك دەبێتەوە** (کە وەك ووتمان ئەمە بریتییە لە لەبارچوونی لەبیرچوو کە کۆرپەلەکە دەچێتەوەیەك و بچووك دەبێتەوە)، **یان بە تەواوەتی نامێنێت** (کە بریتین لەو کۆرپەلانەی کە لەناو منالدانەکاندا لەناودەچن و شیدەبنەوە و شوێنەواریان نامێنێت).

ئەم تەفسیرەی ئاماژەکەی قورئان ئیعجازێکی زانستی زۆر گەورەی تێدایە، چونکە عەرەب لەگەڵ ئەوەشدا کە مانای زاراوەی (غیض)یان دەزانی بەڵام بە هیچ شێوەیەك بە زاراوەی (وَمَا تَغِيضُ الأَرْحَامُ) بەکاریان نەهێناوە، کە ئەمە پێشدەستییەکی گەورەی قورئانە، و لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا لەگەڵ بەرەوپێش چوونی زانستی کۆرپەلەزانیدا مانا وورد و گشتگیرەکەی بە تەواوەتی دۆزراوەتەوە.

ووردەکاری و داهاتووی کۆرپەلە تەنها خودا نەبێت کەس نایزانێت، دیارە زانستی پزیشکی هەندێك لە لەبارچوون و هۆکارەکانی زانیوە بەڵام هەموو راستییەکانی تەنها لەلای پەروەردگارە کە تەنها ئەو پاشەرۆژ، بەتایبەتی پاشەرۆژی کۆرپەلە دەزانێت، کەواتە لەمانەی پێشەوە بۆمان دەرکەوت کە کرداری وونبوون، تیاچوون و رۆچوون بەناو منالدانەکاندا لە هەموو قۆناغەکانی گەشەکردنی کۆرپەلەدا هەلی روودانیهەیە، و تەنها پەروەردگار زانیاری تەواوی لەسەریان هەیە، کە ئەمانە هەمووی سەلمێنەری کرداری (غیض)ن وەکو چۆن لە فەرموودە پیرۆزەکاندا هاتووە و هەموو ماناکانی بە روونی دەرکەوتن.

ئەگەر زۆر بە کورتی مانای تەواوی (غیض) وەك لە ئایەتەکەدا هاتووە باس بکەین دەبینین کۆرپەلەزانی بۆمان باس دەکات کە نوتفە وەك چۆن تۆو بەناو زەویدا رۆدەچێت و شوێنی خۆی دەکاتەوە، بە هەمان شێوەش ئەم نوتفەیە دیواری منالدان شەق دەکات و تێیدا دفن دەبێت و دیار نامێنێت

(بڕوانــە وێنــەی: ٥٢/ هــ)، هەربۆیــە دەبیــنین هــەموو کتێبــەکانی توێکــاری و کۆرپەلەزانی ئەم کردارە بە چاندن (الغرس Implantation) باس دەکەن (وێنەی ٣-٤٥) (هەروەها بڕوانە وێنەی ڕەنگاوڕەنگی: ٥٣/ هـ)، و منداڵدان بە زەوی دەشـوبهێنن کـە کاتێـك تـۆوی تـێدا دادەنرێـت و دوایـی دەڕوێـت، زانایـانی کۆرپەلەزانی بە خەیاڵی خۆیان وادەزانن کە وەسفێکی وورد و بێنموونەیان کردووە بۆ ئـەم کـردارەی کۆرپەلـەزانی کـە لەگـەڵ واقیعدا دەگونجێت، بەڵام بێگومان بە تـەواوەتی سـەریان دەسوڕمێت کاتێك دەبینن کە قورئانی پیرۆز وەسفی ئافرەتی بەمـە کـردووە: ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ ...﴾ (البقرة: ٢٢٢)، واتە: خێزانەکانتان شوێنی چاندنی ئێوەن!!



وێنەی (٢-٤٥)
کۆرپەلە لە دەرچوونییەوە لە هێلکەدان تاوەکو خۆچاندنی لە دیواری منداڵداندا

کەواتـە خوێنـەری بـەڕێز تێبینـی ئەوە بکە کە نوتفەکە ڕۆدەچێتە ناو منداڵدانــەوە و لەلایــەکی تــرەوە کــە دەچێتە ناوی ڕووپۆشەکەی لەدەست دەدات و هــەروەها بەشــێکیش لــە کۆرپەلەکـە خـۆی جیادەبێتـەوە بـۆ دروست کردنی ووێڵاش و بەشەکەی تری دەمێنێتـەوە، کەواتـە ڕۆدەچێت و لێی کـەم دەبێتـەوە بـە تـەواوەتی وەك ماناکـانی زاراوەی (غـیض) کـە هیچ زاراوەیەکی تر نییە هەردوو ئەم مانایە لەخۆ بگرێت.

**تێبینییەکی پێوویست:**

لە ئایەتێکی قورئاندا باسی کلیلـەکانی غـەیب کراوە کە دەفـەرموێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ عِندَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَداً وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾ (لقمان:٣٤)، واتـە: عیلم و

زانینــی کــاتی ڕۆژی دوایــی تــەنها لای خودایــە، و هەرئەویشــە کــە بــاران دەبارێنێت، و دەزانێت چی لەناو منداڵدانەکاندایە، و هیچ کەسێك نازانێت کە سبەینێ کاری چی دەبێت و چی ڕوودەدات، و کەسیش نازانێت کە کەی و لەکوێ دەمرێت، بەڕاستی خودایە کە زانا و شارەزایە بە هەموو شتێك.

هــەروەها لــە فەرموودەیــەکی پێغەمبەریشــدا (ﷺ) ڕوونکردنــەوەی ئەمانــە هاتووە کە دەفەرموێت: ﴿عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضي الله عَنهُما) عَنِ النَّبِــيِّ (ﷺ) قَــالَ: «مَفَاتِيحُ الْغَيْبِ خَمْسٌ لاَ يَعْلَمُهَا إِلاَّ اللَّهُ: لاَ يَعْلَمُ مَا فِي غَدٍ إِلاَّ اللَّهُ، وَلاَ يَعْلَمُ مَا تَغِيضُ الأَرْحَامُ إِلاَّ اللَّهُ ، وَلاَ يَعْلَمُ مَتَى يَأْتِي الْمَطَرُ أَحَدٌ إِلاَّ اللَّهُ ، وَلاَ تَدْرِي نَفْسٌ بِــأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِلاَّ اللَّهُ ، وَلاَ يَعْلَمُ مَتَى تَقُومُ السَّاعَةُ إِلاَّ اللَّهُ»﴾ رواه البخـاري، واتــە: کلیلــەکانی غــەیب و شــتە شــاراوەکان کــە تــەنها خــودا دەیانزانێت پێــنجن: تــەنها خــودا دەزانێــت کــە ســبەینێ (واتــە لــە داهــاتوودا) چــی ڕوودەدات، و تــەنها خــودا دەزانێت کە ئەوەی لەناو منداڵدانەکاندا ڕۆدەچێت چییە ....

دەربــارەی ئــەم کلیلانــەی غــەیب گفتوگــۆی زۆر کــراوە لــە نێــوان قوتابیــانی قوتابخانە ئاینییـەکان و قوتابیـانی قوتابخانـە زانستییەکانەوە، بـە تایبـەتی دەربارەی ڕەگەزی کۆرپەلەکە کە ئایا نێرە یان مێیە؟

ئــەمان وادەزانــن بــە شــێوەیەکی ڕووکەشــییانە کــە کــەس بــۆی نییــە بــە ڕەهایی ئەمـە بزانێت، و ئـەوانیش بە بێبڕوایـی دەڵێن: زانسـت مـادەم ئێسـتا ئەمە دەزانێت کەواتە دەقەکان هەڵدەوەشێنێتەوە؟!

زانایــانی موســوڵمان لــەم ســەردەمەدا زۆر خــەریکی ئەمــە بــوون، و پــاش هەوڵێکی زۆر ئینجا گەیشـتنە مانـا ڕاستەقینەکەی ئایەتەکە لـەژێر ڕۆشـنایی زانستی نوێدا، بەڵام تێبینی ئەوەیان نەکردووە کە ئیمامی ڕاڤەکاری قورئـان (إبن كثير) پێش چەندین سـەدە هـەمان بۆچـوونی هـەبووە دەربـارەی ئایـەت و فەرموودەکـە، خـەڵکی بەشـێوەیەکی گشـتی ئـەم ئایەتـەیان لێـك دەدایـەوە و دەیانووت ئەوەی بڵێت من دەزانم چی لەسکی دایکدایە ئەوا بێباوەڕ بووە!!

بـەڵام زانـای موسـوڵمان (إبـن كـثير) هـەموو دەقـەكانی لـەم بابەتـەدا كۆكردووەتـەوە و پاشـان گەیشـتە راقـەی دروسـتی ئـەم بابەتـە، باشـە چـۆن دەبێت بەڕەهایی بڵێین زانینی ئەوەی لە سكی دایكدایە بریتییە لە كلیلێكی غـەیب؟! ئـەی ئـەوە نییـە لـە فـەرموودەی تـردا هـاتووە كـە دوای ٤٢ ڕۆژ فریشتەكان دەزانن كە ئەو كۆرپەلەیـە نێرە یـان مـێیی؟ رزق و ڕۆزی چـییە؟ ئایا خۆشبەخت یان بەدبەخت دەبێت؟

لێرەدا ئیمامی (إبن كثير) زۆر بەجوانی مانای هەموو فەرموودەكان پێكەوە كۆدەكاتـەوە و دەڵێـت: هـیچ كەسـێك دەربـارەی ئـەوەی لەسـكی دایكدایـە (كۆرپەلە) هیچ زانیارییەكی نییە پێش زانینی فریشتەكان بەو زانیارییانـە، هەر كاتێكیش فریشتەكە زانی ئیتر ئێمـەش توانـای زانینیمـان دەبێـت، لەبەر ئەوەی غەیری پەروەردگار پێی زانیوە، كە بریتییە لە فریشتەكە و ئەوانەی كە پەروەردگاری وویستی هەبێت بزانن لە بەندەكانی.

كەواتە ئەو فەرموودانەی پێغەمبەر: {لەوانە فەرموودەی: ﴿عَنْ أَبِى الزُّبَيْرِ الْمَكِّىِّ أَنَّ عَامِرَ بْنَ وَاثِلَةَ حَدَّثَهُ أَنَّهُ سَمِعَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مَسْعُودٍ يَقُولُ: الشَّقِيُّ مَنْ شَقِيَ فِي بَطْنِ أُمِّهِ وَالسَّعِيدُ مَنْ وُعِظَ بِغَيْرِهِ . فَأَتَى رَجُلاً مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) يُقَالُ لَهُ حُذَيْفَةُ بْنُ أَسِيدٍ الْغِفَارِيُّ فَحَدَّثَهُ بِذَلِكَ مِنْ قَوْلِ ابْنِ مَسْعُودٍ، فَقَالَ: وَكَيْفَ يَشْقَى رَجُلٌ بِغَيْرِ عَمَلٍ، فَقَالَ لَهُ الرَّجُلُ: أَتَعْجَبُ مِنْ ذَلِكَ فَإِنِّى سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: « إِذَا مَرَّ بِالنُّطْفَةِ ثِنْتَانِ وَأَرْبَعُونَ لَيْلَةً بَعَثَ اللَّهُ إِلَيْهَا مَلَكاً فَصَوَّرَهَا وَخَلَقَ سَمْعَهَا وَبَصَرَهَا وَجِلْدَهَا وَلَحْمَهَا وَعِظَامَهَا ثُمَّ . قَالَ يَا رَبِّ أَذَكَرٌ أَمْ أُنْثَى فَيَقْضِى رَبُّكَ مَا شَاءَ وَيَكْتُبُ الْمَلَكُ ثُمَّ يَقُولُ يَا رَبِّ أَجَلُهُ . فَيَقُولُ رَبُّكَ مَا شَاءَ وَيَكْتُبُ الْمَلَكُ ثُمَّ يَقُولُ يَا رَبِّ رِزْقُهُ . فَيَقْضِى رَبُّكَ مَا شَاءَ وَيَكْتُبُ الْمَلَكُ ثُمَّ يَخْرُجُ الْمَلَكُ بِالصَّحِيفَةِ فِى يَدِهِ فَلاَ يَزِيدُ عَلَى مَا أُمِرَ وَلاَ يَنْقُصُ﴾ رواه مسلم}، ئەم فەرموودانە تایبەتین و راڤەی دەقە گشتییەكەی قورئانیـان كـردووە ﴿إِنَّ اللَّهَ عِنْدَهُ عِلْمُ

السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ ....﴾، و لێرەوە بۆمان روون بووەوە کە ئەوەی شاراوەتەوە لە کاتێك و قۆناغێکی دیاری کراوی گەشەی کۆرپەلەکەدایە نەك بە گشتی.



رۆچوونی کۆرپەلە لە منالداندا و زیادبوونی منالدانەکان بە پێی ئایەتی: [... وَمَا تَغِيضُ الْأَرْحَامُ وَمَا تَزْدَادُ ....]

ئەگەر بڕوانینە فەرموودەکەی پێغەمبەریش (ﷺ) کە دەفەرموێت: ﴿مَفَاتِحُ الْغَيْبِ خَمْسٌ لاَ يَعْلَمُهَا إِلاَّ اللَّهُ: لاَ يَعْلَمُ مَا فِي غَدٍ إِلاَّ اللَّهُ، وَلاَ يَعْلَمُ مَا تَغِيضُ الْأَرْحَامُ إِلاَّ اللَّهُ ....﴾ رواه البخاري، واتە: کلیلەکانی غەیب و شتە شاراوەکان کە تەنها خودا دەیانزانێت پێنجن: تەنها خودا دەزانێت کە سبەینێ (واتە لە داهاتوودا) چی روودەدات، و تەنها خودا دەزانێت کە ئەوەی بەناو منالدانەکاندا رۆدەچێت چی‌یە ....

دەبینین پێغەمبەر (ﷺ) تەنها باسی (مَا تَغِيضُ الْأَرْحَامُ)ی کردووە واتە ئەوەی لە منالداندا رۆدەچێت، و باسی زاراوەی (وَمَا تَزْدَادُ)ی ئایەتەکەی نەکردووە (بە مانای ئەوەی لە منالدانەکاندا زیاد دەبن) (وێنەی ٣-٤٦)، ئەمەش بەڵگەیەکی ترە کە ئەوەی کەس نایزانێت تەنها پەروەردگار نەبێت، و ئەوەی لە عیلمی غەیری خودا شاراوەتەوە تەنها لە قۆناغی رۆچوون و (غَيض)دایە، نەك لە قۆناغی زیادبوونی منالدانەکاندا (ئەم بابەتە لە سەرە بابەتی داهاتوودا باس کراوە)، چونکە لەو قۆناغی رۆچوونەدا مەحاڵە کەس

بزانێت کە ئەو کۆرپەلەیە چی‌یە و چی دەردەچێت، ئەمەش وەك ئەوە وایە کە وەستایەك دوو ریز بەرد هەڵچنێت و بڵێت من لەم بەردانە بینایەك دروست دەکەم؟ ئایا لەو قۆناغەدا کەس دەزانێت بەهۆی ئەو دوو ریزە بەردانەوە کە ئایا لە داهاتوودا ئەو بینایە چی دەبێت؟! ئایا نەخۆشخانە دەردەچێت؟ یان قوتابخانە؟ یان خانوویەکی نیشتەجێ بوون؟! بێگومان نەخێر...

مرۆڤیش لەو قۆناغەدا تەنها لە دوو ریز خانە پێك هاتووە، ئەگەر زۆر هەوڵیش بدەین و بمانەوێت بزانین ئەو کۆرپەلەیە چی‌یە سەرکەوتوو نابین، چونکە بۆ نموونە ئەگەر تەنانەت خانەیەکیش وەرگرین لە کۆرپەلە لەو کاتەدا لەوانەیە ببێتە هۆی لەبارچوون و لەناو بردنی کۆرپەلەکە، چونکە ئەو خانەیە لەوانەیە ئەوە بێت کە لە داهاتوودا کۆئەندامی هەناسە دروست دەکات (بابزانین کە هەموو ئەندامەکانی کۆرپەلە لەو کاتە سەرەتایەدا لە یەك خانە یان زیاتر پێکهاتووە).

دەربارەی ئەم بابەتە پرۆفیسۆر (عبدالمجید الزنداني) سەرۆکی زانکۆی (الإیمان) لە (یەمەن) پرسیاری کرد لە زانای توێکاری و کۆرپەلەزانی ئەمریکی (مارشاڵ جۆنسۆن) کە یەکێکە لە زانا پسپۆڕە گەورەکانی جیهان بە تایبەتی لە بواری زانستی بۆماوەیی و توێژینەوە لە کرۆمۆسۆمەکان لە ئەمریکادا، لێی پرسی: ئایا ئێوە هەوڵتان داوە بزانن سیفاتی کۆرپەلە چی‌یە لە قۆناغە سەرەتایی‌یەکانی‌دا بە تایبەتی لە کاتی ڕۆچوونی لەناو مناڵداندا، ئەویش ووتی: بەڵێ، من خۆم چەندین تاقی کردنەوەم لەسەر هەندێك لە کرۆمۆسۆمەکان کرد (کە هەڵگری سیفاتی بۆماوەیین) (**وێنەی ٣-٤٧**)، و ئەم توێژینەوەیەم زیاتر لە ١٠ساڵی خایاند، کە من هەوڵم دەدا بزانم چۆن ئەم زیندەوەرە گەشە دەکات لەمانەوە؟ و چی شتێك لەمەوە بە تایبەتی گەشە دەکات؟ زیندانی دەڵێت لێم پرسی: ئەنجامی ئەم تاقی کردنەوە و

GENETIC PRINCIPLES

وێنەی (٢-٤٧)

کرۆمۆسۆمەکان کە هەڵگری سیفاتی بۆماوەیی کۆرپەلەکەن

توێژینەوەیەت چی بوو؟ ئەویش ووتی: من گریام پاش ئەو ماوەیە، لەبەر ئەوەی شکستم هێنا و نەمتوانی هیچ شتێك لەو بارەیەوە بدۆزمەوە و بزانم. زیندانیش دەڵێت پێم ووت: دەستت خۆش بێت. بەڵام بزانکە ئەم شتە لەلای ئێمە ئامارەی پێدراوە، کە کەس ناتوانێت لەو قۆناغەدا هیچ دەربارەی کۆرپەلەکە بزانێت و تێبگات ئەگەر زۆریش هەوڵ بدات.

کەواتە وەك زانا (إبن كثير) زۆر بەجوانی لێکی داوەتەوە: شارراوەیی سیفاتەکانی کۆرپەلەکە و نەزانین دەربارەی تەنها لە ماوەیەکی دیاری کراودایە، و هەر کاتێك کە فریشتەکە زانی ئیتر ئەم شارراوەیی‌یە نامێنێت، و فەرموودەکەی پێغەمبەریش (ﷺ) ئەوەی بۆ روون کردووینەتەوە کە لە قۆناغی رۆچوون (غَـــيض)دا بە تەنها نازانرێت، و ئەمەیە کە یەکێکە لە کلیلەکانی غەیب و شارراوەیە، پاشان کاتێك کۆرپەلەکە یەکسەر دەچێتە قۆناغی زیادبوونەوە ئەوا ئەم زانیاری‌یانە دەکرێنەوە بو مرۆڤەکان و دەتوانین ئێمەش وەك فریشتەکان زانیاریمان لەم بارەوە دەست کەوێت.

لە کۆتایی‌دا ئەوەمان لەبیر نەچێت کە دیاری کردنی سیفاتی بۆماوەیی ئەم زیندەوەرە نوێ‌یە کە لەسەر کرمۆسۆمەکان نووسراوە، و تێکەڵاویی ئەم سیفاتانە لە دایك و باوکەوە، و کام سیفەت زاڵ و کام سیفەت بەزیو دەبێت، دووپاتی دەکەینەوە کە ئەمانە هەمووی تەنها لە زانیاری خودادایە، و هیچ

مرۆڤێك و هیچ تەكنۆلۆژیایەك لەم سەرەتایەی كۆرپەلەدا ناتوانێت بیزانێت، بۆ نموونە: ڕەنگی چاو، ڕەنگیپێست، ڕاددەی زیرەكی و ژیریی، سیفاتی ماسولكەكان و تواناكانی، توانا دەمارییەكانی، و شتەكانی تری كۆرپەلەكە ئایا چۆن دەردەچێت؟ هەرچەندێك زانست بەرەو پێش بچێت ناتوانێت دیارییان بكات.

پاك و بێگەردی بۆ ئەو پەروەردگارەی كە كلیلی هەموو نهێنییەكان لەلای ئەوە و نموونەی بەرز تەنها بۆ ئەوە، و هەر ئەوە كە گەورەترین و ووردەكارترین دروست كەرە.

**زیادبوونی مناڵدانەكان ( إزدیاد الأرحام ):**

هەمان ئایەتی پیرۆزی سەرەوە (اللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَحْمِلُ كُلُّ أُنثَى وَمَا تَغِيضُ الأَرْحَامُ وَمَا تَزْدَادُ) باسی ڕوودانی كردارێكی تر دەكات لەناو منالدانەكاندا كە تەنها پەروەردگار زانیاری دەربارەی هەیە، كە ئەویش زیادبوونی منالدانەكانە.

زانایانی كۆرپەلەزانی بۆمان باس دەكەن كە لە ڕۆژی دوانزەیەمینی گەشەی كۆرپەلەكەدا بەرزاییەكی بچووك بەقەدەر نوكتەیەك لە دیواری منالدانەوە دەردەكەوێت ( وێنەی ٣-٤٨ )، كە بریتییە لەو كۆرپەلەیەی خۆی چاندووە، و ئەمەیان وەك سەرەتای زیاد بوونی منالدان بەهۆی كۆرپەلەكەوە دیاری كردووە، كە پاشان ئەم نوكتەیە وورده وورده زیاد دەكات لەگەڵ بەرەو پێش چوونی گەشەی كۆرپەلەكەدا و سەرەنجام هەموو ناو منالدان پڕدەكاتەوە.

لەلایەكی ترەوە پێویست دەكات باسی ئەو گۆڕانكارییانە بكەین كە هەموو مانگێك بەسەر منالداندا دێت بۆ ئەوەی گونجاو بێت بۆ پێشوازی كردن لە كۆرپەلەكە (ئەگەر دروست ببێت) و گۆش گرتنی، لەبری ئەوەی كە دەری بكاتە دەرەوە بە هاوشێوەی هەر تەنێكی بێگانە كە بچێتە ناو لەشەوە، ئەمەش بریتییە لە شێوازێكی تری زیادبوونی منالدانەكان (**وێنەی: ٥٤/هـ**).




**وێنەی (٣-٤٨): کۆرپەلە لە پیتاندنەوە تاوەکو چاندن لە دیواری منالْداندا:**

١: قۆناغەکانی دروست بوونی هێلکۆکە. ٢ ، ٣: یەکگرتنی سپێرم و هێلکۆکەکە.

٤: گەشتی هێلکەی پیتێنراو (زایگۆت) بۆ ناو منالْدان کە بە خۆچاندن لە دیوارەکەیدا کۆتایی دێت.

٥: وێنەیەکی راستەقینەی ووردبینیی کۆرپەلەیەك کە خۆی چاندووەتە ناو دیواری منالْدان و لە دیوارەکەیدا وەك نوکتەیەك و بەرزاییەك دەرکەوتووە.

بینراوە کە منالدان مانگانە لە کاتی سووڕی بێنوێژیدا (الدورة الحیضیة Menstrual Cycle) بە سێ قۆناغی سەرەکیدا دەڕوات، کە بریتین لە:

**١- قۆناغی گەشە کردن (Proliferative Phase):** کە تێیدا هێلکۆکەکانی ناو هێلکەدانەکان هان دەدرێن بۆ گەشە کردن و هەروەها ڕێژەیەکی زیاتریش لە هۆرمۆنی مێینە (ئیسترۆجین) لە هێلکەدانەوە دەڕێژرێت کە لەگەڵ خوێندا دەچێت بۆ منالدان و دەبێتە هۆی زیاد بوونی قەبارەی ناوپۆشی منالدان، کە لە نیو میللیمەترەوە ئەستوور دەبێت بۆ (٥ملم) و لوولە خوێنەکان ئەوەندە گەورە دەبن تاوەکو پێچاوپێچ دەبن و ڕژێنەکانی منالدانیش وەك بۆری درێژیان لێدێت (**بڕوانە وێنەی ڕەنگاوڕەنگی: ٥٥/ هـ**).

**٢- قۆناغی دەردان و ڕژاندن (Secretory Phase):** بەهۆی زیادبوونی زۆری ڕێژەی ئیسترۆجینەوە، ژێرمێشکە ڕژێن هاندەدرێت بۆ ڕژاندنی زۆری هۆرمۆنی (L.H: Luteinizing Hormone)، کە کارێکی وادەکات هێلکۆکەیەك لە یەکێك لە هێلکەدانەکانەوە دەرپەڕێت، پاشماوەی هێلکەکە لە ناو هێلکەدانەکەدا تەنی زەرد (Corpus Luteum) دروست دەکات، کە هەڵدەستێت بە ڕژاندنی زیاتری هۆرمۆنی ئیسترۆجین و هەروەها هۆرمۆنی پرۆجیستیرۆن (Progesterone)یش، کە هەردو ئەم هۆرمۆنە کاردەکەنە سەر ناوپۆشی منالدان بۆ ئەوەی ئامادە بێت بۆ پێشوازی کۆرپەلە، لێرەدا ناوپۆشەکە لە (٥ملم)ەوە بۆ (٨ملم) ئەستوور دەبێت، و ڕژێنە ڕەحمی‌یەکان ئێجگار زیاد و گەورە دەبن و ناویان پڕدەبێت لە دەردراو و هەروەها خوێنبەرەکانی منالدان و دیوارەکەی گەورە و زیاد دەبن (**بڕوانە وێنەی ڕەنگاوڕەنگی: ٥٤/ هـ**).

ئەم دوو قۆناغە پێکەوە پێیان دەووترێت **قۆناغی زیاد بوونی گەشەی منالدان** کە تێیدا منالدان ئامادە دەکرێت بۆ وەرگرتنی هێلکە پیتێنراوەکە

بۆ ئەوەی کە کۆرپەلەی لێوە دروست ببێت ( وێنەی ٣-٤٩ )، لێرەدا ئیعجازی گەورەی ئایەتە پیرۆزەکەمان بۆ دەردەکەوێت کە وەسفی زیاد بوون و گەشەی منداڵدان دەکات، کە وەك وتمان زیادبوون بریتی‌یە لەم دوو قۆناغەی مانگانەی منداڵدان کە تێ‌یدا لە قەبارەدا گەورە دەبێت و ژمارە و قەبارەی لوولەکانی خوێن و رژێنەکان زیاد دەکات، خۆئامادە کردن بۆ وەرگرتنی نوتفەکە بە ئەستوور بوونی دیواری منداڵدان و زیاد بوونی گلایکۆجین و رژێنی هەڵگیراو لە دیوارەکەی‌دا دەبێت کە خۆراکی پێویستی بۆ دەستەبەر دەکات، ئەمانە هەمووی پێش سکپڕی دەبێت، کە ئەگەر ئافرەتەکە سکپڕببێت ئەوا منداڵدان بەردەوام لە زیادبووندا دەبێت بەهۆی کۆرپەلەکەوە.




سووڕی منداڵدان ( یان سووڕی مانگانەی ئافرەت ) روونده‌کاتەوە لەگەڵ کاریگەریی هۆرمۆنەکان تێ‌یدا

٣- قۆناغی حەیز یان ڕۆچوون و هاتنە خوارەوە ( Menstrual Phase or Endometrial Break down ): ئەگەر پیتاندن و سکپڕی ڕوونەدات، ئەوا تەنی زەرد دەپووکێتەوە و دەوەستێت لە ڕژاندنی هۆرمۆنی ئیسترۆجین و پرۆجیستیرۆن، کاتێکیش کە ئاستی ئەم هۆرمۆنانە تەواو کەم دەبێتەوە بۆ ئاستێك کە نەتوانێت ناوپۆشی منداڵدان ڕابگرێت، ئەوا عادەی مانگانە (حەیز) ڕوودەدات، کە بریتییە لە خوێنێك لە منداڵدانەوە دەڕژێت لە چەند کاتێکی دیاری کراودا، بەهۆی دەرچوونی ئەم خوێنەوە قەبارە و بارستەی منداڵدان وورده وورده بچووك دەبێتەوە و کەم دەکات، ئەمەش ڕوونکەرەوەی مانایەکی تری (وَمَا تَغِيضُ الأَرْحَامُ)ی ئایەتە پیرۆزەکەی سەرەوەیە کە بریتییە لە کەمکردنی منداڵدان بەهۆی حەیزەوە، دەبینین لەو فەرموودەیەی پێشتردا: (إِذَا وَقَعَت النُّطْفَة فِي الرَّحِم، بَعَثَ اللهُ مَلَكاً فَقَال: يا ربّ مُخَلَّقَة أَو غَير مُخَلَّقة؟ فَإِن قال: غَيْر مُخَلَّقة، مَجَّتْها الأَرْحامُ دَماً) زۆر جوان باسی ئەم بابەتی خوێن بەربوون و حەیزەی کردووە کە ئەگەر چاندنی کۆرپەلە ڕوونەدات ئەوا لەگەڵ خوێندا فڕێ دەدرێتە خوارەوە (کە وەك پێشتر ووتمان بریتییە لە دیاردەی لەبارچوونی سەرەتایی بەپێی زانستی نوێ).

دەربارەی ئەم کرداری ڕۆچوونە یان (حەیز) فەرموودەیەکی تری پێغەمبەر (ﷺ) هەیە کە ئافرەتێك پرسیاری لەم بارەوە لێدەکات، ئەویش لە وەڵامدا دەفەرموێت: ﴿... فَتَحَيَّضي سِتّة أَيّام أَو سَبْعة أَيّام فِي عِلم الله، ثُمّ اغْتَسِلي، فَإِذا رَأَيت أَنّك قَدْ طَهُرْتِ وَاسْتَنْقَأْت، فَصَلّي أَرْبَعاً وَعشرين لَيْلَة أَو ثَلاثاً وَعشْرينَ لَيْلَة وَأَيّامَها وَصُومي وَصَلّي، فَإِن ذَلك يُجزِيك، وَكَذلك فَافْعَلي كُلَّ شَهْر كَما تَحيضُ النِّساءُ وَكَما يَطْهُرْنَ لِمِيقات حَيْضِهِنَّ وَطُهْرِهِن﴾ حديث حسن اخرجه أحمد وابو داود والترمذي وابن ماجة، واتە: تۆ بۆ ماوەی شەش ڕۆژ یان حەوت ڕۆژ لە زانیاری خوادا حەیز حیساب بکە، پاشان خۆت بشۆ، ئەگەر بینیت پاك بوویتەتەوە و خوێن بڕاوە

ماوەی ٢٤ یان ٢٣ رۆژ بە شەوەکانی‌یەوە رۆژوو بگرە و نوێژ بکە، ئەوا لەبرت دەکەوێت، تۆش هەموو مانگێک ئاوا بکە وەك چۆن بەم شێوەیە ئافرەتان حەیز دەبن و پاك دەبنەوە بۆ ئەم ماوە دیاری کراوانە.




**Figure 2-13.** Schematic drawing of changes taking place in the uterine mucosa (endometrium) during a regular menstrual cycle in which fertilization fails to occur. Note the corresponding changes in the ovary.

ئەم هێلکارییە ئەو گۆڕانکارییانە دەخاتەروو کە لە دیواری منالداندا بەهۆی هۆرمۆنەکانەوە روودەدات لە کاتی سووڕی مانگانەی ئاسایی ئافرەتدا، کاتێك کە پیتاندن شکست بێنێت.

دیاری کردنی ماوەی ئەم رووداوە دووبارە بووە لە ژیانی ئافرەتدا، وەك لە فەرموودەکەدا ماوەی بێ‌نوێژی (کە ماوەی کەم بوونەکەیە و بە ٦-٧رۆژ) و پاك بوونەوە (کە ماوەی زیاد بوونەکەیە و بە ٢٣-٢٤ رۆژ) دیاری کراون،

خۆی لەخۆیدا ئاماژەیەکی زانستییە، چونکە ئەم ماوەیە ناوەندی کاتی روودانـی ئـەم دیاردانەیـە لـە ئافرەتـانی ئاسـاییدا وەك لـە کتێبـەکانی نەخۆشـییەکانی ژنـان و مندالْبووندا (Obstetrics & Gynecology) دیـاری کـراوە، کـە تـێیدا هـاتووە: مـاوەی ناوەنـدی خـوێن رۆشـتن (حـەیز) بریتییە لە: ٥رۆژ ± ٢رۆژ، ماوەی گشتی ئەم سوورە مانگانەیەش بریتییە لـە: ٦+٢٤= ٣٠رۆژ، یـان ٧+٢٣= ٣٠ رۆژ، وەك لـە فەرموودەکـەدا دیـاری کراوە، دەبینین زانستی نوێش هەمان ماوەی دیاری کردووە بۆ ئەم سوورە کـە ناوەندەکـەی بریتییـە لـە: ٢٨ ± ٢ رۆژ، کـە یەکدەگرێتـەوە لەگـەڵ فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ).




کاتی دەرپەڕانی هێلکۆکە لە سوورەکانی بێنوێژی ئافرەتدا (کە رۆژی چواردەیەمی سوورەکەیە).

## چاندن (الحرث):

لە ئایـەتێکی قورئـاندا هـاتووە کـە: ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَـرْثَكُمْ أَنَّـى شِـئْتُمْ ...﴾ (البقـرة: ٢٢٢)، واتـە: خێزانـەکانتان شـوێنی چاندنی ئێـوەن، لـە فەرهەنگی (لسان العرب)دا دەربارەی (حرث) دەڵێت: (قذفك الحب في الأرض لإزدراع) واتـە: بریتییـە لـە فڕێـدانی تـۆوی رووەك بـۆ زەوی بـە مەبەسـتی چاندنی، کە لە ئایەتەکەدا مەبەست لە تۆوەکەی کە دەچێنرێت بریتییە لە

نوتفەکە، (طبري) موفەسیر لە (جامع البیان عن تاویل آي القرآن) لە مانای ئەم ئایەتەدا دەڵێت: (نساؤکم مزدرع اولادکم)، واتە: خێزانەکانتان کێڵگەی چاندنی منداڵەکانتانن، باشە تۆبڵێی بۆچی ئەم ئایەتە بە تایبەتی لەنێوان هەموو سیفاتەکانی ئافرەتدا باس لەوە دەکات کە ئافرەت شوێنی چاندنمانە (**بڕوانە وێنەی رەنگاورەنگی: ٥٧/ هـ**).

لە بەشەکانی پێشتردا باسی ئەوەمان کرد کە چۆن دوای یەکگرتنی تۆو و هێلکە لە سەرەتای بۆری مناڵداندا و دروست بوونی هێلکەی پیتێنراو ئیتر ئەم کۆرپەلە نوێیە دەست دەکات بە جووڵان لە بۆری مناڵدانەوە بۆ ناو مناڵدان خۆی، کە ووتمان ئەم قۆناغە قۆناغی ئاوی تێکەڵاوە (النطفة الأمشاج) (**بڕوانە وێنەکانی: ٣-٥٢ ، ٣-٥٣**).




وێنەی (٣-٥٢): کۆرپەلە لە قۆناغی ئاوی تێکەڵاودا لە (سپێرم و هێلکۆکە) پێکدێت، لەگەڵ دروست بوونی زایگۆت و دابەش بوونیدا.




وێنەی (٣-٥٣)

دروست بوونی زایگۆت و کۆچ کردنی بۆ ناو مناڵدان بۆ خۆچاندن لە دیوارەکەیدا

Fertilization of the ovum. A, The mature ovum surrounded by the corona radiata. B, Dispersal of the corona radiata. C, Entry of the sperm. D, Formation of the male and female pronuclei. E, Reorganization of a full complement of chromosomes and beginning division of the ovum. (Modified from Arey LB: Developmental Anatomy: A Textbook and Laboratory Manual of Embryology, 7th ed, Philadelphia: WB Saunders, 1974.)

با لێرەشدا کەمێك بوەستین و بیر بکەینەوە لەوەی کە چۆن ئەم تۆو و هێلکەیە دەگەن بەیەکتری و یەکتری دەدۆزنەوە؟! پاشان چۆن ئەو کۆرپەلە تازە دروست بووە رێی خۆی دەدۆزێتەوە بۆ ناو مناڵدان؟! کە وەك ووتمان لە سەرەتای بۆری مناڵداندا کۆرپەلەکە دروست دەبێت.



وێنەی (٣-٥٤)
هێلکەیەکی پێگەیشتوو کە لە سەرەتای بۆری مناڵداندا و لەنێوان چرچ ولۆچی دیوارەکەیدا چاوەڕێی سپێرمەکان دەکات

زانایەکی کۆرپەلەزانی نموونەیەکمان بۆ دەهێنێتەوە بۆ ئەوەی لەم بابەتە تێبگەین کە بەیەکگەیشتنی تۆو و هێلکە وەك ئەوە وایە کە کەسێك لە ئەمریکاوە لە رۆژئاوای گۆی زەوی و یەکێکی تریش لە یابانەوە لە رۆژهەڵاتی زەوییەوە بنێرین بەپێ بڕۆن و بەچاو بەستراوی بۆ ئەوەی لە ناوەڕاستی زەویدا لە شاری مەککە بەیەك بگەن؟؟!! کە لە ڕاستیدا ئەمە هەرگیز روونادات و بەهیچ شێوەیەك ئەو دووانە بەیەك ناگەن.

بە تەواوەتی ئەمە ئەوەیە کە لەگەڵ تۆو و هێلکەدا رووەدات چونکە تیرەی هێلکە ٢٠٠مایکرۆن دەبێت (١مایکرۆمەتر= ١ لە ١٠٠٠بەشی میللیمەترێك) و تیرەی تۆو لە چەند مایکرۆنێك تێناپەڕێت، بەڵام تیرەی بۆری هێلکەدان ١سانتیمەتر و درێژییەکەی ١٥سم دەبێت، واتە لەچاو تۆو و هێلکەدا درێژییەکەی ٢٤٠هەزار جار گەورەترە کە پێویستە تۆوەکان ٢/٣ی ئەم درێژییە و هێلکەکە ١/٣ی ببڕێت بۆ ئەوەی بگەن بەیەکتری، هەروەها هێلکەی پیتێنراویش کە لە یەکگرتنی ئەم دووانەوە دروست دەبێت، تیرەی ئەمیش لە چەند مایکرۆنێك تێناپەڕێت و پێویستە ئەم ماوە دووردرێژە لەچاو خۆیدا ببڕێت بۆ ئەوەی بگاتە ناو مناڵدان، کە شوێنی جێگیر

بوونێتی، باشە کێ ڕێنوومایی ئەمانە دەکات و ئاگای لێیانە بۆ ئەوەی هەریەکەیان بگەنە شوێنی مەبەستی خۆیان و ڕێیان لێ وون نەبێت؟! (**بۆ زیاتر روون بوونەوە بڕوانە وێنە ڕەنگاوڕەنگەکانی: ٥٨/ هـ ، ٥٩/ هـ ، ٦٠/ هـ ، ٦١/هـ ، ٦٢/ هـ ، ٦٣/ هـ ، ٦٤/ هـ ، ٦٥/ هـ**).

بێگومان دەبێت ئەو کەسە بێت کە هیچ شتێکی لێ وون نابێت و ڕێنوومایيکەری هەموو دروست کراوەکانە، کە خودای پەروەردگاری هەموو زیندەوەرەکانە، دەبینین ئەم ڕاستییە لە ئایەتێکی قورئاندا ئاماژەی بۆ کراوە کە دەفەرموێت: ﴿مِن نُّطْفَةٍ خَلَقَهُ فَقَدَّرَهُ، ثُمَّ السَّبِيلَ يَسَّرَهُ﴾، واتە: پەروەردگار کە مرۆڤ لە نطفةیەکی ئەندازە بۆ دانراوەوە دروست دەکات، پاشان ڕێ بۆ ئەم کۆرپەلەیە ئاسان دەکات کە بگاتە مەبەستی خۆی.

هێلکەی پیتێنراو (زایگۆتەکە) پاش پیتاندن خێرایی جوولانی زۆر خاودەبێتەوە کە وای لێدەکات ماوەی چەند ڕۆژێك (٣-٤ ڕۆژ) لە بۆری مناڵداندا بمێنێتەوە، کە تێیدا بەردەوامە لە دابەش بوون، بەلام ئەوەی یارمەتی دەدات کە بەردەوام بێت لە جوولەیدا بۆ ناو مناڵدان چەند فاکتەرێکە، لەناو بۆری مناڵداندا دارستانێك هەیە لە مووی زۆر بچووك (گەندە موو) کە وەك دەریا شەپۆل دەدەن و پاڵ بە زایگۆتەکەوە دەنێن (**وێنەی ڕەنگاوڕەنگی: ٤٨/هـ**).

هەروەها فاکتەرێکی تر ئەو سپێرمانەن کە سەرکەوتوو دەبن لە چوونە ناو بۆری مناڵدان و گەیشتن بە هێلکەکە (ژمارەیان نزیکەی ٥٠٠دانە دەبێت)، دوای ئەوەی یەك دانەیان سەرکەوتوو دەبێت لە بڕینی دیواری هێلکەکە و چوونە ناوەوەی، ئەوانی تریش زۆر بەخێرایی دەڕۆن و خۆیان دەکێشن بە دیواری مناڵداندا و جۆرە خولانەوەیەکی بۆ دروست دەکەن بە دەوری خۆیدا کە ڕۆشتنی هێلکەکە ئاسان دەکات، کاتێکیش کە دەگاتە کۆتایی بۆری مناڵدان لە نزیکی مناڵداندا کە شوێنێکی تەسکە، ڕاستەوخۆ ئەم شوێنە

فراوان دەبێت و ڕێ بە ڕۆشتنی کۆرپەلەکە دەدات، و بەم شێوەیە کۆرپەلەکە دەکەوێتە ناو منداڵدانەوە.

نوتفەکە پێش کرداری چاندنی لە دیواری منداڵداندا بە بەردەوامی لە جووڵەدایە، دوای چوونە ناوەوەی کۆرپەلەکە بۆ ناو منداڵدان و خۆنووساندنی بە دیوارەکەیەوە و پاشان خۆچاندنی بۆ ناوی ئەم قۆناغە (قۆناغی نوتفە) تەواو دەبێت، و قۆناغێکی تر دەست پێدەکات کە زانستی کۆرپەلەزانی بۆمان باس دەکات کە ئەویش بریتییە لە خۆهەڵواسینی کۆرپەلە سەرەتاییەکە بە دیواری منداڵدانی دایکەکەوە و پاشان جێگیر بوونی لە منداڵداندا، ئەم ڕووداوە لە فەرموودەیەکی پێغەمبەردا (ﷺ) ئاماژەی بۆ هاتووە کە دەفەرموێت: ﴿عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ أَسِيد يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ صلى الله عليه وسلم قَالَ: « يَدْخُلُ الْمَلَكُ عَلَى النُّطْفَةِ بَعْدَ مَا تَسْتَقِرُّ فِي الرَّحِمِ بِأَرْبَعِينَ أَوْ خَمْسَةٍ وَأَرْبَعِينَ لَيْلَةً فَيَقُولُ يَا رَبِّ أَشَقِيٌّ أَوْ سَعِيدٌ فَيُكْتَبَانِ فَيَقُولُ أَيْ رَبِّ أَذَكَرٌ أَوْ أُنْثَى فَيُكْتَبَانِ وَيُكْتَبُ عَمَلُهُ وَأَثَرُهُ وَأَجَلُهُ وَرِزْقُهُ ثُمَّ تُطْوَى الصُّحُفُ فَلاَ يُزَادُ فِيهَا وَلاَ يُنْقَصُ »﴾ (رواه مسلم)، واتە: پاش ئەوەی کە نوتفە جێگیر دەبێت لە منداڵداندا، دوای ٤٠-٤٥ ڕۆژ خوای گەورە فریشتەیەکی بۆ دەنێرێت، کە نامەی کردەوەکانی بۆ دەنووسێت.

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿ وَاللَّهُ أَنبَتَكُم مِّنَ الْأَرْضِ نَبَاتًا ﴿١٧﴾ ثُمَّ يُعِيدُكُمْ فِيهَا وَيُخْرِجُكُمْ إِخْرَاجًا ﴿١٨﴾ [illegible]

لقد لفت القرآن الانظار مراراً على دقة الشبه بين نشأة الجنين في الرحم ونشأة النبات في التربة، وهنا نرى الحق الناطق بالمعجزة القرآنية. فها هو الجنين ينمو على سطح وجدار الرحم ويأتيه رزقه رغداً من تحته عبر أنهار الدماء السارية في جدران الرحم. ما أشبه ما تراه الآن بالنبات إذ ينمو بمجموعه وفروعه فوق سطح الارض بينما يمد جذوره لامتصاص الغذاء من باطن الارض. هل ترى في خلق الرحمن من تفاوت ؟؟ من علم محمداً صلى الله عليه وسلم ما لم يعلم. انها المعجزة الناطقة بأن الذي اوحى بهذا القرآن عليم بالنبات وعليم بالجنين في هذه المرحلة المبكرة التي لا ترى إلا بأعقد التقنيات الحديثة. عليم بالسر وأخفى.

وێنەی ( ٣-٥٥ )

کۆرپەلە لە توێپەڵێک خانە پێکدێت کە دەکەوێتە ناو منداڵدانەوە.

لە کۆتایی قۆناغی نوتفەدا زایگۆتەکە دەچێتە ناو دیواری منداڵدانەوە، ئەگەر بەشێوەیەکی وردتر باسی بکەین ئەم پرۆسەیە بریتییە لە کرداری

خۆچاندنی کۆرپەلەکە بۆ ناو دیواری منالدان (هەروەك چاندنی تۆوی رووەك لە زەوی‌دا) کە لە رۆژی شەشەمی گەشە کردنی کۆرپەلەکەوە دەست پێ‌دەکات، ئەم کردارە بەهۆی چەند خانەیەکی تایبەتی هەلکۆلەرەوە دەبێت کە لە کۆرپەلەکە خۆیەوە دروست دەبن[10] (وێنەی ٣-٥٦)، کە بەهۆیانەوە دیواری منالدان هەلدەکۆلێت تاوەکو بۆشاییەك بۆ خۆی دروست دەکات لە دیوارەکەدا، کاتێك چوونە ناوەوەی کۆرپەلە بۆ ناو دیوارەکە تەواو دەبێت ئەو شوێنەی لێوەی هاتووەتە ژوورەوە دادەخرێت (بڕوانە وێنەکانی ٣-٥٧/ A ، ٣-٥٧/ B)، بەم شێوەیە پرۆسەی خۆچاندنەکە تەواو دەبێت.




وێنەی (٣-٥٦) کۆرپەلە لە دوو بارستە خانە پێکدێت کە خۆی دەنووسێنێت بە دیواری منالدانەوە، ئەویش بەهۆی گەلەپێکانییەوە.

---

(10) پاش ئەوەی کە کۆرپەلە زنجیرەیەك دابەشبوونی بەسەردا دێت، لە سەرەتادا ئەم کۆمەلە خانەیە جیادەبنەوە بۆ دوو تۆپەلی خانەی جیاواز، یەکێکیان بارستەخانەی دەرەوەیە ( outer cell mass or Trophoblast)، لەگەل بارستە خانەی ناوەوە (Inner cell mass or Embryoblast) (وێنەی ٣-٥٦)، بارستە خانەی دەرەوە دەبێت بە دوو چین خانە: چینێکی هەلکۆلەر (Syncytiotrophoblast) کە بەرامبەر دیواری منالدان دەبێت و چینێکی تر (Cytotrophoblast) کە دەکەوێتە ژێر ئەمەوە، ئەم خانە هەلکۆلەرانە لە داهاتوودا ویلاش (المشيمة Placenta) دروست دەکەن.

ئەوەی سەرسوڕهێنەرە ئەوەیە کە زانایانی کۆرپەلەزانی ئەمڕۆ هەمان ناوی قورئانیان لەم کردارە ناوە کە ئەویش پێی دەڵێن: (**Implantation**) واتە (چوونە ناوەوە و خۆچاندنی کۆرپەلە) کە وەرگێڕانی بۆ زمانی عەرەبی لە فەرهەنگەکانەوە دەبێت بە ووشەی (حـرث)!!!



وێنەی (٢-٥٧/A)

لەوانەیە لەکاتی ئەم کرداری هەڵکۆڵین و خۆچاندنەدا کەمێك خوێنبەربوون رووبدات و ئافرەتەکە وابزانێت کە عادەی مانگانەی بۆ هاتووە و بە سکپڕیی نەزانێت، کە خۆی لەخۆیدا ئەم نیشانەیە تەئکیدکەری سکپڕییەکەیەتی، هەربۆیە لێرەوە حیکمەتی ئەو ئایەتە پیرۆزەمان بۆ دەردەکەوێت کە بەرامبەر تەڵاقدراوەکان دەفەرموێت: ﴿وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلاَثَةَ قُرُوَءٍ﴾ (البقرة: ٢٢٨) کە پەروەردگار داوای لەو ئافرەتانە کردووە

که تەڵاق دراون بۆ ئەوەی کە سێ حەیز و سێ پاکبوونەوەی تەواو بووەستن پێش ئەوەی کە شووبکەنەوە، ئەمەش بە مەبەستی دڵنیابوونە لە نەبوونی سکپڕی (چونکە بە بوونی سکپڕی ماوەی وەستانەکە تا کاتی لەدایك بوونی منداڵەکە دەبێت).

وێنەی (٢-٥٧/B): داخرانی شوێنی چوونە ناوەوەی کۆرپەلەکە

دیاری کردنی ماوەی وەستانی تەڵاقدراو بە سێ حەیز حیکمەتەکەی لەلایەن پرۆفیسۆر (جولی سمپسۆن)* ەوە باس کرا لە کۆنگرەیەکی زانستیدا (کە بریتی بوو لە کۆنگرەی پزیشکی جیهانی یەکەم دەربارەی ئیعجازی پزیشکی لە قورئان و سوننەتدا)، کە ووتی: مناڵدان لە هەفتەی دووەمی پیتاندندا خوێناوییەکەی بە شێوەیەکی ئاشکرا زیاد دەکات، هەربۆیە مناڵدان چانسی خوێن بەربوونی هەیە بە هەر هۆیەکی دەرەکی بەهۆی زیادبوونی سووڕی خوێن تیایدا، وەستانی ئافرەتی تەڵاقدراو بۆ ماوەی سێحەیز ئەم دانایییانەی تێدایە:

١- حەیزی یەکەم لەوانەیە بریتی بێت لەو خوێن بەربوونەی کە روودەدات لە کاتی خۆچاندنی مناڵەکە بۆ ناو دیواری مناڵدان، ئەم دیاردەیە لە حاڵەتی نموونەییدا لەدوای ٦-٧ ڕۆژ لە جووت بوون روودەدات.

٢- سەبارەت بە حەیزی دووەم: لەوانەیە بەهۆی کۆرپەلەکەوە لە هەفتەی هەشتەمدا رووبدات، چونکە هۆرمۆنی پرۆجیستیرۆن (**Progesterone**) کە پارێزگاری لە سکپڕی دەکات لە هێلکەدانەوە دەڕێژرێت تا هەفتەی ٧-٨ی

---

* پسپۆڕی نەخۆشییەکانی ژنان و منداڵبوونە، و مامۆستایە لە زانکۆی (نۆرث وێست) لە (شیکاگۆ)ی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

سکپڕی، کە ئیتر لێرەوە ویلاشی کۆرپەلەکە خۆی دەست دەکات بە دروست کردن و رژاندنی، لەوانەیە لەم کاتی گواستەنەوەیەدا کەم بوونێك روویدات لە رێژەی هۆرمۆنی پرۆجیستیرۆندا و ببێتە هۆی روودانی خوێن بەربوونێکی کەم لە منالدانەوە، کە ئافرەتە دووگیانەکە وابزانێت حەیزە بۆی هاتووە.

بەلام روودانی حەیزی سێیەم بە تەواوەتی چانسی بوونی سکپڕی ناهێلێت، کەواتە زۆر بە شێوەیەکی دروست و زانستییانە ئەم ماوەیە دیاری کراوە چونکە وەك ووتمان روودانی دوو حەیز چانسی بوونی سکپڕی دەرناکات (چونکە لەوانەیە بەهۆی منالەکەوە خوێن بەربوون لە منالدانەوە روویدات)، بەلام لەگەل روودانی حەیزی سێیەم ئافرەتەکە دلنیا دەبێت کە سکپڕیی نییە، و دوای تەواو بوونی سووڕەکەی حەیزەکە و خۆپاکردنەوەی ماوەکەی تەواو دەبێت.



Figure 2-3. The approximate time and sequence of events in the menstrual cycle

لێرەدا بابزانین کە پرۆسەی خۆچاندنی کۆرپەلەکە بۆ ناو دیواری منالدان بریتییە لە کۆتایین بەشی قۆناغی نوتفە، کە لەگەل تەواو بوونی ئەم قۆناغەدا شکلی کۆرپەلەکە دەگۆڕێت و دەچێتە قۆناغێکی نوێوە، کە ئەمەش لە رۆژەی پانزەهەمی گەشەی کۆرپەلەکەدا دەبێت.

## چوونە ناوەوەی کۆرپەلەکە بۆ ناو منالّدان و جێگیر بوونی:

وەك لە بابەتی (ڕۆچوون و وونبوون لە منالّداندا) باسمان کرد یەکێك لە ماناکانی (غیض) بریتی‌یە لە چوونە ناوەوە، کەوتە مانای ئایەتی (اللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَحْمِلُ كُلُّ أُنثَى وَمَا تَغِيضُ الأَرْحَـامُ ...) دەبێت بەوەی: کە تەنها خوای گەورە دەزانێت کە ئەوەی هەر مێینەیەك هەڵی گرتووە، و ئەوەی کە دەچێتە ناو منالّدانەوە و قووتی دەدات، کە وەك ووتمان ئەمە وەسفێکی ووردی ئەو کردارەیە کە ڕوودەدات لە چوونە ناوەوەی کۆرپەلە بۆ دیواری منالّدان، ئەویش پاش هەڵکۆڵینی دیوارەکەی و چوونە ناوەوەی بۆ ناو ئەستووریی دیوارەکە و پاشان داخرانی شوێنی چوونە ناوەوەکە (**وێنەی ٣-٥٧**).

لێرەدا لەوانەیە خەڵکێك بپرسێتەوە: بۆچی پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرموودەیەکی‌دا پێمان ڕادەگەیەنێت: ﴿وَلا يَعْلَمُ مَا تَغِيضُ الأَرْحَـام إِلاَّ الله ...﴾ رواه البخاري، واتە: تەنها خودا خۆی دەزانێت ئەوانەی لە منالّدانەکاندا دەچنە ناوەوە و ڕۆدەچن، وون دەبن و تیا دەچن چین؟ لە کاتێکدا زانایان لەمڕۆدا گەیشتوونەتە دەرخستنی ئەو کردارانەی کە لەناو منالّدانەکاندا روو دەدەن؟

لە وەڵامدا دووبارە دەڵێین: ئەو کەسانە بێ‌ئاگابوون لەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) ووشەی (تغیض)ی بەکارهێناوە، کە ئەم ووشەیە مانای چوونە ناوەوە و ڕۆچوون بۆ ناو رووکاری منالّدان دەگەیەنێت، کە لێرەوە دەتوانین بڵێین (وەك لە پێشتردا زیاتر روون کراوەتەوە) زانیاری خەڵکی دەربارەی ووردەکاری‌یەکانی قۆناغەکانی دروست بوونی کۆرپەلە تەنیا قۆناغەکانی دوای چاندن و چوونە ناوەوە (غیض) دەگرێتەوە، نەك قۆناغەکانی پێش ئەمە، ئەگینا خوای گەورە تەحەددای مرۆڤەکانی نەدەکرد بەوەی کە زانیاری‌یان لە گەردوون و لەشی خۆیاندا بۆ دەردەکەوێت کە ڕاستی فەرموودەکانی قورئان دەردەخەن، هەروەك لە ئایەتی (٥٣)ی سوورەتی (فصلت)دا هاتووە: ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ

أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾، واتە: ئێمە لە پاشەڕۆژدا نیشانی خەڵکی دەدەین بەڵگەکانمان لە ئاسۆکان و لە لاشەی خۆشیاندا بۆ ئەوەی کە بۆیان دەربکەوێت ئەم کتێبەی پەروەردگار( قورئانی پیرۆز) هەق و راستی‌یە، کەواتە زانیاری خەڵکی تەنیا دیاری کراو دەبێت بەوەی کە فەرموودەکە باسی کردووە و پێشتر ئاماژەمان پێ‌دا.

قۆناغی رۆچوون و چوونە ناوەوە (غیض) دوای قۆناغی پیتاندنی هێلکەکە و دوای دابەش بوونی و کەوتنە ناو مناڵدانەوە دێت، لەبەر ئەوە کەس ناتوانێت بزانێت وردەکاری‌یەکانی ئەم پیتاندنە لەناو سکی دایکدا چین و ئایا چی لێ‌دەکەوێتەوە؟ و رەگەز و سیفاتی کۆرپەلەکە چی دەبێت دوای پیتاندن، و هیچ ئامرێك ناتوانێت ئەمە بدۆزێتەوە و بکاتە ئەنجام، بۆیە پەروەردگار عیلم و زانیاری ئەم شتانەی کە لەناو سکی دایکدا روودەدات تەنیا تایبەت بەخۆیەوە کردووە.

هێلکەی پیتێنراو کە دابەش دەبێت بۆ چەند خانەیەك و لەناو دیواری مناڵداندا نوقم دەبێت درێژی‌یەکەی (لە رۆژی هەشتەمدا) تەنیا ٠,٧ میللیمەترە، کە ئەم نوتفەیە شێوەی دەرەوەی وردە وردە لەدەست دەدات و لە شکڵی تنۆکێك ئاو (نوتفە) دەردەچێت کاتێك کە دەچێتە ناوپۆشی مناڵدانەوە، ئەم کۆمەڵە خانەیە جیادەبنەوە بۆ دوو بارستەخانە: بارستەخانەی دەرەوە و بارستەخانەی ناوەوە (وێنەی ٣-٥٦)، کە بارستەخانەی دەرەوە چواردەوری بارستەخانەی ناوەوە (کۆرپەلەکە) دەدات، و لە کۆتایی‌دا لەگەڵ ناوپۆشی مناڵداندا یەکدەگرێت و بەم شێوەیە نوتفەکە شێوەی دەرەوەی (کە لە تنۆکێك ئاو دەچێت) بە تەواوەتی لەدەست دەدات، بەم شێوەیە تەنیا بارستەخانەی ناوەوە دەمێنێتەوە وەك بەشێکی سەرەکی بۆ دروست کردنی کۆرپەلەکە.

ئەگەر بزانین ئەم بارستەیە کۆمەڵێکی ئێجگار زۆرە لە خانە (کە ژمارەیان بە ۲۰۰۰ خانە مەزەندە دەکرێت لە رۆژی دوانزەیەمدا)، و لە قەبارەیەکی زۆر بچووکدان کە لە دوایەمین رۆژی رۆچوونەکەدا (کە دەکاتە رۆژی چواردەیەم کە لە کۆرپەلەزانی نوێدا بە قۆناغی ژمارە ۷ ئاماژەی بۆ دەکرێت) قەبارەی کۆرپەلە تەنیا (۰٫۸) میللیمەترە لەناو ناوپۆشی منداڵداندا، ئیتر چۆن تەصەور دەکرێت کە نهێنییەکانی ناوی ئاشکرا بکرێت؟! مەگەر تەنیا لە حاڵەتی دەرهێنانی لە منداڵدانەوە بۆ دەرەوە نەبێت!

یەکێك لەو نموونانەی کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە رووداوەکانی پێش رۆچوونی نوتفەکە بەناو دیواری منداڵداندا (غیض) بریتین لە نهێنی لای پەروەردگار ئەوەیە کە وەك پێشتر باسمان کرد کاتێك کە هێلکەکە لەلایەن سپێرمەوە دەپیتێنرێت دابەش دەبێت بۆ چەند خانەیەك، ئەم خانانە بەتەواوەتی لەیەك دەچن تا ژمارەیان دەبێت بە هەشت خانە (واتە لە قۆناغی لەتووچوو (Morula)دا دەبێت)، ئیتر دوای ئەمە خانەکان وردە وردە دەست دەکەن بە جیاواز بوون و بەردەوام دەبن لەسەر دابەش بوون، تا ژمارەیان دەگاتە ۵۰ خانە، ئیتر لەگەڵ بەردەوام بوونی دابەشبووندا ئەم تۆپەڵە خانەیە دەبن بە دوو بارستەوە:

یەکێکیان کە لە داهاتوودا کۆرپەلەکە دروست دەکات پێی دەووترێت (بارستەخانەی ناوەوە)، ئەوی تریان کە وێڵاش دروست دەکات پێی دەووترێت (بارستەخانەی دەرەوە)، پاشان خانەکانی بارستەی ناوەوە (کە کۆرپەلەکە دروست دەکەن) دەبن بە سێ چین: ۱- چینی دەرەوە (ئیکتۆدێرم Ectoderm). ۲- چینی ناوەڕاست یان میزۆدێرم (Mesoderm). ۳- چینی ناوەوە (ئینۆدێرم Endoderm). سەبارەت بەوەی کە ئایا هەر خانەیەك چۆن دەزانێت کە دەچێتە چ گرووپێکەوە؟ ئایا بۆ بارستەخانەی دەرەوە یان ناوەوە، یان چینی دەرەوە یان ناوەڕاست یان ناوەوە دەچێت؟ و

ئایا بەشداری لە دروست کردنی چ ئەندامێکدا دەکات؟ ئەمە بابەتێکی نادیارە تا ئێستا و تەنها لە زانیاری پەروەردگاردایە، لەم بارەیەوە (د. لارس هامبیرگەر) شارەزای کۆرپەلەزانی وەك شایەتییەك دەڵێت: (ئەمە یەکێکە لە نهێنییەکانی ژیان کە تا ئێستا سەرسامی کردووین، و بابەتی چەندین لێکۆڵینەوەی زانستی بەرفراوانە)[11].

لێرەشدا بابزانین کە مەبەستی پەروەردگار لە ئایەتی: ﴿إِنَّ اللَّهَ عِندَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَداً وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾ (لقمان: ٣٤)، واتە: بەڕاستی هەر خودا خۆی زانیاری بەرپابوونی ڕۆژی قیامەت دەزانێت، بارانیش هەر ئەو دەیبارێنێت، دەزانێت چی لە سکی دایکاندا هەیە، هیچ کەس نازانێت سبەی چی بەسەردێت و چی دەست دەکەوێت (لە بەرهەمی ماددی و دنیایی یان لە زەخیرە و توێشووی قیامەت)، هیچ کەسیش نازانێت لەسەر چ زەوییەك دەمرێت و کۆتایی بە ژیانی دێت (هەروەها کاتی مردن و چۆنێتییەکەیشی شاراوەیە)، بەڕاستی خودا بە هەموو شتێك زانا و ئاگادارە.

جارێکی تر دەڵێین: مەبەستی پەروەردگار لەوەی کە تەنیا خودا دەیزانێت کە چی لەسکی دایکدایە ئەوەیە کە ئایەتی: ﴿اللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَحْمِلُ كُلُّ أُنثَى وَمَا تَغِيضُ الأَرْحَامُ وَمَا تَزْدَادُ﴾ ڕوونی کردووەتەوە، کە بریتییە لە کۆرپەلە لە قۆناغی پێش چوونە ناوەوە و ڕۆچوونیدا بەناو دیواری منداڵداندا.

تەنیا پەروەردگار ئاگاداری سیفاتەکانی و ووردەکارییەکانێتی، و هیچ مرۆڤێك ناتوانێت ئەو زانیارییانە لەو کاتە دیاری کراوەدا دەربارەی کۆرپەلە لەسکی دایکیدا دەست بخات (بۆ زیاتر ڕوون بوونەوەی ڕووداوەکان بڕوانە وێنە ڕەنگاوڕەنگەکانی: ٥/٦٦، ٥/٦٧، ٥/٦٨، ٥/٦٩).

---

(11) لە کتێبی: منداڵێك لەدایك بوو (A Child is Born).

**ڕۆچوونی کۆرپەلە بە دیواری مناڵداندا هاوشانە لەگەڵ بڵاوبوونەوەیەکی چڕی خانە هەڵکۆڵەرەکان بەناو ناوپۆشی منالداندا کە ئەم پرۆسەیە یارمەتی جێگیر کردنی کۆرپەلەکە دەدات لەناو منالداندا، هەروەك لە فەرموودەی ﴿يَدْخُلُ الْمَلَكُ عَلَى النُّطْفَةِ بَعْدَ مَا تَسْتَقِرُّ فِي الرَّحِمِ بِأَرْبَعِينَ أَوْ خَمْسَةٍ وَأَرْبَعِينَ لَيْلَةً﴾دا روون کراوەتەوە(12)، ئەمەش ئیعجازێکە کە پێغەمبەر (ﷺ) بە ووردی کاتی جێگیر بوونی کۆرپەلەکەی دیاری کردووە لەچاو ماوەی زۆری سکپڕیدا (کە ٩ مانگە)، و هەروەها بە بوونی ئەو ڕووداوە جۆراوجۆرانەی کە لەم ماوەیەدا بەدوای یەکدا دێن، لێرەدا زۆر سەرسوڕهێنەرە کە پێغەمبەر (ﷺ) ئاماژەی داوە بۆ ئەوەی کە لەم کاتەوە دوو پرۆسە لە یەك کاتدا ڕوودەدەن:**

---

(12) لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە: (روي عن النبيّ (ﷺ) أنه قال لأحد الصّحابة: ما وُلِدَ لَكَ؟ قالَ الرَّجُل: يا رسول الله: ما عَسَى اَن يُولَد لِي إمّا غُلام وَإمّا جَارِيَة! قالَ: فَمَن يَشْبِه؟ قال: يَا رَسولَ الله: ما عَسَى أن يُشْبِه؟ إمّا أَباهُ وَإمّا أُمَّه! فقال الرَّسول –صلوات الله عليه وسلامه–: مَه! لا تَقُولَنَّ هذا، إنَّ النُّطفَة إذا استقرَّت في الرَّحم أَحْضَرَها اللهُ تعالى كلَّ نَسَب بَيْنها وَبَينَ آدَم أما قَرَأْتَ هذه الآية في كِتاب اللهِ تعالَى: ﴿فِي أَيِّ صُورَةٍ مَّا شَاء رَكَّبَكَ﴾ الإنفطار:٨، قالَ: شَكَّلَك) رواه الطبراني بسند ضعيف جداً، واتە: دەگێڕنەوە کە ڕۆژێك پێغەمبەر (ﷺ) لە یەکێك لە هاوەڵەکانی پرسی: چیتان بووە؟ ئەویش ووتی: ئەی پێغەمبەری خودا لەوانەیە چیم ببێت! یان کوڕە یان کچە، پێغەمبەر پرسی: ئەی لەکێ دەچێت؟ ئەویش ووتی: لە کێ بچێت! یان لە باوکی یان لە دایکی، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: لەسەرخۆ بە، وامەڵێ، هەر کاتێك کە نوتفە لە منالداندا جێگیر دەبێت، خوای گەورە هەموو نەوەکانی پشتی پێش خۆی بۆ دێنێت (کە لەوانەیە لە هەر یەکێکیان بچێت)، ئایا ئێوە ئەو ئایەتەی پەروەردگارتان نەخێندۆتەوە (لەسەر هەر شێوە و شکڵێك ئارەزووی لێبێت دروستتان دەکات)، کە مەبەست لە (رَكَّبَكَ) بریتییە لە دیاری کردنی شکڵتان، ئەم فەرموودەیە لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆر لاوازە بەڵام ئاماژەیەکی جوانی تێدایە لەسەر ئەوەی کە کۆرپەلەکە لەوانەیە لە یەکێك لە باو و باپیرانی بچێت، لەبەرئەوەی کە پیلانی بۆماوەیی کۆرپەلەکە لەوانەیە لەسەر هەر یەکێك لەو شێوازانەی پێش خۆی بێت، کە ئەمەش بوارێکی غەیبی و نادیارە و لەو سەردەمەدا زانیاری لەسەر نەزانراوە (کە پیلانێکی جینی هەیە بۆ دروست بوونی کۆرپەلە)، هەروەها بۆ بەهێز کردنی مانای فەرموودەکەی سەرەوەش دەست دەدات چونکە ئاماژەی تێدایە کە دروست بوون و کامڵ بوونی کۆرپەلەکە دوای جێگیربوونی لەناو منالداندا دەبێت.

پرۆسەی جێگیر بوونی کۆرپەلە، و کۆبوونەوەی خانەکانی (جمع خلايا الجنين)[13]، کە ئەمە ئەوە دەگەیەنێت زانیاری‌یەکانی قورئان و سوننەت هەموو لایەك و هەموو ووردەکاری‌یەکی ئەو ڕووداوانەی باس کردووە کە بەسەر نوتفەکەدا دێن، جا ئەگەر ووردەکاری دەرەوە بێت (جێگیر بوونی کۆرپەلەکە)، یان ووردەکاری ناوەوە (وەك کۆبوونەوە خانەکانی)، هەروەها بە تەواوەوەتیش ئەو مێژووانەی کە ئەم ڕووداوانەی تێ‌دا ڕوودەدات دیاری کردووە، کە ئەمەش تەنیا بە هۆی زانیاری ئەو کەسەوە دەزانرێت کە هیچ ووردەکاری‌یەکی زیندەوەرەکان و ئاسمانەکان و زەوی لەلا شاراوە نی‌یە ﴿وَمَا يَعْزُبُ عَن رَّبِّكَ مِن مِّثْقَالِ ذَرَّةٍ فِي الأَرْضِ وَلاَ فِي السَّمَاء وَلاَ أَصْغَرَ مِن ذَلِكَ وَلا أَكْبَرَ إِلاَّ فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ﴾ (يونس: ٦١).

## کۆبوونەوەی خانەکانی کۆرپەلەکە:

لە چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەردا (ﷺ) ئاماژەیەکی سەیر هاتووە بۆ دیاردەیەك کە لە کاتی دروست بوونی کۆرپەلەدا ڕوودەدات و فەرموودەکان بە کۆکردنەوە و کۆبوونەوەی کۆرپەلەکە ناویان بردووە:

- ﴿عن ابن مسعود (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿إِنَّ أَحَدَكُم يُجْمَعُ خَلْقُهُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ أَرْبَعِينَ يَوماً ...﴾ رواه مسلم، واتە: بزانن بە دڵنیایی‌یەوە کە

(13) لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە: عن مالك بن الحويرث: أنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قال: ﴿... فَإِذا كانَ يَومُ السَّابِعِ، جَمَعَهُ اللهُ تَعالى، ثُمَّ أَحْضَرَ لَهُ كُلَّ عِرْقٍ لَهُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ آدَم، ثُمَّ قَرَأَ: [فِي أَيِّ صُورَةٍ مَّا شَاء رَكَّبَكَ]﴾ الإنفطار:٨﴾ رواه الطبراني والبيهقي وابن منده، وقال الهيثمي (في مجمع الزوائد): رجاله ثقات، واتە: کاتێك کە ڕۆژی حەوتەمی دروست بوونی کۆرپەلەکە دێت پەروەردگار کۆی دەکاتەوە (واتە خانەکانی کۆمەڵ دەبێت)، و پاشان هەموو نەوەکانی پێش خۆی تا ئادەم بۆ دێنێت (بۆ ئەوەی دیاری بکرێت کە لە کامیان دەچێت)، پاشان پێغەمبەر (ﷺ) ئەو ئایەتە پیرۆزەی خوێندەوە (لەسەر هەر شێوە و شکڵێك ئارەزووی لێ بێت دروستتان دەکات)، لێرەدا ئەم فەرموودە پیرۆزە زۆر بە ووردی ئەو کردارەی دروست بوونی کۆرپەلەی دیاری کردووە (کە بریتی‌یە لە کۆبوونەوەی خانەکانی کۆرپەلە و جێگیر بوونی لەناو منداڵداندا)، کە زانستی کۆرپەلەزانی نوێش بە تەواوەتی هەمان ڕای هەیە.

هەریەکێك لە ئێوە کۆبوونەوەی و پەیدا بوونی ئەندامەکانی لەشی لە سکی دایکیدا لە چل ڕۆژدا تەواو دەبێت ....

- ﴿عن مالك بن الحويرث: اَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قال: [... فَإذا كانَ يَومُ السَّـابِعِ، جَمَعَهُ اللهُ تَعالى ...]﴾ رواه الطبراني والبيهقي وابن منده، وقال الهيثمي (في مجمع الزوائد): رجاله ثقات، واتە: کاتێك کە ڕۆژی حەوتەمی دروست بوونی کۆرپەلەکە دێت پەروەردگار کۆی دەکاتەوە (واتە خانەکانی کۆمەڵ دەبێت)، (جَمع) وەك لە فەرهەنگی (معجم مقاييس اللغة)دا هاتووە (يَدُل على تضامّ الشَّيء) واتە: مانای کۆبوونەوە و چوونەیەك و یەکگرتنی شتێك لە چەند شتێکەوە دێت، لەم فەرموودەیەدا بە ئاشکرا دیارە کە مەبەستی پەروەردگار (نطفةکە)یە کە ئەم کردارەی بەسەردا دێت، چونکە بە تاك هاتووە، بابزانین چۆن ڕوودەدات؟:




کۆرپەلەزانی بۆمان باس دەکات کە ئەم کرداری کۆبوونەوەیەی خانەکان و لەشی کۆرپەلەکە لە کاتی پرۆسەی ڕۆچوونی کۆرپەلەکە بەناو دیواری مناڵداندا ڕوودەدات و بریتییە لە پرۆسەی خۆجێگیر کردنی زایگۆتەکە، کە لەم کاتەدا لە تۆپەڵێك خانە پێکهاتووە بەهۆی دابەش بوونی بەردەوامییەوە، ئەم تۆپەڵە خانەیە جیادەبێتەوە بۆ دوو بارستەخانە: بارستەخانەی دەرەوە (کە وویڵاش دروست دەکات) و بارستەخانەی ناوەوە (کە کۆرپەلەکە دروست دەکات) (وێنەی ڕەنگاوڕەنگی: ٧٠/ هـ)، ئەم دوو بارستەخانەیە لە جەمسەرێکدا بەیەکەوە نووساون کە پێی دەووترێت جەمسەری کۆرپەلەیی (Embryonic pole) (وێنەی ڕەنگاوڕەنگی: ٧١/ هـ)، کە زۆری پێناچێت دەست دەکەن بە جیاوازبوون لە یەکتری و بارستەخانەی ناوەوە لە بارستەی

دەرەوە جیادەبێتەوە لە ناوەڕاستیدا و بۆشاییەك و چۆڵییەك لە نێوانیاندا دروست دەبێت بەناوی بۆشایی ئەمنیۆنی (Amniotic Cavity) (وێنەی رەنگاوڕەنگی: ٧٢-A/ هـ ، ٧٢-B/ هـ)، بەڵام کۆتاییەکانی ئەم دوو بارستەیە هەر پێکەوە نووساون (وێنەی: ٧٣/ هـ)، لەدوای ئەمە گۆڕانکاری تەواو بەسەر کۆرپەلەکەدا (بارستەخانەی ناوەوە) دێت کە دەبێتە هۆی ئەوەی شێوەی دیسکێکی تەختی بازنەیی وەربگرێت و پێی دەووترێت دیسکی کۆرپەلەیی (القرص الجنيني Embryonic Disc)، کە ئەم دیسکە هەر پەیوەندی دەبێت بە خانەکانی دەرەوە لە کۆتاییەکانیدا.

سەرەنجام ئەم کۆتاییانەش جیادەبنەوە لە خانەکانی بارستەی دەرەوە، و خانەکانی کۆرپەلەکە بەرەو یەکتری گەشە دەکەن و دەچنەوەیەك و کۆدەبنەوە و یەکدەگرن لە چوارچێوەی ئەم دیسکەدا لە رۆژی سیانزەیەمدا، و لە رۆژی چواردەیەمدا بە تەواوەتی کۆرپەلەکە بە سەربەخۆیی دەردەکەوێت (وێنەی: ٧٤/ هـ)، کەواتە وەك بینیمان لە رۆژی حەوتەمەوە کۆبوونەوەی کۆرپەلەکە دەست پێدەکات (وەك فەرموودەکە ئاماژەی پێداوە) و لە رۆژی ١٤دا کۆتایی دێت.

ئیعجازی زانستی فەرموودەکانی سەرەوە بە ئاشکرا دەرکەوت، بەڵام حەزدەکەم ئاماژە بە ئیعجازێکی تر بدەم کە لە فەرموودەکانەوە تێی دەگەین، ئەویش ئەوەیە: فەرموودەکان ئاماژە بە کۆبوونەوەی کۆمەڵە شتێك دەدەن، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە پێشتر ئەم شتە (کۆرپەلەکە) لە چەند شتێکی بڵاوەبوو و دابەشبوو پێك هاتووە، کە بریتین لە خانەکان وەك زانستی نوێ بۆمان باس دەکات کە بەردەوامن لەسەر دابەشبوون، ئەمە خۆی لەخۆیدا ئاماژەدانە بەوەی کە لەشی مرۆڤ (و کۆرپەلەکەشی) لە خانە دروست دەبێت و لە خانە پێکهاتووە، کە ئەمە بۆچوونێکی زۆر گرنگە و بریتییە لە بنەمای زانستی بایۆلۆجی نوێ، و هەردوو زانا (شیڵدن و شوان) تەنیا لەساڵی

(١٨٣٩ن) دۆزییانەوە، واتە دوای نزیکەی ١٢٠٠ ساڵ لە هاتنی فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ)!!

## منداڵدان باشترین شوێنی جێگیربوونی کۆرپەلەیە ( القرار المكين ):

قورئانی پیرۆز وەسفی منداڵدانی ئافرەتی بە ووردترین شێوە کردووە، بەوەی: ﴿ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ﴾ (المؤمنون:١٣)، واتە: پاشان مرۆڤ تنۆکێك ئاو بووە کە لە شوێنێکی زۆر گونجاو و دامەزراودا جێگیرمان کرد، هەر لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ نَخْلُقكُّم مِّن مَّاء مَّهِينٍ{٢٠} فَجَعَلْنَاهُ فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ{٢١} إِلَى قَدَرٍ مَّعْلُومٍ{٢٢}﴾ (المرسلات)، واتە: ئەی ئەوە بۆ سەرنج نادەن، ئایا ئێوەمان لە ئاوێکی کەم و بێ‌نرخ دروست نەکردووە؟! ئینجا لە جێگەیەکی قایم و مەحکەمدا ئەم نوتفەیەمان جێگیر نەکردووە؟! بۆ ماوەیەکی دیاری کرا؟!

بەڕاستی وەسفێکی گشگیر و پڕ لە رەوانبێژی‌یە و هیچ زمانێك نی‌یە لەسەر زەوی کە ووشەی ئاوا رەوانبێژی تیّدا بێت (قَرَارٍ مَّكِينٍ).

ووشەی (قرار) واتە: شوێنی گیرسانەوە و جێگیربوون، لە فەرهەنگی (تاج العروس)دا هاتووە: (قرار: بمعنی استقر واستراح، وکذلك هو مکان یستقر فیه الماء)، واتە: بە مانای جێگیربوون و حەوانەوە دێت، هەروەها بریتی‌یە لەو شوێنەی کە ئاو تیّیدا جێگیر دەبێت، هەروەها لە فەرهەنگی (لسان العرب)دا دەربارەی (قرار) هاتووە: (والقرار من الأرض: المطمئن المستقِرّ)، واتە: بە شوێنێکی زەوی دەووترێت کە پڕ لە دڵنیایی و جێگیر بێت، ووشەی (قرار) لەو ئایەتە پیرۆزەدا ئاماژە بۆ پەیوەندی نێوان کۆرپەلە و منداڵدان دەکات چونکە منداڵدان شوێنێکی پڕ لەدڵنیایی‌یە بۆ جێگیربوونی کۆرپەلەکە (مکان آمن لإستقرار الجنین)، بەڵام ووشەی مکین (واتە: دامەزراو) ئاماژەیە بۆ پەیوەندی نێوان منداڵدان و لەشی ئافرەت، کە منداڵدان بە شێوەیەکی زۆر باش و تەواو لە لەشی ئافرەتدا دامەزراوە و جێگیر بووە (وێنەی ٣-٦٠) (هەروەها وێنە رەنگاورەنگەکانی: ٧٥/ هـ ، ٧٦/ هـ).




ئەم وێنانە وەسفی منداڵدان دەردەخەن کە (القرار المکین)ە، کە لەگەڵ گەشە کردنی کۆرپەلەکەدا قەبارەکەی زیاد دەکات بۆ لەخۆ گرتنی ئەم گەشە کردنەی، و هەروەها منداڵدان خۆیشی بە توندی لەناو سکدا جێگیر بووە.

قورئانی پیرۆز وەسفی منداڵدانی ئافرەت (کە نطفةکەی تێدا جێگیر دەبێت) بەوە کردووە کە شوێنی جێگیربوونە (قرار)، و تەئکیدیشی لەسەر کردووە، لە راڤەی ئەم ئایەتەدا (الآلوسي) لە تەفسیری (روح المعاني)دا دەڵێت: (فِي قَرَارٍ: اي مستقرّ وهو في الأصل مصدر من قرّ يقرّ قراراً بمعنى ثبت ثبوتاً، وأطلق على ذلك مبالغة)، واتە: بە مانای جێگیر بوو دێت کە چاوگە و مەبەست پێی جێگیر بوونە بە تەواوەتی، و بۆیە ئەم ووشەیە بەکارهێنراوە بە مەبەستی موبالەغە و تەئکید کردنە لەسەر جێگیریەکەی.

زانستی نوێی ئەمڕۆ زۆر ووردەکاری ئەم بابەتەی بۆ روون کردووینەتەوە، و بۆمان باس دەکات کە چۆن کۆرپەلە بۆ ماوەی نۆ مانگ لەناو منداڵداندا جێگیر دەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا کە لەشی مرۆڤ کاتێك هەر تەنێکی بێگانە بچێتە ناو لەشەوە بەرەنگاری دەبێتەوە و لەناوی دەبات، بەڵام ئەم کۆرپەلەیە (کە تەنێکی بێگانەیە) دەگرێتە خۆو بەخێویشی دەکات!! (وێنەی رەنگاورەنگی: ٧٧/ھ)

منداڵدان بە چەندین ماسولکە دەورە دراوە کە کۆرپەلەکە دەپارێزێت، و لەهەمان کاتدا لەگەڵ گەشەکردنی کۆرپەلەکەدا قەبارەی منداڵدانیش گەورە

دەبێت بۆئەوەی لەگەڵ قەبارەی کۆرپەلەدا بگونجێت کە وورده وورده گەشە دەکات (چونکە شوێنی جێگیر بوونێتی تا لەدایک بوون) (وێنەی ٣-٦١).




بروانە پێکهاتەی بەهێز و پارێزەری ئێسکەکانی حەوز، هەروەها ماسولکەی بەهێز منداڵدانی جێگیر کردووە لەناو سکدا پانی و فراوانی حەوزی ئافرەت لەچاو پیاودا بۆ لەخۆگرتنی کۆرپەلە. لەگەڵ قایم کردنی دەرکەکەی بۆ جێگیر کردنی کۆرپەلەکە.




چەند برگەیەکی ناوچەی حەوزی ئافرەت لەگەڵ وێنەی منداڵدان و هێڵکەدان کە جێگیری شوێنەکەیان لەناو سکدا دەردەخات




وێنەی (٣-٦١): چەند هێلکارییەك کە منداڵدان دەردەخات چۆن جێگیر و ئارامە لەناو سکدا و بە ئارامی کۆرپەلەکە لەخۆ دەگرێت تا لەدایك بوون.

هەروەها بینراوە کە کۆرپەلە بە سێ بەرگ داپۆشراوە دوای شلەی ئەمنیۆنی (Amniotic Fluid) کە تێ‌یدا مەلە دەکات، ئەوەی کە مایەی سەرسوڕمانە ئەوەیە کە لە قورئانی پیرۆزدا ئەم راستی‌یەش باسکراوە کە دەفەرموێت: ﴿يَخْلُقُكُمْ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ خَلْقًا مِن بَعْدِ خَلْقٍ فِي ظُلُمَاتٍ ثَلَاثٍ ...﴾ (الزمر:٦)، واتە: پەروەردگار ئێوە دروست دەکات لەسکی دایکانتاندا قۆناغ بە قۆناغ لەناو سێ تاریکی‌دا، ئەو سێ رووپۆش و بەرگەی کە دەوری کۆرپەلەی داوە و سێ تاریکی‌یەکە پێکدێنن زانستی نوێ بۆمان باس دەکات کە بریتین لە: ١- دیواری سک (Abdomenal Wall): کە لە پێست و ماسولکە و شانە بەستەرەکان پێك هاتووە. ٢- دیواری منالّدان (Uterine Wall): کە لە ماسولکەی بەهێز پێك هاتووە. ٣- رووپۆشەکانی داپۆشەری کۆرپەلە خۆی (Chorionic Membrane)، کە ئەمانە هەمووی وادەکات منالّدان شوێنێکی گونجاوبێت بۆ گەشە کردنێکی باش.




وێنەی (٢-٦١) صورة توضح الجنين وهو محاط بالأغشية الثلاثة

کۆرپەلە لەناو تاریکایی ٣ دیوارادایە، و بە ٣ پەردەش دەورە دراوە.

بەلاّم لە راستی‌دا ئەمەی باسکرا یەکەم ئیعجازی زانستی ئایەتەکەیە، ئیعجازی دووەم ئەوەیە کە زانایەکی فەرەنسی باسی کرد لە یەکێك لە کۆنگرە زانستی‌یەکاندا، کە ووتی: (ئێمە لە تاقیگاکانماندا کە خەریکی گەشەپێکردنی

کۆرپەلە بووین لە دەرەوەی منداڵداندا بینیمان کە کۆرپەلەکە پاش ماوەیەك لەناو دەفری تاقیکردنەوەکەدا دەوەستێت لە گەشەکردن لەگەڵ ئەوەشدا کە هەموو بارودۆخێکی گونجاوی بۆ دەرەخسێنین، لە دوایی‌دا بۆمان دەرکەوت کە هۆکاری ئەم وەستانی گەشەکردنە بریتی بوو لە نەبوونی تاریکی کە زۆر پێویستە بۆ گەشەکردنی کۆرپەلەکە[14]!!.

پێشتر بینیمان کە خوای پەروەردگار باسی سێ تاریکی دەکات نەك تەنها سێ دیوار، کە وەك بۆمان دەرکەوت و زانستی نوێی ئەمڕۆش بۆی سەلماندین کە کۆرپەلە بەبێ ئەو سێ تاریکی‌یە ناتوانێت گەشەبکات و بەردەوام بێت لە ژیانی‌دا (وێنەی ٣-٦١) (هەروەها بڕوانە وێنەکانی: ٧٨/هـ ، ٧٩/ هـ).

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە کاتێك قورئان وەسفی منداڵدان بەوە دەکات کە شوێنێکی گونجاوی جێگیربوونە (قرار)، هەموو راستی‌یە زانستی‌یە دۆزراوەکانی لەخۆ گرتووە و بەراستی وەسفێکی گونجاو و گشتگیرە، چونکە هەموو ئەو سیفاتانەی منداڵدانی لەخۆ گرتووە کە یارمەتی جێگیر بوونی کۆرپەلەکە و گەشە کردنی دەدات.

ووشەی دووەم کە قورئان وەسفی منداڵدانی پێکردووە بریتی‌یە لە ووشەی(مكين)، واتە بەهێزدامەزراو لەناو لەشی ئافرەتدا، لە فەرهەنگی(لسان العرب) دەرباری مانای (مكين) هاتووە: (مكين: بمعنى ثابت، راسخ في مكانه)، واتە: بە مانای جێگیر و دامەزراو لە شوێنی خۆی‌دا دێت، و پەیوەندی منداڵدان بە لەشی ئافرەتەکەوە دەردەخات کە شوێنێکی نموونەیی‌یە بۆ گەشە کردنی زیندەوەرێکی نوێ، بە گەڕانەوە بۆ زانستی توێکاری دەبینین شوێنی منداڵدان لە لەشی ئافرەتدا دامەزراوترین و پارێزراوترین شوێنە، کە دەکەوێتە ناوەڕاستی لەش بە گشتی و ناوەڕاستی حەوزەوە بە تایبەتی، کە لە هەموو

(14) لە موحازەرەیەکی (پرۆفیسۆر عبدالمجيد الزنداني) بەرامبەر قوتابیانی زانستدا وەرگیراوە.

لایەکەوە بە ئێسك دەورە دراوە، و وەکو سندوقێکی بەهێز چواردەوری داوە، لە هەمان کاتدا بە چەندین ماسولکە[15] و شانەی بەستەر و لکێنەری بەهێز جێگیربووە لە شوێنی خۆیدا، لە هەمان کاتیشدا پێش چوونە ناوەوەی کۆرپەلە بۆ ناومناڵدان بەهۆی چەند هۆرمۆنێکی تایبەت لە ئافرەتدا دیواری مناڵدان چەندین گۆڕانکاری بەسەردا دێت و ئەستوورتر دەبێت بۆ ئەوەی وەکو دۆشەکێکی نەرم و نیان پێشوازی لە کۆرپەلەکە بکات.

لە لایەکی ترەوە یەکێك لە کارەکانی مناڵدان ئەوەیە کە یارمەتی کۆرپەلەکە بدات لە بەردەوام بوون لە گەشە کردندا، هەربۆیە مناڵدان دەتوانێت هەزاران جار گەورە ببێت (لە ٢-٣ سانتیمەتر سێجا پێش سکپڕی بۆ ٥٠٠٠ سانتیمەتر سێجا لە کۆتایی سکپڕیدا، واتە نزیکەی ٢٥٠٠جار گەورەتر دەبێت)، کە بەمە لەگەڵ قەبارەی گەورە بووی کۆرپەلەکەدا خۆی دەگونجێنێت بەپێی قۆناغە جیاوازەکانی، و بەهۆی هۆرمۆنی پرۆجیستیرۆنەوە گرژبوونەکانی زۆر کەم دەبن و بە هێمنی دەبن بۆ ئەوەی زیان بە کۆرپەلەکە



کۆرپەلە لەناو سکی دایکیدا لەناو سێ تاریکاییدا پارێزراوە

(15) دیواری مناڵدان لە ماسولکەی بەهێز پێکهاتووە، کە وای لێکردووە مناڵدان بە ئەندامێکی ماسولکەیی دابنرێت، ئەستووریی دیوارەکەی ٢,٥سم دەبێت، و لە سێ چین پێکهاتووە، کە لە دەرەوە بۆ ناوەوە ئەمانەن: ١- چینی پرۆتینی (Perimetrium) کە لە دەرەوە مناڵدان دادەپۆشێت. ٢- چینی ماسولکەیی (Myometrium) کە زۆربەی ئەستووریی دیوارەکە پێکدێنێت. ٣- ناپۆشی مناڵدان (Endometrium) کە لە ناوەوە دایپۆشیوە.

نەگەیەنێت ( بڕوانە وێنەی رەنگاوڕەنگی: ٧٧/ هـ )، ئیتر دەبێت چ شوێنێك ئەمینتر و هێمنتر بێت لەم جێگایەی پەروەردگار رەخساندوویەتی!.

ئەم ووشەیەش زۆر گونجاو و لەبارە بۆ وەسف کردنی باری منداڵدان لەناو لەشی ئافرەتدا، کەواتە لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت هەموو ئەو وەسفانەی قورئانی پیرۆز دەیکات هەموویان لە شوێنی خۆیدان و زۆرگونجاو و لەبارن و زۆر بە ووردیی وەسفی کار و شوێنی منداڵدان دەکات، کە ئەوەی شارەزا و پسپۆڕ نەبێت لەو بوارەدا بە تەواوەتی لێیان تێناگات و بەڕاستی موعجیزەیەکی گەورەن بۆ یەکێك کە تێبگات: ﴿وَيَرَى الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ الَّذِي أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ الْحَقَّ وَيَهْدِي إِلَى صِرَاطِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ﴾ (سورة سبأ:٦).

## کورتەی زانیارییەکان دەربارەی نوتفە:

دوای ئەوەی کە زوربەی ئایەت و فەرموودەکانی باسی نوتفە دەکەن باسکران، پێویستە موراجەعەیەکی گشتی ئەو زانیارییانە بکەین کە لەم بارەوە هاتوون، بۆ ئەوەی بە دڵنیایییەوە بۆمان دەربکەوێت کە مەحاڵە قورئان و سوننەت بە رێکەوت باسی ئەم بڕە زۆرەیان لە زانیاری وورد کردبێت! تەنها دەبێت وەحی بێت لەلایەن ئەو کەسەی کە دروستکەری مرۆڤە و هەر ئەویشە گەشتی منداڵ بەرهەم هێنانی بۆ روون کردووینەتەوە، کۆی گشتی زانیاری و سیفاتەکان کە ئایەتەکانی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) باسیان کردووە ئەمانەن:

**سەبارەت بە هێلکەکەی ئافرەت:**

١- نوتفەکان لە کاتێکی زۆر زوودا دروست دەکرێن.

٢- ئەم هێلکۆکانە لە عەمبارێکی جێگیر و شارراوەدا هەڵدەگیرێن.

٣- بچووکی قەبارەی هێلکۆکەکە کە لە شێوەی تنۆکێك ئاودایە.

٤- دەرپەڕینی هێلکۆکە و ئاوەکەی، کە هێزێکی پاڵنەری خۆیی تێدایە.

٥- دەرهێنانی هێلکۆکەکە لە توورەکە داپۆشەرەکەی و دەرپەڕانی بە شێوەیەکی هێمنانە.

٦- هێلکۆکەکە ڕەنگی زەردە.

٧- پیتاندن و تێکەڵاوبوونی ئاوەکان.

٨- ڕۆیشتن بەخێرایی و دەرپەڕان.

٩- هێلکۆکەکە گەورەترە لە سپێرم.

١٠- کرداری ڕۆچوون لە هێلکۆکەی ئافرەتدا.

١١- هێلکۆکەکە کرۆمۆسۆمی تێدایە (کە پوختەی هەموو سیفاتەکانی دایکەکەی تێدایە).

سەبارەت بە سپێرمەکان:

١٢- لە قۆناغێکی زوودا دروست دەکرێن.

١٣- سپێرمەکان لە عەمبارێکی جێگیر و شاراوەدا هەڵدەگیرێن.

١٤- بچووکی قەبارەی سپێرمەکە کە لە شێوەی تنۆکێك ئاودایە.

١٥- دەرپەڕینی سپێرمەکان و ئاوەکەی، کە هێزێکی پاڵنەری خۆیی تێدایە (واتە خۆی جووڵەی تێدایە و جووڵەش دەبەخشێت).

١٦- دەرهێنانی سپێرمەکە لە تۆواوەکەی و دەرپەڕانی بە شێوەیەکی هێمنانە.

١٧- لە شێوەی ماسییەکی درێژدایە.

١٨- سپێرمەکان لە قەڕەباڵغییەوە دەردەچن و ژمارەیان زۆرە.

١٩- بەناو شوێنێکی تەسکدا تێدەپەڕن.

٢٠- بەخێراییەکی زۆر دەڕۆن.

٢١- هەستانی سپێرم بە کرداری پیتاندن و تێکەڵاو بوونی ئاوەکان.

٢٢- کرداری ڕۆچوون لە سپێرمی پیاودا.

٢٣- سپێرمەکان کرۆمۆسۆمیان تێدایە (کە پوختەی سیفاتەکانی باوکەکەیە).

٢٤- تۆو بچووکترە لە هێلکۆکە.

٢٥- سپێرم هۆکاری نێرینەیی و مێینەیی کۆرپەلەکەیە.




## وێنەی ( ٣-٦٣ )

**بەراوردێك لەنێوان دروست بوونی هێلكۆكە و سپێرمدا، كە تێبینی ئەمانە دەكرێت:**

**١- لە ئاكامی ٢ كەمە دابەشبووندا ژمارەی كرۆمۆسۆمەكان لە ( ٤٦ ) دانەوە دەبێت بە نیوە ( ٢٣ ) دانە.**

**٢- چوار سپێرم لە یەك خانەی تۆوی سەرەتاییەوە دروست دەبێت بەڵام تەنها یەك هێلكۆكە لە خانەیەكی سەرەتایی هێلكەوە دروست دەبێت.**

### هێلکەی پیتێنـراو ( زایگـۆت ):

٢٦- دروست بوونی هێلکەی پیتێنراو لە نوتفەی پیاو و نوتفەی ئافرەت.

٢٧- پیتاندنی هێلکە لە دەرەوەی مناڵدان دەبێت.

٢٨- تێکەڵاو بوون و یەککرتنی ماددەی بۆماوەیی هێلکە پیتێنراوەکە (کرۆمۆسۆمەکان کە لە دایك و باوکەوە هاتوون).

٢٩- لێکچوون و سیفاتەکانی کۆرپەلەکە لە زایگۆتەکەوە دەبێت (واتە لە باو و باپیرانەوە دەبێت).

٣٠- دوو لەتبوون (کەرت بوون)ی هێلکە پیتێنراوەکە.

٣١- خاسییەتی ڕۆشتن بەهێمنی.

٣٢- زایگۆتەکە (نوتفەکە) تەسکییەك دەبڕێت.

٣٣- زایگۆتەکە دەکەوێتە ناو منالدانەوە.

٣٤- میوانداری کردنی زایگۆتەکە لەلایەن منداڵدانەوە و پاراستنی گەشە کردنەکەی تا تەواو دەبێت.

٣٥- خۆچاندنی هێلکە پیتێنراوەکە لەناو دیواری منداڵداندا.

٣٦- هەلی لەبارچوونی ئەم زایگۆتە.

٣٧- ڕۆچوونی زایگۆتەکە بەناو دیواری منداڵداندا.

٣٨- کۆکردنەوە و کۆبوونەوەی کۆرپەلەکە.

٣٩- کۆرپەلە لە خانە پێکهاتووە.



وێنەی (٣-٦٤)

بەڕاستی زۆر سەرسوڕهێنەرە کە ئایەت و فەرموودەکان ئەم ڕێژە زۆرەی زانیارییان تێدابێت دەربارەی قۆناغی (نطفة)، و ئەو هەموو مانا ووردانە لەخۆ بگرن کە وەسفی نوتفەی پیاو و ئافرەت و نوتفەی تێکەڵاو بە ووردی دەکەن بەشێوەیەك وەك بەهەردوو چاوی خۆمان ببیینین وایە، ئەمانە دەیسەلمێنن کە دەبێت ئەم ئایەتانە لەلایەن پەروەردگاری زانا و داناوە نێردرابن، و ئەو کەسەشی کە هەواڵی بەمانە داوە دەبێت نێردراو و پەیامبەری بەڕێز و ڕاستگۆی ئەو بێت.

لێرەوە دەگەینە ئەو ڕاستییەی کە قورئانی پیرۆز هەموو لایەنێکی گەشەی کۆرپەلەی باس کردووە لە قۆناغی یەکەمدا (قۆناغی نطفة) هەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی، کە لەم باسەیدا چەند زاراوەیەکی وەسفکەری ووردی زانستی بەکار هێناوە بۆ هەموو بەشێکی ئەم قۆناغە، کە وەك ووتمان مەحاڵە بتوانرێت ئەو گەشە کردن و گۆڕانکارییانە بدۆزرێنەوە بەبێ بوونی ووردبینی زەبەلاح و بەکارهێنانیان لەم بوارەدا! ئەویش بەهۆی قەبارەی بچووکی نوتفەوە.

لەو سەردەمەی کە قورئان و سوننەتی پیرۆز ئەم زانیارییانەیان باس کردووە دەربارەی قۆناغی یەکەمی گەشەی کۆرپەلە، زانایانی توێکاری غەیری موسوڵمان وایان دەزانی کە کۆرپەلە لە خوێنی مانگانەی ئافرەتەوە گەشە دەکات، کە ئەم بۆچوونە باوبوو تاوەکو دۆزینەوەی مایکرۆسکۆپ لە سەدەی ١٧ی زایینیدا، دۆزینەوەی سپێرم و هێلکەش دوای ئەمە بووە هۆی پەیدا بوونی چەند بیروبۆچوونێکی هەڵەی تر کە زاڵ بوون لەم سەردەمانەدا، بەڵام تەنها لە کۆتایی سەدەی هەژدەدا دەرکەوت کە هەردوو سپێرم و هێلکە پێویستن بۆ دروست بوونی کۆرپەلە.

سەبارەت بە زانیاریی عەرەبەکانی سەردەمی پێغەمبەریش (ﷺ) کە زۆر لەدواوە بوو دەتوانین نموونەیەك بێنینەوە، لەو کاتەدا تەنیا سەرچاوەی زانیاریی ئەوان بریتی بوون لەو جوولەکانەی کە لەناویاندا دەژیان، و لە

یەکێك لە ووتەکانیاندا دەیانووت کە ئەگەر پیاو کاتێك بچێتە لای خێزانەکەی لەدواوە (واتە لە شوێنی شەرعی‌یەوە بچێتەلای بەڵام لەدواوە)، ئەوا منداڵەکەی خێل دەردەچێت! ئەوەبوو هاوەڵەکان هاتن و ووتیان جوولەکەکان شتێکی وا دەڵێن ئایا ئەمە ڕاستە؟

خوای گەورەش بۆ ڕەواندنەوەی ئەم قسە پڕوپووچە ئەو ئایەتەی ناردە خوارەوە ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ ...﴾، کە سەلماندی ئەم کردارە هیچ ڕۆڵێکی نی‌یە لە نوقسان بوونی کۆرپەلەکەدا (بە تایبەتی خێلیی)، کەواتە قورئانی پیرۆز تەنها بەوەوە نەوەستاوە کە بە ووردیی باسیی ڕاستی‌یەکانی دروست بوونی کۆرپەلەی کردبێت بەڵکو خورافات و قسە ناڕاستەکانیشی لەو بوارەوە دەڕەواندەوە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی چەندین هەنگاو لە پێش زانیاری‌یەکانی ئەو سەردەمەوە بووە و بە هیچ شێوەیەك لە زانیاری‌یەکانی ئەو کاتەوە وەرنەگیراوە.

کەواتە بۆمان دەرکەوت دوای چەندین سەدە ئینجا زانستی نوێ گەیشتە هەندێك لەو زانیاری‌یانەی دەربارەی گەشە کردنی کۆرپەلەی ئادەمیزاد لە قورئان و سوننەتدا هاتوون، وەك ووتمان ئەو زاراوانەش کە قورئان بەکاری هێناون زۆر گشتگیر و ووردن و دەست دەدەن بۆ ناولێنانی زانستی، کە لەگەڵ پێشکەوتنی زانستی لەم بوارەدا لەوانەیە ئەم زاراوە قورئانی‌یانە (لە هەموو بوارە زانستی‌یەکاندا) گونجاوترین لەو زاراوانەی ئێستا بەکاردێن، بە شێوەیەك کە زانایان و توێژەروان وەك بەدیلێك بۆ زاراوەکانی سەردەم بەکاریان بهێنن، ئەویش لەبەرئەوەی کە بە ووردی وەسفی سەرەتا و کۆتایی هەموو کردارێك دەکەن و زۆر سادە و ئاسانیشن بۆ تێگەیشتن.

کێ باوەڕی دەکرد و بەخەیاڵیدا دەهات لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) کە (نطفة) ئەم هەموو نهێنی‌یانەی تێدایە، بەڵام دەبینین قورئانی پیرۆز لەو کاتەدا ئەم زانیاری‌یانەی وەکو ڕاستی‌یەکی بێگومان باسکردووە و تحدی‌ی هەموو مرۆڤەکانیشی پێکردووە، دەبا لێرەدا هەموومان بەگشتی ئەو

راستی‌یە دووپات بکەینەوە کە قورئان و سوننەتی پیرۆز هاوئاهەنگی بەردەوامی یەکترین و زانستی نوێی ئەمڕۆش سەلمێنەری راستی‌یەکانی هەردووکیانە.

## ئەی مرۆڤ: چۆن بێباوەڕی دەکەیت ؟!!

ئەی ئادەمیزاد ئایا لەخۆت پرسیوە کە تۆ لەکوێ بوویت پێش لەدایک



بوونت؟ چۆن دروست بوویت؟ لە چی‌یەوە دروست بوویت؟ و چەندەها پرسیاری تر؟!

– ئایا دەزانیت چۆن دروست بوونت دەستی پێکرد؟

+ لەشی مرۆڤ دەردراوی زۆری هەیە، لەوانە ئارەق، و فرمێسک، و لیک، هەروەها میز و شیر و بەڵغەم، هەروەها ئاوێکی زۆر کەم و حیساب بۆ نەکراو، کە وەك دەردراوەکانی تر نی‌یە، چونکە لەم ئاوە بێنرخەوە گەل و نەتەوەکان و هۆز و تیرەکان دروست دەبن.... تۆ سەرەتا دوو بەش بوویت کە نیوەی باوکت و نیوەی دایکت دەریانداویت... ئەی ناپرسیت ئایا چۆن ئەم دوو نیوەیە بەیەك گەشتن؟! ئەمە بە ویست و ئەندازە بۆدانانی پەروەردگاری بەدەسەڵات و زانیار بووە.



کێیە ئەو خۆشەویستی و میهرەبانی‌یە دەخاتە نێوان ژن و مێردەوە کە هاندەر بێت بۆ هاوسەری گرتنیان؟ کێیە نیوەی تۆی لە باوکتەوە ئامادە کرد و بارودۆخێکی وەها گونجاوی ژیانی بۆ رەخساند و ئامادەی کرد و ئیمدادی کرد بە خۆراك و چالاکیی و جووڵە؟؟

کێیە کە بەڕێی کرد لە جێیەکەوە بۆ جێیەکی تر؟ و کارئاسانی بۆ کرد بۆ ئەوەی کە نیوەکەی تر ببینێت و دەرگاکانی بۆ والاّ کرد؟! کێیە کە



کارێکی وای کرد منالّدانی دایک گرژببێت بۆ ئەوەی کە یارمەتی نیوەکەی باوکت بدات بەردەوام بێت لەسەر جوولّە و پێشبڕکێ بە مەبەستی گەیشتن بە شوێنی دیاری کراوی بەیەك شادبوون؟ کێیە نیوەکەی دایکتی گواستەوە و خۆراك و شوێنی بۆ ئامادە کرد؟

کێیە ئەم دوو نیوەیەی کۆکردەوە لە کاتێکی دیاری کراو و شوێنێك و دەروبەرێکی دیاری کراودا؟ و ئامادەی کردن لە ماوەیەکی دیاری کراوی




تەمەنی دایکتدا کە بتوانێت سکپڕ ببێت و هەلّتبگرێت؟ بۆ ئەوەی بوونی دروستکراوێکی نوێ ئاشکرا بکرێت ....

کێیە هەموو ئەو ئەندازە و تەقدیرەی کرد بۆ دەرچوون و دروستبوونی زیندەوەرێکی بلیمەت کە تۆی؟ زیندەوەرێك کە کارەکانی بۆ رێکخرا بە ووردی، و وەسفەکانی و بارەکانی بۆ تەقدیر کرا بە تەواوی، ئەندازە بۆ دانانێك کە کات و شوێنی گرتەوە، و ئەندازە بۆ دانانی بارودۆخ و هەیئەت و بارەکانی، ئەندازە دانان بۆ رژێنەکان و



هۆرمۆنەکان، و ئەندازە دانانێك کە سیفات و جیاکەرەوەکان و هەلّس وکەوت و تواناکانی گرتەوە، ئەندازە دانان بۆ نەوەکان و رۆلّەکانی دوارۆژ، ئەندازە دانان بۆ دوارۆژی و



دەرهێنانی لە رابوردووی شارراوەوە بۆ زەمەنی ئێستا... و گواستنەوەی سیفاتەکان لە باوانەوە بۆ نەوەکان ...

تۆ ئەی مرۆڤ کە هەر چی‌یەك بیت.... و پلە و پایەت هەرچی‌یەك بێت: بچووك یا گەورە، پێشەوا یان کەڵەپیاو، پاشا یان سەرۆك ، زانا یان نەزان بیت... تۆ پێشتر ئاوێکی بێ‌نرخ بوویت کە ئەندازەی بۆ دانرا و کاروبارەکانی ئاوا تەقدیر کرا، و بووی بە مرۆڤێکی بیسەر و بینەر!! دەبێت کێ لە پشت ئەم رێکخستن و ئەندازە بۆ دانانەوە بێت؟ ئایا بە رێکەوتی کوێر بووە؟ یان نوتفەکە خۆی ئەم کارەی کردووە؟ یان کاری رژێن و هۆرمۆنەکانە بە تەنیا؟



تۆ بڵێی یەکێك لەمانە لە پشت ئەم پێکهاتنە وورد و ئەندازە دانانە دامەزراوەوە بێت بۆ شێوەکان، و قەبارەکان، و کارەکان و سیفاتەکان، و کات، و شوێن!!؟ ئەمانە کە هیچیان خاوەنی تەقدیر و تەدبیر نین، و ئاگایان لە پرۆسەکە نی‌یە لە سەرەتاوە تا کۆتایی!!

یان بێگومان ئەمە کاری دروستکەری زانا و دانا و خاوەن دەسەڵاتە کە ئاگای لە هەموو شتێکە و زەڕڕەیەك لە زانیاری ئەو وون نابێت!! و ئەندازە و تەقدیری کارەکانی بۆ هەموو ئەندامێك داناوە، و ئەرکەکان و پێویستی‌یەکانی هەموو رێك خستووە و کامڵی کردووە!؟

﴿قُتِلَ الْإِنسَانُ مَا أَكْفَرَهُ، مِنْ أَيِّ شَيْءٍ خَلَقَهُ، مِن نُّطْفَةٍ خَلَقَهُ فَقَدَّرَهُ، ثُمَّ السَّبِيلَ يَسَّرَهُ، ثُمَّ أَمَاتَهُ فَأَقْبَرَهُ، ثُمَّ إِذَا شَاءَ أَنْشَرَهُ، كَلاَّ لَمَّا يَقْضِ مَا أَمَرَهُ﴾ (عبس: ١٧-٢٣)، واتە:

تیا چوون بۆ مرۆڤ بێت (ئەی ئادەمیزاد بە کوشت بچیت) کە ئەوەندە بێباوەڕی دەکات! کە چەند سپڵەیە! چەندە خوانەناس و یاخییە! (یان بەکوشت بچێت ئادەمیزاد چی وای لێکردووە کە کافر بێت؟! چ پاساوێکی هەیە بۆ خوانەناسی و




یاخی بوون)، ئەی باشە بۆ بیرناکاتەوە و سەیر ناکات کە لە چییەوە دروست بووە، ئەو سەرەتا لە تنۆکێک ئاوەوە (نوتفەیەکەوە کە بەچاو نابینرێت) دروستمان کرد و یەکسەر ئەندازەمان بۆ دانا (هەموو ئەندامانی دەر و ناوەوەی پێدا ... ەوە و ئەندازەگیری ووردی لە دروستکردنیدا ئەنجامداوە)، لەوەودوا ڕێگەی بۆ ئاسان کردووە کە بێتە ژیانەوە و ژیانی بۆ ئاسان کردووە و سەرپشکی کردووە لە پەیڕەوی کردنی ڕێگەی چاکە یان خراپە، ئیمان یان کوفر (دوای ئەوەی کە دەست نیشانی هەردووکیانی بۆ کردووە و سەرەنجامی روون کردووەتەوە)، لەوەودوا دەیمرێنێت و دەیخاتە ناو گۆڕەوە، پاشان کاتێك بیەوێت زیندووی دەکاتەوە، بەڕاستی ئەوەی کە خوا فەرمانی پێداوە هێشتا ئادەمیزاد بەجێی نەهێناوە.

هەروەك چۆن ئەمە بریتی بوو لە سەرەتای مرۆڤ لە نوتفەیەکەوە کە هەموو ئەو مادده بۆماوەیی و کرۆمۆسۆمانەی تێدایە کە بەچاو نابینرێن و بوونی مرۆڤی لێوە پەیدابوو، و بەهۆیانەوە مرۆڤێکی ڕێك وڕاست و ڕێك و پێك پەیدا بوو کە زەوی پڕکرد لە کار و کردار و شارستانییەکانی دامەزراند، بەهەمان شێوەش زیندوو بوونەوە و دروستبوونەوەی دواڕۆژیش روودەدات... ئەو کەسەی کە یەکەم جار توانی دروستی بکات دەتوانێت

جارێکی تر دروستی بکاتەوە، خوای گەورە زۆر جوان وەسفی مرۆڤی سپڵە و ناپەسەنی کردووە کە دەفەرموێت:

﴿أَوَلَمْ يَرَ الْإِنسَانُ أَنَّا خَلَقْنَاهُ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ {٧٧} وَضَرَبَ لَنَا مَثَلاً وَنَسِيَ خَلْقَهُ قَالَ مَنْ يُحْيِي الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ {٧٨} قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ﴾ (سورة يس)، واتە: ئایا ئادەمیزاد سەرنجی نەداوە کە ئێمە بێگومان دروستمان کردووە لە نوتفەیەك، کەچی خێرا بووەتە دوژمنێکی ئاشکرا و دژایەتیمان دەکات؟! نموونەی لاوازیی و بێدەسەڵاتی بۆ ئێمە هێناوەتەوە و بەدیهاتنی خۆی لەبیر کردووە، دەیووت: کێ ئەم ئێسکانە زیندوو دەکاتەوە لە کاتێکدا کە ڕزیوو و پرتووکاون؟!.




ئایا ئەمە ئەوپەڕی بێعەقڵی نییە لە بەرامبەرکێدا؟! لە کەسێکی دروست بوو لە نوتفەیەکەوە بەرامبەر پەروەردگاری ئاسمان و زەوی و دروستکەری ژیان و زیندەوەرەکان.

زەمانێکی زۆر بەسەر زەویدا ڕۆی کە نەیدەتوانی شایەتی لەسە بوونی مرۆڤ بدات و هیچ جۆرە بوونێکی نەبوو، ئەوەبوو لە پڕێکدا بوو بە سەروەر لەسەر زەویدا و نەوەکانی بۆی دەردەچوون لە نوتفەیەکی تێکەڵاوەوە و بە ئامادە کراوی و پڕچەك کراوی بە هۆکارەکانی وەرگرتنی زانست (بیستن و بینین و ... هتد) بۆ ئەوەی مرۆڤ شایەنی وەرگرتنی هیدایەت و ئەمانەتی

خودایی بێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿هَلْ أَتَى عَلَى الْإِنسَانِ حِينٌ مِّنَ الدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْئاً مَّذْكُوراً﴾ (الإنسان:١)، واتە: بەڕاستی ماوەیەکی زۆر لە ڕۆژگار بەسەر ئادەمیزاددا هات کە شتێکی وانەبوو ناو ببرێت.

ئەمانە هەمووی بە مەبەستی تاقی کردنەوەی مرۆڤە لەسەر زەوی‌دا، و بۆ ئەوەی ئەوەندەی خودا وویستی لێبێت لە زانست و کردەوە مرۆڤ وەریبگرێت و بیکات، کە پاشان هەموو شتێك لە دونیادا لەناو ئەچێت و تەنیا کردەوە چاك و خراپەکان دەمێننەوە کە ئادەمیزاد پاداشت یان سزایان لەسەر وەردەگرێت.

# هاوپێچی وێنە ڕەنگاوڕەنگەکانی

# بەشەکانی (١ ، ٢ ، ٣)



دەرکەی منالْدان بە بەربەستێکی لینج گیراوە کە کارێکی وا دەکات لێکۆلْینەوەی کۆرپەلە لە سکی دایکیدا کارێکی زۆر گران بێت




﴿ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا﴾ [سورة المؤمنون: ١٤]

# الفصول الرئيسية في خلق الجنين
















لا يزال تضارب الأطباء قائماً حتى يومنا هذا في تحديد الفصول الأساسية لعملية خلق الجنين والتي تمر عبر مئات المراحل.

في حين أن كتاباً منذ ١٤٠٠ عام حدد أنها خمسة فصول أساسية:

١ - نطفة.

٢ - علقة، «وتعني الشيء المعلق».. «انظر الصورة ولاحظ كيفية التعلق بجدار الرحم».

٣ - مضغة، «قبل العظام واللحم».

٤ - عظام.

٥ - اللحم.

لقد أصيب العلماء بالذهول، فمنهم من أقر بالاسلام ومنهم من جحد الحق وهو يعلم.




[سورة النمل: ٨٤]

# وێنەکانی بەشی «١»




## وێنەی ژمارە ( ١/ هـ )

زانا ( ڤان لیڤینهۆك ) لە کۆتایی سەدەی حەڤدەیەمدا ووردبینی بەکارهێنا و بەهۆیەوە سپێرمی دۆزییەوە، لەم وێنەیەدا دیمەنێکی بەکارهێنانی ووردبینێکی کۆن روون کراوەتەوە، کە تەنەکە دەخرایە بەردەم هاوێنەکە و بەهۆی ئەو برغووەوە شوێنەکەی ڕێك دەکرا.



## وێنەی ژمارە ( ٢/ هـ )

ئەو زانایەی کە سپێرمی دۆزییەوە ( بەهۆی ووردیی دروست بوونییەوە ) وای دەزانی کە سپێرمی پیاو مرۆڤێکی بچووك کراوەی تێدایە، ئەم وێنەیەی کە زانا ( هارتسوکەر ١٦٩٤ز) دایناوە ئەو بۆچوونەمان بۆ روون دەکاتەوە، کە مرۆڤێکی تەواوی قەزەم لەگەڵ بوونی دەستەکان و قاچەکان لەناو سپێرمەکەدا پیشاندراوە.




## وێنەی ( ٣/ هـ )

زاووزێ بە پێی زانا ( Buffon 1749 ):

وێنەی ( A ) تۆوی پیاوە و تێکەڵاو کراوە لەگەڵ باراناودا بە مەبەستی جیاکردنەوەی ئەو تەنە بچووکانەی کە باوەڕیان وابووە تێیدایە.

وێنەی ( B ) هەمان تۆواوە کە ماوەیەك وازی لێهێنراوە بۆ ئەوەی شلتر ببێت.

وێنەی ( C ) لە نێرینەی سەگێکەوە وەرگیراوە.

وێنەی ( D ) لە مێینەی سەگێکەوە وەرگیراوە کە هێشتا نە پیتێنراوە.

ئەم وێنانە ئەو بۆچوونەمان بۆ ڕوون دەکەنەوە کە زانایان پێشتر لە خەیاڵی خۆیانەوە هەوڵی لێکدانەوەی دروست بوونی مرۆڤیان دەدا کە لێرەدا ئاشکرایە وویستوویانە بە خەیاڵی خۆیان ئەو مرۆڤە بچووککراوانەی کە لەناو سپێرمدایە بەم کردارە جیابکەنەوە!!

# وێنەکانی بەشی ﴿٢﴾



وێنەی ( ٤/ هـ )

ئەمە وێنەی کەشتی‌یەکی ئاسمانی نی‌یە بەڵکو بریتی‌یە لە کۆرپەلەیەك لەناو پەردەکانی‌دا !!


خشتەی زەمەنی گەشە کردنی مرۆڤ (١ تا ٣٨ هەفتە)
TIMETABLE OF HUMAN PRENATAL DEVELOPMENT
1 to 38 weeks
EARLY DEVELOPMENT OF OVARIAN FOLLICLE
MENSTRUAL PHASE
PROLIFERATIVE PHASE
day 1 of menses
COMPLETION OF DEVELOPMENT OF FOLLICLE
oocyte
ovulation
CONTINUATION OF THE PROLIFERATIVE PHASE
midcycle
AGE (weeks)
1
2
1 Stage 1
fertilization
2 Stage 2 begins
zygote divides
3
morula
4 Stage 3 begins
early blastocyst
5
late blastocyst
6 Stage 4 Implantation begins
7 Stage 5 begins
SECRETORY PHASE OF MENSTRUAL CYCLE
8 amniotic cavity
bilaminar disc
9 Lacunae appear in syncytiotrophoblast
primitive yolk sac
10 Blastocyst completely implanted
epithelium growing over surface defect
11 Primitive placental circulation established
12 extraembryonic mesoderm
coelom
13 Stage 6 begins
primary villi
14 dorsal aspect of embryo
prochordal plate
embryonic disc


3
16 first missed menstrual period
primitive streak
16 Stage 7 begins
noto-chordal process
17 intra-embryonic mesoderm
trilaminar embryo
18 Stage 8 begins
neural plate
primitive streak
length: 1.5 mm
19 neural fold
notochord
embryonic coelom
20 Stage 9 begins
brain
neural groove
somite
Thyroid begins to develop.
21 neural groove
somite
Heart tubes begin to fuse.
4
22 Stage 10 begins
Heart begins to beat
Neural folds fusing.
23 rostral neuropore
primordia of eye and ear present.
caudal neuropore
24 Stage 11 begins
heart bulge
rostral neuropore closes
2 pairs of branchial arches
25 otic pit
3 pairs of branchial arches
26 Stage 12 begins
arm bud
indicates actual size
27 4 pairs of branchial arches, arm & leg buds present.
CR = crown-rump length.
28 Stage 13 begins
CR: 4.0 mm
5
29 CR: 5.0 mm
30 Lens pits, optic cups, nasal pits forming.
31 developing eye
nasal pit
primitive mouth
32 Stage 14
Hand plates (paddle-shaped)
Lens pits and optic cups formed.
33 Stage 15 begins
hand plate
CR: 7.0 mm
34 Head much larger relative to trunk.
cerebral vesicles distinct
leg buds (paddle-shaped)
35 CR: 8.0 mm
6
36 Oral & nasal cavities confluent.
37 Stage 16 begins
foot plate
CR: 9.0 mm
38 Upper lip formed.
39 CR: 10.0 mm
40 Arms bent at elbow.
Finger rays and auricular hillocks distinct
Palate developing.
41 Stage 17 begins
finger rays
ventral view
42 CR: 13.0 mm


(weeks)
7
8
9
10
43
C.R: 16.0 mm
44
Stage 18 begins
Eyelids beginning
45
Tip of nose distinct
Toe rays appear
Ossification may begin
C.R: 17.0 mm
46
Loss of villi
Smooth chorion forms.
47
genital tubercle
urogenital membrane
anal membrane
♀ or ♂
48
Stage 19 begins
Trunk elongating and straightening
49
C.R: 18 mm
50
Upper limbs longer & bent at elbows
Fingers distinct
51
Anal membrane perforated
Urogenital membrane degenerating.
Testes and ovaries distinguishable.
52
Stage 21 begins
53
Stage 21
External genitalia still in sexless state but have begun to differentiate.
54
Stage 22 begins
genital tubercle
urethral groove
anus
♀ or ♂
55
Beginnings of all essential external & and internal structures are present.
56
Stage 23
C.R: 30 mm
57
beginning of fetal period
58
59
Genitalia show some ♀ characteristics but still easily confused with ♂.
60
phallus
urogenital fold
labioscrotal fold
perineum
♀
61
Genitalia show fusion of urethral folds.
Urethral groove extends into phallus.
62
phallus
urogenital fold
labioscrotal fold
perineum
♂
63
C.R: 50 mm
64
Face has human profile.
Note growth of chin compared to day 44.
65
66
Face has human appearance.
67
clitoris
labium minus
urogenital groove
labium majus
♀
68
Genitalia have ♀ or ♂ characteristics but still not fully formed.
69
glans penis
urethral groove
scrotum
♂
70
C.R: 61 mm




وێنەی (٥/ھ): گەشە کردنی کۆرپەلە لە پیتاندنەوە دەست پێدەکات، کە بە قۆناغەکانی نوتفە، و دروست کردن، و گەشە کردندا دەڕوات

وێنەی زنجیرەیی ژمارە ( ٦/هـ ): ئەم وێنانە ووردەکاریی قۆناغە جیاوازەکانی دروست بوونی کۆرپەلە روون دەکەنەوە




**The seminiferous tubules.** *(a)* A sagittal section of a testis and *(b)* a transverse section of a seminiferous tubule.




ئەم وێنانە هێلکەدانی ئافرەت دەردەخات کە کارگەی دروست کردنی خانەکانی زاووزێی ئافرەتن کە ( هێلکۆکە پێگەیشتووەکانن ).

من المفارقات المثيرة أن المولودة الأنثى تولد وتشمل مبايضها العدد الكامل من البويضات التي تفرزها طوال عمرها. وفي الصورة العليا مبيض طفلة ولدت وبه البويضات البدائية. والصورة اليسرى لمبيض امرأة بالغة خصبة وفيه البويضات المستعدة للإنطلاق. وفي اليمنى مبيض امرأة في سن اليأس حيث لاتوجد أية بويضات في المبيض.




یەکەم خانەی مرۆڤێکی نوێ کە پێی دەووترێت هێلکەی پیتێنراو (زایگۆت)، کە لە یەکگرتنی تۆو و هێلکۆکەوە دروست دەبێت.

چەند دیمەنێکی بەرکەوتنی سپێرم لەگەڵ هێلکۆکەدا و یەکگرتنیان و دروست بوونی زایگۆت و دابەشبوونی.

**رۆژی سێیەم:**
زایگۆتەکە دوای پیتاندن بە ٣ سەعات دەست دەکات بە دابەش بوون لە بۆری مناڵداندا و لە هەمان کاتدا بەناو ئەو بۆرییەدا دەجووڵێت بۆ گەیشتن بۆ ناو مناڵدان.




لە رۆژی شەشەمدا: تۆپەڵێك خانە (کە ژمارەیان دەگاتە نزیکەی ١٠٠خانە) دەکەوێتە ناو مناڵدانەوە و پێی دەووترێت (Blastocyst)، کە تۆپەڵێك خانەیە لەناو ڕوپۆشێکی بەهێزدا.




گەشە کردنی کۆرپەلە لە مانگی یەکەمدا: دوای گەیشتنی زایگۆت بۆ ناو منداڵدان و خۆچاندنی لەناو دیوارەکەیدا، ئیتر لێرەوە پێی دەووترێت کۆرپەلە و بە هێواشی ئەندامە جۆراوجۆرەکانی دروست دەبن و گەشە دەکەن.




دوای خۆچاندن لەناو منداڵداندا خانەکانی کۆرپەلەکە دەست دەکەن بە جیاواز بوون و سەرەتای ئۆرگانەکان دروست دەکەن، ئەم کۆرپەلە ٤ هەفتەیە درێژییەکەی ٥ ملم دەبێت (لە سەرەوە تا کۆتایی لەش).




**کۆرپەلە لە قۆناغی گۆشتپارە و دوای ئەودا : دەبینین چۆن وورده وورده شکلی مرۆڤ وەردەگرێت، سەرەتای هەموو ئۆرگانەکان دروست بووە، و دەبینین چۆن لەناو شلەی ئەمنیۆنیدا مەلە دەکات کە مژمرێکی پەستان و بەرکەوتنە بۆ پاراستنی کۆرپەلەکە. لە کۆتایی ٨هەفتەدا درێژی کۆرپەلەکە دەگاتە ٣٠ میللیمەتر.**




**چەند دیمەنێکی راستەقینەی تەواو بوونی دروست بوونی کۆرپەلە لە قۆناغە کۆتاییەکانیدا**




لەگەڵ ئەوەشدا کە منداڵ ٩ مانگ لە سکی دایکیدا دەبێت، بەڵام کۆرپەلەکە لە هەفتەی دوانزەوە ڕوخساری تەواوی مرۆڤی وەرگرتووە، بەڵام هێشتا ئەندامەکانی بە تەواوەتی گەشەیان نەکردووە، و ئەو ماوەیەی کە دەمێنێت ماوەیەکی تەواوکەر و گۆش گرتنە لەناو منداڵداندا، پاک و بێگەردی بۆ ئەو پەروەردگارەی ئەم ووردەکارییەی ڕاگرتووە:

﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن سُلَالَةٍ مِّن طِينٍ {١٢} ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ {١٣} ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ {١٤}﴾ (المؤمنون).

# وێنەکانی بەشی ﴿٣﴾




**وێنەی (٧/ هـ)** پێکهاتەی سپێرمەکان لە پیاودا: (وێنەی لای چەپ وێنەیەکی ڕاستەقینەی بەشێکی گونە لە پیاودا کە سپێرمەکانی تێدا دروست دەبن).




(وێنەی ٨/ هـ): گونەکان لە پیاودا کارگەی دروست کردنی خانەکانی زاووزێن (سپێرمەکان).




وێنەی (٥/٩)

ئەم وێنەیە کۆئەندامی زاووزێ لە ئافرەتدا ڕوون دەکاتەوە، کە تێیدا هێلکەدانەکان دەرکەوتوون، کە کارگەی دروست کردنی خانەکانی زاووزێی مێینەن (هێلکۆکەکان).




وێنەی (٥/١٠)

**Stages of ovum and follicle development.** This diagram illustrates the stages that occur in an ovary during the course of a month. The arrows indicate changes with time.

ئەم وێنەیە دروست بوونی هێلکۆکەی پێگەیشتوو لە خانە سەرەتاییەکان، و دەرپەڕینی لە هێلکەدانەوە و دروست بوونی تەنی زەرد و سەرەنجامەکەی ڕوون دەکاتەوە.




ئەم هێلکاریانە دروستبوون وگەشەکردنی سپێرم و هێلکۆکەی پێگەیشتوو لە خانە سەرەتاییەکانیانەوە ڕوون دەکاتەوە، کە لەکاتی گەشە کردنیاندا کرداری کەمە دابەش بوونیان بەسەردا دێت و دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی ژمارەی کرۆمۆسۆمەکانیان بۆ نیوەی ژمارەی ئاسایی خانەکانی لەش.

## وێنەی (١٣/ هـ)

ئەم وێنانەی سەرەوە چەند وێنەیەکی راستەقینەی وردبینیی هێلکۆکە و سپێرمە پێگەیشتووەکانە، هێلکاریەکانی خوارەوە شوێنی دروست کردنیان و هەڵگرتنیانە لە ئەندامەکانی زاووزێی پیاو و ئافرەتدا.

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿ خُلِقَ مِن مَّآءٍ دَافِقٍ ۝٦ يَخۡرُجُ مِنۢ بَيۡنِ ٱلصُّلۡبِ وَٱلتَّرَآئِبِ ۝٧ ﴾

[سورة الطارق: ٦ - ٧]

حشد المفسرون كل سلاح من الأثر والنظر وانتهوا إلى عشرة آراء
وحشد علماء الأجنة أعظم مجاهرهم لكشف تفاصيل الأحداث المثيرة المؤدية إلى تكون الجنين
عبر أربعة قرون كاملة ..

**وإذا بالحقيقة العلمية المذهلة:**

- لم يكن ماء الرجل إلا سائلاً يموج بملايين الحوينات (الدافعة) في سباق رهيب صوب الوعد الموعود.
- لم يكن ماء المرأة إلا سائل (دافق) بعد انفجار مثير به (تندفق) البويضة طائرة من جرابها عبر تجويف البريتون صوب الوعد الموعود.
- أما الأصل الأول لنشوء الخصية والمبيض فكان فريداً. إنه يبدأ هنالك عند زاوية التقاء الصلب مع الترائب. ثم يرحل ساحباً وراءه جسراً من الدماء ممتداً من ركب الزاوية وحتى الصفن (في الرجل) والحوض (في المرأة).

لقد اختصرت جهود أربعة قرون متواصلة في علم الأجنة في أربع عبارات. يخلق الإنسان من:

سائل (الرجل والمرأة). مندفع بسرعات رهيبة. يتخلص وينتج. من كيمياء تكوين الخلايا الحية من مكوناتها عبر مسارات الدماء من زاوية الصلب والضلوع.

وبإيجاز معجز إذ هي أربع كلمات:

«ماء دافق - يخرج - من بين الصلب والترائب».

**وقال الله تعالى:**

﴿ وَيُرِيكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ فَأَيَّ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ تُنكِرُونَ ۝٨١ ﴾

[سورة غافر: ٨١]

صورة باهرة لبويضة (أنثوية) وقد استقرت في قناة فالوب عقب رحلة (طائرة) منطلقة من المبيض إلى قدر معدود. إنها بانتظار جموع المنويات المندفعة من غير هوادة لتخصيبها. (أسفل)






صورة للمبيض توضح مختلف مراحل نمو البويضة

مقطع يوضح الخصية في الجهاز التناسلي للرجل




لە سەرەوە توورەکەی گون (Scrotum) دەبینین کە گونەکانی تێدایە، و ئەمانیش بریتین لە عەمباری گشتی نوتفەی پیاو، و لە تەنیشتیانەوە بەربەخ (Epididymis) هەیە کە بریتین لە عەمبارە تایبەتییەکەی سپێرمەکان، لە خواریشەوە بڕگەیەکی بۆرییەکی سپێرم نیشاندراوە کە کارگەی دروست کردنی سپێرمەکانن، هەموو ئەمانە ڕاستی ئەو ئایەتە پیرۆزە دووپات دەکەنەوە کە دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ الَّذِيَ أَنشَأَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ فَمُسْتَقَرٌّ وَمُسْتَوْدَعٌ قَدْ فَصَّلْنَا الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَفْقَهُونَ﴾ (الأنعام:٩٨).







## وێنەی ژمارە (١٥/ هـ)

لە وێنەی سەرەوەدا و لەملاولای منالدانەوە هێلکەدانەکان (Ovaries) دەبینین، کە بریتین لە عەمباری هەڵگرتنی هێلکۆکەکان، و وێنەی لای چەپ برگەیەکی وەرگیراوە لە هێلکەدانێك کە تێ‌یدا چەندین توورەکە دەبینین، و وێنەی خوارەوەش توورەکەیەکی (گراف)ی پێگەیشتووە و هێلکۆکەکەی تێدایە، کەواتە هێلکەدانەکان عەمباری گشتین و توورەکەکانی(گراف)یش عەمباری تایبەتی خانەکانی زاووزێی مێینەن.

Fimbria of uterine tube

هێلکەیەک کە لە هێلکەدانەوە تەقیوە و بەرەو سەردتای بۆری منداڵدان دەڕوات

Oocyte

Ovary

سەردتای بۆری منداڵدان

Ovulation from a human ovary. Notice the cloud of fluid and granulosa cells surrounding the ovulated oocyte.

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ مِمَّ خُلِقَ ۝ خُلِقَ مِن مَّاءٍ دَافِقٍ ۝ يَخْرُجُ مِن بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ ۝ إِنَّهُ عَلَىٰ رَجْعِهِ لَقَادِرٌ ۝﴾




صورة لقناة فالوب (قناة المبيض) وهي تحيط بالمبيض وفيه البويضة في طريقها إلى القفز من المبيض في عملية دفق هائلة متجهة نحو قناة فالوب (الجزء المرتفع وسط الصورة) بينما الرحم (هو الدائرة الكبيرة على يمين الصورة). يقول الله تعالى عن ماء الرجل والمرأة انه دافق.

ئەمە وێنەی تەقینەوەیەکی بورکانی نییە بەڵکو هێلکۆکەیەکی پێگەیشتووە کە لە هێلکەدانەوە تەقیوە

هێلکۆکە

البويضة بعد خروجها من المبيض

## وێنەی ژمارە (١٦/ هـ)

چەند دیمەنێکی تەقینی هێلکۆکە لە هێلکەدانەوە کە زۆر بە جوانی ئەوەمان بۆ ڕوون دەکەنەوە کە هێلکۆکە لە هێلکەدانەوە کە دەردەچێت بە گورجی و بەهێزەوە دەردەپەڕێت، کە بە تەواوەتی ئەوەیە ئایەتی پیرۆزی: ﴿خُلِقَ مِنْ مَـاءٍ دَافِقٍ﴾ (الطارق:٥) ڕوونی کردووەتەوە.




وێنەی (١٧/هـ)
ئەم وێنانەدا دەبینین
کە چۆن پەستانی ناو
تووزەکەی گراف
(هێلکەی پێگەیشتوو)
زیاد دەکات و وەک
بلقێکی لێدێت لەسەر
ڕووی هێلکەدان و
پاشان دەتەقێت و
هێلکۆکەکە و ناوەکەی
دەکەونە سەرەتای
بۆری منداڵدانەوە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ مِمَّ خُلِقَ ۝٥ خُلِقَ مِن مَّاءٍ دَافِقٍ ۝٦ يَخْرُجُ مِن بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ ۝٧ إِنَّهُ عَلَىٰ رَجْعِهِ لَقَادِرٌ ۝٨﴾

[سورة الطارق: ٥ - ٨]

صورة معبرة للمبيض في حالة انفجار بركاني وسط سائل مندفع ينتج عنه القذف بالبويضة في الفراغ البريتوني في بطن المرأة طائرة في رحلة الحياة أو الموت نحو قناة الرحم حيث تنتظرها ملايين الحيوانات المنوية للتخصيب.

وێنەی (١٨/هـ) وێنەیەکی ڕاستەقینەی دەرپەڕینی هێلکۆکەیەک لە هێلکەدانەوە




لەم وێنەیەدا چەند پارچە مایتۆکۆندریایەك دەبینین ( ڕەنگیان زەردە ) لە پشتی سەری سپێرمێکەوە، ئەم مالەووزانەن کە هێزی جوولە و دەرپەڕان دەبەخشن بە سپێرمەکان



**وێنەی ( ٢٠/ هـ )**
لێرەدا هێلکۆکەیەکی دەرپەڕیو دەبینین لەناو لۆچەکانی سەرەتای بۆری منالداندا، کە ڕەنگی زەرد دیارە، ئەمەش دەقاودەق لەگەڵ فەرموودەی: ﴿مَاءُ الْمَرْأَةِ أَصْفَر﴾ ( رواه مسلم ) یەکدەگرێتەوە.



**وێنەی ( ٢١/هـ )**

ئەم وێنانە دروست بوونی تەنی زەرد ڕوون دەکەنەوە، وێنەی سەرەوە وێنەیەکی ڕاستە-قینەی وەرگیراوە بۆ بڕگەیەکی هێلکەدان کە تەنی زەرد تێیدا بە ئاشکرا دەبینرێت کە ڕەنگەکەی زەردە، هەروەها وێنەی خوارەوەش هێلکارییەکە بۆ چۆنێتی دروست بوونی ( لە پاشماوەی توورەکەی گرافەوە ) و لەناوچوونی ئەم تەنە.




**Stages of ovum and follicle development.** This diagram illustrates the stages that occur in an ovary during the course of a month. The arrows indicate changes with time.

## وێنەی ژمارە (٢٢- A/ هـ)

وێنەی سەرەوە ئەو خوێنبەر و خوێنهێنەرانە ڕوون دەکاتەوە کە خوێن دەبەن بۆ گونەکان، و ڕاستەوخۆ لە خوێنبەری گەورەوە دێن لەنێوان پشت و پەراسووەکاندا، کە ئەمە ئەو ڕاستییە دەسەلمێنێت پێشتر شوێنیان لە ناوەڕاستدا و لە نزیک پشتدا بووە، هەروەها وێنەی خوارەوە دروست بوونی چینی ناوەڕاست لە کۆرپەلەیەکی ١٨ ڕۆژدا ڕوون دەکاتەوە (ڕەنگی چینەکە سوورە)، لەم چینەوە سیستمی زاووزێی پیاو و ئافرەت دروست دەبێت و گەشە دەکات.



﴿فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ مِمَّ خُلِقَ ﴿٥﴾ خُلِقَ مِن مَّاءٍ دَافِقٍ ﴿٦﴾ يَخْرُجُ مِن بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ ﴿٧﴾ إِنَّهُ عَلَىٰ رَجْعِهِ لَقَادِرٌ ﴿٨﴾﴾ [سورة الطارق: ٥ - ٨]

### معجزة الماء الدافق والصلب والترائب

الخصيتان والمبايض تتكونان في الجنين في مكان الكليتين (زاوية التقاء الصلب مع الترائب) ثم تنزلان مع عروقهما الى اسفل البطن

### بالعلم تسطع الأيات

قال الطبري: (اختلف اهل التأويل في معنى الترائب، فقال بعضهم:

الترائب: موضع القلادة من صدر المرأة، وقال آخرون: الترائب: ما بين المنكبين والصدر، وقال آخرون: هو اليدان والرجلان والعينان، وقال آخرون: يخرج من بين صلب الرجل ونحره، وقال آخرون: هي الأضلاع التي اسفل الصلب، وقال آخرون: هي عصارة القلب).

وما أن انشرعت المجاهر حتى بدت معجزة كبرى في كتاب الله تعالى: إن الماء الدافق سواء في الرجل او في المرأة إنما يخرج مستخلصا بالاستعانة بالعروق المغذية للمبيض والخصية، النازلة معهما من (بين الصلب والترائب) مكان الكليتين) بالتدريج اثناء فترة الحمل حتى تستقر الخصيتان والمبايض في مكانهما الجديد اسفل البطن، إنه العلم البليغ الذي لم يكن احد يدري عنه شيئا قبل مائة عام عددا، سلوهم: من الذي اعطاه محمدا صلى الله عليه وسلم في الزمن الأول.



صورة توضح مسار الدماء الممتدة من اعلى (زاوية التقاء الصلب (العمود الفقري) والترائب (الضلوع) حتى تصل الى مقر تكوين ماء الرجل (الخصيتين).

يقول الله تعالى:

﴿لَّٰكِنِ اللَّهُ يَشْهَدُ بِمَا أَنزَلَ إِلَيْكَ أَنزَلَهُ بِعِلْمِهِ وَالْمَلَائِكَةُ يَشْهَدُونَ وَكَفَىٰ بِاللَّهِ شَهِيدًا﴾ [سورة النساء: ١٦٦]






وێنەی ژمارە (٢٢-B/ هـ)
ڕوونکردنەوەی ئایەتی پیرۆزی
{يَخْرُجُ مِنْ بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ}

وێنەیەکی تۆێکاری خوێنبەر و خوێنهێنەری گون کە ڕاستەوخۆ خوێن دەدەن بە گونەکان و نیشانی دەدات کە چۆن لە خوێنبەر و خوێنهێنەری گەورەوە لەناو سکدا دروست دەبن لە ناوچەیەکدا کە دەکەوێتە نێوان بڕبڕەی پشت و پەراسووەکانەوە.

ئەم وێنەیە بڕگەیەکی لەشی کۆرپەلەکە نیشاندەدات تا کاتی دابەزینی گونەکان لە هەفتەی (٢٨)ەوە، بێگومان هۆرمۆنی نێرینە دەبێتە هۆی دابەزاندنیان، و لە هەمان کاتدا ماسولکەی (Gubernaculum) ئاراستەکەی بۆ دیاری دەکات بۆ ناو توورەکەی گون، کەواتە شوێنی سەرەتایی گون لە نێوان پشت و پەراسووەکاندایە.







**Homologous pairs of chromosomes.** These were obtained from diploid human cells. The first twenty-two pairs of chromosomes are called the autosomal chromosomes. The sex chromosomes are (*a*) XY for a male and (*b*) XX for a female.




## وێنەی ژمارە (٢٣/ هـ)

وێنەی سەرەوە کرۆمۆسۆمەکانی پێکهێنەری لەشی مێینە ( XX ) و نێرینە ( XY ) روون دەکاتەوە، کە هەڵگری هەموو سیفاتە بۆماوەییـیە گوێزراوەکانن بۆ کۆرپەلەکە لە دایك و باوکەوە، وێنەی خوارەوە ئەوەمان نیشان دەدات کە ئەگەر بێتو پێکهاتە پێچاوپێچەکەی کرۆمۆسۆمەکان بکەینەوە دەبینین لە دوو ریز لە ترشەلۆکی ناووکی جۆراوجۆر پێکهاتوون هەروەکو پەیژە.




وێنەی (٢٤/هـ): ملیۆنەها سپێرم لەناو تۆواودا مەلە دەکەن کە تەنها یەك دانەیان چانسی یەکگرتنی لەگەڵ هێلکۆکەکەدا هەیە، ئەمەش سەلمێنەری راستی فەرموودەکەی پێغەمبەرە:

{مَا مِنْ كُلِّ الماءِ يَكُونُ الوَلَد} (رواه مسلم)



## وێنەی ژمارە (٢٥)

ئەم وێنەیەدا هێلکۆکەیەك دەبینین کە لە هێلکەدانەوە دەرپەڕیوە و دەورە دراوە بەو ئاوەی کە لەگەڵیدا دەرپەڕیبوو، ئەمەش بە تەواوەتی ئەوەیە کە لە ئایەت و فەرموودەکانی:

﴿... ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُ مِنْ سُلالَةٍ مِّنْ مَاءٍ مَّهِينٍ﴾ (السجدة)

{مَا مِنْ كُلِّ الماء يَكُونُ الوَلَد} (رواه مسلم)

ئاماژەی بۆ کراوە کە لە بەشێکی ئاوەکەوە سەرچاوەی بوونی مرۆڤە.




وێنەی ژمارە (٢٦/ هـ)

ئەم وێنەیە دروست بوونی نێر و مێ لە خانەکانی زاووزێی پیاو ئافرەتەوە روون دەکاتەوە، و بە ئاشکرا دەریخستووە کە دەیێرمی پیاو تاکە فاکتەری ئەم مەسەلەیەیە، بە تەواوەتی وەك ئەوەی ئایەتی: ﴿فَجَعَلَ مِنْهُ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالأُنْثَى﴾ (القيامة) دەفەرمووێت.




وێنەی (٢٧/هـ)

Figure 20.6 The development of the external genitals in the male and female. (a [a', sagittal view]) At 6 weeks, the urethral fold and labioscrotal swelling have differentiated from the genital tubercle. (b) At 8 weeks, a distinct phallus is present during the indifferent stage. By week 12, the genitals have become distinctly male (c) or female (d), being derived from homologous structures. (e, f) At 16 weeks, the genitals are formed.

ئەم وێنەیە گەشە کردنی ئەندامەکانی زاووزێی دەرەوە لە خانە سەرەتاییەکانییەوە لە نێر و مێدا روون دەکاتەوە، کە بە ئاشکرا دیارە چۆن ئەندامەکانی زاووزێی دەرەوەی نێر و مێ بە تەواوەتی لەیەك دەچن لە سەرەتادا و پاشان جیاواز بوون روودەدات بەهۆی فاکتەری؛ بۆماوەیی (بوونی کرۆمۆسۆمی Y)، و کاریگەریی هۆرمۆنەکان و .......هیتر.




چەند دیمەنێکی یەکگرتنی سپێرم و هێلکۆکە، وێنەی ناوەڕاست وێنەیەکی ڕاستەقینەی ووردبینییە بۆ لێبوونەوەی کلکی سپێرمەکە و دەرپەڕانی سەری بۆ ناو هێلکۆکەکە، کە ئەمە کرداری دەرهێنانی پوختەی سپێرمەکەیە.




**وێنەی ژمارە ( ٢٩/هـ )**

ئەمانە دیمەنی ژێر دەریا نین!! بەڵکو ئەمانە سپێرمن و لەناو شلەمەنی و دەردراوەکانی ناو مناڵاندا ( هەروەك ماسیەکی درێژ لەناو دەریادا ) مەلە دەکەن!

## وێنەی ژمارە (٣٠/ هـ)

لەلای ڕاست هێڵکاری دەرگای منداڵدانە و دەبینین کە چۆن سپێرمەکان قەڕەباڵغی دەکەن و دوایی بە ژمارەی کەم لەم قەرەباڵغی یەوە دەردەچن، لە خواریشەوە وێنەیەکی ڕاستەقینەیە ڕوونی دەکاتەوە کە چۆن سپێرمەکان لەناو ماددەی لیلجی منداڵدانەدا قەڕەباڵغی دروست دەکەن و دوایی بە ژمارەی زۆر کەم لەم شوێنە تەسکەوە دەردەچن.







## وێنەی ژمارە (٣١/ هـ)

وێنەیەکی ڕاستەقینەی ووردبینیی سپێرمێکە، و ڕوونی دەکاتەوە کە چۆن لەناو کەناڵێکی تەسکی ماددەی لینجی ناو منداڵدان و بۆری منداڵداندا مەلە دەکات و سەردەکەوێت بۆ گەیشتن بە ئامانجەکەی.

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعًا بَصِيرًا ۝٢﴾

[سورة الإنسان: ٢]

كيف يمكن أن تكون الصفة جمعاً بينما الموصوف مفرداً؟! إنه مما يعين على زيادة البيان ما نطقت به المجاهر الإلكترونية تلك التي قررت الحقائق المذهلة الآتية:

ما النطفة إلا وعاء يجمع العشرات من الصبغيات الوراثية التي تحوي مئات الآلاف من الحاملات الوراثية (الجينات). وبعبارة أفصح.. إنها أخلاط (أمشاج) بأعداد هائلة تجتمع في قطرة واحدة (نطفة).

وبتعبير معجز.. هي (نطفة) ملئت (بالأمشاج) إنها (نطفة أمشاج).

وإذا بالسؤال المزلزل يقفز فجأة.. لم يكن النبي يملك في بادية مكة الموحشة مجهراً إلكترونياً ولا من الأجهزة الدقيقة التي يسّرها الله للناس اليوم، ولكن الله أوحى له تلك البينة المدوية. فهل من معتبر؟!



صورة فريدة للبويضة الأنثوية وقد اجتمعت حولها مئات الآلاف من الحيوانات المنوية الذكرية. لا يسمح إلا لواحد فقط بالدخول فتتكون (النطفة الأمشاج).





صورة مكبرة ٢٠٠٠ مرة للحيوان المنوي وقد نجح في اختراق غشاء البويضة (يمين). وحين تستقر الرأس داخلها تبدأ الإلتحام مع نظيرتها بعد تسع ساعات مكونة (النطفة الأمشاج) (يسار).

وێنەی ژمارە (٣٢/ هـ): نوتفەی تێکەڵاو




وێنەی (٣٣/ هـ): لەم وێنە ڕاستەقینانەدا دەبینین کەچۆن نوتفەی تێکەڵاو لە کۆبوونەوەی سپێرمی پیاو و هێلکۆکەی ئافرەتەوە دروست دەبێت. لە خوارەوە دوو وێنەی بەرکەوتنی سپێرم ڕوون دەکاتەوە لەگەڵ دیواری هێلکۆکەدا.

ساتی بەریەککەوتنی سەری
سپێرم لەگەڵ دیواری هێلکۆکە

قال رسول الله صلى الله عليه وسلم:



« يا يهودي من كلٍ يخلق .. من نطفة الرجل ، ونطفة المرأة »







هنا نهاية السباق المعجز بين خمسمائة مليون حيوان منوي وها هي البويضة في تمام زينتها وبهائها (هذه الكرة الصفراء الكبيرة). كم من قتيل قضى نحبه وهو يحلم بهذا اللقاء. الصراع المريع بين خمسمائة مليون ليفوز واحد فقط. وهنا تكون المكافأة الكبرى حيث ينعم الفائز بالوصل والجائزة. واحد فقط والباقون على الأبواب بين قتيل أنهكه الألم وجريح يلعق جراحاته الدامية.



Zona pellucida
Perivitelline space
Corona radiata
Cytoplasm of oocyte
Second meiotic metaphase
First polar body
Plasma membrane of oocyte
Sperm nucleus containing chromosomes
Acrosome containing enzymes
Plasma membrane of sperm
Perforations in acrosome wall
Enzymes are breaking down zona pellucida
Sperm in cytoplasm of oocyte without its plasma membrane

## وێنەی (٣٤/هـ)

لە سەرەوە چەند وێنەیەکی ڕاستەقینەی یەکگرتنی سپێرم و هێلکۆکە نیشان دەدات و لە خوارەوەش هێلکارییەك کە وردەکارییەکانی ئەم یەکگرتنە ڕوون دەکاتەوە ( لە چوونە ناوەوەی سەرەکەی و بەجێمانی کلکەکەی ).

وێنەی (٢٥/ هـ) لە سەرەوە وێنەیەکی ڕاستەقینەی چوونە ناوەوەی سپێرم بۆ ناو هێلکۆکە دەبینین، و لە خوارەوەش پاش چوونە ناوەوەی ناووکی سپێرمەکە یەکگرتنیان و یەکسەر دابەشبوونیان ڕوو دەدات.

وێنەی (٢٦/ هـ) لە سەرەوە دابەشبوونی خانەی یەکەم (زایگۆت) بۆ دوو خانە، و لە خوارەوەش بەردەوام بوونی ئەم دابەش بوونە بە قۆناغ تاوەکو تۆپەڵێك خانە (لەتوو چوو) دروست دەبێت.






وێنەی (٣٧/هـ)

دوو وێنەی ڕاستەقینەی لێک نزیک بوونەوە و یەکگرتنی ناووکی سپێرم و هێلکۆکە و توانەوەیان لە یەکتردا.

دوو هێڵکاری کرداری چوونە ناوەوەی ناووکی سپێرم بۆ ناو هێلکۆکە و یەک گرتنی لەگەڵیدا و بوونیان بەیەک و دروست بوونی زایگۆت و پاشان دابەش بوونی.




کرۆمۆسۆمەکانی مرۆڤ کە ٤٦ دانەن، و لەناو جینەکانیاندا هەموو سیفاتەکانی مرۆڤ هەڵگیراون.

# وێنەی (٣٨/هـ): کرداری دووکەرت بوونی هێلکە پیتێنراوەکە (نوتفەکە)




ئەم وێنەیەدا دەبینین کە ناووکی تۆو و هێلکۆکە چۆن لەیەکتر نزیک دەبنەوە، و لە وێنەی خوارتردا هێلکاری‌یەك دەبینین کە چۆن هەردوو ناووکەکە بەرامبەر یەکترن و چاوەڕێن لەیەکتردا بتوێنەوە.

لێرەدا دەبینین کە چۆن کرۆمۆسۆمەکان لە ناوەڕاستدا ڕیزدەبن و هێڵە تیشکی‌یەکان لە هەردوو تەنە ناوەندی‌یەکانەوە بۆ کرۆمۆسۆمەکان درێژ دەبنەوە.

لەم وێنەیەدا دەبینین کە چۆن دوو جووتە کرۆمۆسۆمەکە لەیەکتر جیادەبنەوە، و بەهۆی هێڵە تیشکی‌یەکانەوە (کە وەك ڕێگایەك وایە بۆیان) هەریەکەیان دەچێت بۆ لایەکی خانەکە.

لەم وێنەیەدا کۆتایی دووکەرت بوون و دابەشبوونەکە دەبینین، و خانە دایکەکە بووە بە دووان و دوو ناوکیشی هەیە، بەلام زایگۆتەکە هێشتا هەریەك ڕووپۆشی هەیە، ئەمەش سەلمێنەری ووتەی پەروەردگارە:

{إِنَّ اللَّهَ فَالِقُ الْحَبِّ وَالنَّوَى} (الأنعام)

وێنەی ( ٤٠/هـ ): هێلکۆکە و هاوپێچەکانی لە کاتی گەشە کردنیاندا دەبن بە دووان، کە بەشی دووەم لە سووچێکیدا بە بچووک کراوەیی دەمێنێتەوە.



(المنويات)
تكون الحيوانات المنوية
الخصية
سلف الخلايا التناسلية
٤٦ xy
الخلية المنوية الاولية
٤٦ xy
الانقسام
النصفي الاول
x ٢٣
y ٢٣
الخلايا المنوية الثانوية
الإنقسام
النصفي الثاني
x ٢٣
x ٢٣
y ٢٣
y ٢٣
أرومة نطفية
تكون الحييات المنوية
x ٢٣
x ٢٣
y ٢٣
y ٢٣

وێنەی ( ٣٩/ هـ ): بە کرداری دوولەت بوون سپێرمی پیاو دروست دەبێت و لە هەر خانەیەکی سەرەتاییەوە دوو جووت سپێرم دروست دەبێت.

♀ Pronucleus

Second polar body

جەمسەرە تەنی دووەم

وێنەی ( ٤١/هـ ): لێرەدا جەمسەرە تەنی دووەم ( Second Polar Body ) دەبینین کە لە دابەش بوونی هێلکۆکەوە دروست دەبێت پاش ئەوەی کە سەری سپێرمەکە دەچێتە ناوی‌یەوە.




**وێنەی (٤٢/هـ)**: زایگۆت لەناووکی سپێرم و هێلکۆکە لە پاڵ یەکدا دروست دەبێت (واتە لە جووتێك ناووك)، بڕوانە لە سەرەوەش هەردوو جەمسەرە تەن دەرکەوتوون.



**وێنەی ژمارە (٤٣/ هـ)**

زایگۆتەکە دوای دروست بوونی یەکسەر دابەش دەبێت و دەبێت بە جووتێك خانە.




**وێنەی (٤٤/هـ)**: دوو وێنەی ناو منداڵدان کە نوتفەکە دابەش بووە بۆ ٨ خانە و پاشان ١٦ خانە، وەك ئەوەی ئایەتەکە کە دەفەرموێت: {إِنَّ اللَّهَ فَالِقُ الْحَبِّ وَالنَّوَى} (الأنعام)




وێنەی (٤٥/هـ)

ئەم وێنەیە بۆمان ڕوون دەکاتەوە کە دابەشبوونە بەردەوامەکان وا لە کۆرپەلەکە دەکەن کە ببێت بە دوو بارستە خانە.



**وێنەی (٤٥/ هـ):** ئەم وێنە ڕاستەقینەیە بۆمان ڕوون دەکاتەوە کە چۆن کرۆکۆسۆمەکانی مرۆڤ هەمیشە بە جووتی هەن لە خانە ناسایییەکانی لەشدا.




**وێنەی ژمارە (٤٧/هـ)**

ئەم وێنەیە پێکهاتەی زنجیرەکانی (DNA) ڕوون دەکاتەوە کە هەمیشە ترشەلۆکەکان جووتن پێکەوە.

**وێنەی (٤٦/هـ)**

ئەم وێنەیەش بۆمان ڕوون دەکاتەوە کە ترشی ناووکی (DNA)ی ناو کرۆمۆسۆمەکان لە دوو زنجیرەی پێکەوە گرێدراو لە ترشەلۆکی ناووکی پێک هاتووە.




**وێنەی (٤٨/ هـ)**: دیواری بۆری مناڵدان ناوپۆش کراوە بە گەندەموو کە پاڵ بە زایگۆتەکەوە دەنێت بۆ پێشەوە، و ئەو سپێرمانەش کە خۆیان دەکێشن بە هێلکۆکەکەدا جووڵەیەکی بە خوولی پێدەدەن، بەهۆی ئەمانەوە زایگۆتەکە بە دەوری خۆیدا دەسووڕێتەوە و کۆچ دەکات لە سەرەتای بۆری مناڵدانەوە بۆ ناو مناڵدان بۆ ئەوەی تێیدا جێگیربێت.



**وێنەی ژمارە (٤٩/ هـ)**

لەم وێنەیەدا دیمەنێکی راستەقینەی زۆر جوانی کەوتنە خوارەوەی نوتفە (زایگۆتەکە) بە هێواشی بۆ ناو مناڵدان لە بۆری مناڵدانەوە دەبینین، بە تەواوەتی وەك ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ﴿إذا وَقَعَتِ النُّطْفَةُ فِي الرَّحِمِ .......﴾.






**وێنەی ژمارە (٥٠/هـ)**
ئەم وێنەیە گەشتی کۆرپەلەی مرۆڤمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، هەر لە پیتاندنەوە تاوەکو کەوتنە ناو مناڵدان و خۆچاندنی لە دیوارەکەیدا.



**وێنەی (٥١/هـ):** لەم وێنە ڕاستەقینەیەدا دەبینین کە چۆن نوتفەکە هەندێک ماددەی شەکرەمەنی دەڕێژێت بۆ ئەوەی ئاشکرای بکات کە زایگۆتەکە کەوتۆتە سەر ڕووی منالدان، بە مەبەستی ئەوەی منالدان ئەیکاتە دەرەوە و لەدواییدا بە ئاسانیی خۆی تێیدا بچێنێت.




**وێنەی (٥٢/هـ)**

Schematic representation of the events taking place during the first week of human development. (*1*) Oocyte immediately after ovulation. (*2*) Fertilization approximately 12 to 24 hours after ovulation. (*3*) Stage of the male and female pronuclei. (*4*) Spindle of the first mitotic division. (*5*) Two-cell stage (approximately 30 hours of age). (*6*) Morula containing 12 to 16 blastomeres (approximately 3 days of age). (*7*) Advanced morula stage reaching the uterine lumen (approximately 4 days of age). (*8*) Early blastocyst stage (approximately 4½ days of age). The zona pellucida has now disappeared. (*9*) Early phase of implantation (blastocyst approximately 6 days of age). The ovary shows the stages of the transformation between a primary follicle and a Graafian follicle as well as a corpus luteum. The uterine endometrium is depicted in the progestational stage.




هێلکارییەك كە ڕووداوەكانی هەفتەی یەکەمی دروست بوونی مرۆڤ ڕوون دەکاتەوە.




وێنەی (٥٢/هـ) Implantation of the blastocyst. (a) A diagram showing the blastocyst attached to the endometrium on about the sixth day. (b) Implantation of the blastocyst at the ninth or tenth day.

قۆناغەکانی کرداری خۆچاندنی کۆرپەلە لە دیواری منداڵداندا بەهۆی گەندەپێکانییەوە.

Hypothalamic impulses
Pituitary gland
Gonadotropins
FSH
LH
Maturation of follicle
Ovulation
Corpus luteum
Degenerating corpus luteum
Compact layer
زیادبوونی دیواری منداڵدان
Spongy layer
Basal layer
Gland
کەمبوونەوە و ڕزبوونی دیواری منداڵدان
Artery
0 4 14 21 28
Menstrual phase
Proliferative phase
Secretory phase
Menstrual phase

وێنەی (٥٤/ هـ): هێلکارییەک کە گۆڕانکارییەکان لە دیواری منداڵداندا ڕوون دەکاتەوە لە سووڕێکی بێنوێژی ڕێک وپێکدا. ئەمە لە کاتێکدایە کە پیتاندن شکست بێنێت. بڕوانە ئەو گۆڕانکارییانەش کە لە هێلکەداندا ڕوودەدات (بریتییە لە دروست بوونی تەنی زەرد).




## وێنەی (٥٥/هـ)

A : برگەیەکی مناڵدان کە ناوپۆشەکەی دەردەخات.

B : قۆناغەکانی زیادبوونی ناوپۆشەکە وەك ئایەتی: ﴿...وَما تَغيضُ الأَرْحامُ وَما تَزْداد .....﴾ (الرعد) ئاماژەی پێدەدات.

C : زیادبوونی دیواری منالّدان بە ڕژێنەکان ولوولەکانی خوێن.

في الوقت الذي تتضع فيه البويضة في المبيض فإن بقايا مخاطية الرحم تبدأ بالافراز

لدى قذف البويضة تبدأ الهرمونات بتحريك عملية أنتفاخ المخاطية

تمر البويضة عبر القناه وتصبح قناه فالوب سميكة جداً

مخاطية الرحم يبدأ بالتمزق وفي المبيض الثاني تتضع بويضه أخرى

عملية الإباضة الحيض

## وێنەی ژمارە (٥٦/ هـ)

ئەم وێنەیە ڕوودانی کرداری دەرپەڕینی هێلکۆکە و پەیوەندی بە سووڕی مانگانەی ئافرەتەوە دەردەخات، وهەروەها ئەو کردارانەش کە پێوەیان بەندە ڕوون دەکاتەوە.




**وێنەی (٥٧/ هـ):** دوو وێنەی راستەقینەی: ١- بەرکەوتنی زایگۆت لەگەڵ دیواری منداڵدان و پاشان خۆچاندنی لە دیوارەکەدا، ٢-دەرکەوتنی وەك بەرزاییەك (نوکتەیەك) لە دیوارەکەدا.




وێنەی (٥٨/هـ): چەند وێنەیەکی ڕاستەقینەی وەرگیراو بۆ سپێرمەکان لە کاتی گەشتەکەیاندا بەناو منالدان و بۆری منالدانداو، کە بەهۆی کلکە درێژەکەیانەوە مەلە دەکەن و دەجووڵێن بەناو ئەو دەوروبەرە نەزانراوەدا، مەگەر بەزەیی پەروەردگار ڕێنموویی‌یان بکات لەم گەشتە پڕ مەترسی‌یەدا بۆ دۆزینەوەی مەبەستەکەیان!!




وێنەی (٥٩/ هـ): دەردراوەکانی منداڵدان پارمەتیدەریکی گەورەی پیتاندنن، وێنەیەکی راستەقینەی دەرچوونی دەردراوەکانە.

وێنەی (٦٠/ هـ): هێلکۆکەیەک کە دەورە دراوە بە سەدان سپێرم




وێنەی (٦١/هـ) چەندین دیمەنی سپێرمەکان لە کاتی بەرکەوتنیان لەگەڵ دیواری هێلکۆکەدا و لێبوونەوەی زرێپۆشەکەی و پاشان چوونە ناو هێلکۆکەوە.




وێنەی (٦٢/ هـ): هێلکارییەك کە قۆناغەکانی یەکگرتنی سپێرم و هێلکۆکە ڕوون دەکاتەوە.



وێنەی (٦٣/ هـ): دوای چوونە ناوەوەی ناووکی سپێرم بۆ ناو هێلکۆکە هەڵ دەئاوسێت، و بە هێواشی لە ناووکی هێلکۆکەکە نزیك دەبێتەوە (وێنەیەکی ڕاستەقینەی ووردبینییە).

وێنەی (٦٤/ هـ): وێنەیەکی ڕاستەقینەی پێکەوە نووسانی هەردوو ناوکەکە، کە پاشان یەکدەگرن و دەبن بەیەك.




وێنەی (٦٥/هـ): كرداری ئاڵوگۆڕكردن و گواستنەوەی ماددەی بۆماوەیی وەك لە فەرموودەی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە.




**وێنەی ژمارە (٦٦/هـ)**

١: هێلکەی پیتێنراو (زایگۆت).
٢: قۆناغی (٨ خانەیی). ٣: قۆناغی (١٠ خانەیی).
٤: کۆرپەلەکە بووە بە دوو بارستە خانە کە وێنەکەی لای چەپی روونی کردووەتەوە.

**وێنەی (٦٧/ هـ):** چەند دیمەنێکی ڕاستەقینەی کۆرپەلە چێنراوەکەیە لەناو دیواری مناڵداندا، کە وەك بەرزاییەك (نوگتەیەك) لە دیوارەکەیدا دەردەکەوێت، هێلکاری لای چەپیش کرداری خۆچاندنەکە بەهۆی گەندە پێکانەوە دەردەخات.




**وێنەی (٦٨/هـ):** لەم کۆمەڵە هێلکارییەدا دەبینین کە چۆن زایگۆتەکە ڕۆدەچێتە ناو دیواری مناڵدانەوە، و پاشان ئەو شوێنەی لێی چووەتە ژوورەوە دادەخرێت بە (Closing Plug).




**Fertilization, cleavage, and the formation of a blastocyst.** A diagram showing the ovarian cycle, fertilization, and the events of the first week following fertilization. Implantation of the blastocyst begins between the fifth and seventh day and is generally complete by the tenth day.

**وێنەی (٦٩/هـ): ئەم هێلکارییە قۆناغەکانی گەشە کردنی کۆرپەلە لە هەفتەی یەکەمدا روون دەکاتەوە، هەر لە پیتاندنەوە تاوەکو خۆچاندنی لە دیواری منالّدانا کە لە نێوان رۆژی پێنجەم و حەوتەمدا دەست پێدەکات و بە گشتی لە رۆژی دەیەمدا کۆتایی دێت.**

بارستە خانەی ناوەوە
(Inner Cell Mass)

بارستە خانەی دەرەوە
(Outer Cell Mass or Trophoblast)

**وێنەی ژمارە (٧٠):**

ئەم وێنەیە کۆبوونەوەی خانەکانی لەشی کۆرپەلەکە ڕوون دەکاتەوە، کە لە ڕۆژی پێنجەمدا لە ٢ بارستەخانە پێکدێت، وەك لەم وێنە ڕاستەقینە مایکرۆسکۆپی‌یەدا دیارە.

**وێنەی ژمارە (٧١/هـ)**

هێلکاری‌یەکی کۆرپەلە لە ڕۆژی شەشەمدا، کە بە ئاشکرا ڕوونی دەکاتەوە هەردوو بارستە خانەکەی پێکەوە بەستراون لە جەمسەری کۆرپەلەکەدا.

Endometrial gland
Endometrial capillary
Endometrial epithelium
Embryonic pole
بارستە خانەی ناوەوە
Inner cell mass
Blastocyst cavity
بارستە خانەی دەرەوە
Trophoblast

**وێنەی ژمارە (A-٧٢/هـ)**

هێلکاری‌یەکە بۆمان ڕوون دەکاتەوە کە هەردوو بارستە خانەکەی کۆرپەلە بەهۆی بۆشایی ئەمنیۆنی‌یەوە لە ناوچەی جەمسەری کۆرپەلەیی‌دا لەیەك جیادەبنەوە لە ڕۆژی هەشتەمدا.

Endometrial stroma
Uterine gland
Blood vessel
Syncytio-trophoblast
Surface epithelium
Cytotrophoblast
Amnioblasts
Epiblast
Blastocyst cavity
Hypoblast
بۆشایی ئەمنیۆنی
Amniotic cavity




**وێنەی (٧٢-B/هـ)**

وێنەیەکی ڕاستەقینەی هێلکاری ژمارە (٧٢-A/ هـ) لە پێشەوە.

**وێنەی (٧٣/هـ)**: ئەم هێلکارییە بڕگەیەکی کۆرپەلەیەکی ٩ ڕۆژە، کە دەبینین بۆشایی ئەمنیۆنی بە تەواوی گەورە بووە، بەڵام هەردوو بارستەخانەی کۆرپەلەکە هێشتا لە کۆتاییەکاندا پێکەوە نووساون.

**وێنەی ژمارە (٧٤/هـ)**

کۆرپەلەیەك لە ڕۆژی دەیەمدا، دەبینین کە چۆن بارستەخانەی ناوەوە بە تەواوەتی لە بارستەی دەرەوە جیابووەتەوە بەهۆی چینێك خانەی نەرمەوە، لێرەدا کۆرپەلەکە بە تەواوی خانەکانی کۆکراونەتەوە، ئەمەش لەم فەرموودەیەدا ئاماژەی بۆکراوە: ﴿فَإذا كـان يَوْمُ السَّابعِ جَمَعَهُ الله .....﴾.





صورة تشريحية للرحم وقناة الرحم والمبيض

**وێنەی ژمارە (٧٥/ هـ):**
وێنەیەکی توێکارییە مناڵدان و بۆری مناڵدان و هێلکەدانەکان دەردەخات، کە لەناو سکدا هەڵواسراو و جێگیرن.



صوره تشريحيه للرحم و قناتي الرحم والمبيضين وبعض الأربطه التي تثبت الرحم في مكانه

**وێنەی ژمارە (٧٦/ هـ):**
بەهۆی چەندین ماسولکە و بەستەرەشانەی بەهێزەوە مناڵدان و هاوپێچەکانی بە توندی لە شوێنی خۆیان لەناوسکدا جێگیر کراون.

**وێنەی (٧٧/هـ):** لەم وێنەیەدا توانای مناڵدان بۆ کشان دەبینین، بە رادەیەك کە زۆربەی ناوسکی ئافرەت داگیر دەکات لە کۆتایی سکپڕیدا، ئەمەش بە بەراورد کردن بە وێنەکانی سەرەوە کە قەبارەی بچووکی مناڵدان لە حاڵەتی ئاساییدا روون دەکەنەوە. لە لایەکی ترەوە هەڵواسراوی مناڵدان لەناو سکدا دەبینین کە دەپارێزێت لە پەستان و بەرکەوتنی راستەوخۆ.




وێنەی (٧٨/هـ): لە هێڵکارییانەدا کۆرپەلە دەبینین لەناو سێ تاریکاییدا:
١- تاریکایی دیواری سک. ٢- تاریکایی دیواری منداڵدانی ماسولکەیی.
٣- تاریکایی پەردەکانی دەوری کۆرپەلەکە کە ئەمانیش هەر سیانن (لە وێنەکەدا نیشانە کراون).
دەرکەوتنی ئەم زانیارییانە ڕاستی ئایەتە پیرۆزەکە دووپات دەکەنەوە:
{يَخْلُقُكُمْ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ خَلْقًا مِّنْ بَعْدِ خَلْقٍ فِي ظُلُمَاتٍ ثَلَاثٍ} (الزمر).




لەم وێنانەدا دەبینین کە چۆن هێلکەکە دوای دەرچوون، و پاشان پیتاندنی، و ڕۆیشتنی بەناو بۆری مناڵداندا بە توێکڵێکی ئەستوور دەورە دراوە کە تاریکایی یەکەمە، ولەناو بۆری مناڵداندایە کە تاریکایی دووەمە، وئەمیش لەناو سکدایە کە تاریکایی سێیەمە.



**وێنەی (٧٩/هـ)**: لە بەشی سەرەوەدا سەلماندنی ڕاستی ئایەتی: ﴿يَخْلُقُكُمْ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ خَلْقًا مِن بَعْدِ خَلْقٍ فِي ظُلُمَاتٍ ثَلَاثٍ﴾ (الزمر:٦) دەبینین، کە ٣ تاریکاییەکە هەر لە دەرچوونی هێلکۆکەکەوە دەوری کۆرپەلەکەی داوە، لە بەشی خوارەوەش وێنەیەکی ڕاستەقینەی هێلکۆکەیە کە توێکڵ و بەرگەکەی لێدەبێتەوە و فڕێی دەدات، پاشان لەناو دیواری مناڵاندا خۆی دەچێنێت، بەمەش لەناو ٣ تاریکایی بەردەوامدا دەبێت: ١- دیواری سک. ٢- دیواری مناڵدان. ٣- پەردەکانی دەوری.



*This fertilized egg now has two cells called blastomeres and is the primitive embryo. It will multiply to over 100 cells.*

هێلکەیەکی پیتێنراو دابەش بووە بۆ دووان.




*A sperm and an ovum are tiny. A man ejaculates about 300 million sperm, while a woman usually produces one ovum half-way through her menstrual cycle.*






هذا هو الحيوان المنوي الاول على خمسمائة مليون من بني جنسه في سباق بالغ العنف والضراوة. وحق له الفوز بعد رحلة الكفاح، وحقيق به الآن أن يصل بالرسالة الحيوية . إن البويضة تستقبله بالنشطات والملعقات من مادة (البروستا جلانديز) والإنزيمات النشطة ثم تفتح له الأبواب على مصاريعها. بينما تفرض سورا مانعا من أي آخر سواه .. وهذه هي الحياة .. لا تمكن حتى تبتلي، وهي الوقائع الناطقة بقدرة المدبر الحكيم ... أين أصحاب نظريات الكفر والإلحاد ؟؟ أين اصحاب نظريات العبثية والصدفة ؟!؟




**وێنەی (٨٠/هـ):** پاك و بێگەردی بۆ پەروەردگاری راگری ئەم ووردەکارییە لە دروست بوونی مرۆڤدا، لەگەر سەرنجێکی گشتی لە پێکهاتەکان و ڕووداوەکانی بدەین دەستی میهرەبانی ئەم دروستکەرە زانا و دانایە بە ئاشکرا دەبینین ﴿فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ﴾.




« مطابقة علم الأجنه لما جاء في القرآن والسنة »

مراحل خلق الجنين من النطفة حتى مرحلة الخلق المتكامل مروراً بالعلقة والمضغة وبقية المراحل التي ذكرها القرآن الكريم في سورة « المؤمنون » سابقاً بذلك ماجاء في علم الأجنه الحديث

قورئانی پیرۆز تەئکید لەسەر قۆناغەکانی گەشە کردنی کۆرپەلە دەکاتەوە و دابەشیان دەکات لەم ئایەتە پیرۆزانەدا: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن سُلَالَةٍ مِّن طِينٍ، ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ، ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ﴾ (المؤمنون ١٢-١٤).

لێرەدا قورئان قۆناغەکانی گەشە کردنی کۆرپەلەی کردووە بە سێ قۆناغی سەرەکیەوە، کە بە پیتی عەطف (ثُـمَّ) لەیەکی جیاکردوونەتەوە کە مانای هێواشی و ڕێکخستن دەگەیەنێت (الترتيب مع التراخي) ئەگەر سەیری فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبی بکەین، لەبەرئەوە لەژێر ڕۆشنایی ئەم ئایەتە پیرۆزانەدا دەتوانین بڵێین قۆناغە سەرەکیەکانی گەشە کردنی کۆرپەلە ئەمانەی خوارەوەن:

١- قۆناغی نوتفە (مرحلة النطفة).

٢- قۆناغی دروست بوون (مرحلة التَّخليق).

٣- قۆناغی نەش ونما و گەشەکردن (مرحله النَّشأة).

باسی قۆناغی (نوتفە)مان کرد، ئەگەر بێینە سەر باس کردنی قۆناغی سەرەکی دووەم دەبینین لە چەند قۆناغ و بارێکی تر پێکهاتووە کە چوار دانەن: (العلقة، المضغة، العظام، واللحم)، ئەم قۆناغە سەرەکیە لە هەفتەی سێیەمەوە دەخایەنێت تا کۆتایی هەفتەی هەشتەم، گەورەترین جیاکەرەوەکانی بریتیە لە زیادبوونی خێرایی دابەشبوونی خانەکان، و چالاکیە زۆرەکانیان لە دروست کردنی ئەندامەکانی لەشدا (**بڕوانە خشتەی ژمارە ١ لە کۆتایی ئەم بەشەدا**)، کە خۆی لەخۆیدا وەسف کردنی ئەم قۆناغە سەرەکیە بەوەی قۆناغی دروست بوونە زۆر ووردە و وەسفکەری کردارەکانی ناو کۆرپەلەکە، و هەروەها شکڵی دەرەوەی کۆرپەلەکەیە، چونکە

لە شكڵێكی نەناسراو و ناجیاكراوەوە دەگۆڕێت بۆ شكڵی تایبەتی مرۆڤ لە هەفتەی حەوتەمدا، ئەویش بەهۆی بڵاوبوونەوەی پەیكەری ئێسكی بەناو لەشیدا و پەیدابوونی ماسولكەكانەوە لە هەفتەی هەشتەمدا.

لەبەرئەوەی كە كردارەكانی قۆناغی دروستبوونی كۆرپەلەكە زۆر بەخێرایی روودەدەن و رووداوەكان بەدوای یەكدا دێن لەم ماوەیەدا، تێبینی ئەوە دەكەین كە قورئانی پیرۆز پیتی بەیەكەوە بەستنەوەی (عەطفی) (فـ)ی بەكارهێناوە كە لە فەرهەنگەكانی زمانی عەرەبیدا مانای رێكخستن و بەدوای یەكدا هاتن دەگەیەنێت، بە مەبەستی بەیەكەوە بەستنەوەی بارە جیاوازەكانی ئەم قۆناغە سەرەكییە.

دەبا دەستبكەین بە باس كردنی یەكەم قۆناغی ناسەرەكی ئەم زنجیرەیە كە بریتییە لە:

## قۆناغی (العلقة):

لە پاش گەیشتنی كۆرپەلەی مرۆڤ پاش گەشتە سەرسوڕهێنەرەكەی لە بۆری هێلكەدانەوە بۆ ناو منداڵدان قۆناغی (النطفة) تەواو دەبێت و ئەم قۆناغە نوێیەی گەشەكردنی كۆرپەلە دەست پێدەكات كە قۆناغی (العلقة)یە، و لە رۆژی ١٤ تا رۆژی ٢٤ دەخایەنێت.

قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن سُلَالَةٍ مِّن طِينٍ، ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ، ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً﴾ (المؤمنون:١٢-١٣). واتە: ئێمە بنچینەی مرۆڤمان لە پوختەیەكی گڵەوە دروست كردووە، پاشان نەوەكانی لە (نطفة)یەكەوە دروست دەبن كە لە شوێنێكی دامەزراودایە، پاشان ئەم (نطفة)یە دەبێت بە (علقة)، لە ئایەتێكی تردا هاتووە: ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ، خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ﴾ (العلق:١-٢)، واتە: بخوێنە ئەی محمد (ﷺ) بە ناوی ئەو خودایەی كە دروست كەرە، مرۆڤی دروست كردووە لە (علق)، هەروەها لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێت: ﴿أَيَحْسَبُ الْإِنسَانُ أَن يُتْرَكَ سُدًى، أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن

مَنِيّ يُمْنَى، ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّى﴾ (القيامة:٣٦-٣٨)، واتە: ئایا مرۆڤ وا گومان دەبات کە هەروا بەجێ بهێڵرێت و لێپرسینەوەی لەگەڵ نەکرێت لە دوارۆژدا، بۆ وا خۆی بە گەورە دەزانێت، ئەی بۆ ئەو بیرناکاتەوە و سەیر ناکات سەرەتا کە دروست بوو (نطفة) بوو کە بەشێکی لە ئاوی پیاوەوە بووە، پاشان بوو بە (علقة) کە دوایی دروست کراو رێك وپێك کرا.

لە فەرموودەیەکی پێغەمبەریشدا (ﷺ) هاتووە: عن ابن مسعود (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿إِنَّ أَحَدَكُم يُجْمَعُ خَلْقُهُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ أَرْبَعِينَ يَوْماً، ثُمَّ يَكُونُ فِي ذَلِك عَلَقَةً مِثْلَ ذَلِك، ثُمَّ يَكُونُ فِي ذَلِك مُضْغَةً مِثْلَ ذَلِك ...﴾ رواه مسلم، واتە: هەریەکێك لە ئێوە کۆبوونەوەی و پەیدا بوونی ئەندامەکانی لەشی لەسکی دایکیدا لە چل رۆژدا تەواو دەبێت، کە هەر لەم چل رۆژەدا (علقة) دەبێت، کە پاشان هەر لەم چل رۆژەدا قۆناغی (المضغة) تەواو دەکات.

لە هەموو ئەو فەرموودە پیرۆزانەی سەرەوە ئاماژە بۆ ئەوە کراوە کە مرۆڤ لە قۆناغێکی سەرەتایی دروست بوونیدا (علقة) دەبێت، ووشەی (العلقة) لە فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبیدا بەم مانایانە هاتووە: ١- مُشتقّة من (عَلَق) وهو: الإلْتِصاق و التَّعَلُّق بشيءٍ ما. ٢- والعلقة: دودة في الماء تَمْتَص دم الحيوانات و تَلْتَصق بها و تعيش في البرك و جمعها (العَلَقْ)، وعَلَقت الدّابَة إذا شَرِبَت الماءَ فعَلَقَت بِها العَلَقة. ٣-والعلق: الدم عامة، و الشديد الحمرة أو الغليظ أو الجامد. ٤-الدم الرطب[1]. واتەکانیان: ١-بە مانای خۆ نووساندن و خۆ هەڵواسین بە شتێکدا. ٢-بەمانای جۆرە کرمێك دێت کە لە زۆنگاودا دەژی و خۆی دەنووسێنێت بە قورگی ئاژەڵەوە و خوێنی دەمژێت، شێوەی لەشی ئەم کرمە پارچە پارچەی بازنەییە (ئەم کرمە بە ئینگلیزی پێی

(1) بروانە ئەم فەرهەنگانەی زمانی عەرەبی: (الصحاح للجوهري)، (لسان العرب)، (مقاييس اللغة)، (القاموس المحيط)، (مفردات ألفاظ القرآن للراغب الأصبهاني).

دەووترێت Leech). ٣-مانای علق: خوێن دەگەیەنێت بەگشتی، هەروەها خوێنی زۆر سوور، یان خوێنێکی ئەستوور، یان خوێنی وەستاو. ٤-خوێنی گەش و تازە.

ووشەی (علقة) لە قورئان دا بە ڕەهایی هاتووە کە ئەو مانایانەی سەرەوە هەمووی دەگرێتەوە، بۆ ئەوەی کە گەورەیی ئەم زاراوەیە و ماناکانیمان بۆ دەرکەوێت،

وێنەی (٤-١): کۆرپەلە لە تۆپەڵێك خانە پێکهاتووە کە جیاواز دەبێت بۆ ٢ چین خانە.

بابزانین زانستی کۆرپەلەزانی ئەمڕۆ چۆن وەسفی کۆرپەلە و باسی دروست بوونی دەکات لەم قۆناغەدا:

کاتێك کە کۆرپەلە دەگاتە ناو منالْدانی ئافرەت (کە لەم کاتەدا پێی دەووترێت Blastocyst) (وێنەی ٤-١)، لە ڕۆژی شەشەمی دروست بوونی کۆرپەلەدا یەکسەر خۆی دەنووسێنێت بە دیواری پشتەوەی منالْدانەوە، و لە بەر ئەوەی کە قەبارەی لەم قۆناغەدا زۆر بچووکە بە هەڵواسراوی دەردەکەوێت گەر بە ووردبین سەیر بکرێت، ئەم کردارە ڕوودەدات کاتێك کۆرپەلەکە تەنها لە تۆپەڵێك خانە پێك دێت، ئەم خۆهەڵواسینەی کۆرپەلەکە بەهۆی چەند گەندە پێیەکەوە دەبێت کە لە بارستەخانەی دەرەوەی کۆرپەلەکەوە پەیدا دەبن (وێنەی ٤-٢) (٤-٣).




وێنەی (٤-٢): خۆهەڵواسینی کۆرپەلە بە دیواری منالْدانداو پاشان هەڵکۆڵینی.

زۆر بەهێواشی کۆرپەلەکە بە هۆی ئەم گەندە پێیانەوە دیواری مناڵدان هەڵدەکۆڵێت تاوەکو بە تەواوەتی خۆی دەچێنێتە ناو دیواری منالدانەوە (Implantation) و پاشان ئەو شوێنەی لێوەی هاتووەتە ناو

وێنەی (٤-٣): لە کۆتایی گەشتەکەیدا بۆ ناو منالدان کۆرپەلەکە دەکەوێتە ناوی و خۆی بە دیوارەکەیەوە دەنووسێنێت.

دیوارەکە بە تەواوەتی دادەپۆشرێت لە دوایەوە (وێنەی ٤-٤)، ئەم کردارە لە قورئانی پیرۆزدا زۆر بە جوانی باس کراوە کە پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ ...﴾ (البقرة:٢٢٣)، واتە: ئافرەتانتان شوێنی چاندنی ئێوەیە، وەك بینیمان زانایانی کۆرپەلەزانی ئەمڕۆ هەمان ناویان لەم کردارە ناوە کە بریتی‌یە لە خۆچاندن (Implantation)، و ئەمە یەکێکە لە ماناکانی (علقة) کە بە ڕاستی موعجیزەیەکی گەورەیە!!

ئەم کردارە تاوەکو خۆچاندنی تەواوی کۆرپەلە یەك هەفتەی پێ دەچێت، کە پاشان ئەو بەشەی کۆرپەلە کە دەنووسێت بە دیواری منالدانەوە (بارستەخانەی دەرەوە) ئەندامێکی زۆر گرنگ دروست دەکات بۆ بەردەوام بوونی گەشە کردنی کۆرپەلەکە کە ئەویش وێلاشە (المشيمة Placenta)، هەروەها گەندەپێکان ئەو بەشە لکێنەرەش دروست دەکەن کە کۆرپەلە و وێلاش بە یەکەوە دەبەستێت و کۆرپەلە بە هەڵواسراوی رادەگرێت لەناو منالداندا، ئەو بەشەش کە لە شێوەی گوریسێکدایە پێی دەووترێت پەتی ناووك یان ناوکەپەتك (الحبل السري Umbulical cord) (وێنەی ٤-٥).




کۆرپەلە لە رۆژی پێنجەمدا لە دوو بارستەخانە پێکدێت، پاشان لە رۆژی شەشەم بەدواوە بەهۆی گەندە پێکانەوە دیواری منداڵدان هەڵدەکۆڵێت




کۆرپەلەکە بە رادەیەکی باش چۆتە ناو دیواری منداڵدانەوە (وێنەیەکی راستەقینەی چوونە ناوەوەکەیە)




وێنەی (٤-٤) دوای چوونە ناوەوەی کۆرپەلەکە شوێنی چوونە ناوەوەکە دادەخرێت.

ئەم کردارەی کە لە رووی زانستی‌یەوە باسمان کرد بە تەواوەتی سەلمێنەری مانای یەکەمی (علقة)یە وەك لە قورئاندا هاتووە کە ئەویش بریتی‌یە لە خۆ نووساندن و خۆ هەڵواسین بە شتێکدا (بۆ زیاتر روونبوونەوەی ئەم کردارانە بڕوانە وێنە رەنگاوڕەنگەکانی: ٨٢/ هـ ، ٨٣/ هـ ، ٨٤-A/ هـ ، ٨٤-B/ هـ ٨٥/ هـ ، ٨٦/ هـ).

بابزانین زانستی کۆرپەلەزانی گۆڕانکاری‌یەکانی تر چۆن باس دەکات؟ ئەگەر بێتو مانای حەرفی ووشەی (علقة) وەربگرین دەبینین لە کاتی خۆ چاندنی کۆرپەلە بۆ ناو دیواری منداڵدان کردارێکی تر روو دەدات کە ئەویش بریتی‌یە لە گۆڕانی شکڵی کۆرپەلەکە، کە شکڵی وورده وورده لە خڕیی‌یەوە بەرەو درێژکۆلەیی دەگۆڕێت (ئەویش بەهۆی پەیدابوونی پەتی پشتەوە (**Notochord**) دەبێت لەهەمان کاتدا پەیـــــدابوونی چـــینی ناوەڕاســـــت (**Mesoderm**) لەشی کۆرپەلەکە رەق دەکات) تا شێوەی کۆرپەلەکە لە کرم دەچێت (سەری ئەستوور دەبێت و ناوەڕاستی باریك دەبێتەوە و خەتێکی درێــژ بەدرێــژایی ناوەڕاستی پەیدا دەبێت)، بە تایبەتی ئەگەر بەراوردی بکەین لەگەڵ ئەو شکڵەی کە قورئانی پیرۆز باسی کردووە کە ئەویش کرمی زەروو (العلق)ە، دەبینین ١٠٠٪ لە یەك دەچن لە شێوە و قەبارەدا، تەنانەت شکڵی دەرەوەی کۆرپەلەکەش هەروەکو




وێنەی (٤-٥): کۆرپەلە لە منداڵداندا بەهۆی ناووکە پەتکەوە هەڵواسراوە

ئەو کرمە دەبێت (وەکو پێشتر ووتمان) پارچە پارچەی بازنەیی دەبێت، ئەم بازنانە بەهۆی پەیدابوونی چینی ناوەڕاست (**Mesoderm**) و سەرەتا دەماری‌یەکان لە لاشەی کۆرپەلەکەدا پەیدا دەبن، کە پاشان بارستە لەشی‌یە

بازنەیی‌یەکان (Somites) دروست دەکەن و لەشی کۆرپەلەکە دەبێتە شێوەی پارچە پارچەی بازنەیی (وێنەکانی: ٤-٦، ٤-٧)، هەروەها کۆرپەلە لەو قۆناغەدا دەست دەکات بە وەرگرتنی خۆراك و ئۆکسجین لە دایکەکەوە (واتە: لە خوێنی دایکەکەوە خۆراك و ئۆکسجین دەمژێت و خۆی دەژێنێت) بە تەواوەتی وەکو کرمی (علق) کە ووتمان ئەم کرمە بە هۆی مژینی خوێنی قورگی ئاژەڵەوە دەژی. (هەروەها بڕوانە وێنە رەنگاورەنگەکانی: ٨٧/ هـ، ٨٨/ هـ، ٩٢/ هـ).




وێنەی (٤-٦): ئەم وێنانە رادەی لێکچوونی نێوان کرمی زەروو و کۆرپەلەی مرۆڤ روونده‌کاتەوە لە هەموو وردەکاری‌یەکی پێکهاتنیاندا.

هەروەها کۆرپەلە لەم کاتەدا بە شلەمەنی‌یەکی لینج دەورە دراوە هەروەکو کرمەکە کە بە ئاو دەورە دراوە، ئا لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە وەسف کردنی کۆرپەلە لەم قۆناغەدا بەوەی کە لە کرمی (علق) دەچێت وەکو قورئان دەڵێت گونجاوترین وەسف و باس کردنە، چونکە کۆرپەلەکە بە تەواوەتی لە کرم

prochordal plate
oropharyngeal membrane
neural fold
cranial end
primitive knot
neural plate
notochordal process
primitive streak
caudal end
newly added cells
cloacal membrane
notochord
STAGE 6
A. (about 15 days)
STAGE 8
B. (about 18 days)
STAGE 9
C. (about 20 days)
STAGE 9
D. (about 21 days)

وێنەی (٤-٧)

ئەم وێنەیە برگە برگە بوونی لەشی کۆرپەلەکە روون دەکاتەوە بە تەواوەتی وەك کرمی زەروو.

دەچێت لە ڕووی دەوروبەر و کرداریشی‌یەوە، ئەمە بریتی بوو لە سەلماندنی زانستی‌یانەی مانای دووەمی (علقة) هەروەکو لە قورئاندا هاتووە.

ئێستا با بچینە نێو ووردەکاری ماناکانی تری (علقة) وەکو لە قورئاندا هاتووە؛ سەبارەت بە مانای سێیەم کە بە مانای خوێنێکی زۆر سوور، زۆر گەش، وەستاو، پارچەیەك خوێنی ئەستوور دێت، زانایانی کۆرپەلەزانی دەڵێن: ئەگەر لە ژێر ووردبیندا سەیری کۆرپەلە بکەین لەم قۆناغەدا دەبینین شکڵی دەرەوە و ئەو توورەکانەی پێوەی نووساون لە پارچەیەك خوێنی مەیيو (وەستاو)ی ئەستور دەچێت (وێنەی ٤-٨)، چونکە لەم کاتەدا دڵ، خوێن، لوولەکانی خوێن، و توورەکەکانی وێلاش دروست دەبن، بەڵام خوێنی ناو دڵ و لوولەکانی خوێنی کۆرپەلەکە خوێنێکی وەستاوە چونکە لێدانی دڵ و سووڕی خوێن هێشتا دەستی پێ‌نەکردووە، کە تەنها دوای کۆتایی هەفتەی سێیەم دڵ دەکەوێتە لێدان و سووڕی خوێن دەست پێ‌دەکات، بەم شێوەیە بۆمان دەرکەوت کە کۆرپەلە لەم کاتەدا خوێنێکی ئەستووری وەستاوە، بەڵام با بشزانین کە خوێنێکی گەش و تازە دروست بووە، لەگەڵ ئەوەشدا کە ناجوڵێت، کە ئەمەش مانای چوارەمی (علق) دەسەلمێنێت بە مانای خوێنێکی گەش و تازە. (**هەروەها بڕوانە وێنە ڕەنگاوڕەنگەکانی: ٨٩/ هـ ، ٩٠/ هـ ، ٩١/ هـ ، ٩٣/ هـ**).

ئەو ماوەیەی کە پێویستە بۆ ئەوەی کۆرپەلە لە قۆناغی (نطفة)وە ببێت بە (علقة) وەکو زانایانی کۆرپەلەزانی باسی دەکەن: کۆرپەلە بە هێواشی لە کاتی خۆ چاندنی‌دا گەشە دەکات و دەگۆڕدرێت، کە ماوەی هەفتەیەك دەخایەنێت لە سەرەتای خۆچاندنەوە تا دەبێت بە (علقة) تاوەکو لە رۆژی ١٤ یان ١٥ دا خۆی هەڵدەواسێت، دروست بوونی ناووکە پەتك (یان پەتی ناووك Umbulical cord) نزیکەی ١٠ رۆژ دەخایەنێت، کە سەرەنجام دەبێتە هۆی هەڵواسینی کۆرپەلە لەناو منداڵداندا، و لەناو ئاوی پەردەکانی کۆرپەلەدا (Amniotic fluid) مەلە دەکات، و دەبێت بە (علقة).




لەم وێنەیەدا دەبینین کە چۆن کۆرپەلە دوای هەڵکەندنی دیواری منداڵدان خوێن بەربوونێکی زۆر ڕوودەدات لە لوولە خوێنەکانی دیواری منداڵدانەوە و دەوروبەری پردەکەنەوە.

دوای خۆچاندنی تەواوی کۆرپەلەکە لەناو دیواری منداڵدانا دەبینین بە خوێن دەورە دراوە و لە پارچەیەک خوێنی مەییو دەچێت، کە ئەم خوێنە سەرچاوەی خۆراکێتی.




هێلکارییەکە سیستەمی دڵ و سووڕانی خوێنی سەرەتایی لە کۆرپەلەیەکی (٢٠) ڕۆژیدا دەردەخات، کە هێشتا خوێنەکەی وەستاوە و بە تەواوەتی لە کڵۆیەک خوێنی گەورە دەچێت.

کۆرپەلـە لـە ڕۆژی (٢١)دا لەنـاو بۆشایی ووێڵاشدا هەڵواسراوە بـەهۆی قاچێکەوە، و لـەناو شلـەیەکی لینجدایـە و خوێن لـەناو لـەشیدا دروستبووە بـەڵام هێشتا وەستاوە (کەواتە پارچەیەک خوێنی هەڵواسراوە).

وێنەی (٤-٨): لەم وێنانەدا هۆکاری ناونانی کۆرپەلەکە بە (پارچەیەک خوێنی گەشی وەستاوی هەڵواسراو) دەبینین.

ئەو ئاماژانەی لە ئایەتەکانی قورئاندا هاتووە باسی هێواشی ئەم قۆناغە دەکات کە ئەمەش موعجیزەیەکی ترە، خوای پەروەردگار لە قورئاندا پیتی (ثم)ی بەکارهێناوە کە دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً﴾، کە لە زمانی عەرەبیدا بەکارهێنانی ئەم پیتە مانای هێواشی دەگەیەنێت لەو کردارەدا (التراخي)، واتە ماوەیەك دەخایەنێت تاوەکو گۆڕان بۆ ئەم قۆناغە نوێیە رووبدات و کۆرپەلەزانیش ئەمەی بۆ سەلماندووین.

کەواتە لەمانەی سەرەوە بۆمان دەرکەوت کە ئەو وەسفەی قورئان کردوویەتی بۆ کۆرپەلە لەم قۆناغەدا (بە بەکارهێنانی زاراوەی علقة) بە تەواوەتی پڕاوپڕی خۆیەتی و وەسفێکی وورد و هەمەلایەنەیە دەربارەی قۆناغی دووەمی گەشە کردنی کۆرپەلە، و هیچ ووشەیەك نییە وەك ئەم ووشەیە بێت چونکە هەموو جیاکەرەوە سەرەکییەکانی دەرەوە و ناوەوەی کۆرپەلەکەی لەخۆ گرتووە.

ئەم ووشەی (علقة)یە ئەوەندە ماناکەی فراوانە کە وەسفی روخساری گشتی کۆرپەلەکە دەکات کە لە کرمی (علق) دەچێت، و هەروەها کردارە ناوخۆییەکانی ناو لەشی کۆرپەلەکەش روون دەکاتەوە (وەك دروست بوونی خوێن و لوولە داخراوەکانی خوێن)، هەروەها مانای خۆهەڵواسینی کۆرپەلەکەش بەدیواری مناڵدانەوە دەگەیەنێت، زانستی کۆرپەلەزانی هەمووی ئەمانەی سەلماندووە، تەنانەت ئەو پیتانەشی کە ئایەتەکان بۆ بەستنەوەی ووشەکان بەکاری دەهێنن ئەوپەڕی ووردەکاری تێدایە، بەڵێ هەروا دەبێت چونکە خاوەنی قورئان هەر ئەوە کە دروستکەری مرۆڤە و راگری ئەم ووردەکارییەیە: ﴿أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ﴾ (الملك: ١٤).


وێنەی (٤) چەند وێنەیەکی راستەقینەی کۆرپەلە لە قۆناغی (عەلەقە)دا

## ئیعجازی پزیشکی لەو فەرمووودانەی پێغەمبەر (ﷺ) کە کلێنچکە (عجب الذنب)ی کردووە بە بنچینەی دروست بوونی مرۆڤ

وەك ئاماژەمان پێدا زۆرێك لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) باسی چەندین بابەتیان کردووە لە لەشی مرۆڤدا کە تەنها زۆر نوێ لە رۆژگاری ئەمڕۆدا راستییەکانیان دۆزاونەتەوە، هەندێك لەو فەرموودانە شوێنێکی گرنگی لەشی مرۆڤیان باسکردووە کە لەم دواییانەدا مەڵبەندە زانستییەکان توێژینەوەیان لەسەر بڵاوکردووەتەوە و راستی فەرموودەکانی خوای گەورە و پێغەمبەرمان (ﷺ) ئەسەلمێنن، (وەك پێشتر باسمان کرد) خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا بۆی روونکردووینەتەوە کە چەندین بەڵگەی روون و ئاشکرا لە لەشی خۆماندا و لە ئاسمان و زەویدا هەیە، کە گەورەیی دەسەڵاتی پەروەردگارمان بۆ دەسەلمێنن، و هەروەها ئەم فەرموودانە بۆمان روون دەکەنەوە بە بەڵگەی زانستی کە ووتەکانی خوا و پێغەمبەر راستییەکی رەهان، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ (فصلت:٥٣).

لە چەند فەرموودەیەکیدا پێغەمبەر (ﷺ) باسی کلێنچکەی کردووە کە بەشێکی گرنگی لەشی مرۆڤە، و بە بەردی بناغەی دروستبوونی کۆرپەلەی مرۆڤی داناوە، و بە روونی باسی ئەوەی کردووە کە مرۆڤ لەمەوە دروست دەبێت، هەروەها هەر دەربارەی کلێنچکە فەرموویەتی کە هەموو ئێسکەکانی لەشی مرۆڤ لە خاکدا دەڕزێت و ئەبێتەوە بە خۆڵ، جگە لە بەشێکی زۆر بچووك لە ئێسکی کلێنچکە کە بە ئەندازەی تۆوی خەرتەلە ئەبێت لەناو خاکەکەدا ناڕزێت و دەمێنێتەوە، و بە فەرمانی خوای گەورە جارێکی تر مرۆڤی لێوە زیندوو ئەکرێتەوە لە رۆژی دواییدا، واتە ئەو بەشە بچووکە لە

کلێنچکەیە کە ناڕزێت بە تۆوی زیندوو بوونەوەی مرۆڤ دادەنرێت لە رۆژی دوایی‌دا، ئەمەش دەقی فەرموودەکانی پێغەمبەرە (ﷺ) لەم بارەیەوە:

١- (ئیمامی بوخاری) لە فەرموودە راستەکانی پێغەمبەردا (ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە: ﴿عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ): (ما بَيْن النَّفْخَتَين أربعون، قال: أَربعون يَوماً؟ قال أبو هريرة: أَبَيْت، قال: أربعون شهراً؟ قال: أَبَيْت، قال؟ أَرْبعون سَنة؟ قال: أَبَيْت (أي أنَّ أبا هريرة أَبَى أَن يُحَدد الأربعين هل هيَ يوماً أو شهراً او سَنة)، قال: (أَي أبو هريرة يَرفَعُه إِلـى النَّبي (ﷺ): (ثُمَّ يُنْزِلُ الله مِن السَّماء مـاءً فَيَنْبُتون كما يَنْبت البَقل، لَيس من الإنسان شَيء إلا يبلى إِلا عَظْماً واحداً، وَهو عجب الذنب، وَمنه يَرَكَّب الخَلْق يوم القيامة)﴾ رواه البخاري، واتە: لە نێوان هەردوو فوو پیاکردنەکەدا[2] چلە (ئەبو هورەیرە دیاری نەکرد ٤٠ رۆژە یان مانگە یان ساڵە)، پاشان خوای گەورە بارانێك دەبارێنێت کە لەشی مرۆڤەکانی لێوە دەڕوێنێتەوە وەکو چۆن رووەك دەڕوێتەوە، هیچ شتێك نی‌یە لە لەشی مرۆڤ کە نەڕزێت و نەفەوتێت، تەنیا بەشێکی ئێسکێك نەبێت، ئەویش بەشێکی کلێنچکەیە، لەمەوە مرۆڤەکان دەڕوێنەوە و دروست دەکرێنەوە لە دوارۆژدا.

٢- (ئیمامی موسلیم) لە فەرموودە راستەکانی پێغەمبەر (ﷺ) وەك ئەو فەرموودەیەی سەرەوەی بۆ گێڕاوینەتەوە: عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ): (كُلُّ ابْنِ آدَم يَأْكُلُه التُّراب إلاَّ عَجْبَ الذَّنب، مِنْـهُ خُلِـقَ وَمِنْـهُ يُركب)، وفي لفظ آخر: (وَلَيس مِن الإنسانِ شَيءٌ إِلاّ يَبْلَى إِلاّ عَظْماً واحداً هُوَ عَجْبُ الذَّنَب، وَمِنْه يُركَّب الخَلْق يَوم القِيامة)، وفي لفظ آخر لمسلم أَيْضاً: (إِنَّ فِي الإنسان عَظْماً لا تَأْكُلُه الأَرْضُ أَبداً فِيه يُركَّب يَوم القيامة، قالوا: أَيُّ عَظْمٍ هُوَ يا رسول الله؟

(2) مەبەست لە فووکردنە بە کەڕەنادا (الصور)، کە فریشتەیەکی تایبەت پەروەردگار بۆ ئەم مەبەستە دیاری کردووە (بەناوی ئیسرافیل)، هەر کاتێك یەکەم جار فووی پیادا بکات رۆژی دوایی بەرپا دەبێت، کە دووەم جار فووی پیادا دەکاتەوە ئیتر زیندەوەرەکان زیندوو دەبنەوە.

قـال: عَجْـب الـذَّنَب)، مانای فەرمووودەکان: هەموو بەشێکی مرۆڤ زەوی دەیخوات و دەیڕزێنێت تەنها بەشێکی ئێسکێك نەبێت کە هەرگیز زەوی ناتوانێت بیفەوتێنێت، لەم ئێسکەوە ئادەمیزاد دروست بووە و هەر لەمیشەوە زیندوو دەبێتەوە، هاوەڵەکان پرسییان ئەو ئێسکە کامەیە؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بەشێکی کلێنچکەیە.

٣- (ئەبو داود) لە سونەنەکەیدا هەمان فەرمووودەی گێڕاوەتەوە لە زاری هەمان هاوەڵەوە (ئەبو هورەیرە) بەم شێوەیە: (کُلّ ابْـن آدَم تأْکُـلُ الأرضُ إلاّ عَجْب الذّنَب منْه خُلقَ وفيه يُركَّب).

٤- ئیمامی (ئەحمەد) فەرمووودەیەکی ترمان بۆ دەگێڕێتەوە: ﴿عن أبي سعيد الخدري (رضي الله عنه) عن رَسول الله (ﷺ) أنَّهُ قال: يَأْكُلُ التُّرابُ كُلَّ شَيْءٍ مِنَ الإِنْسـان إلاّ عَجْبَ ذَنَبِه، قيل: وَمِثْلُ ما هُوَ يا رَسولَ الله؟ قالَ: مِثْلُ حَبَّةِ خَرْدَل مِنْهُ تَنْبُتون﴾.

٥-زانایانی فەرمووودە (النَّسائي، إبن ماجة) هەمان فەرمووودەیان لە چەند شوێنێکی کتێبەکانیاندا گێڕاوەتەوە، هەروەها ئیمامی (مالیك)یش لە کتێبەکەیدا (الموطأ) بە هەمان شێوەی پێشوو فەرمووودەکەی گێڕاوەتەوە.

٦-ئیمامی (إبن حِبّان)یش هەمان فەرمووودەی گێڕاوەتەوە لە چەند شوێنێکدا لە (ئەبو هورەیرە)وە، تەنها یەك فەرمووودەیان نەبێت کە لە (أبي سعيد الخدري)وە گێڕاویەتەوە: کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی:

(يَأْكُلُ التُّرابُ كُل شَيءٍ من الإنسان إلاّ عَجْبَ ذَنَبِه، قيل: وما هُو يـا رَسُـولَ الله؟ قال: مِثل حَبَّة خَردَل منه يُنشأ)، واتە: زەوی هەموو شتێکی مرۆڤ دەخوات تەنها بەشێکی کلێنچکەی نەبێت، هاوەڵەکان پرسییان: ئەو بەشە چییە ئەی پێغەمبەری خودا؟ ئەویش فەرمووی: بەقەدەر دەنکە خەرتەلەیەك دەبێت کە مرۆڤی لێوەی دروست دەبێت.

زانایانی زمانەوانی سەبارەت بە (عَجْب الذَّنَب) دەڵێن: (هو العظم الذي في أسفل الصلب عند العجز) (بڕوانە فەرهەنگی لسان العرب/ ماددەی (عجب))، واتە: بریتی‌یە لەو ئێسکەی کە لە کۆتایی بڕبڕەی پشتدا هەیە لە بەشی خوارەوە (کە لە زاراوەی زانستی ئەمڕۆدا پێی دەووترێت ئێسکی کلێنچکە)، ئەم ئێسکە لە ئاژەڵانیشدا هەیە کە کلك دروست دەکات، فەرموودەکە ووشەی (الذَّنَب)ی بەکارهێناوە بە مانای (کلك)، کە ئەوە دەگەیەنێت کۆرپەلەی مرۆڤ پێشتر کلکی هەبووە و لە دوایی‌دا دەپووکێتەوە.

ئەم فەرموودانە چەند ئاماژەیەکی زانستیی زۆر نوێی تێدایە، **یەکەمیان:** ئەوەیە کە مرۆڤ کلکی هەیە، **دووەمیان:** کۆرپەلەی مرۆڤ لەم کلێنچکەوە دروست دەبێت، **سێیەمیان:** ئەوەیە کە شوێنی دروست بوونی کۆرپەلە لە کۆتایی ئەم کلکەدایە، **چوارەم:** ئەوەیە ئەم شوێنە بریتی‌یە لە ئێسك، **پێنجەم:** کۆتایی ئەم کلکە زۆر بچووکە (بڕوانە ووشەی (حَبَّة خَردَل) کە لە فەرموودەکاندا بەکارهاتووە)، **شەشەم:** یەکەم شتێك کە لە کۆرپەلەکەدا دروست بوونی تەواو دەبێت بریتی‌یە لەم کلکە کە پاشان مرۆڤ و هەموو ئەندام و شانەکانی لێوە دروست دەبێت، **حەوتەم:** بەرگە گرتنی ئەم بەشەیە بۆ گۆڕانکاری‌یەکانی رۆژگار، کە لە دوای ڕزانی هەموو لاشەی مرۆڤ بەشێك لەم ئێسکە هەر دەمێنێتەوە و لە دوارۆژدا مرۆڤ و شانەکانی و ئەندامەکانی لەم بەشەوە وەکو چەکەرەیەك دروست دەبێتەوە و زیندوو دەبێتەوە.

کۆرپەلەزانی بۆمان باس دەکات کە ئەم کردارە لە ڕۆژی پانزەیەمەوە تا ڕۆژی نۆزدەیەمی گەشە کردنی کۆرپەلەکە دەخایەنێت، و ئەم کردارە بەشێکە لە قۆناغی (العلقة)، چونکە کۆرپەلەکە لەم کاتەدا خۆی هەڵواسیوە بەدیواری مناڵدانەوە بەهۆی قاچێکەوە.

دەبا ئێستا لەژێر ڕۆشنایی نوێترین دۆزینەوە و تاقی کردنەوەی ڕۆژگاردا بە شێوەیەکی وورد و بەدرێژی لەم فەرموودانە بکۆڵینەوە:

**کلێنچکە لە زانستی کۆرپەلەزانیدا (شریتی سەرەتایی):**

تـازەترین توێژینـەوەی زانسـتی کۆرپەلـەزانی روونـی کردووەتـەوە کـە کلێنچکەی مرۆڤ لە سەرەتادا بریتی‌یە لە ئەندامێکی بچووك پێی دەووترێت: شریتی سەرەتایی (Primitive Streak)، لەگەڵ دەرکەوتنی ئەم شریتی سەرەتایی‌یەی کۆرپەلە، چینەکانی لەش وئەندامەکانی کۆرپەلە و کۆئەندامی دەمـاری کۆرپەلەکـە پێکـدێنێت، دوایـی ئـەم شـریتی سـەرەتایی‌یە هـیچ شوێنەوارێکی نامێنێت جگە لە جێماوەیەك نەبێت، کە لە مرۆڤی پێگەیشتوودا پێی دەڵێن ئێسکی کلێنچکە (عظم العصعصي Coccygeal Bone).

**پێکهاتنی شریتی سەرەتایی:**

لە بەشی پێشتردا باسی ئەوەمان کرد کە خانەکانی کۆرپەلە کۆدەبنـەوە لـە شـێوەی دیسـکێکی بازنـەیی‌دا (وەك لـە فەرموودەیـەکی پێغەمبـەردا (ﷺ) هاتووە)، (**بڕوانە وێنەی ڕەنگاوڕەنگی: ٩٤/ هـ ، ٩٥/ هـ**) لێرەوە کۆرپەلەکە دێتە دونیای بوونەوە کە پێشتر بوونی نەبووە، ئەوەی کە رۆڵی سەرەکی لەم هاتنە بوونـەدا دەبینێـت بـریتین لـە کرۆمۆسـۆمەکان کـە لـە دایـك و باوکـەوە بـۆ کۆرپەلەکـە هـاتووە و پوختەیـەکی سـیفاتەکانی ئـەوانی تێدایـە، ئەگـەر بـە شـێوەیەکی ووردتـر باسـی ئـەم رووداوانـە بکـەین: دوای ئـەوەی ئـەو تۆپەڵـە خانەیـە (Blastula)یـەی لـە هێلکـەی پیتێنـراوەوە دروسـت دەبێـت دەگاتـە مندالّـدان، خـۆی بـە دیـواری منالّدانـدا هەڵدەواسـێت و تیایـدا جێگیر دەبێـت، پاشان جیا دەبێتەوە بۆ دوو بارستەخانە:

أ- بارستەخانەی دەرەوە (Outer cell mass or Trophoblast): دەبێـت بـە دوو چـین: چـینێکی هەڵکۆڵـەر کـە خانـە داخۆرەکـان یـان خـۆرە خانـەکان (الخلايـا الآكلـة Syncytiotrophoblast)ی تێدایـە و بەرامبـەر دیواری منالّدان دەبێت، و چینێکی تر (Cytotrophoblast) کە دەکەوێتە ژێـر ئەمـەوە، خـۆرە خانـەکان هەڵدەسـتن بـە کـرۆژین و هـەڵکۆڵینی دیـواری

منداڵدان، و کارێکی وا دەکەن کە تۆپەڵە خانەکەی لەسەر جێگیر ببێت (وێنەی ٤-١٠)، ئەم بارستە خانەیە رێگە ئەدات بە خۆراك کە بڕوات بۆ خانەکانی تری (کۆرپەلەکە)، ئەویش وەریدەگرێت لەوانەی لە چوار دەورێتی لە خوێن و دەردانەکان (إفرازات)ی رژێنەکانی مناڵدانی دایکەکە، ئەم خانە هەڵکۆڵەرانە لە داهاتوودا ویلاش (المشيمة Placenta) دروست دەکەن.

ب- بارستەخانەی ناوەوە (كتلة خلايا الداخلية Inner cell mass):

لەم بارستەیەی ناوەوەیە کە لەشی کۆرپەلەکە دروست دەبێت، کۆی گشتی ئەو گۆڕانکاری‌یانەی بەسەر ئەم بارستەخانەیەدا دێت سەرەنجام سێ جۆر خانەی لێوە دروست دەبێت.

ئەم خانانەن کە دابەش دەبن و زیاد دەکەن و کۆچ دەکەن بۆ دروست کردنی ئەندامەکانی لەشی کۆرپەلەکە، ئەم پرۆسەیە پێی دەووترێت (سەرەتای دروست بوون و پێکهاتنی کۆرپەلەکە Gastrulation)[3]، پاش جیابوونەوەی کۆرپەلەکە بۆ دوو بارستەخانە، بارستە ناوەکی‌یەکە جارێکی تر دابەش دەبێت بۆ دوو پەڕەی تەنك لە خانە کە وەك کاغەز وان:

١) دەرەکی‌یەکەی پێی دەڵێن ئیپیبلاست (Epiblast)، کە دوایی دەبێت بە ئیکتۆدێرم (Ectoderm).

٢) ناوەکی‌یەکەی پێی دەڵێن هایپۆبلاست (Hypoblast)، کە دوایی دەبێت بە ئیندۆدێرم (Endoderm) (وێنەی ٤-١٠).

---

(3) ئەمە بریتی‌یە لە سەرەتای پێکهاتن و رێکبوونی مرۆڤ، هەر بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) لە کاتی باس کردنی پەیدابوونی کۆرپەلەدا ئەم ئایەتەی هێناوەتەوە کە پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فِي أَيِّ صُورَةٍ مَّا شَاءَ رَكَّبَكَ﴾ (الإنفطار:٨)، واتە: لەسەر هەر شێوە و شکڵێك ئارەزووی لێبێت دروستتان دەکات و شکڵتان بۆ دیاری دەکات، لێرەوە دەگەینە ئەو راستی‌یەی کە زانایانی کۆرپەلەزانی هەمان ووتەی پەروەردگار و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) دووبارە دەکەنەوە کە کرداری (Gastrulation) بریتی‌یە لە سەرەتای راستەقینەی پەیدا بوونی کۆرپەلەکە.




کۆرپەلە لە دوو چین خانە پێکدێت لەکاتی خۆچاندندا

کۆرپەلەیەکی خۆچاندوو کە شریتی سەرەتایی تێدا پەیدا بووە







وێنەیەکی ڕاستەقینەی مایکرۆسکۆپی شریتی سەرەتایی

شریتی سەرەتایی

وێنەی ( ٤-١٠ ): ئەم وێنەیە ئەمانە ڕوون دەکاتەوە: جیاوازبوونی کۆرپەلەکە بۆ دوو بارستەخانە، و پاشان دروست بوونی دیسکی ( خەپلەی ) کۆرپەلەکە و جیاواز بوونی چینەکانی، و دوایی پەیدابوون و گەشە کردنی شریتی یان هێڵی سەرەتایی ( Primitive Streak ) کە لە وێنەکاندا بە ئاشکرا بۆمان ڕوون دەبێتەوە.

– چینی هایپۆبلاستی ناوەوە لە هەشتەمین رۆژ دوای پیتاندنی هێلکەکە لە منالْداندا دەردەکەوێت، کەلێنێکی بچووك دەردەکەوێت لە سەرەوەی چینی ئیپیبلاستی دەرەوە و ئەم بەشە دەبێتە پێکهێنەری سەرەتایی بۆشایی ئەمنیۆن (Amniotic Space)، سەری بۆشایی ئەمنیۆن پێکدێت لە خۆرە خانەکان (الخلايا الأكلة)، بەلاّم بنکی بۆشایی ئەمنیۆن لە خانەکانی ئیکتۆدێرم پێکدێت.

–لە نۆهەمین رۆژدا لە خانەکانی چینی ناوەوە (هایپۆبلاست یان ئیندۆدێرمەوە) شریتێك لە خانە درێژ دەبێتەوە و بە خانەکانی چینی میزۆدێرمی دەرەکییەوە دەنووسێ و دەبێتە پێکهێنەری توورەکەی زەردێنەی یەکەم (Primary Yolk Sac).

– لە رۆژی سیانزەهەمیندا لە خۆرە خانەکانی دەرەکییەوە نووکەکان (نتوءات) پەیدا دەبن و گەشە دەکەن، کە پاشان بە نووکە نەرمەکانی پەردەی وێلاّش ئەناسرێن (مخملات الغشاء المشيمي Chorionic Villi)، بەهۆی ئەو نووکانەوە توورەکەی کۆرپەلە بەمندالْدانەوە خۆی جێگیر دەکات، دوایی ئەم تووکانە لقیان لێ دەبێتەوە وەکو لقی درەخت، هەروەها خانەکانی ئیندۆدێری ناوەوە گەشە دەکەن و دەبنە پێکهێنەری تورەکەی زەردێنەی دووەهەم کە زۆر لە تورەکەی زەردێنەی یەکەم بچوکترە.

– لە کۆتایی هەفتەی دووەمدا کۆرپەلەکە لە دوو خەپلەی بەیەك گەیشتوودا خۆی ئەبینێتەوە کە ئەمانەن:

١)خەپلەی (دیسکی) دەرەوە (القرص الخارجي) یان (ئیکتۆدێرم): کە بنی (بۆشایی ئەمنیۆن) پێك دێنێت.

٢)خەپلەی (دیسکی) ناوەوە (القرص الداخلي) یان (ئیندۆدێرم): کە سەری بۆشایی تورەکەی زەردێنە پێکدێنێت (وێنەی ٤-١١).




لە ڕۆژی ١٦ بەدواوە کۆرپەلەکە شێوەی دەبێتە هەرمێیی و شریتی سەرەتایی تێدا پەیدا دەبێت

چینی ناوەڕاستی کۆرپەلە لە خانە کۆچ کردووەکانی شریتی سەرەتاییەوە بەناو گرێی سەرەتاییدا بۆ نێوان دوو چینە سەرەکییەکەی کۆرپەلەکە دروست دەبێت.

Cut edge of amnion
Yolk sac
A
گرێی سەرەتایی
Primitive streak
Primitive node
Primitive streak
Epiblast
Amnion
B
Invaginating mesoderm cells
Hypoblast
Yolk sac

بەردەوام بوونی پرۆسەی کۆچ کردنەکە تا دروست بوونی چینی ناوەڕاست

Prochordal plate
Cut edge of amnion
Notochordal process
Primitive node
Primitive streak
Future cloacal membrane
A
Amniotic cavity
Epiblast
Primitive pit
Prochordal plate
Notochordal process
Primitive streak
Allantois
B

Amnion
B
Neurenteric canal
C
Future cardiogenic area
A
Prochordal plate
Cloacal membrane
Allantois

تەواو بوونی دروست بوونی چینی ناوەڕاست

Intra-embryonic mesoderm
چاڵایی سەرەتایی
Primitive groove
Intra-embryonic mesoderm
Extra-embryonic mesoderm
B
Notochord
Endoderm
Yolk sac
C
Endoderm

وێنەی (٤-١١): دوای دروست بوونی شریتی سەرەتایی هەر لەمەوە چینی ناوەڕاستی کۆرپەلەکەش دروست دەبێت

ئەم دوو خەپلەیە لە بەشی پێشەوایاندا بەیەکەوە ئەنووسێن کە لە دوایی‌دا بە بەشی سەریی دەناسرێت (Cephalic Portion) ، ئەمیش بەهۆی چڕبوون و ئەستووربوونی خانەکانی ئیندۆدێرم، هەروەها ئەم دوو خەپلە شێوە هێلکەیی‌یە دوایی لە ناوچەی کۆتاییشیاندا (کلکی)یاندا (Caudal Portion) بەیەکەوە ئەنووسێن، و دەبنە پێکهێنەری پەڕەی کلکیی گۆشەیی لە ئایندەدا (Cloacal Plate).

– لە چواردەهەمین رۆژدا دوو خەپلەکە درێژ دەبنەوە هەتا شێوەیەکی هەرمێیی وەردەگرن، سەرە پانەکەی بەشی پێشەوەیەتی بەڵام بەشە کۆتایی‌یەکەی باریك دەبێتەوە، خانەکانی چینی ئیکتۆدێرمی دەرەوە لە ناوچەی کۆتایی‌دا چالاك دەبن و سەرەنجام دەبنە پێکهێنەری شریتی سەرەتایی (Primitive Streak)، کە بۆ یەکەمجار لە پانزەهەمین رۆژی دوای پیتاندنی هێلکەکەدا دەردەکەوێت، کە پێکهاتووە لە خانەی شێوەداسی لە کۆتایی چینی دەرەوەی دیسکی کۆرپەلەکەدا کە ئەم شوێنە پێی دەووترێت ناوچەی کۆلەر (Koller's Sickle)، کە بریتی‌یە لە جیسمی سەرەتایی (شریتی سەرەتایی)(4).

لە سەرەتای هەفتی سێ‌یەمدا و دوای پێکهاتنی شریتی سەرەتایی دابەشبوونێکی خێرا لە خانەکانی ئەم شریتەدا روودەدات، و گەشەکردنێکی زۆر بە پەلە روو دەدات لە خانەکانی شریتەکەدا، و دەبێتە هۆی درێژ بوونەوەی و دوایی هێڵێکی راست پێکدێنێت کە هەر دوو لای راست و چەپی

(4) لە سایتی زانکۆی (کۆرنێل Cornell) لەسەر تۆڕی ئینتەرنێتدا هاتووە: چاندنی ئەم ناوچەی کۆلەرە (Koller's Sickle) لەناو کۆرپەلەی باڵندەدا دەبێتە هۆی دروستکردنی شریتێکی سەرەتایی.

کەمێك بەرز دەبنەوە و کۆتاییەکەشی بەرزتر دەبێت و پێی دەڵێن گرێی سەرەتایی (Primitive node) (وێنەی ٤-١١).

لە کاتی درێژ بوونەوەی ئەم شریتەدا لە ناوەڕاستیدا ڕێڕەوێك دروست دەبێت بەهۆی بەرز بوونەوەی ئەملاولاکەی کە پێی دەووترێت ڕێڕەوی یان چاڵایی سەرەتایی (Primitive groove)، کە لەم ڕێڕەوەوە خانەکانی شریتی سەرەتایی دەچنە ناو دیسکی کۆرپەلەکەوە لەرێی کونێك لە کۆتایی ئەم ڕێڕەوەدا کە دەڕوانێت بەسەر ناوەوەی کۆرپەلەکەدا و پێی دەووترێت کونی سەرەتایی (Primitive pit)، لێرەوە شریتی سەرەتایی دروست بوونی تەواو دەبێت کە دەکەوێتە بەشی دەرەوەی کۆتایی دیسکی کۆرپەلەکەوە (Caudal End of Embryonic Disc).

کاتێك کە شریتی سەرەتایی دروست دەبێت ئیتر دەتوانرێت تەوەرەی پێشەوە بۆ دواوەی کۆرپەلەکە بزانرێت و کۆتایی پێشەوە و دواوەی دیاری دەبێت، و هەروەها بەشی پشتی و سکی و ڕاست و چەپی جیادەکرێتەوە، کەواتە لێرەوە خاڵی شەشەممان لە ئاماژە زانستییەکانی فەرموودەکان بۆ روون دەبێتەوە کە دروست بوونی ئەم بەشی کلکە پێش دروست بوونی کۆرپەلەکە دەکەوێت.

پاش دروست بوونی شریتی سەرەتایی بە ماوەیەکی کەم کۆچی خانەکان لە دەرەوە بۆ ناوەوە بەناو ڕێڕەوەکەدا روو دەدات، و دیسکی کۆرپەلەکە جیادەبێتەوە بۆ سێ چین، بەم شێوەیەی خوارەوە:

خانە دروست بووەکان لە شریتی سەرەتاییەوە لە کونی سەرەتاییەوە دەچنە ناو کۆرپەلەکەوە و بەلای ڕاست و چەپدا بڵاو دەبنەوە لە نێوان هەردوو چینی هایپۆبلاست (ئیندۆدێرمی ناوەوە) و ئیپیبلاست

(ئیکتۆدێرمی دەرەوە)، کە دوایی ئەم خانە کۆچ کردووانە دەبنە پێکهێنەری چینێکی نوێ لە کۆرپەلەکەدا، کە پێی دەووترێت چینی ناوەراست یان (میزۆدێرم Mesoderm) (وێنەی ٤-١١) (هەروەها وێنەکانی: ٩٦/هـ ، ٩٧/هـ).

ئەم چینە نوێیەی دروست بووە (چینی میزۆدێرم) پاش ماوەیەکی کەم کاردەکاتە سەر چینی هایپۆبلاست (Hypoblast) و دەبێتە هۆی گۆڕانی ئەم چینە و دروست بوونی چینێکی نوێ لێیەوە کە جێی دەگرێتەوە و پێی دەووترێت چینی ئیندۆدێرم (Endoderm)، ئەویش لەرێی کردارێکەوە کە پێی دەووترێت لادان (Displacement).

- بەهۆی کۆچی بەردەوامی خانەکان لە دەرەوە بۆ ناوەوە لەرێی کونی سەرەتایی‌یەوە و بۆ ناو چینی ناوەڕاست، تونێلێکی درێژ لە خانە دروست دەبێت لە چینی ناوەڕاستدا کە پێی دەووترێت تونێلی پشت (Notochordal canal)، کە ئەمە دەبێتە هۆی درێژبوونەوەی دیسکی کۆرپەلەکە و قەبارەکەی زیاد دەکات و شێوەی (هەرمێ) وەردەگرێت، لە پاش چەندین پرۆسەی نوشتانەوە و یەکگرتن ئەم تونێلە دەگۆڕێت بۆ پشتەپەت یان نۆتۆکۆرد (Notochord) کە دوایی بڕبڕەی پشتی کۆرپەلەکەی لێوە دروست دەبێت (بڕوانە وێنەی ڕەنگاوڕەنگی: ٩٧/ هـ).

-زۆر بە کورتی دەتوانین بڵێین لە ئەنجامی پێکهاتنی شریتی سەرەتایی و زیادبوونی دابەشبوونە چالاکی‌یەکەیدا، دیسکی کۆرپەلەکە درێژ دەبێتەوە و هەر سێ چینەکەی لەشی دروست دەبن و لە یەکتری جیادەبنەوە، پاشانیش خانەکانی کۆئەندامی دەماری لەشی کۆرپەلەکە و بڕبڕەی پشت {یان نۆتۆکۆرد (Notochord)} پێکدێت. (بڕوانە وێنەکانی: ٤- ١٢ ، ٤- ١٣) (هەروەها وێنە ڕەنگاوڕەنگەکانی: ٩٨/ هـ ، ٩٩/ هـ).




**وێنەی (٤-١٢): ئەم دیمەنانە رووداوە سەرەکییەکانی گەشە کردنی کۆرپەلە لەدوای هەفتەی دووەمەوە دەردەخات بە تایبەتی گەشە کردنی پێکهێنەرەکانی کۆئەندامی دەمار.**




**وێنەی (٤-١٣):** تەواوبوونی گەشەکردنی پێکهاتەکانی کۆئەندامی دەمار و داخرانی بۆری دەمار لە ڕۆژی (٢٥)دا، لە خوارەوە جارێکی تر هەنگاوەکانی داخرانی بۆری دەمار لە هێلکاری-یەکدا نیشاندراوە.

هەروەها تەواوی چینی ناوەڕاست (میزۆدێرم) و زوربەی چینی ناوەوە (ئینـدۆدێرم) لـەم شـریتەوە دروسـت دەبێـت، کـە لـەم دووانـەوە زوربـەی ئەندامەکانی لەشی کۆرپەلەکە دەست دەکەن بە دروست بوون و گەشە کردن، ئەگـەر بێتـو ئـەم شـریتی سـەرەتایی‌یە دروسـت نـەبێت ئـەوا ئەندامـەکانی کۆرپەلـەش دروسـت نـابن و گەشـە ناکـەن، و هـەرگیز خەپلـەی سـەرەتایی کۆرپەلەکە ناچێتە قۆناغی دروست کردنی ئەندامەکانەوە[5].

(5) ئەگەر بە ووردی‌یەکی زیاتر لەم بابەتە بدوێین دەڵێین: ئەگەر ئێمە مەبەستمان لەوە بێت کە شریتی سەرەتایی فاکتەری سەرەکی‌یە لە دروست بوونی (خلق)ی کۆرپەلەکەدا {کە (خلق) بریتی‌یە لە هێنانە کایە لە نەبوونەوە وەك لە فەرهەنگەکاندا هـاتووە}، ئـەوا وەك بینیمـان تـەواوی چینی ناوەڕاست (میزۆدێرم) لەمەوە دروست دەبێت (لە نەبوونەوە) و زوربەی چینی ناوەوەش (ئیندۆدێرم) هەر لەمەوە دروست دەبێت، کەواتە بەهۆی پەیدابوونی ئەم شریتەوەیە کە ئەم دوو چینە لە نەبوونەوە پەیدا دەبن، بـەڵام ئـەم شریتە رۆڵی نەبینیوە لە دروست بـوونی چینی دەرەوەدا (ئیکتـۆدێرم) چـونکە ئـەم چینە پـێش دروست بوونی شریتی سەرەتایی هەیە و ناوی ئیپیبلاستە (Epiblast).

بەڵام لە لایەکی ترەوە بابزانین کە شریتی سـەرەتایی پشـتەپەت یـان ئۆتۆکۆرد دروسـت دەکـات، کـە رۆڵی جیاکەرەوەی سەرەتایی (Primary Inductor) دەبینێت بۆ هەموو خانـەکانی کۆرپەلەکـە بـە گشـتی، و بـۆ خانـەکانی چـینی دەرەوە (ئیکتـۆدێرم) بـە تایبـەتی، و هـانی دەدات بـۆ زیـادکردنی ئەسـتووری‌یەکەی و هـەروەها بـۆ دروسـت کردنـی دەمـارە پـەڕە (Neural plate) کـە بریتی‌یـە لـە سـەرەتای کۆئەنـدامی دەمـاری ناوەنـدی (CNS: Central Nervous System)ی کۆرپەلەکـە، هەروەها ئەم پشتەپەتە هانی ئەو ئەندامانەی تر دەدات کە لە ئیکتۆدێرمەوە پەیدا دەبن بۆ جیاواز بـوون، لەوانە: بـەرگی دەرەوەی پێسـت (Epidermis)، داپۆشـەری دانـەکان، هاوێنـەی چـاو، بەشـی دواوەی ژێرمێشکە رژێن، و گوێی ناوەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەمانە هـەموو ئەندامـەکانی لەشـی کۆرپەلەکـە نـین بەڵام بریتین لە زوربەیان، لە زمانی عەرەبیشدا زۆربەی شتێك وەکو هەمووی وایە (**وێنەکانی: ٤-١٢، ٤-١٣**).

کەواتە لێرەوە تێدەگەین کە شریتی سەرەتایی بەرپرسە لە دروست بوون و جیاوازبوونی خەموو خانـە و شانە و ئەندامەکانی لەشی کۆرپەلەکە، هەروەها لەلایەکی ترەوە کونی سەرەتایی (کـە بەشـێکی شـریتی سـەرەتایی‌یە) رۆڵـی رێکخـەر و رێنومایکـەری سـەرەتایی (Primary organizer) دەبینێـت و رێنمویی ئەو خانانە دەکات کە بەناوی‌دا دەڕۆن بـۆ ئـەوەی هەریەکـە و بگاتـە شـوێنی مەبەسـتی خـۆی و ئەندامە جیاوازەکانی کۆرپەلەکە دروست بکەن.

لە ناسراوترین ئەو زانایانەی باسی شریتی سەرەتایی‌یان کردووە هەردوو زانـای ئـەڵمانی (هـانس سـپیمان Hans Speman) و (هایڵـد مانگۆڵـد Hilde Mangold)ن، کە هەستان بە توێژینەوە لەسەر شریتی سەرەتایی و کـونی سـەرەتایی و دۆزی‌یانـەوە کـە ئـەم کونانـەن (کـونی سـەرەتایی) کـە کـرداری دروســت بـوونی کۆرپەلەکـە رێکدەخـەن، و ناویاننـان رێکخـەری سەرەتایی (Primary organizer)، ئەم دوو زانایە تاقی کردنەوەکانیان لەسەر گیانداره ووشکاوەکی‌یەکان (البرمائیات) ئەنجامدا و هەستان بە بڕینی ئەم بەشەی کۆرپەلەیەك و چاندنی لە کۆرپەلەیەکی تری ووشکاوەکی‌دا کە لە هەمان تەمەندا بوو لەژێر چینی ئیپیبلاستدا، ئەویش لە کاتێکی زۆر زووی گەشەکردنی‌دا (لە هەفتەی سێیەم و چوارەمدا)، ئەوەبوو ئەم پارچە چێنراوە بـووە هـۆی دروســت بـوونی کۆرپەلەیـەکی تـری لاوەکـی لـە کۆرپەلـە سـەرەکی‌یەکەدا، بینی‌یان ئـەم پارچـە چێنراوە کـاری کـردە سـەر خانـەکانی دەوروبەری کە خانەی وەرگرەکە بوون و رێکی خستن و لێرەوە کۆرپەلەیـەکی نوێی لێ‌دروست کردن کە لەناو لەشی وەرگرەکەدا چێنرابوو.

هەروەها لە باڵندەشدا هەمان تاقی کردنەوە ئەنجامدرا بە چاندنی گرێی سـەرەتایی (Henson's node) کـە لـە ناوچـەی دواوە دروسـت دەبێـت ، بینی‌یان دەبێتە هۆی دروست بوونی تـەوەرەی کۆرپەلەیـەکی تر لـە کۆرپەلـە وەرگرەکەدا، مرۆڤیش بەشێکە لـە خێزانـی گیانـداره شیردەرەکان و ئـەنجامی ئەم تاقی کردنەوانە بەسەر ئەمیشدا دەچەسپێت، کەواتە لێرەوە بە تـەواوەتی بۆمان روون دەبێتەوە کە شریتی سەرەتایی هۆکاری سەرەکی دروست بوونی دیسکی کۆرپەلەکەیە، وەك ئەوەی کە فەرمووده پیرۆزەکان ئاماژەیان پێ‌داوە.

ساڵی ١٩٣٥ز زانای ئەڵمانی سپیمان خەڵاتی (نۆبڵ)ی وەرگرت لەسەر ئەو دەستپێشـخەری‌یەی بـۆ دۆزینەوەیـەی شـریتی سـەرەتایی و چاندنی، بـەڵام

دەبینین پێغەمبەر (ﷺ) پێش ١٤٠٠ساڵ باسی کاری ئەم شریتەی کردووە، بەڵام بە زاراوەی جیاواز و ناوی (عجب الذنب)ی لێناوە کە فەرموویەتی (منه خلق) واتە مرۆڤ لەمەوە دروست بووە(6).

لەبەر ئەوەی کە هەرسێ چینەکەی (ئیکتۆدێرم و میزۆدێرم و ئیندۆدێرم)ن کە دەبنە هۆی دروست بوونی کۆرپەلەکە و هەموو پەردە و رۆپۆش و ناوپۆشەکانی، هەربۆیە دەتوانین بڵێین کە شریتی سەرەتایی (عجب الذنب) بریتی‌یە لە هۆکاری دروست بوونی کۆرپەلەکە، لەبەر ئەم گرنگی‌یەی شریتی سەرەتایی‌یە کە لیژنەی (وارنك Warnock) لە پەرلەمانی بەریتانی‌دا (کە تایبەتە بە پیتاندنی دەستکرد لە دەرەوەی منداڵدان و قۆناغەکانی گەشەکردنی کۆرپەلە) کردوویەتی بە نیشانە و قۆناغی جیاکەرەوە، بۆ

(6) لێرەدا سەبارەت بەو زاراوەیەی کە لە فەرموودەکاندا هاتووە (عجب الذنب) دەڵێین: لە رووی کۆرپەلەزانی‌یەوە گونجاوترین زاراوەیە بۆ وەسف کردنی ئەو بەشەی کە کۆرپەلەکەی لێوە دروست دەبێت، و زۆر گونجاوترە لە زاراوەکانی (شریتی سەرەتایی) و (رێکخەری سەرەتایی) کە زانایانی کۆرپەلەزانی بەکاری دێنن، چونکە زاراوەی (عجب الذنب) ئاماژە دەدات بە بوونی کلك لە کۆرپەلەدا (ذنب) کە زۆر راستە، و هەروەها ئاماژە دەدات بەو شوێنەی کە مرۆڤی لێوە دروست دەبێت (ئەویش بەهۆی ووشەی عجب: کە بە مانای کۆتایی کلك دێت).

هەروەها ئاماژە دەدات بۆ قەبارەی ئەو شتەی کە مرۆڤی لێوە دروست دەبێت (ئەویش لەرێی ووشەی عجب: کە مانایەکی تری بریتی‌یە لە بەشێکی بچووکی کۆتایی ئێسکی کلك یان بەشێکی کلێنچکە)، هەروەها ئاماژەشە بۆ ئەو قۆناغەی کەتێ‌دا روودەدات کە قۆناغێکی سەرەتایی‌یە (عجب الذنب: واتە سەرەتای کلك)، بەڵام دەبینین کە زاراوەی (شریتی سەرەتایی) ئاماژە دەدات بۆ ئەو شێوەیەی کە (عجب الذنب) لەسەری دەبێت کە لە شریت دەچێت، هەروەها ئاماژەیە بۆ ئەو قۆناغەی کە تیایدایە (کە ووشەی سەرەتایی مانای قۆناغە سەرەتایی‌یەکان دەگەیەنێت)، هەروەها زاراوەی (رێکخەری سەرەتایی)یش ئاماژەیە بۆ ئەو رۆڵەی کە شریتی سەرەتایی دەیبینێت کە بریتی‌یە لە رێکخستنی گەشەی خانەکانی کۆرپەلە و هەروەها بۆ قۆناغە سەرەتایی‌یەکەشی، کەواتە دوو زاراوەی کامڵ نین وەك (عجب الذنب)، ئەم لەپێشی‌یەی کە زاراوەکەی فەرموودەکان هەیەتی بەسەر زاراوە زانستی‌یەکاندا خۆی لەخۆی‌دا ئیعجازێکی دەربڕین و بەیان کردنە لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا (ﷺ).

ئەنجامدانی تاقیکاری لەسەر ئەو کۆرپەلانەی مرۆڤ کە زیاد دەبن لە کاتی ئەنجامدانی پیتاندنی دەستکرد لە دەفری تاقیکردنەوەدا، پێش پەیدا بوونی ئەم شریتە لیژنەکە رێگا بە تاقیکردنەوە دەدات لەسەر کۆرپەلەی مرۆڤ، بەڵام پاش پەیدابوونی ئەم شریتە (کە لیژنەکە بە سەرەتای پەیدابوونی راستەقینەی مرۆڤی داناوە) لیژنەکە هەموو جۆرە تاقیکاری‌یەکی لەسەر کۆرپەلەی مرۆڤ قەدەغە کردووە لە رۆژی چواردەیەمی دروست بوونی کۆرپەلەکەوە (کە لەم رۆژەوە شریتی سەرەتایی پەیدا دەبێت)، چونکە دوای پەیدابوونی ئەم شریتە سەرەتای کۆئەندامی دەمار و سەرەتای ئەندامەکانی لەش وورده وورده دەست بە پەیدا بوون دەکەن.

(د. کیث مور)یش لەم بارەوە دەڵێت: بەشی هەرە زۆری گەشە کردن و درێژبوونەوەی تۆپەڵە خانەکەی کۆرپەلە دەگەرێتەوە بۆ کۆچ کردنی خانەکان لە شریتی سەرەتایی‌یەوە، و لەبەر ئەوەی ئەم شریتە دەکەوێتە بەشی دواوەوەی (بەشی کلکی) تۆپەڵە خانەی کۆرپەلەکەوە[7]، کەواتە ئەم کلکەی کۆرپەلەکەیە کە بناغە و سەرەتای راستەقینەی دروست بوونی ئەندامەکانی کۆرپەلەی مرۆڤە.

سەرەنجامی گشتی ئەم باسە دەگەینە ئەوەی کە لە ئەنجامی پەیدابوونی ئەم شریتە و چالاکی‌یە زۆرەکانی‌یەوە، ئەم دروست کراو و پێکهاتووانەی خوارەوە پەیدا دەبن:

١- پشتەپەت یان نۆتۆکۆرد (سەرەتای پەتکی پشت یان سەرەتای برِبرەی پشت): کە ئەم بۆری‌یە لە گرێی سەرەتایی یان گرێی هانسن (Primitive or Henson's Node)ەوە درێژ دەبێتەوە بەرە و بەشی سەریی لە کۆرپەلەکەدا.

---

(7) بروانە کتێبی: گەشە کردنی مرۆڤ یان مرۆڤی گەشە کردوو (The Developing Human)/ دانراوی (د. کیث مور)/ لاپەرە ٧٥.

٢- دوای پێکهاتنی شریتی سەرەتایی، خەپلەی بازنەیی کۆرپەلەکە دەگۆڕێت بۆ شێوەی هەرمێیی کە دەتوانرێت هەردوو سەرەکەی لە یەك جیا بکرێتەوە، بەشە پانەکەی پێی دەووترێت بەشی سەری کورپەلەکە و بە بەشە باریکەکەی دەووترێت بەشی خوارووی کۆرپەلەکە (بەشی کلکیی کۆرپەلە).

٣- سەرەتای کۆئەندامی دەمار: لە چینی دەرەکی (ئیکتۆدێرم)ەوە دەردەکەوێت لە کۆتایی هەفتەی سێیەمدا (٢٠-٢١ڕۆژ)، ئەم چینە ووردە ووردە و بەدوای یەکدا ئەم پێکهاتانەی خوارەوەی کۆئەندامی دەمار دروست دەکات:

پەڕەی دەماریی (الصفيحة العصبية Neural Plate)، ئەم پەڕەیە لوول دەخوات بۆ دروست کردنی لوولپێچی یان توێی دەماریی (الإلتفاف العصبي Neural Folds)، ئەم لوولپێچەش لەملاولاوە یەکدەگرێت بۆ دروست کردنی بۆری دەماریی (الأنبوبة العصبية Neural Tube) کە دوو سەری دانەخراوی هەیە، لەڕۆژی ٢٥دا کونی سەرەوە دادەخرێت و لەڕۆژی ٢٧دا کونی خوارەوە دادەخرێت، لەم کۆئەندامە سەرەتاییەوە دڕکەپەتك (النخاع الشوكي) و مێشك (واتە کۆئەندامی دەماری مرۆڤ) دروست دەبێت، لەو کاتەی ئەم بۆری دەمارییە دادەخرێت پەڕەی بیستن (الصفيحة السمعية Otic Placode) و پەڕەی لێنس یان هاوێنەی بینین (الصفيحة العدسية Lens Placode) دروست دەبن (بڕوانە وێنەی ٤-١٤).

٤- چینی میزۆدێرم: کە لە شریتی سەرەتاییەوە دروست دەبێت، و چڕدەبێتەوە بەدەوری تەوەری کورپەلەکەدا، و بارستە لەشییەکان (الكتل البدنية Somites) دروست دەکات، ئەمانیش دوایی بڕبڕەی پشت و ماسولکەکان دروست دەکەن، هەروەها سەرەتای هەر چوار پەلەکە (دوو

دەست و دوو قاچ) لەم چینەوە چەکەرە دەکات و دەردەچێت، هەر ئەم چینی ناوەڕاستەشە کۆئەندامی ئێسك وماسولکەی لێوە دروست دەبێت.




وێنەی (٤-١٤): ئەم دیمەنانە گەشەکردنی کۆرپەلە لە شریتی سەرەتاییەوە روون دەکەنەوە، بە تایبەتی گەشەی کۆئەندامی دەمار لە پەڕەی بیستنەوە کە دەست دەکات بە داخران و دروست کردنی بۆری دەمار.

چینی ناوەڕاست (میزۆدێرم) دابەش دەبێت بۆ سێ بەش، بەپێی دووریی لە سەنتەری کۆرپەلەکەوە، واتە لەناوەوە بۆ دەرەوە، کە ئەمانەن:

**بەشی یەکەم:** ئەو بەشەیە کە لە سەنتەری کۆرپەلەکە و بۆری دەمارییەوە نزیکە، لەم بەشەوە تۆپەڵە لەشییەکان یان بارستە لەشییەکان (الكتل البدنية Somites) دروست دەبێت، ئەم بارستانە دیارترین بەشی کۆرپەلەن لە نێوان هەفتەی سێیەم و پێنجەمدا، لەم بارستانەوەیە کە کۆئەندامی ئێسك و ماسولکە و هەر چوار پەلەکان دروست دەبێت (وێنەی ٤-١٤).

**بەشی دووەم:** بەشی ناوەندی ئەم چینەیە یان بەشی میزۆدێرمی ناوەنجی (Intermediate Mesoderm)، بە فەرمانی خودا لەم بەشەوە ئەمانە دروست دەبێت: ناوپۆشی داپۆشەری ناوسك یان پریتۆن (Peritoneum)، رووپۆشی داپۆشەری سییەکان و دیواری سنگ یان پلوورا (Pleura)، پەردە و رووپۆشی داپۆشەری دڵ (Pericardium).

**بەشی سێیەم:** لەم بەشەوەیە کە بۆرییەکانی خوێن و دڵ، و ماسولکەکانی کۆئەندامی هەرس دروست دەبن.

کەواتە تەواو روون بووەوە کە دروست بوونی شریتی سەرەتایی بریتییە لە سەرەتایەکی جیابوونەوەی شانەکانی کۆرپەلە بۆ دروست کردنی چینە جیاجیاکان و ئەندامەکانی لەشی کۆرپەلەکە، لەڕاستیدا ئەوەی دەناسرێت بە قۆناغی دروست بوونی ئەندامەکان (Organization) تەنها دوای پەیدا بوونی شریتی سەرەتایی و بارستە لەشییەکان دەست پێدەکات، کە لە سەرەتای هەفتەی ٤ تا کۆتایی هەفتەی ٨ دەخایەنێت، بە شێوەیەك کە کۆرپەلەکە لە کۆتایی ئەم ماوەیەدا هەموو کۆئەندامە سەرەکییەکان و ئەندامەکانی تێدا دروست بووە، و تەنها وردەکارییەکانیان و گەورە بوون و گەشەکردنی ئەم ئەندامانە ماوە، کە لە قۆناغەکانی داهاتوودا روودەدەن.

**سەرەنجامی شریتی سەرەتایی:**

لێرەدا کاتی پرسیارێك هاتووە کە دەڵێت: ئایا ئەم بەشە کۆتاییەی کە مرۆڤی لێوە دروست دەبێت، ئایا بەڕاستی کلکە؟ و سەرەنجامەکەی بەچی دەگات و چی لێدێت؟

ئەگەر سەیری (**وێنەی رەنگاورەنگی: ١٠٠/ هـ**) بکەین کە گەشە کردنی کۆرپەلە روون دەکاتەوە، دەبینین بە جوانی وەڵامی ئەم پرسیارەمان دەدرێتەوە، کە بۆمان دەردەخات چۆن ئەم بەشەی دواوەی کۆرپەلەکە لوول

دەخوات بۆ ئەوەی کلکێك دروست بکات، ئەگەر سەیری وێنە ڕەنگاو ڕەنگەکانی (١٠١/ هـ ، ١٠٢/ هـ)یش بکەین وێنەی سروشتی ئەم کلکە دەبینین لە کۆرپەلەیەکی چوار هەفتەدا، و نەمانی ئەم کلکە لە هەفتەی حەوتەمدا.

وەك باسمان کرد شریتی سەرەتایی گرنگییەکی گەورەی هەیە، چونکە چالاکییە یەکجار زۆرەکانی دەبێتە هۆی دروست بوونی کۆئەندامی دەمار و چینی ناوەڕاست و چینی ناوەوە، کە ئەمانیش زۆربەی کۆئەندامەکانی لەشی کۆرپەلەکەیان لێوە دروست دەبێت، پاش دروست بوونی ئەو ئەندامانەی باسمان کرد لێیەوە و تەواو بوونی کاری ئەم شریتە، لە هەفتەی چوارەمدا، سەرەنجام ئەم شریتە دەست دەکات بە پووکانەوە، و تەنها لە کۆتایی بڕبڕەی پشتی کۆرپەلەکە و پاشان منداڵە لەدایك بووەکەدا دەمێنێتەوە، (د. کیث مور) دەڵێت: شریتی سەرەتایی دوای ئەم کردارانە زۆر بە زوویی دەچێتەوەیەك و لە قەبارەدا بچووك دەبێتەوە و دەبێت بە ئەندامێکی بێگرنگیی لە ناوچەی کۆتایی بڕبڕەی پشتدا (لە ئێسکی کلێنچکەدا)[8]، کەواتە لەبەرئەوەی شریتی سەرەتایی بریتییە لە هۆکاری گەشە کردنی کۆرپەلە، و لە مرۆڤی گەورەدا شوێنەوارەکەی تەنها بریتییە لە ئێسکی کلێنچکە، سەرەنجامی گشتی دەتوانین بڵێین کە بەشێکی ئەم ئێسکی کلێنچکەیەیە کە بنچینەی دروست بوونی مرۆڤە، بە تەواوەتی وەك فەرموودەکان ئاماژەیان پێداوە!.

هەروەها لەگەڵ پووکانەوەی ئەم شریتە سەرەتاییە لە ئێسکی کلکدا (کلێنچکە)، ئەم کلکە خۆیشی دەست دەکات بە پووکانەوە و بە تەواوەتی نامێنێت لە هەفتەی حەوتەم یان هەشتەمدا، دەربارەی ئەم کرداری

---

(8) بڕوانە کتێبی: گەشە کردنی مرۆڤ یان مرۆڤی گەشە کردوو (The Developing Human)/ دانراوی (د. کیث مور)/ لاپەڕە ٧٥.

پووکانەوەیـە (د. لارس هامبیرگـەر) لـە کتێبـی (منـداڵێك لـەدایك دەبێـت)دا دەڵێـت: (ئێمـە تـەنها چـەند بڕگەیـەکی چـووەیەك و بچـووکی کلکمـان بـۆ دەمێنێتەوە دوای لەدایك بوونمان، کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لە کاتی دروست بوونماندا کلکمان هەبووە)، هـەروەها ناوچـەی ئێسکی کلێنچکە ناوچەیەکی ئێسکی‌یە، و لەبەرئەوەی کە شریتی سەرەتایی دەبێت بە بەشێك لەم ناوچەیە ئـەوا دەتـوانین بڵـێین: لـە گـەورەدا شـریتی سـەرەتایی یـان (عجـب الـذنب) بریتی‌یە لە ئێسکێك! ئەمەش بە تەواوەتی ئەو ڕاستی‌یەیە کە فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) ئاماژەی پێداوە کە دەفەرموێت: ﴿... لَيس من الإنسان شَيء إلا يبلى إلا عَظْماً واحداً، وَهو عجب الذنب ...﴾ (**بڕوانە وێنەی ڕونگاوڕەنگی: ١٠٣/ هـ**).

وەك ووتمـان شـریتی سـەرەتایی لـە ئێسـکی کلێنچـکەدا شـوێنەوارێك دروست دەکات کە زانایان دەڵێن ئەوەندە بچووکە کە حیسابی بۆ ناکرێت و بەچاو نابینرێت، کە دەقاودەق ئەمەیە پێغەمبەر (ﷺ) ئاماژەی بۆ ئـەوە داوە کە هەموو لەشی مرۆڤ پاش مردن شی‌دەبێتەوە و دەڕزێت و نامێنێت، تـەنها بەشـێکی کـەمی ئـەم کلێنچـکەیە نـەبێت کـە بەچاو نابینرێـت (واتـە: عجـب الـذنب)، فەرموویـەتی: ئـادەمیزاد لەمـەوە دروسـت بـووە، و هـەر کاتێـك پەروەردگار وویستی لێبێت لە ڕۆژی دوایـی‌دا بارانێك دەبارێنێت، کە لەشـی مرۆڤەکان لـەو بەشـە کەمـەوە کـە نافـەوتێت لـە ناوچـەی ئێسکی کلێنچکەدا دەڕوێنێتەوە وەك ڕووەك.

ئەمـەی لەسـەرەوە باسـکرا ئیعجـازی یەکـەمی فەرموودەکەیە کە ئاماژە بـە دروست بوونی مرۆڤ دەدات لەم (عجب الذنب)ەوە، لێرەوە دەگەینـە ئیعجازی دووەمـی فەرموودەکـە کـە ئـەویش مانـەوەی بەشـێکی ئـەم کلێنچـکەیەیە، و بەرگە گرتنی ئەم بەشەیە بۆ گۆڕانکاری‌یەکانی ڕۆژگار، و نەفەوتان و نەڕزانی ئـەم بەشـە بـە تایبـەتی پـاش مردنـی مرۆڤەکـە و شـیبوونەوە و خـواردنی لاشەکەی لەلایەن زەوی‌یەوە.

## لەشی مرۆڤ هەمووی دەرزێت و دەفەوتێت تەنیا بەشێکی کلێنچکە (عجب الذنب) نەبێت:

هەمان ئەو فەرموودانەی پێشترن کە باسی نەفەوتانی ئەم بەشەی لەشی مرۆڤ دەکەن، بە تایبەتی فەرموودەکانی:

-﴿إن في الإنسان عظماً لا تأكله الأرض أبداً فيه يركب يوم القيامة، قالوا: أي عظم هو يا رسول الله؟ قال: عَجْبُ الذَّنب﴾ رواه مسلم، واتە: هەموو بەشێکی مرۆڤ زەوی دەیخوات و دەیرزێنێت تەنها بەشێکی ئێسکێك نەبێت کە هەرگیز زەوی ناتوانێت بیفەوتێنێت، لەم ئێسکەوە دروست بووە و هەر لەمیشەوە زیندوو دەبێتەوە، هاوەڵەکان پرسی‌یان: ئەو ئێسکە کامەیە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟ ئەویش فەرمووی: بەشێکی کلێنچکەیە.

-﴿يَأْكُلُ التُّرابُ كُلَّ شَيءٍ مِن الإنسان إلاّ عَجْبَ ذَنَبِه، قيل: وما هو يا رسول الله؟ قال: مِثْل حَبَّة خَردل مِنه ينشأ﴾ رواه ابن حِبّان، واتە: زەوی هەموو شتێکی مرۆڤ دەخوات تەنها بەشێکی کلێنچکە نەبێت، پرسیان: ئەو بەشە چی‌یە ئەی پێغەمبەری خودا، ئەویش فەرمووی: بەقەدەر دەنکە خەرتەلەیەك دەبێت کە مرۆڤی لێوەی دروست بووە و دروست دەبێتەوە.

وەك باسمان کرد لە رووی زانستی‌یەوە سەلماوە کە مرۆڤ لە شریتی سەرەتایی‌یەوە دروست دەبێت، و ئەم شریتە دوایی دەپووکێتەوە تەنها بەشێکی کەمی نەبێت لە کۆتایی بڕبڕەی پشتدا (ئێسکی کلێنچکە-عظم العصعصي)دا دەمێنێتەوە، کاتێك مرۆڤ دەمرێت هەموو لەشی دەڕزێت و دەفەوتێت تەنها ئەم بەشە بچووکەی نەبێت، کە بەرگەی هەموو بارودۆخێکی ناهەموار دەگرێت و دەمێنێتەوە، و دەبێتە تۆو و چەکەرەی زیندوو بوونەوەی مرۆڤ لە رۆژی دوایی‌دا.

دیارە ئەم جۆرە کارە هیچ قورس نی‌یە بۆ دەسەڵاتی ئەو پەروەردگارەی کە ئاگاداری هەموو نهێنی‌یەکانە، و ئاگاداری ئەوانەشە لە لەشی هەموو

مرۆڤێک کەم دەبێتەوە و ئەوەشی کە دەمێنێتەوە و هیچ شتێک لای ئەو نافەوتێت، پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿قَدْ عَلِمْنَا مَا تَنقُصُ الْأَرْضُ مِنْهُمْ وَعِندَنَا كِتَابٌ حَفِيظٌ﴾ (ق:٤)، واتە: بەڕاستی ئێمە زانیومانە کاتێک کە مردن، زەوی چۆن بەرەبەرە لاشەیان دادەڕزێنێت و دەیکاتەوە بە خاک، ئێمە تۆماری تایبەتیمان هەیە کە هەموو شتێکی تێدا تۆمار کراوە، و هیچ شتێک لەبارەی ئەوانەوە لە ئێمە شاراوە نییە، لە تەفسیری (إبن كثير)دا هاتووە: (واتە: ئێمە دەزانین ئەو بەشانەی لاشەیان کە دەفەوتێن و دەڕزێن لەلایەن زەوییەوە کامانەن، و لێمان شارراوە نییە کە بەشەکانی لاشەکان بۆ کوێ پەرش و بڵاو دەبنەوە)، کەواتە عیلم و زانیاریی خودایی هەمەلایەنە.




وێنەی (٤-١٥): ئێسکی کلێنچکە دەردەخات لە مرۆڤێکی پێگەیشتوودا (کە لە بەشێکی ئەمەوەیە مرۆڤ زیندوو دەبێتەوە).

بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستییە ئەو تاقی کردنەوانە دەکەین بە بەڵگە کە هەندێک لە زانایانی وڵاتی (چین) پێی هەستان لەم ساڵانەی دواییدا، کە بۆیان سەلما هەرگیز ناتوانرێت ئەم ئێسکە (کلێنچکە یان عجب الذنب) بە تەواوەتی بفەوتێنرێت، لە ڕووی کیمیاییەوە هەوڵیاندا بیفەوتێنن بە تواندنەوەی لە بەهێزترین ماددەی ترشدا (الأحماض Acids) بەڵام بینییان کە هەر خانەی زیندووی تێدا دەمێنێت و بە تەواوەتی ناتوێتەوە، هەروەها وویستیان لە ڕووی فیزیاییەوە خانەکان و پێکهاتووەکانی بفەوتێنن ئەویش بە سووتاندنی لە بەهێزترین فڕندا، و پاشان هاڕین و پان کردنەوەی

بە بەهێزترین ئامێر لەو بوارەدا، لەکۆتاییدا خستنە بەری ئەم ئێسکە بۆ بەردەم ماددەیەکی ناووکی تیشکدەر و چەندین جۆر تیشکی ناووکی زیان بەخش کە هەموو ماددەیەکی زیندوو دەفەوتێنێت و دەمرێنێت، بەلام سەرەنجام دوای هەموو ئەم کردارانە و هەولانە نەیانتوانی بە تەواوەتی هەموو ئەم ئێسکە بفەوتێنن و بینییان کە هێشتا هەر خانەی تێدا دەمێنێت و مەحالە بتوانرێت ئەم ئێسکە بە تەواوەتی بفەوتێنرێت[9].

زانای ئەلمانی (هانس سپیمان)یش لە سالی (۱۹۳۱ز)دا، هەستا بە هاڕین و پان کردنەوە و پەستاندنی رێکخەری سەرەتایی کۆرپەلەیەك (Primary Organizer)، و پاشان هەستا بە چاندنی لە کۆرپەلەیەکی تردا، شتێکی زۆر سەیری بینی کە ئەم هاڕینە کاری نەکردبووە سەر رێکخەرەکە و پاش چاندنی هەستا بە دروست کردنی شریتێکی سەرەتایی نوێ، و پاشان شریتەکەش هەستا بە دروست کردنی دەمارە پەڕەیەك، لەمەوە بۆی دەرکەوت خانەکانی ئەم پێکهاتەیە بەهۆی هاڕینەوە کاریان نەکرابووە سەر، و بەکاری خۆیان هەستان.




وێنەی (٤-١٦): وێنەی ئەو دوو زانایەی دەربارەی شریتی سەرەتایی توێژینەوەیان ئەنجامداوە.

(9) بەڕێز (م. شەمال موفتی) بابەتێکی لەم بارەیەوە پێش کەش کرد لە رۆژی ٢٠٠٢/٤/٢٥ کە لەلایەن (ناوەندی کوردستان بۆ ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا) بۆ بەڕێزیان ساز کرابوو، هەروەها بڕوانە کتێبی (کۆباسەکانی میحراب)، ١-٦/ م. شەمال موفتی.

هەروەها ئەم زانایە و چەند زانایەکی تر لە ساڵی (١٩٣٣ز)دا هەستان بە کوڵاندنی ئەم ڕێکخەرە سەرەتایی‌یە و پاشان چاندنی پاش کوڵاندنەکە، بینی‌یان کە کرداری هاندانی گەشەکردن (Induction) لەلای ئەم ڕێکخەرە هەر کار دەکات و بەهۆی کوڵاندنەوە کاری نەکراوەتە سەر.

لە ڕەمەزانی (١٤٢٤ك)دا پزیشکی موسوڵمان (د. عثمان جیلان علي معجمي) لە زانکۆی (ئیمان) لە (یەمەن) بە سەرپەرشتی سەرۆکی زانکۆکە (شێخ عبدالمجید الزنداني) هەستا بە تاقیکردنەوەیەك لەسەر ئێسکی کلێنچکە کە بە کامیرای ڤیدیۆیی تۆماریان کرد، پێنج ئێسکی کلێنچکەی مەڕیان هێنا و هەستان بە سوتاندنیان لەسەر بەرد بەهۆی ئاگری دەمانچەیەکی غازەوە، و دڵنیابوو لەوەی کە بە تەواوەتی سووتاون، ئەوەبوو یەکەم جار سووربوونەوە و دوایی ڕەش بوون و بوون بە خەڵوز، پاشان ئەم پارچە سوتاوانەی نارد بۆ ناسراوترین تاقیگە لە شاری (صنعاء) کە تاقیگەی (د. صالح العولقي- کە پرۆفیسۆری زانستی شانەزانی و نەخۆشیزانی‌یە لە زانکۆی صنعاء) بوو، ئەم دکتۆرە هەستا بە پشکنینی شانەیی بۆ ئەم پارچانە، و سەرەنجامێکی دڵفرێنی هەبوو کاتێك کە بینی خانەکانی ئێسکی کلێنچکەکان کاریان تێنەکرابوو، و هەر زیندوو بوون وەك ئەوەی کە نەسووتێنرابن (کە خانەکانی تری وەك: ماسولکە خانەکان و شانە چەوری‌یەکان و مۆخی ناو ئێسقانەکە هەموویان فەوتابوون و بووبوون بە خەڵوز!! بەڵام خانەکانی ئێسکی کلێنچکەکان کاریان تێنەکرابوو)[10].

خوای گەورە پاداشتی خێری ئەم پزیشکە موسوڵمانە بداتەوە کە لە ڕێی تاقیکردنەوەیەکی تۆکمەوە هەستا بە دەرخستنی لایەنێکی ئیعجازی زانستی

---

(10) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە ئەو توێژینەوەیەی کە (د. عثمان جیلان علي معجمي) پێشکەشی کرد لە کۆنگرەی جیهانی حەوتەم بۆ ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا کە لە شاری (دوبەی) سازدرا/ لە ٢٢-٢٤ی ئازاری ٢٠٠٤ز.

فەرموودەکان، و ئێمەی موسوڵمان پێویستیمان زۆر زۆرە بەم جۆرە تاقی کردنەوانە بۆ سەلماندنی زیاتری راستیی ئایەت و فەرموودە پیرۆزەکان.

لێرەدا ئەگەر بچینەوە سەر فەرموودەکانی قورئان و سوننەت و چۆنێتی زیندوو بوونەوە لەرۆژی دوایی‌دا بە ئاشکرا ئەم بابەتەمان بۆ روون دەکەنەوە. ئەم بەشەی کلێنچکە (عجب الذنب)ە کە نافەوتێت و تۆوی زیندوو بوونەوەیە. لەوانەیە لە ناخی زەوی‌دا بێت یان لەژێر بینایەکی ١٠٠ نهۆمی‌دا بێت یان نەهەنگێك ئەم مرۆڤەی خوارد بێت، و لە ناخی دەریادا ئەم بەشە گیرسا بێتەوە. یان هەر شوێنێکی تر!!

خوای گەورە بۆمان باس دەکات کە بوومەلەرزەیەکی زۆر مەزن روو دەدات لە رۆژی دوایی‌دا و دەبێتە هۆی هێنانە دەرەوەی ئەم بەشانەی مرۆڤەکان لەناو زەوی‌یەوە بۆ سەرەوە ﴿إِذَا زُلْزِلَتِ الْأَرْضُ زِلْزَالَهَا، وَأَخْرَجَتِ الْأَرْضُ أَثْقَالَهَا﴾ (الزلزلة:١-٢)، واتە: کاتێك دێت کە زەوی بوومەلەرزە ترسناکەکەی بەسەردا دێت، ئەم بوومەلەرزەیە دەبێتە هۆی هێنانە دەرەوەی قورسایی‌یەکانی ناخی زەوی (موفەسیرەکان یەکێك لە ماناکانی ئەو قورسایی‌یانەی دێنە دەرەوە بە هاتنە دەرەوەی (عجب الذنب)ی مرۆڤەکانیان لێك داوەتەوە).

کاتێك ئەم تۆوانەی مرۆڤەکان دێنە سەر رووی زەوی، دوایی خوای گەورە بارانێك دەبارێنێت، کە لە کتێبی (شرح العقیدة الطحاویة)دا هاتووە: وەك مەنی پیاو وایە، و دەبێتە هۆی رواندنی ئەم بەشانە و دەرهاتنیان لە زەوی‌یەوە وەك چۆن تۆوی درەخت لە زەوی‌یەوە سەر دەردێنێت و دەروێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَ يُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ وَيُحْيِي الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَكَذَلِكَ تُخْرَجُونَ﴾ (الروم:١٩)، واتە: پەروەردگارتان ئەو خودایەیە کە زیندوو لە مردووەوە دەردێنێت، و مردوو لە زیندووەوە دەردێنێت، و زەوی پاش مردنی زیندوو دەکاتەوە و رووەکی لێ‌دەردێنێت، ئێوەش بە هەمان شێوە زیندوو دەکرێنەوە، و لە زەوی‌یەوە (وەك رووەك) دەردەهێنرێن (لە رۆژی دوایی‌دا).

لاشەی مرۆڤەکان دەڕوێتەوە لە (عجب الذنب)ەوە هەروەك چۆن یەکەم جاریش لە سکی دایکیدا لەمەوە دروست بووە، بۆ دووەم جاریش هەر لەم بەشەوە لە زەوی‌یەوە دەردەهێنرێت، هەر کاتێك لاشەکان روانەوە، گیان(رۆح)ەکانیش بەرەڵا دەکرێن و دێنەوە بۆ ناو لاشەکانیان، ئەمەیە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا النُّفُوسُ زُوِّجَتْ﴾ (التکویر:٧)، واتە: رۆژێك دێت کە لاشەکان جووت دەخرێنەوە لەگەڵ رۆحەکانیاندا، ﴿فَإِذَا هُم قِيَامٌ يَنظُـرُونَ﴾ (الزمـر:٦٨)، واتـە: پاشـان مرۆڤـەکان زینـدوو دەکرێنـەوە و هەڵدەسـتنەوە و بەچاوی خۆیان دەیبینن، لێرەدا و لەو رۆژە سەختەدا مرۆڤی بێباوەڕ هیچی بۆ نامێنێتەوە و دان بەو راستی‌یەدا دەنێت و دەڵێت: ﴿قَالُوا يَا وَيْلَنَا مَن بَعَثَنَـا مِن مَّرْقَدِنَا هَذَا مَا وَعَدَ الرَّحْمَنُ وَصَدَقَ الْمُرْسَـلُونَ﴾ (یس:٥٢)، واتە: تیاچوون بۆ ئێمە ئەوە کێیە ئێمەی ئاوا لە گۆڕەکانمان دەرهێنا و زیندووی کردینەوە، بەڕاستی ئەمە ئەوەیە کە پەروەردگار بەڵێنی پێدابین و پەیامبەرەکان راستیان ووت. ئەمە پەشیمان بوونەوەیەکە لە کاتێکدا کە پەشیمان بوونەوە هیچ جۆرە سوودێکی نی‌یە.

لەگەڵ ئەوەدا کە ئێمە ئەم باوەڕە پتەوەمان هەیە بە دەسەڵاتی پەروەردگار لە زیندوو بوونەوەدا، بەڵام زەرەری نی‌یە هەوڵبدەین ئەوە روون بکەینەوە کە زیندوو بوونەوە دەکرێت رووبدات لە رووی زانستی تیۆری‌یەوە، چونکە خوای گەورە هەر لەم دونیایەدا نموونەمان لەسەر ئەم راستی‌یانە پیشان دەدات ﴿كَذَلِكَ يَضْرِبُ اللّهُ الأَمْثَـالَ﴾ (الرعد:١٧)، واتە: ئا بەو شێوەیە خودا نموونە جۆراوجۆرەکان دێنێتەوە، کەواتە دەتوانین ئەوە نزیك بکەینەوە بۆ مێشکەکان کە زیندوو بوونەوە لە رووی زانستی‌یەوە دەکرێت، بەڵام با بیریشمان نەچێت کە ئەم نموونانە تەنها بۆ روون بوونەوەیە، و پێوەرەکانی رۆژی دوایی زۆر جیاوازە لە پێوەرە دونیایی‌یەکان.

- یەکەم: زانستی کۆرپەلەزانی نوێی ئەمڕۆ بۆی سەلماندووین کە لە شریتی سەرەتاییەوە (واتە لە (عجب الذنب)ەوە) خانە بنەڕەتییە دایکانەکان (الخلایا الجذعیة الأم Stem Cells) دروست دەبن، ئەم خانانە بریتین لە خانەی فرە چالاکیی (متعددة الفعالیة Pluripotent)، واتە دەتوانن هەموو جۆرە خانەیەکی ناو لەشی مرۆڤ دروست بکەن (بێجگە لە وویلاش)، هەر لەم خانانەوە خانەکانی هەر سێ چینە سەرەکییەکەی کۆرپەلەکە دروست دەبن (ئێکتۆدێرم، میزۆدێرم، لەگەڵ ئیندۆدێرم) کە مرۆڤی لێوە دروست دەبێت، کاتێکیش کە شریتی سەرەتایی دەپووکێتەوە لە ناوچەی کلێنچکەدا هەندێك لەم خانە بنەڕەتییانەی تێدا دەمێنێت.



وێنەی (٤-١٧/ A): وێنەی منالێکە کە وەرەمێکی (Teratoma)ی ناوچەی کلێنچکەی تێدا پەیدا بووە، و بووەتە هۆی پەیدابوونی پێیەك بە پەنجەکانی و نینۆکەکانییەوە، ئەویش بەهۆی گەشە کردنی خانە بنەڕەتییە دایکانەکان.



وێنەی (٤-١٧/ B): وێنەی منالێکە کە وەرەمێکی (Teratoma)ی ناوچەی کلێنچکەی تێدا پەیدا بووە، و بووەتە هۆی پەیدابوونی دەستێك لە نەنجامی گەشە کردنی خانە بنەڕەتییە دایکانەکان.

بەڵگەشمان لەسەر ئەم راستییە ئەوەیە کە لە هەندێك حاڵەتدا و بۆ هەندێك لە کۆرپەلەکان وەرەمێك (شانەی زیادە) دروست دەبێت لەم ناوچەی کلێنچکەیەدا، کە پێی دەووترێت وەرەمی فرەشانە (الورم المتعدد الأنسجة Teratoma) (وێنەی ٤-١٧)، کە پێکدێت لە شانەی جۆراوجۆر (ماسولکە،

پێست، کرکراگە، ئێسك، و هەندێك جار ددان)، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم وەرەمە لە ناوچەی کلێنچکەدا دروست دەبێت کە ناوچەیەکی ئێسکی‌یە لە کۆرپەلەکەدا دەبینین ئەم شانە جۆراوجۆرانەی تێدایە! کە ئەمە بە پێچەوانەی هەموو وەرەمێکی ترەوەیە کە لە شانەکانی تری لەشدا دروست دەبن، چونکە ئەمان هەمان خاسی‌یەتی ئەو شانانەیان هەیە کە لێیانەوە دروست دەبن! بۆ نموونە: وەرەمی ماسولکە لە شانەی ماسولکە پێکهاتووە، وەرەمی ئێسك لە ئێسك پێکدێت، و وەرەمی رژێنە لیمفی‌یەکان لە لیمف پێکهاتووە، بەڵام ئەوەی سەرسوڕهێنەرە کە وەرەمی کلێنچکە لەم هەموو شانە جۆراوجۆرانە پێکدێت، کە ئەمە دەیسەلمێنێت خانەی بنەڕتی تێدا دەمێنێت، و لەمانەوەیە کە ئەم وەرەمانە دروست دەبن.

بینراوە وەرەمی فرەشانەی کلێنچکە نەك تەنها لەم شانانە پێکهاتووە بەڵکو شانەی تێدایە لە هەر سێ چینەکانی لەشی کۆرپەلە (ئێکتۆدێرم، میزۆدێرم، لەگەڵ ئیندۆدێرم)[11]، کەواتە ئەم وەرەمە لە کۆرپەلەیەك دەچێت بەوەی کە خانەی هەر سێ چینی (ئێکتۆدێرم، میزۆدێرم، لەگەڵ ئیندۆدێرم)ی تێدایە، لە هەندێك حاڵەتی تردا بینراوە کە ئەندامێکی تەواو لەم وەرەمانەوە دروست دەبێت، وەك دەستێك بە نینۆکەکانی‌یەوە، یان قاچێك بە پێ و پەنجە و نینۆکەکانی‌یەوە (وێنەی ٤-١٧)، دەتوانین بڵێین ئەم وەرەمانە بریتین لە کۆرپەلەیەکی لاوەکی شێوێنراو کە لە ناوچەی کلێنچکەوە دروست دەبن، ئەویش لەبەر ئەوەیە کە شریتی سەرەتایی هەندێك جار بە تەواوەتی ناپووکێتەوە لە ناوچەی کلێنچکەدا و دەبێتە هۆی دروست کردنی سێ چینەکەی کۆرپەلەکە، و ئەمانیش دەبنە هۆی پەیدابوونی هەندێك ئەندامی شێوێنراو وەك قاچ یان دەست، و شانەکانی تریش لەناو وەرەمەکەدا

(11) بروانە کتێبی (Short Practice of Surgery)/ چاپی ٢١ – ١٩٩١/ لاپەڕە (٨٦٩)/ ئەم کتێبە بریتی‌یە لە پرۆگرامی خوێندنی نەشتەرگەری پزیشکی لە زانکۆکانی عێراق و کوردستاندا.

دروست دەبن و دەمێننەوە بەشێوەیەکی جیاواز، بە جۆرێك ئەگەر پزیشکی نەشتەرگەر ئەم وەرەمە بکاتەوە پاش لابردنی و پشکنینی بۆ بکات دەبینێت کە شانەکانی تری تێدایە، وەك: ددان، ریخۆڵە، پێست، قژ و رژێنەکان و چەندین شانەی تریش.

لە کتێبی پرۆگرامی پزیشکی: کورتەیەك لە پراکتیك کردنی نەشتەرگەریدا (Short Practice of Surgery)دا هاتووە: ئەم وەرەمە سەرەتاییانە (Teratomas)، خانەیان تێدایە لە هەر سێ چینەکەی کۆرپەلە: (ئێکتۆدێرم، میزۆدێرم، لەگەڵ ئیندۆدێرم)، ئەم وەرەمانە قژ، ددان، ماسولکە، رژێنە خانە، و چەندین جۆر خانەی تریان تێدایە، یەکێك لە جۆرەکانی وەرەمە نائاساییەکان بریتییە لە وەرەمی ناوچەی کلێنچکە (Sacrococcygeal Teratomas)، کە دەتوانین بڵێین بریتییە لە کۆرپەلەیەکی تر لەناو کۆرپەلە سەرەکییەکەدا (Fetus in Fetu)[(12)].

کەواتە لەبەر ئەوەی کە کلێنچکە نافەوتێت بە تەواوەتی و ئەم خانە بنەڕەتییانەشی تێدا دەمێنێت، دەتوانین بڵێین کە پارێزەرەی ئەو ماددەیەیە کە توانای دروست کردنەوەی مرۆڤەکەی هەیە (بە ویستی پەروەردگار).

- دووەم: زانستی بۆماوەزانی دەریخستووە کە خانە لەشییەکان (Somatic Cells) ئەو پلانە جینییەی تێدایە کە مرۆڤی لێوە دروست دەبێت (وەك پێشتر باسمان کرد) لەشی مرۆڤ بە گشتی لە رووی بۆماوەییەوە لە دوو جۆر خانە پێکدێت:

(خانە لەشییەکان و خانە سێکسییەکان)، و ئەگەر بزانین کە کلێنچکە (عجب الذنب) ئەم خانە لەشییانە دەپارێزێت لە فەوتان ئەوا بۆمان روون

(12) بڕوانە کتێبی (Short Practice of Surgery)/ چاپی ٢١ – ١٩٩١/ لاپەڕە (١٣٩).

دەبێتــەوە کــە وەك ســندوقی رەشــی نــاو فڕۆکــە[13] وایــە کــە دەبێتــە هــۆی پاراستنی پلانی جینی مرۆڤ، بۆشمان دەرکەوت کە کلێنچکە بەرگەی فەوتان و تیاچوون دەگرێت، ئەوا بە تەواوەتی ئەم راستی‌یەمان بۆ روون دەبێتـەوە: کـە ناوچـەی کلێنچـکە بریتی‌یـە لـە شـوێنی مانـەوەی هەنـدێك لـە شـریتی سەرەتایی، کە بریتین لە کۆمەڵێك خانە کە توانایەکی گشتی تـەواویان هەیـە، و دەتـوانن ئـەم توانایانـەیان لـە هـەموو خانەیـەکی لـەش زیـاتر بپـارێزن، و بەمـەش سـەرەتای مـرۆڤ، و هـەروەها هۆکـاری دروسـت بوونـەوەی رەگـەزی مرۆڤیش دەپارێزن.

- سێیەم: زانستی بۆماوەزانی لـە تاقیکردنـەوەکانی کۆپی کردنـی مرۆڤدا سەلماندی کە ئەو هێلکەیـەی ناوکەکـەی دەردەهێنرێـت، و لـەبری ئـەم نـاوکی خانەیـەکی لەشـی تێدەکرێـت، دەتوانێـت دابـەش ببێـت و زیـاد ببێـت بـەهۆی لێـدانی تەزوویـەکی کارەبـاوە، واتــە هانـدەدرێت بـۆ دابـەش بـوون لـەژێر کاریگەریی هۆکاری دەرەکی‌دا.

لەمانەی سەرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە لە رووی زانست و مەنتیقەوە زۆر گونجاوە و دەکرێت مـرۆڤ لـە کلێنچـکەوە دروسـت بکرێتـەوە، ئـەویش بـەهۆی ئەو هۆکارانەی سەرەوە، کە بە کورتی بریتین لە:

١- ئەو خانانەی لە کلێنچکە (عجب الذنب)دایە پارێزراوە تا رۆژی دوایی، و توانایان هەیە کە هەموو خانەکانی لەشی مرۆڤ دروست بکەن، واتە دەتوانن جەستەیەکی کامڵی مرۆڤ دروست بکەن لەو کاتەدا.

---

(13) سندوقی رەش: دامێنراوێکـە کـە لـەناو هـەموو فڕکەیەکـدا هەیـە و لـە شـوێنێکی پـارێزراودا لـەناو فڕۆکەکەدا دادەنرێت، ئەم سندوقە چەند ئامێرێکی تۆمار کردنی تێدایە کە هەموو زانیاری‌یەکان دەربارەی فڕۆکەکە تۆمار دەکات لەگەڵ ئەو گفتوگۆیانەی لـە ژووری لێخوڕینـدا روو دەدەن، ئـەم سـندووقە لـە کـاتی کەوتنە خوارەوەی فڕۆکەکەدا گرنگی‌یەکی گەورەی هەیە لەبەر ئەو زانیاری‌یانەی کە تێی‌دا تۆمار دەکرێت.

٢- پلانـی جینی‌یـە کـە خانـەکان رێنیشـان دەدات بـۆ دروسـت بـوون و گەشەکردن بە مەبەستی دروست کردنـی ئادەمیزاد، و هـەر ئەمانیشـن کـە بـۆ هـەموو مرۆڤێـك سـیفاتە تایبـەتی و جیاکـەرەوەکانی دەبەخشـن، ئـەم مـاددە بۆماوەیی‌یـە پـارێزراوە لـە خانـەکانی کلێنچکەدا و لـە رۆژی دوایـی‌دا ئامـادە دەکرێت بۆ دروست بوونەوە.

٣- ئەم خانانە وەڵامیان دەبێت بۆ کارتێکەرە دەرەکی‌یـەکان، کـە ئەگـەر لـە رۆژی دوایی‌دا هەورە بروسکەیەك روویدات (بۆ نموونە) یان هـەر هانـدەرێکی تر کە تەزوویەکی کارەبایی دیاری کراوی تێدابێت (یـان هـەر شـتێکی تـر کـە هـانی خانـەکان بـدات بـۆ دابـەش بـوون) ئـەوا ئـەم خانانـە وەڵامیـان دەبێـت و دەست دەکەن بە دابەش بوون.

بەشێکی ئەم کلێنچکەیە وەك تـۆوێکی مرۆڤـی لێدێـت دوای شـیبوونەوەی جەستەکەی، تەنانـەت ئەگـەر لـە بنکـی دەریـا یـان لـەژێر چینێکـی ئەسـتووری زەوی‌دا بێت یان لە هەر بارودۆخ و شوێنێکی تردا ئەوا خـوای گـەورە دەریـان دێنێـت بـۆ چـینی سـەرەوەی رووی زەوی (وەك پێشـتر باسمـان کـرد) بـەهۆی بوومەلەرزەیـەکی سـامناك کـە خـوای گـەورە لـەو رۆژەدا بـەرپای دەکـات: ﴿إِذَا زُلْزِلَتِ الْأَرْضُ زِلْزَالَهَا، وَأَخْرَجَتِ الْأَرْضُ أَثْقَالَهَا﴾ (الزلزلة:١-٢).

خانـەکانی کلێنچکە کـە نەخشـەی ئەنـدازیاریی تایبـەتی هـەموو مرۆڤێکـی تێدایە. ئەو توانایەیان هەیە (بە وویستی پەروەردگار) کە هـەموو خانـەکانی لەشی مرۆڤ دروست بکەن، ئەم بەشە بەرگەی هەموو کارتێکەرە دەرەکی‌یەکان دەگرێت هەر وەکو تۆوی رووەك لـە خاکدا کـە نەخشـەی جینـی رووەکەکـە لـە فـەوتان دەپارێزێـت، و لـە دوایـی‌دا دەبێتـە هـۆی دروسـت کردنـی رووەکێکـی نوێ کاتێك کـە بـاران لێی دەدات بـەپێی ئایـەتی ﴿وَتَرَى الْأَرْضَ هَامِدَةً فَإِذَا أَنزَلْنَا عَلَيْهَا الْمَاءَ اهْتَزَّتْ وَرَبَتْ وَأَنبَتَتْ مِن كُلِّ زَوْجٍ بَهِيجٍ﴾ (الحج:٥)، واتـە: (بەڵگەیـەکی تر لەسەر زیندوو بوونەوە ئەوەیە کە) تۆ زەوی دەبینیت ووشك و برنگـە، جا

کاتێك کە ئاوی بارانمان بەسەردا باراند دادەچڵەکێت و دەلەرزێت و تۆوەکان چەکەرە دەکەن و رەگ و رەچەلەك دەردەکەن و دەڕوێن، ئەوسا لە هەموو جۆرە گژوگیا و گوڵ و گوڵزارێکی جوان پەروەردگار جووت دەڕوێنێت، هەربۆیە لە رۆژی دواییشدا پەروەردگار بارانێك دەبارێنێت کە ئەمە هاندەرێك دەبێت بۆ هاتنە دەرەوەی خانە زیندووەکان لە کلێنچکەی مردووەوە و وەك رووەك دەبێتە هۆی رواندنەوەی لەشی مرۆڤەکان جارێکی تر وەك لەم فەرموودەیەدا هاتووە: ﴿قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): « ثُمَّ يُنْزِلُ اللَّهُ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً، فَيَنْبُتُونَ كَمَا يَنْبُتُ الْبَقْلُ ...﴾ رواه البخاري، واتە: پاشان خوای گەورە لە ئاسمانەوە بارانێك دەبارێنێت کە دەبێتە هۆی رواندنەوەی مرۆڤەکان هەروەکو رووەك.

لێرەدا دەپرسین: دەبێت بۆچی پێغەمبەر (ﷺ) باسی بارانی کردبێت بۆ زیندوو کردنەوەی کلێنچکە (عجب الذنب) و پاشان مرۆڤەکە؟ و بۆچی باسی شتی تری نەکردووە؟ دیارە دەبێت لەژێر رۆشنایی ئەو تێبینییانەی پێشتر دامان ئەمەش روون کردنەوەیەکی زانستییانەی هەبێت.

لە وەڵامدا دەڵێین: پێغەمبەر (ﷺ) لەو فەرموودەیەی سەرەوەدا، و هەروەها پەروەردگاریش لە ئایەتی: ﴿وَالَّذِي نَزَّلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً بِقَدَرٍ فَأَنشَرْنَا بِهِ بَلْدَةً مَّيْتاً كَذَلِكَ تُخْرَجُونَ﴾ (الزخرف:١١)، واتە: هەروەها ئەو خوایە لە ئاسمانەوە بە ئەندازەیەکی دیاری کراو بارانی باراندووە و دەفەرموێت: وڵاتی ووشك و مردوومان پێ زیندوو کردۆتەوە، هەر بەو شێوەیەش ئێوە لە گۆڕەکانتان دەهێنرێنە دەرەوە و زیندوو دەکرێنەوە.

بە ئاشکرا باسی ئەوە دەکەن کە پرۆسەی زیندوو کردنەوەی مرۆڤ بە هەمان شێوەی کرداری رواندنەوەی تۆوی رووەك دەبێت، بە ووتەیەکی تر ئەو کردارە کیمیایی و بایۆلۆجییانەی لە کاتی رواندنی رووەکدا بەکاردێن هەمان ئەو کردارانەن کە بۆ زیندوو کردنەوەی مرۆڤەکانیش بەکاردێت، و لەبەر ئەوەی ماددەی بۆماوەیی کە ترشی ناووکی سەرەکییە (DNA)

زۆربەی پێکهێنەری ماددەی ئەو بەشە بچووکەیە و گرنگترینیشێتی، کەواتە بریتی‌یە لە خاڵی هاوبەشی نێوان تۆوی رووەك و تۆوی مرۆڤ، و ئەو کردارانەشی کە ووتمان لە کاتی زیندوو بوونەوەدا روودەدەن پەیوەندی‌یان بەم پێکهاتەیەوە هەیە.

دەقە شەرعی‌یەکان باسی ئاویان کردووە کە ئەم ئەندامانە بەکاری دێنن بۆ ئەنجامدانی ئەو کارلێکانە، کەواتە ئاوە کە دەبێتە هۆی گێڕانەوەی چالاکی بۆ ماددەی بۆماوەیی لە کلێنچکەدا و بە فەرمانی پەروەردگار رووەکێکی نوێ یان مرۆڤێکی لێ‌دروست دەبێتەوە، بابزانین زانستی نوێ چی دەڵێت:

زۆر بە کورتی: ترشی ناووکی سەرەکی چەندین گەردیلەی تێ‌دایە، لەناو ئەم گەردیلانەدا گەردیلەیەکی تایبەتی هەیە کە یارمەتی بەردەوام بوونی ژیان و درێژە پێدانی دەدات، کە بریتین لە گەردیلەکانی بۆندی هایدرۆجینی (Hydrogen Bonds)، ئەم گەردیلانەی هایدرۆجین بە بەردەوامی بۆندی نوێ و یەکگرتنی نوێ دروست دەکەن لە نێوان چوار ترشەڵۆکە ناووکی‌یە نایترۆجینی‌یەکانی کرۆمۆسۆمەکان (ئەدینین، گوانین، سایتۆسین، و ثایمین)، کە لەرێ‌ی ئەمەوە یارمەتی گواستنەوە و بەردەوام بوونی ژیان دەدەن کاتێك کە دوو بەشەکەی پەیژەی ترشی DNA لە یەك جیادەبنەوە و هەریەکەیان زنجیرەیەکی تر دروست دەکات لە کاتی کرداری زۆربووندا و زنجیرە کۆنەکە لەگەڵ زنجیرە نوێ‌یەکەدا یەك پێ‌دەگرن.

تەنیا سەرچاوەی ئەم توخمی هایدرۆجینە بریتی‌یە لە گەردی ئاو کە لەگەڵ ئۆکسجیندا یەکی گرتووە و کاتێك کە ئاوەکە شی‌دەبێتەوە و بە ئایۆن دەبێت گەردی هایدرۆجین بەرەڵڵا دەکات[14]، و ئەم هایدرۆجینەیە کە لە

(14) ئەوەی سەرنج راکێشە ئەوەیە کە سەرەکیترین رێگا بۆ بەرەڵڵا بوونی ئەم گەردیلەی هایدرۆجینە لە گەردی ئاوەوە و شیبوونەوەی بریتی‌یە لە بەکارهێنانی تەزووی کارەبا (کە لە هەورە بروسکەدا هەیە)!!

دروست کردنی گەردی نوێی ترشی ناووکیدا DNA بەکاردێت، ئەم یاسایە هەموو دروستکراوەکان دەگرێتەوە بەبێ جیاوازی (واتە رووەك و گیاندار و مرۆڤیش)، کە ئەگەر بێتو هەر زیندەوەرێك یان تۆوەکەی بەبێ ئاو بمێننەوە ئەوا دەتوانێت کە ئەم ترشە ناوکییە سەرەکییە و شیفرە بۆماوەییەکەی بهێڵێتەوە و بیپارێزێت، بەلام ئەم گەرد و شیفرانە بەشێوەیەکی وەستاو و ووشکەوەبوو دەبن و ناتوانن بجوولێن و زیاد بکەن، هەر کاتێك کە ئاو دەستەبەر ببێت و گەردیلەکانی هایدرۆجین بدات بە ترشی ناووکی ئەوا ئەم شیفرەیە دەژێتەوە و دەکەوێتە جوولە و زیاد بوون.

بینراوە کە ئەم یاسایە بە تایبەتی بەسەر میکرۆبەکاندا جێبەجێ دەبێت بە ئاسانی، بەلام لە زیندەوەرە پلە بەرزەکان و ئالۆزەکاندا نەمانی ئاو بۆ ماوەیەکی زۆر دەبێتە هۆی پووکانەوەی شانەکان و فەوتانیان، کە دەستەبەر بوونی ئاو دوای ئەم قۆناغە هیچ سوودێکی نییە و نابێتە هۆی ژیانەوەی ئەو ئەندامانە، و مردنیان بەردەوام دەبێت، بەلام بە نیسبەت کلێنچکە (عجب الذنب)ەوە ئەم کردارە جیاوازە، چونکە ئەم پارێزگاری لە خانە بنەڕەتییە دایکییەکان دەکات بە ساغی بۆ ماوەیەکی زۆر درێژ، هەر کاتێك کە باران داباری بۆ سەری ئەوا بۆندە هایدرۆجینییەکان دەژێنەوە و دروست دەبنەوە و پارمەتی دابەش بوون و زیاد بوونی مادده بۆماوەییەکان دەدەن، و سەر لە نوێ لەشی مرۆڤی لێوە دروست دەکەنەوە.

لەم روون کردنەوانەی پێشەوە ئەو راستییە زانستییە سەرسوڕهێنەرانەمان بۆ دەردەکەوێت کە لە فەرموودەکاندا ئاماژەی بۆ دراوە، کە لە لایەن کەسێکی نەخێندەوار و لە دەوروبەرێکی نەخوێندەواریدا ووتراوە، تەنها دەتوانین بڵێین ئەمە نیگای ئەو کەسەیە کە بنەماکانی دروست بوونی کۆرپەلەی داناوە لە بەشێکی کلێنچکەوە و ئاگاداری هەموو شتێکە و هەموو شتێکیش هەر بۆلای ئەو دەگەڕێتەوە.

## لەناو سێ تاریکاییدا:

پێشتر باسمان کرد کە خوای گەورە باسی ئەوە دەکات کۆرپەلە لە سکی دایکیدا لەناو سێ تاریکیدا گەشە دەکات: ﴿يَخْلُقُكُمْ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ خَلْقاً مِن بَعْدِ خَلْقٍ فِي ظُلُمَاتٍ ثَلَاثٍ﴾ (الزمر:٦) واتە: لەوەودوا لە سکی دایکانتاندا ئێوە دروست دەکات بە چەند قۆناغێك لەناو سێ تاریکاییدا، ئەم ئایەتە پیرۆزە باسی دوو بابەتی سەرەکی دەکات کە بریتین لە: تاریکاییەکان و دروست بوونی یەك لەدوای یەك، ئایەتی (خَلْقاً مِن بَعْدِ خَلْقٍ) ئاماژەیە بۆ ئەوەی کۆرپەلە بە قۆناغ دروست دەبێت، بەڵام لێرەدا ئەوەی بۆ زیاد دەکەین کە ئەم قۆناغانە دەبێت هەریەکەیان دروست بوونی (خلق)ی نوێی لەگەڵدا بێت وەك ئایەتەکە ئاماژەی پێدەدات، و کۆرپەلەزانی نوێ بۆی سەلماندووین و هەروەها ئایەتەکە ئاماژەی ئەوەش دەدات کە ئەم دروست بوونانە دەبێت لە تاریکاییدا بن بۆ ئەوەی سەرکەوتوو بن.

دەبێت ئەو تاریکاییانە چی بن؟ و سیفاتیان چی بێت؟ و بۆچی لێرەدا باس کراون؟ لێرەدا کەمێك بە درێژی لەم بابەتە دەدوێین:

پێویست دەکات هەندێك ئایەتی تری قورئان کە باسی تاریکایی دەکەن بکەین بە نموونە بۆ ئەوەی بابەتەکە روونتر ببێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَوْ كَظُلُمَاتٍ فِي بَحْرٍ لُّجِّيٍّ يَغْشَاهُ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِ سَحَابٌ ظُلُمَاتٌ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ إِذَا أَخْرَجَ يَدَهُ لَمْ يَكَدْ يَرَاهَا وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ اللَّهُ لَهُ نُوراً فَمَا لَهُ مِن نُّورٍ﴾ (النور:٤٠)، واتە: یاخود (کردەوەیان) وەك چەندەها تاریکایی وایە کە لەناو دەریایەکی قووڵدا شەپۆل لەسەر شەپۆل بدات بەسەریدا، لە سەرووشییەوە هەورێکی تاریك دایگرتبێت، تاریکاییەکان چین لەسەر چین نیشتبن، کاتێك کە دەستی دەربهێنێت خەریکە دەستی خۆی نەبینێت (لەبەر تاریکایی) بێگومان ئەوەی خوا نووری پێنەبەخشێت هەرگیز نووری دەست ناکەوێت، ئەگەر بڕوانینە ئەم ئایەتە دەبینین دەبێت ئەو تاریکاییانە یەك لەسەر یەك

بن، وەك دەفەرموێت ﴿بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ﴾، هەروەها ئەم تاریکایی‌یانە بوونی رووناکی بە تەواوەتی رەت ناکەنەوە وەك دەفەرموێت ﴿إِذَا أَخْرَجَ يَدَهُ لَمْ يَكَدْ يَرَاهَا﴾ واتە زۆر بە ئەستەم دەستی دەبینێت و نەیفەرمووە کە بە هیچ شێوەیەك نایبینێت.

ئایەتەکەی سوورەتی (الزمر) ژمارەی تاریکایی‌یەکان بە سێ دانە دیاری دەکات، ئەم تاریکایی‌یانە تەنها بریتین لە سێ دانە داپۆشەر کە دەوری کۆرپەلەکە دەدەن لە قۆناغەکانی دروست بوونی‌دا، کە دیارە هەر داپۆشەرێك بریتی‌یە لە بەربەستێك و تاریکی دروست دەکات، بوونی سێ داپۆشەریش دەبێتە هۆی دروست بوونی سێ تاریکایی.

دروست بوون کاتێك دەست پێ‌دەکات کە نوتفەی نێرینە (سپێرم) دەچێتە ناو نوتفەی مێینەوە (هێلکۆکە)، هەروەك بینی‌مان خانەکانی ئەو هێلکە پیتێنراوە (زایگۆتە) دابەش دەبێت بۆ چەندین خانە، کە ئەو تۆپەڵە خانەیەی دروست دەبێت لەناو پەردەیەکدایە کە لە هەموو لایەکەوە داییپۆشیوە (کە پەردەی هێلکەی سەرەتایی‌یە)، و ئەم هێلکەیە لەناو بۆری مناڵداندایە (بۆری فالووپ)، و ئەم بۆری‌یەش لەناو سکدایە (بڕوانە وێنەی ڕەنگاوڕەنگی: ٧٩/ هـ)، کەواتە دەبینین سێ تاریکایی چوار دەوری ئەم دروست بوونە دەدات: تاریکایی سکی دایکەکە، تاریکایی بۆری مناڵدان، و تاریکایی پەردەی هێلکەکە.

پاشان ئەم زایگۆتە دەکەوێتە ناو مناڵدانەوە و لە کاتی کەوتنە ناوەوەی ئەو پەردەی هێلکۆکەیەی دەورەی‌داوە لێی جیادەبێتەوە، و دوایی دەچێتە ناو دیواری مناڵدانەوە و بە پەردەیەکی نوێ دەورە دەدرێت کە بریتی‌یە لە پەردەکانی ووێلاش، لێرەشدا زانیاری‌یە قورئانی‌یەکان لەگەڵ راستی‌یە زانستی‌یەکاندا جارێکی تریش یەکدەگرنەوە و سێ تاریکایی‌یەکە دەبن بە: تاریکایی سك، تاریکایی دیواری مناڵدان، و تاریکایی پەردەکانی ووێلاش، کە ئەمانە هەموو تاریکایین لەسەر تاریکایی (بڕوانەوە وێنەی: ٧٩/ هـ).




**وێنەی (٤-١٨):** دەبینین کۆرپەلەی مرۆڤ لە قۆناغی (عەلەقە)دا لەناو ٣ تاریکایی‌دایە و بە ٣ پەردەش دەورە دراوە.

الجنين في الشهر الثاني والحبل السري المغذي له
الغشاء المشيمي (الكوريون)
الحبل السري
غشاء السلي (الأمنيون)

**وێنەی (٤-١٩):** لەم وێنە راستەقینە مایکرۆسکۆپی‌یەدا دەبینین کۆرپەلە بەهۆی ناووکە پەتکەوە لەناو منداڵدانـدا هەڵواسراوە (کە ڕێڕەوی وەرگرتنی خۆراکێتی) و هەروەها بە سێ پەردەش دەورە دراوە.

ئەمە بەشێوەیەکی گشتی، ئەگەر بمانەوێت ووردتر سەیر بکەین دەبینین ئەم پەردانەی ووێڵاشیش کە چواردەوری کۆرپەلەکەیانداوە ئەمانیش لە سێ چینی لەسەریەك پێکهاتوون، کە لە دەرەوە بۆ ناوەوە ئەمانەن (بڕوانە وێنەکانی: ٤-١٨ و ٤-١٩) و (وێنەی ڕەنگاوڕەنگی: ١٠٤/ هـ):

١- پەردەی کەوتوو (دیسیدوا Decidua).

٢- پەردەی کۆریۆنی (Chorion).

٣- پەردەی ئەمینیۆسی (Amnion).

هەروەها منالّدان و بۆری‌یەکەشی دیوارەکەیان لە سێ چین پێکهاتوون، کە لە دەرەوە بۆ ناوەوە ئەمانەن: **یەکەمیان**: چینی پەردەی ناوپۆشی سکە (پێریتۆنی Peritoneal) کە جیسمی منالّدان دادەپۆشێت، **دووەمیان**: چینی ماسولکەیی دیواری منالّدانە، و **سێیەمیان**: لە ناوەوە منالّدانی داپۆشیوە و بریتی‌یە لە پەردەی ناوپۆشی منالّدان (**وێنەی ڕەنگاوڕەنگی: ١٠٤/ هـ**).

لێرەدا ئاماژە بەوە دەدەین کە خوای گەورە فەرموویەتی (يَخْلُقُكُمْ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ)، واتە لەناو سکی دایکانتاندا دروستتان دەکات و نەیفەرمووە لەناو منالّدانی دایکانتاندا دروستتان دەکات، کە ئەمە ئاماژەیە بەوەی ئەم تاریکایی‌یانە تەنها نەبەستراونەتەوە بە منالّدانەوە، بەڵکو ئەم تاریکایی‌یانە لەناو منالّدان و دەرەوەشی‌دا هەن، سەبارەت بە گرنگی بوونی تاریکایی بۆ کۆرپەلەکە کە لە مانای ئایەتەکەوە تێدەگەین، دەڵێین: کۆرپەلەزانی نوێ بۆی دۆزیوینەتەوە کە بوونی تاریکایی بۆ دروست بوونی کۆرپەلەکە زۆر گرنگە، و بوونی ڕووناکی بەگشتی زیانی هەیە بۆی.

بوونی ئەو ڕووناکی‌یە لەوانەیە ببێتە هۆی زەرەرهێنانی تۆڕی بینین لە چاوی کۆرپەلەکەدا پێش ئەوەی کە دروست بوونی تەواو ببێت، ڕووناکی لەوانەشە زەرەر بدات لە خانەکانی تری کۆرپەلەکە و بینراوە کە کوژەرە بۆ هێلکۆکەکە، توێژینەوەکان دەریان خستووە کە شەپۆلی ڕووناکی سەروو وەنەوشەیی (شەپۆلی نێوان ٣٢-٤٠٠ نانۆمیتەر)، و شەپۆلی تیشکی چڕ و نزیك لە شەپۆلی سوور (واتە زیاتر لە ٧٥٠ نانۆمیتەر) لەوانەیە زەرەری گەورە بە کۆرپەلەکە بگەیەنێت[15]، هەروەها ئەو ڕووناکی‌یە زەردە

---

(15) ئەم زانیاری‌یانە لە توێژینەوەیەکدا خرایەروو کە لە کۆنگرەی جیهانی شانزەیەمی نەزۆکی و بەپیتی (The 16th world Congress on Fertility & Sterility)دا کە لە ٥ی ئۆکتۆبەری سالّی ١٩٩٨ لە کۆلیژی پزیشکی زانکۆی ئەنقەرە لە تورکیا گیرا پێشکەش کرا.

هالۆجینی‌یەی (کە لە حاڵەتی روونـاك کردنـەوەی ئاسـایی‌دا بـەکاردێت) بینـراوە کـە زەرەرمەنـدە بـۆ هێلکـە بـە تایبـەتی بـۆ ترشـە ئەمینی‌یـە سەرەکی‌یەکەی (DNA).

بۆ نموونە ئەگەر سەیری کاریگەریی تیشکی سەروو وەنەوشەیی لەسەر DNA و کارتێکردنە لاوەکی‌یەکانی ئەم کاریگەریی‌یە بکەین ئەم بابەتەمان بۆ روون دەبێتەوە، لوولپێچی DNA پێکهاتووە لە دوو زنجیرە گەرد، هەر زنجیرەیـەك لـەم دووانـە پێکهـاتووە لـە زنجیرەیـەك نیوکلیۆتایـد (Nucleotides) کە بەدوای یەکدا ریزکراون، کە ئەم (نیوکلیۆتاید)انەش بـریتین لـە کۆمـەڵێك گـەردی فۆسـفات و شـەکری کـەم ئۆکسـجین (Deoxyribose) و ترشی نایترۆجینی، ئەم دوو زنجیرە گەردەی (DNA) پێکەوە بەستراون بەهۆی چەند بۆندێکەوە کە لە گەردیلەی نایترۆجینی بەستراو پێکەوەدا بە بۆندی هایدرۆجینی پێکهاتوون.

ئەو ووزەیەی کە لە تیشکی سەروو وەنەوشەیی‌دایە و گەردی (DNA) دەیمژێت دەبێتە هۆی دروست بوونی بۆندی کیمیایی نوێ لە نێوان ترشەڵۆکە نایترۆجینی‌یەکانی هەمان زنجیرەدا، ئەم حاڵەتە گۆڕانکاری لە جووتیی ترشەڵۆکە نایترۆجینی‌یەکان لە کاتی کۆپی کردندا (کۆپی کردنی DNA و پاشان خانەکاندا) دروست دەکات و دەبێتە هۆی پەیدابوونی بازدان (Mutation) کە بریتی‌یە لە گۆڕانکاری لە ریزبەندیی ترشەڵۆکی ناوکی‌یەکانی زنجیرەکانی (DNA)دا، و ئەم بازدانانە دەبێتە هۆی روودانی گۆڕانکاریی بۆماوەیی لە دروست کردنی پرۆتیندا لەلایەن خانەکانەوە.

ئەویش لەبەر ئەوەیە کە گۆڕانکاری لە ریزبەندیی ترشەڵۆکە ناووکی‌یەکاندا وا لە ئەنزیمی (RNA Polymerase) دەکات کە شیفرەی بۆماوەیی لوولپێچی (DNA) بە شێوەیەکی جیاواز بخوێنێتەوە، و بەپێی ئەمە

ئاوێتەیەکی تر بەناوی (mRNA) دروست بکات، ئەم ئاوێتەیە لە ناوکی خانەوە دەردەچێت و دەنێردرێت بۆ کارگەی دروست کردنی پرۆتینەکان کە رایبۆسۆمەکانە (Ribosomes) لە سایتۆپلازمی خانەکاندا، و لەبەرئەوەی کە شیفرەکە جیاوازە ئەوا پرۆتینێکی جیاواز دروست دەکرێت.

ئەم گۆڕانکارییانە دەبێتە هۆی دروست بوونی تێکچوون و ڕوودانی گۆڕانکاری لە سیستمی زیندە چالاکییەکاندا (Metabolism)، بەڵام لەهەمان‌کاتیشدا هەندێك ئەنزیمی تر هەیە کە ئەم عەیب و تێکچوونانە چاك دەکەنەوە و سارێژیان دەکەن، کە پێیان دەووترێت ئەنزیمی (دی ئێن ئەی) چاککەرەوە (DNA repair Enzymes).

ئەو تەنها ڕووناکییەی کە زیان بە کۆرپەلە ناگەیەنێت بریتییە لە ڕووناکی سەوز (کە درێژی شەپۆلەکەی لە نێوان ٥٢٥-٥٧٥ نانۆمیتەردایە)، هەروەها دەشزانین کە دروست بوونی کۆرپەلەکە پشت بە کۆپی کردنی خانەکان دەبەستێت، هەر کاتێکیش کە خانە سەرەتاییە سەرەکییەکان زیانیان پێگەیشت ئەوا ئەو خانانەی تر کە لەمانەوە دروست دەبن خانەی زیان لێکەوتوو و زەرەرمەند دەبن.

لێرەدا ئاماژە بەوەش دەدەین لەبەر ئەوەی کە ڕووناکی زیان بە خانەکان دەگەیەنێت، هەر کاتێك کۆپی کردنی خانە زەرەر لێکەوتووەکان بەهۆی ڕووناکییەوە کەمی کرد ئەوا رادەی ئەو زیانانەی بە کۆرپەلەکە دەگات کەمتر دەبێت، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە هەر کاتێك کۆرپەلەکە لە تەمەندا بەرەو پێش بچێت و لە قۆناغی دروست بوونی خانەکاندا (Organogenesis) تێپەڕێت، ئەوا کاریگەریی خراپی ڕووناکی بۆ کۆرپەلەکە کەم دەبێتەوە چونکە لە مانگە کۆتاییەکانی کۆرپەلەدا دروست بوونی نوێ ڕوونادات و تەنها کۆرپەلەکە لە قەبارەدا گەورە دەبێت، هەروەها

دروست بوونی پێستیش بۆ کۆرپەلەکە و داپۆشینی هەموو لەش جۆرە رێگرێك دروست دەکات لەبەردەم رووناکیدا، لەمانەوە حیکمەت و دانایی ووتەی پەروەردگارمان بۆ دەردەکەوێت لە پێکەوە بەستنی قۆناغە دروست بوونەکانی کۆرپەلە بە بوونی تاریکاییەوە.

وەکو پێشتریش (لە بەشی زانستی کۆرپەلەزانی و کورتەیەکی مێژوویی‌دا) ئاماژەمان پێدا یەکەم کەسێك کە وێنەی ووردی دەربارەی پەردەکانی دەوری کۆرپەلە بلاوکردەوە زانای ئیتالی لیۆناردۆ داڤینشی (Leonardo Da Vinci) بوو لە سەدەی پانزەیەمی زاییینیدا، واتە نزیکەی ١٠٠٠ساڵ پاش هاتنە خوارەوەی قورئان بۆ پێغەمبەر (ﷺ)!! باشە دەبێت کێ ئەم نیگا و هەواڵە ووردەی دەربارەی کۆرپەلە و پەردەکانی دەوری بە پێغەمبەر (ﷺ) راگەیاند بێت؟! و کێیە ئاگاداری کردووەتەوە کە تاریکایی زۆر گرنگە بۆ گەشە کردنی کۆرپەلە؟! وەڵام: (ﷲ)ی پەروەردگاری هەموو جیهانە.

**کورتەی باس:**

بەڕاستی ئەم فەرموودانەی پەروەردگار و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) موعجیزەیەکی گەورەن و لە رۆژگاری ئەمڕۆدا راستییەکانیان دۆزراونەتەوە، لێرەدا پرسیارێك دێتە مێشکمانەوە کە ئایا بۆ پێغەمبەر (ﷺ) لە پێش ١٤٠٠ساڵ باسی چەند بابەتێکی زانستی ئاوەها دەکات کە لەلای هیچ کەسێك و هیچ زانستێکی ئەو رۆژگارەدا نەناسرا بوو؟

بۆ وەڵامی پرسیارەکەی سەرەوە دەڵێین: خودای زانا بە هەموو رووداوەکان تا رۆژی دوایی بەم زانینە فراوانەی خۆی دەیزانی کە رۆژێك دێت مرۆڤەکان دەگەنە نهێنییەکانی زانستی کۆرپەلەزانی و بە تایبەتی بۆیان روون دەبێتەوە کە مرۆڤ لەم شریتی سەرەتاییەوە (کلێنچکە)وە دروست دەبێت، هەر ئەمیشە کە هانی خانەکانی لەش دەدات بۆ دروستکردنی ئەندامەکانی لەش و پسپۆڕ کردنیان بەکارەکانیانەوە، و

خۆیشی دەبێتە هۆی دروست کردنی زوربەی ئەندامەکانی لەش، هەروەها پەروەردگاریش دەیزانی کە مرۆڤەکان دەگەنە ئەو راستییەش کە بەشێکی ئەم کلێنچکەیە هەرگیز نافەوتێت و دەمێنێتەوە (لەرۆژی دواییشدا مرۆڤەکانی لێوە زیندوو دەبێتەوە)، هەر بۆیە ئەم نیگایەی ناردووە بۆ پێغەمبەر و بە ئیلهام خستوویەتییە دڵی پیرۆزییەوە بۆ ئەوەی لە فەرموودەکانیدا ئەم راستییەمان بۆ روون بکاتەوە، و ئەم بابەتە ببێتە بەڵگەیەك لەسەر راستیی پێغەمبەرایەتی محمد (ﷺ)، و راستیی وەرگرتنی فەرموودەکانی لە پەروەردگاری باڵا دەستەوە، هەروەها بۆ سەلماندنی گونجاویی ئەم پەیامەیە بۆ هەموو سەردەم و رۆژگارێك تا رۆژی دوایی و یەکگرتنەوەی راستییە زانستییە سەلمێنراوەکانی ئەمڕۆ لەگەڵ فەرموودەکانی قورئان و سوننەتی پیرۆز، هەتاوەکو زانستی مرۆڤەکانیش بەرەو پێش بچێت بەڵگەی زیاتر دەدۆزرێتەوە لەسەر ئیعجازی قورئان و سوننەتی پیرۆز.

لێرەدا پێم خۆشە چەند وتەیەکی زانایەکی کۆرپەلەزانی رۆژئاوا بێنم لەسەر ئەم بابەتە، کە ئەویش (پرۆفیسۆر کیث ڵ. مور)ە، کە یەکێکە لە گەورە زانایانی کۆرپەلەزانی لە جیهاندا و مامۆستای کۆرپەلەزانی چەند زانکۆیەکی ئەمریکا و کەنەدایە، و سەرۆکی (کۆمەڵەی زانایانی توێکاری و کۆرپەلەزانی لە کەنەدا و ئەمریکادا) بووە، و هەڵبژێردراوە بە ئەندامی کۆمەڵەی پزیشکی شاهانەی کەنەدا، و یەکێتی زانایانی توێکاری ئەمریکا، هەروەها خاوەنی هەشت کتێبی پزیشکییە کە هەندێکیان بریتین لە پرۆگرامی کۆلیژی پزیشکی، لەو کتێبانە: کتێبی گەشەکردنی مرۆڤ یان مرۆڤی گەشە کردووە (The Developing Human) کە سەرچاوەیەکی سەرەکی کۆرپەلەزانییە لە جیهاندا (بە تایبەتی لە ئینگلتەرا و ئەڵمانیادا وەك پرۆگرامی خوێندنی کۆرپەلەزانی لە کۆلیژەکانی پزیشکیدا دیاری

کراوە)، و وەرگێڕدراوە بۆ چەندین زمان و ٨ جۆر چاپی هەیە بە زمانەکانی (روسی و یابانی و ئەڵمانی و صینی و ئیتاڵی و پورتوگاڵی و ئینگلیزی و یۆگۆسلاڤی)، کاتێکیش کە لیژنەیەك لە ئەمریکا دانرا بۆ دیاری کردنی باشترین کتێب کە لەلایەن یەك نووسەرەوە دانرابێت، ئەم کتێبە براوە بوو لەلای ئەو لیژنەیە.

کاتێك کە داوای لێکرا ببێت بە راوێژکاری زانستی بۆ دەربڕینی رای زانستی‌یانەی خۆی دەربارەی هەندێك ئایەت و فەرموودە لە بواری پسپۆڕی خۆیدا کە کۆرپەلەزانی‌یە، کاتێك کە ئایەتەکان و فەرموودەکان و ماناکانیانی بیست سەرسوڕمانی خۆی دەربڕی و ووتی: **چۆن دەبێت محمد (ﷺ) پێش ١٤٠٠ ساڵ توانیبێتی ئاوا بەو شێوە وورده باسی قۆناغەکانی گەشە کردنی کۆرپەلە بکات کە زانایان ئەمڕۆ تەنها ٣٠ساڵ دەبێت گەیشتوونەتە ئەم راستی‌یانە؟!** ئەوە بوو زۆر بە زوویی ئەم سەرسوڕمانەی گۆڕرا بۆ دەربڕینی کامەرانی و ئیعجاب بۆ ئەم دەربڕینە جوان و ئەم رێنموویی کردنە، و ئەوە بوو دەستی کرد بە پشتگیری کردنی ئەم بیروبۆچوونانە و لە کۆمەڵە زانستی‌یەکاندا باسی دەکردن، تەنانەت موحازەرەیەکی پێشکەش کرد بەناونیشانی یەکگرتنەوەی زانستی کۆرپەلەزانی لەگەڵ قورئان و سوننەتدا (مطابقة علم الأجنة لما في القرآن والسنة).

لەم موحازەرەیەدا (د. مور) ووتی: **من زۆر خۆشحاڵم کە بەشدار ببم لە روون کردنەوەی ئەم ئایەت و فەرموودە پیرۆزانەی کە باسی دروست بوونی کۆرپەلە دەکەن، و ئەمە بۆم دەردەخات کە محمد نێردراوی خودایە و لە لایەن ئەوەوە ئەم زانیاری‌یانەی پێ دراوە، چونکە ئەم هەموو زانیاری‌یە تەنیا زۆر نوێ و دوای چەندین سەدە دۆزراونەتەوە**، کاتێکیش کە وەسفی قورئانی پیرۆزی بینی بۆ کۆرپەلە لە قۆناغی (علقة)دا بەوەی لە کرمی (علق) دەچێت ووتی: **(کۆرپەلە لەم قۆناغەدا بە تەواوەتی لە شێوەی کرمی (علق)دایە و بە هەمان شێوەی ئەم کرمە بە دیواری**

مناڵدانەوە هەڵواسراوە)، و سەرسوڕمانیی گەورەی خۆی دەربڕی کاتێك کە بەراوردی شکڵی هەردووکیانی کرد و دوو وێنەی هێنا کە یەکێکیان کرمی زەروو (علق) بوو و ئەوی تریان وێنەی کۆرپەلەیەك بوو لەو قۆناغەدا و کە کۆی کردنەوە و بەراوردی کردن بینی دەقاودەق لەیەك دەچن و ئەم وێنانەی پیشانی زانایاندا لە چەند کۆنگرەیەکی زانستیدا، و ئەوە بوو تەبەنناى ئەم وەسفەی کرد (**بڕوانە وێنەکانی: ٤-٢٠ ، ٤-٢١**).


وێنەی (٤-٢٠): پارچە پارچەیی لەشی کۆرپەلە هەروەك کرمی زەروو.



وێنەی (٤-٢١): بەراوردێکی نێوان کۆرپەلە و کرمی زەروو.

هەروەها پرۆفیسۆر (مور) ئەوەی روون کردەوە کە کۆرپەلە لە قۆناغی (علقة)دا بەدیواری مناڵدانی دایکییەوە هەڵواسراوە (**وێنەی ٤-٢٢**)، و لە زمانی عەرەبیدا بە مانای خوێنی بەستوو دێت، کەواتە ووشەی (علقة) هەموو وەسفەکانی کۆرپەلەکەی تێدایە، و پاشان پرۆفیسۆر (کیث مور) باسی گۆشپارە (مضغة)ی کرد و ئەوەبوو کە پارچەیەك قوڕی هێنا و قەپێکی لێگرت و دوایی وێنەی کۆرپەلەیەکی هێنا



وێنەی (٤-٢٢): کۆرپەلە لەناو مناڵداندا هەڵواسراوە و خوێنێکی وەستاوە.

لەم قۆناغەدا و بەراوردی کرد، بینی کە ١٠٠٪ لەیەك دەچن (بڕوانە وێنەی ٥-٥).

هەندێك لە رۆژنامەکانی کەنەدا زۆرێك لە ووتەکانی (د. کیث مور)یان بڵاوکردەوە، و لە کۆتایی‌دا تەلەفیزیۆنی کەنەدی سێ زنجیرەی بڵاوکردەوە لەسەر یەکگرتنەوەی ووتەکانی قورئان پێش ١٤٠٠ ساڵ لەگەڵ ئەو راستی‌یانەی کە زانستی ئەمڕۆ دۆزیویەتەوە، دوای ئەم ووتانە یەکسەر ئەم پرسیارە لەم زانایە کرا: (پرۆفیسۆر مور) کەواتە تۆ باوەڕت بەوە هەیە کە قورئان لەلایەن خوداوە بۆ محمد نێردراوە؟ ئەویش ووتی: (**هیچ قورسی‌یەکم نەبینی لە وەرگرتنی ئەم راستی‌یەدا**)، پاشان ووتیان: تۆ چۆن باوەڕ بە (محمد) دێنیت کە خۆت باوەڕت بە (مەسیح) هەیە؟ ئەویش ووتی: **من باوەڕم وایە کە هەردووکیان لە یەك قوتابخانەوە نێردراون**.

لە دیدارێکی تردا کە پرۆفیسۆر (عبدالمجيد الزنداني) سەرۆکی زانکۆی (ئیمان) لە (یەمەن) لەگەڵ (د. مور)دا سازی‌دا، پرسیاری لێکرد: تۆ لە کتێبەکەتدا (کتێبی مرۆڤی گەشە کردوو (The Developing Human)) باسی سەدە ناوەڕاستەکان (القرون الوسطى)ت کردووە و ووتووتە: ئەم سەدانە هیچ جۆرە پێشکەوتنێکی زانستی‌یانەی کۆرپەلەزانی تێدا نەبووە، و تەنها چەند شتێکی زۆر کەم زانراون، ئا لەم سەردەمەدا بوو کە قورئان بۆ پێغەمبەرمان (ﷺ) دادەبەزی کە هیدایەتی خەڵکی دەکرد و وەسفێکی ووردی قۆناغەکانی گەشە کردنی کۆرپەلەی مرۆڤیشی کردووە، تۆش زانایەکی جیهانیت بۆچی دادپەروەر نەبوویت و ئەم راستی‌یانەت نەخستۆتە ناو کتێبەکەتەوە؟

لە وەڵامدا ووتی: ئەمە خەتای خۆتانە، دە ئێوە ئەو بابەتە پێشکەش بە من بکەن با منیش بیخەمە ناو کتێبەکەمەوە!! ئەوە بوو زانایەکی ئازا و دادپەروەر دەرچوو و ئەو زیاد کردنانەی پرۆفیسۆر (الزنداني) پێشکەشی کرد خستی‌یە ناو بەشی مێژوویی کتێبەکەیەوە لە چاپی سێیەمی‌دا،

پرۆفیسۆر (مور) لە ژێر ناونیشانی (سەدە ناوەڕاستەکان) لە کتێبەکەیدا ئەمەی نووسیوە:

پێشکەوتنی زانست لە سەدە ناوەڕستەکاندا زۆر هێواش بوو، و دەربارەی کۆرپەلەزانی زۆر کەممان دەزانی، بەڵام دەبینین لە قورئاندا (کە کتێبی پیرۆزی موسوڵمانانە) هاتووە کە مرۆڤ دروست دەبێت لە تێکەڵاوێکی دەردراوەکانی نێر و مێ، و چەندین ئاماژە بۆ ئەوە هاتووە کە ئادەمیزاد لە نوتفەوە دروست دەبێت، و ئەوەشی روون کردووەتەوە کە ئەم نوتفە دروست بووە پاش شەش رۆژ وەکو چەکەرەیەك لە مناڵداندا جێگیر دەبێت، زانراویشە کە هێلکەی پیتێنراو دوای ئەوەی کە دەست دەکات بە دابەش بوون دوای شەش رۆژ پاش پیتاندن دەست دەکات بە گەورە بوون.




وێنەی (٤-٢٢): کۆرپەلە لە قۆناغی (عەلەقە)دا پارچەیەك خوێنی گەشی وەستاوی هەڵواسراوە.

هەروەها قورئانی پیرۆز دەڵێت: ئەم نوتفەیە گەشە دەکات بۆ ئەوەی ببێت بە پارچەیەك خوێنی وەستاو (علقة)، کە هێلکەی پیتێنراو لەم قۆناغەدا دەست دەکات بە دابەش بوون و پارچەیەك خوێنی وەستاوە و لەو دەچێت (بڕوانە وێنەی ٤-٢٣)، هەروەها دەتوانرێت شکڵی دەرەوەی کۆرپەلەکە ببینرێت لەو قۆناغەدا، کە لە کرمی زەروو (علقة) دەچێت (وەك لە وێنەی ٤-٢١

دیــارە)، کـە لـەو وێنـەیـەدا دەبیـنین وێنـەکـەی جیـاواز نیـیـە لـە شـکڵی کرمـی زەروو (علقة) یان مژەری خوێن و لەو دەچێت.




من التبرص الجنيني إلى المضغة

وێنەی (٤-٢٤): کۆرپەلە لە قۆناغی (عەلەقە)وە دەچێتە قۆناغی گۆشتپارەوە.

پـاش ئەمـە کۆرپەلەکـە لـە قۆنـاغێکی تـردا لـە شـتێکی جـووراو بـە ددان دەچـێت، هـەروەك بنێشـت (بڕوانـــە وێنـــەی ٥-٥)، وێنەکـەی بـە تـەواوەتی شوێنەواری ددانەکانی مرۆڤی تێدایە وەك ئەوەی جوورابێت، هەروەها وایان داناوە کە دوای پتێپەڕ بوونی ٤٠ یان ٤٢رۆژ شکڵی ئادەمی وەردەگرێت و ئیتر لە کۆرپەلەی ئاژەڵان ناچێت، ئەویش لەبەر ئەوەیە کە کۆرپەلەی مرۆڤ دەست دەکات بە وەرگرتنی سیفات و جیاکەرەوە مرۆیی‌یەکان لەم قۆناغەدا (وەك لە وێنەکانی بەشی حەوتەمدا دیارە).

لێرەدا با بڕوانینـە ووتـەی پـەروەردگار: ﴿يَخْلُقُكُمْ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ خَلْقاً مِن بَعْدِ خَلْقٍ فِي ظُلُمَاتٍ ثَلَــاثٍ ...﴾ (الزمر:٦)، ئەم ئایەتـە پـیرۆزە ئامـاژە بۆ ئەوە دەدات کە کۆرپەلە لەناو سێ بەربەستی تاریکدا گەشە دەکات، کە بریتین لە:

١- دیواری سکی ئافرەتەکە لە دەرەوە.

٢- دیواری مناڵدان.

٣- رووپۆشە ناوکی‌یەکەی کە راستەوخۆ دەوری کۆرپەلەکەی داوە،لێرەدا بوار نی‌یە کە بابەتی سەرنج راکێش و گرنگتر گفتوگۆ بکەین کە لە قورئانـدا هاتووە دەربارەی گەشە کردنی ئادەمیزاد لە قۆناغی پێش لەدایك بوونیدا...

ئەمە ئەو ووتانە بوون کە (د. مور) لە کتێبەکەیدا نووسیویەتی و لە هەموو جیهاندا بڵاوبووەتەوە، و بە پشتیوانی خودا ئەمە سەرەنجامی توێژینەوەی زانستییانەیە، هەروەها (د. مور) قەناعەتی بەوەش هێناوە کە ئەو دابەش کردن و پۆلێن کردنەی قۆناغەکانی گەشە کردنی کۆرپەلە کە ئێستا لە هەموو جیهاندا پیادە دەکرێت، دابەش کردنێکی قورسە و تێگەیشتنی ئاسان نییە (کە بە ژمارە دابەشکراوە بۆ قۆناغەکانی: ١، ٢، ٣، ٤، ٥ .... و بەم شێوەیە)، هەروەها ناتوانین لێیەوە بە جوانی تێبگەین لە گۆڕانکارییە تایبەتییەکانی هەر قۆناغێك، بەڵام ئەو دابەشکردنەی کە لە قورئاندا هاتووە پشت بە ژمارە نابەستێت بەڵکو پشت بە شکڵە جیاکەرەوە ئاشکراکانی کۆرپەلە دەبەستێت لە هەر قۆناغێکدا، هەربۆیە دابەشکردنی قۆناغەکان لە قورئاندا بەم شێوەیەیە: {(نطفة)، (علقة)، (مضغة)، (ئێسك-عظام)، (داپۆشینی ئێسك بە گۆشت-كساء العظام باللحم)، (گەشە کردن-النشأة)، (دروست کراوێکی جیاواز-خلقاً آخر)}، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ من سُلَالَة مِّن طِين {١٢} ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَار مَّكِين {١٣} ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَاماً فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْماً ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقاً آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ {١٤}﴾ (المؤمنون).

دەربارەی ئەم دابەش کردنە قورئانییانە کە پشت بە شکڵی دیاری کراو و جیاکەرەوە دەبەستێت (د. مور) دەڵێت: بریتین لە دابەشکردنێکی زانستییانەی وورد، و هەروەها ئاسان و تێگەیەنەر و سوودبەخشن، و ئەوەبوو لە یەکێك لە کۆنگرە زانستییەکاندا وەستا و ووتی: کۆرپەلە لە سکی دایکیدا بە سێ بەربەست یان چین دەپارێزرێت: ١- دیواری سك. ٢- دیواری مناڵدان. ٣- پەردەکانی ووێلاش.

لەبەر ئەوەی کە قۆناغەکانی گەشە کردنی کۆرپەلە زۆر ئاڵۆزن و بەهۆی ئەو گۆڕانکارییە بەردەوامانەی کە بەسەریدا دێن، دەتوانرێت پشت بە

سیستمێکی نوێی پۆلێن کردن ببەسترێت کە دامەزراوە لەسەر بەکارهێنانی ئەو زاراوە و بۆچوونانەی کە لە قورئان و سوننەتی پیرۆزدا هاتووە، و ئەم سیستمە نوێیە بەوە جیادەکرێتەوە کە ئاسانە لە تێگەیشتندا و ووردی‌یەکی زۆری تێدایە و گونجاوە لەگەڵ راستی‌یە نوێکانی کۆرپەلەزانی‌دا، بە تایبەتی توێژینەوە نوێکانی ئەم چەند ساڵەی دوایی گەورەیی ئەم ئامێری پۆلێن کردنە سەرسوڕهێنەرەی سەلماند، کە لە سەدەی حەوتەمی زایینی‌دا ئەوەندەی زانیاری وورد دەربارەی گەشەی کۆرپەلە و پۆلێن کردنی قۆناغەکانی دروست بوونی تۆمار کردووە، کە لە مێژووی مرۆڤایەتی‌دا تەنها لە سەدەی بیستەمدا ئەم زانیاری‌یانە دۆزراونەتەوە، هەربۆیە لێرەوە دەگەینە ئەوەی ئەم زانیاری‌یانە ناتوانرێت بووترێت کە لە ئاستی زانستیی سەدەی حەوتەمەوە وەرگیراوە، و تەنها بۆچوونی مەعقول و راست ئەوەیە کە بڵێین ئەم وەسفانە بە نیگا و وەحی خودایی بۆ محمد (ﷺ) هاتووە، چونکە هیچ کەسێك لەو کاتەدا نەیدەتوانی ئەم ووردەکاری‌یانە بزانێت، بە تایبەتی کە محمد (ﷺ) نەخوێندەوار بووە و هیچ جۆرە راهێنانێکی زانستی وەرنەگرتووە.

پرۆفیسۆر (الزنداني) لە چاوپێکەوتنەکەی‌دا بە (د. مور)ی ووت: ئەمانەی تۆ دەیلێیت زۆر راستن، بەڵام بەشێکی کەمە لەوەی دەربارەی قورئان و فەرموودەکان زانیوتە لە بواری کۆرپەلەزانی‌دا، و هیوادارم کە زیاتر دادپەروەر و بە ئینصاف بیت و بوار بکەیتەوە بۆ روون کردنەوەی هەموو ئەو ئایەت و فەرموودانەی لەم بوارەدە هاتووە کە پسپۆریی خۆتە، ئەویش لە وەڵامدا ووتی: من ئەوەندەی پێویست بێت لە پێشەکی کتێبێکی زانستی لەم جۆرەدا بڵاوم کردووەتەوە، بەڵام من بوار بە تۆ دەدەم کە بەشێك لە کۆتایی کتێبەکەمدا زیاد بکەیت کە تێی‌دا هەموو ئەو ئایەت و فەرموودانەی کە باسمان کرد و گفتوگۆمان لەسەر کرد کۆبکەیتەوە و لە شوێنی خۆیاندا

دایان بنێیت، و دوایی لایەنەکانی ئیعجازیان روون بکەیەتەوە، ئەم بابەتەش وەك هاوپێچێکی ئیسلامی دەخەمە سەر کتێبەکەم.

پرۆفیسۆر (الزنداني) دەڵێت: ئەوەبوو منیش کردم، و (د. مور)یش پێشەکی‌یەکی بۆ ئەم زیادکرنە ئیسلامی‌یانە دانا و کتێبەکەی لەگەڵ زیادکردنە ئیسلامی‌یەکاندا چەند جارێك چاپکرا لەژێر ئەم ناونیشانەدا: (The Developing Human-with Islamic Additions).

لە پێشەکی ئەم زیادکردنە ئیسلامی‌یانەدا بۆ کتێبەکەی (د. مور) دەڵێت: (محمد) پێغەمبەری ئیسلام پیاوێکی نەخوێندەواری سادە بووە کە لە سەدەی حەوتەمی زایینی‌دا ژیاوە و مردووە، واتە لە سەردەمێکدا کە کۆرپەلەزانی هیچ جۆرە هەواڵ و دەنگ وباسێکی نەبووە، هەروەها ووردبینیش بە هیچ شێوەیەك بوونی نەبووە و زانستی هاوێنەکان و بەصەریات نەهاتبوونە بوون، باشە دەبێت ئەم زانیاری‌یانەی لە کێوە دەست کەوتبێت؟! و چۆن توانی یەکگرتنی تۆ و هێلکە ببینێت؟!

پاشان پرۆفیسۆر (مور) دەڵێت: من هیچ گومانێکم نی‌یە لەوەدا کە ئەم زانیاری‌یانە لەلایەن خوداوە بۆ محمد نێردراوە، و هیچ گومانێکیشم لەوەدا نەماوە کە محمد نێردرا و پێغەمبەری خودایە، ئەمە شایەتی زانایەکی رۆژئاوایە نەك موسوڵمان لە سەر ئەوەی کە قورئان پەیامی خودایە.

زانایانی ئەمڕۆ دەتوانن بزانن ئەم قورئانە بە زانیاری خودایی نێردراوە و پڕە لەو زانیاری‌یانە: ﴿لَّـٰكِنِ اللَّهُ يَشْهَدُ بِمَا أَنزَلَ إِلَيْكَ أَنزَلَهُ بِعِلْمِهِ﴾ (النساء:١٦٦)، و لێرەوە ئەو راستی‌یەیان بۆ دەردەکەوێت کە محمد (ﷺ) نێردراوی خودایە ﴿وَيَرَى الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ الَّذِي أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ الْحَقَّ وَيَهْدِي إِلَى صِرَاطِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ﴾ (سبأ:٦).

## خشتەی ژمارە (١)

سیفاتە سەرەکی‌یەکانی کۆرپەلە لە ماوەی گەشە کردنی لە قۆناغی (علقة)وە بۆ گۆشتپارە (مضغة)، کە بارستە لەشی‌یەکان بەخێرایی دروست دەبن لە رۆژەکانی کۆتایی قۆناغی (علقە)دا، و گۆڕانی کۆرپەلەکە بۆ گۆشتپارە بە خێرایی‌یەکی زۆر روودەدات.

| تەمەن (بە رۆژ) | ژمارەی بارستە لەشی‌یەکان | درێژی کۆرپەلەکە (ميلليمەتر) | خاسی‌یەت و سیفاتە سەرەکی‌یەکان |
|---|---|---|---|
| ٢٠-٢١ | ١-٣ | ١,٥-٣ | پەیدابوونی چالآیی‌یەکی قوولی دەماری و بارستە لەشی‌یە یەکەمەکان، ئاشکرا بوونی لۆچی سەر (بەرزایی سەر). |
| ٢٢-٢٣ | ٤-١٢ | ٢- ٣,٥ | کۆرپەلەکە رێکە یان چەماوەیە بە کەمیی، و بۆری دەماریی لە رێگەی دروست بووندایە (یان دروست بووە) لە بەرامبەر بارستە لەشی‌یەکاندا، بەلآم بە شێوەیەکی فراوان کراوەتەوە لە هەردوو کۆتایی کۆرپەلەکەدا. |
| ٢٤- ٢٥ | ١٣-٢٠ | ٢,٥- ٤,٥ | کۆرپەلەکە چەماوە دەبێت بەهۆی هەردوو بەرزایی سەر و کلکەوە، کۆئەندامی دەمار لە بەشی سەریی‌دا دەست بە داخران دەکات، دیسکی گوێ پەیدا دەبێت، و توورەکەی چاوەکانیش پەیدا دەبن. |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٢٦-٢٧* | ٢١-٢٩ | ٣,٥- ٥ | پەیدابوونی چەکەرەی هەردوو پەلی سەرەوە، کۆئەندامی دەمار لە بەشی کۆتایی (کلکی)دا دەست بە داخران دەکات، پەیدابوونی سێ جووتی کەوانە سنگ، ئەگەری ئەوە هەیە بەرزیی جیاکەرەوەی دڵ ببینرێت، پەیدا بوونی هەردوو کونی گوێکان. |
| ٢٨-٣٠ | ٣٠- ٣٥ | ٤-٦ | کۆرپەلە لەم کاتەدا لە شێوەی پیتی Cدا دەبێت، هەردوو چەکەرەی دوو پەلەکەی سەرەوە لە شێوەی سەوڵدا دەبن، چوار جووتی کەوانە سنگ پەیدا دەبن، دوو چەکەرەی پەلەکانی خوارەوە دەست دەکەن بە دەرکەوتن، توورەکەی هەردوو گوێ پەیدا دەبن، دەتوانرێت دیسکی هاوێنەکانی هەردوو چاو جیابکرێتەوە، و کلکێکی تەنك پەیدا دەبێت بۆ کۆرپەلەکە. |
| ٣١-٣٢** | | ٥-٧ | هەردوو پەلی سەرەوە لە شێوەی سەوڵدا دەبن، هەردوو کونی لووت و هاوێنەی چاو پەیدا دەبن، لەگەڵ ئاشکرا بوونی دیسکی چاوەکان. |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٣٦-٣٣ | ٤٢-٣٦ | ٩-٧ | پەیــدا بــوونی پــانیی هـــەردوو دەسـتەکان، پەیـدا بـوونی توورەکـەی هاوێنــەی هــەردوو چــاوەکان، بــەرز بوونــەوەی هــەردوو کــونی لــووت، هـەردوو پـەلی خـوارەوە لـە شـێوەی سەوڵدان، پەیدابوونی لۆچێکی مل. |
| ٤٠-٣٧ | | ١١-٨ | پەیـدا بـوونی پـانیی هـەردوو پێکـان، پەیـدابوونی رەنـگ لـە تـۆڕی چـاودا، گەشە کردنی هەردوو بەرزیی گوێکان. |
| ٤٣-٤٠ | | ١٤-١١ | پەیــدابوونی پەنجــەکانی پەلــەکان، گەشە کردنی هەردوو بەرزیی گوێکان بە شێوەیەك کە شکڵی دەرەوەی گوێ جیادەکرێتەوە، رێك بوونەوەی دەمارە پــەتك و پشــت دەســت پێدەکــات، دەرکەوتنی توورەکەکانی مێشك. |

* چـەندین هەڵاوسـاوی و چـاڵایی و تۆپـەڵی لەشـی پەیـدا دەبـن کـە شـوێنەواری ددان دەبەخشن، کە ئەمە یەکەم دەرکەوتنی ئاشکرای شێوەی گۆشتپارەیە (المضغة).

** لەم قۆناغە و قۆناغەکانی دوایی‌دا زۆر گرانە کە ژمارەی بارستە لەشی‌یەکان دیاری بکرێت، و ئەم ژمارەیە وەك پێوەرێك سوود بەخش نی‌یە.

بسم الله الرحمن الرحيم

# إنما يخشى الله من عباده العلماء

صدق الله العظيم



کۆرپەلـەی مـرۆڤ لـەرۆژانی ۲۳ و ۲٤ ی تەمـەنی‌دا لـە کۆتـایی قۆنـاغی (العلقة)دا دەبێت، و پاشان دەچێتە قۆناغێکی نوێوە کە قورئانی پیرۆز بە (مضغة) باسی کردووە، ئەویش لە رۆژانی ۲٥-۲٦ی تەمەنی‌دا، کە دیارە ئەم گۆڕانکاری‌یە زۆر بە خێرایی دەبێت، ئەگەر سەرنج بدەین دەبینین لەم ئایەتە پیرۆزانەدا باسی (مضغة) هاتووە:

- ﴿ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً﴾ (المؤمنون:١٤)، واتە: پاش ئەوەی کۆرپەلە دەبێت بە (علقة)، ئێمە یەکسەر دەیگۆڕین بۆ (مضغة).

- هەروەها لە ئایەتێکی تردا هاتووە: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّنَ الْبَعْثِ فَإِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ مِن مُّضْغَةٍ مُّخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ لِّنُبَيِّنَ لَكُمْ﴾ (الحج:٥)، واتە: ئەی خەڵکینە ئەگەر ئێوە گومانتان هەیە لە زیندوو بوونەوە ئەوا بۆ سەیری دەسەڵاتی ئەو خودایە ناکەن کە سەرەتاتانی لە گڵەوە دروست کرد پاشان نەوەکانی لە (نطفة)وە کە دەبێت بە (علقة) و دواتریش دەبێت بە (مضغة)، کە ئەم (مضغة)یە هەندێکی دروست بووە و هەندێکی تریشی دروست نەبووە، ئێمە ئەمە بۆ ئێوە باس دەکەین تاوەکو بۆتان روون ببێتەوە و باوەڕتان بە زیندوو بوونەوە بەهێز بێت.

- لە فەرموودەیەکی پێغەمبەریشدا (ﷺ) هاتووە: ﴿عَن عَبْدُ اللّٰهِ بن مَسْعود (رضي الله عنه) قال: حَدَّثَنَا رَسُولُ اللّٰه (ﷺ) وَهُوَ الصَّادِقُ الْمَصْدُوقُ قَالَ: « إِنَّ أَحَدَكُمْ يُجْمَعُ خَلْقُهُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ أَرْبَعِينَ يَوْماً ، ثُمَّ يَكُونُ فِي ذَلِكَ عَلَقَةً مِثْلَ ذَلِكَ ، ثُمَّ يَكُونُ فِي ذَلِكَ مُضْغَةً مِثْلَ ذَلِكَ .... ﴾ رواه مسلم، واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: هەریەکێك لە ئێوە کۆبوونەوە و دروست بوونی لە ٤٠ رۆژدا تەواو دەبێت، هەر لەو ٤٠ رۆژەدا (علقة) دەبێت، و هەر لەو ماوەیەشدا گۆشتپارە (مضغة) دەبێت.

- لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە: ﴿عَنْ أَنَس بْنِ مَالِك (رضي الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: « إِنَّ اللّٰهَ وَكَّلَ فِي الرَّحِمِ مَلَكاً فَيَقُولُ يَا رَبِّ نُطْفَةٌ ، يَا رَبِّ عَلَقَةٌ ، يَا رَبِّ مُضْغَةٌ ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَخْلُقَهَا قَالَ: يَا رَبِّ ، أَذَكَرٌ أَمْ يَا رَبِّ أُنْثَى؟ يَا رَبِّ شَقِيٌّ أَمْ سَعِيدٌ؟ فَمَا

الرِّزْقُ فَمَا الأَجَلُ؟ فَيُكْتَبُ كَذَلِكَ فِي بَطْنِ أُمِّــهِ »﴾ رواه مسلم، واتە: خوای گەورە فریشتەیەکی دیاری کردووە کە ئاگای لە منداڵدان بێت، کاتێك کە کۆرپەلەکە دروست دەبێت، ئەم فریشتەیە نازانێت کەی دەبێت بەچی و پرسیار دەکات: ئەی پەروەردگار نوتفەیە؟ ئەی پەروەردگار بووە بە (علقة)، ئەی پەروەردگار بووە بە گۆشتپارە (مضغة)؟ کاتێکیش کە پەروەردگار ویستی دروست ببێت فەرمان بە فریشتەکە دەکات، ئەویش دەڵێت: نێرە یان مێیە؟ ئایا خۆش بەختە یان زەرەرمەند؟ رۆزی چییە؟ ئەجەلی کەیە؟ خوای گەورە پێی دەڵێت و فریشتەکە بۆی دەنووسێت، ئاوا لە سکی دایکیدا.

ئەگەر جارێکی تر بگەڕێینەوە بۆ فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبی، ووشەی (مضغة) لە زمانی عەرەبیدا بەم مانایانە هاتووە: ١-شيء لاكته الأسنان. ٢-مضغ الأمور: يعني صغارها. ٣-المضغة: في حجم ما يمكن مضغه[1]. واتاکانیان: ١-بە مانای شتێك کە دان جوییبێتی (واتە پارووەیەك)، هەر بۆیە لێرەوە دەتوانین بڵێین کە مانای کوردی (المضغة) بریتییە لە گۆشت پاروو یان گۆشتپارە. ٢-بە مانای شتێکی زۆر بچووك. ٣-هەروەها هەندێك لە راڤەکارانی قورئان دەڵێن بە مانای شتێك دێت کە قەبارەکەی ئەوەندە بێت ددان بتوانێت بیجوێت.

لە کاتی هەڵبژاردنی زاراوەیەك بۆ وەسف کردنی قۆناغێکی گەشە کردنی کۆرپەلە پێویستە ئەو زاراوەیە شکڵی دەرەوە و گۆڕانکارییەکانی ناو لەشی کۆرپەلەکە وەسف بکات بە ووردی، کە دەبینین ووشەی (المضغة) هەموو ئەم سیفاتە زانستییانەی تێدایە وەك لە خوارەوە باسی دەکەین، زانستی کۆرپەلەزانی ووردیی لە هەڵبژاردنی ئەم زاراوەیەدا بۆ روون کردووینەتەوە،

---

(1) بڕوانە فەرهەنگەکانی: (لسان العرب)، (تاج العروس)، (معجم مقاييس اللغة)، هەروەها تەفسیرەکانی: (الطبري)، (إبن كثير)، (فتح القدير)، (البيضاوي)، (القرطبي).


وێنەی (٥-١): کۆرپەلە لە سەرەتای [illegible] دووەمدا

کە بینراوە لە کۆتایی قۆناغی (العلقة)دا بە خێرایی کۆرپەلەکە شێوە هەڵواسراوەکەی لە دەست دەدات، ئەو قاچەی (بەشەی) کە کۆرپەلەکە خۆی بەهۆیەوە بە منالدانەوە هەڵواسیوە جیاواز دەبێت بۆ دروست کردنی (ناووکە پەتك Umbulical Cord)، بەهۆی چەمانەوەی کۆرپەلەکە بەسەر خۆیدا لە ڕۆژانی ٢٢-٢٦دا بەشێکی توورەکەی هێلکە (Yolk Sac) دەچێتەوە ناو کۆرپەلەکە و لەگەڵ بەشێکی قاچی هەڵواسەردا پێکەوە ناوەڕاستە ڕیخۆڵەی سەرەتایی (Midgut) دروست دەکەن، ئەو بەشەی تر کە لەم دووانە دەمێنێتەوە یەکدەگرێت و پەردەی ئەمینیۆنی (Amnion) دەوریان دەدات و پێکەوە ناووکە پەتك دروست دەکات.

لە لایەکی ترەوە پاش دروست بوونی سەرەتایی کۆرپەلەکە و وڵاشەکەی ئیتر کۆرپەلە دەست دەکات بە وەرگرتنی خۆراك و ووزە لە دایکەکەوە، کە ئەمە دەبێتە هۆی خێرابوونی پرۆسەی گەشەکردنی کۆرپەلەکە و سەرەنجام دەبێتە هۆی پەیدا بوونی تۆپەڵە لەشییەکان یان بارستە لەشییەکان (الفلقات Somites) لەم زۆربوونە خێرایەی خانەکانەوە (بە تایبەتی خانەکانی چینی ناوەڕاست (میزۆدێرم)) (بڕوانە وێنەی ٥-٢)، بەهۆی بوونی ژمارەیەکی زۆر لەم بارستە لەشیانەی کە دروست دەبن شکلی کۆرپەلەکە بە ئاشکرا و بە تەواوەتی نزیك دەبێتەوە لە شکلی ماددەیەکی جوراو کە شوێنی ددانەکانی لەسەر دەرچووە!! (بۆ روون بوونەوەی بابەتەکە بڕوانە وێنە ڕەنگاوڕەنگەکانی: ١٠٥/ هـ).




**وێنەی** (٥-٢): پرۆسەی دروست بوونی چینی ناوەڕاست ( میزۆدێرم ):

- هێلکاریەکی دیسکی کۆرپەلەیە کە دەریدەخات چۆن خانەکانی چینی دەرەوە کۆچ دەکەن بۆ ناو دیسکەکە بە هەموو لایەکیدا.

- هێلکاری برگەیەکی کۆرپەلەیەکی (١٥رۆژ)، بەئاشکرا کۆچی خانەکان دەردەخات لە دەرەوە بۆ ناوەوە بە مەبەستی دروست کردنی چینی ناوەڕاست ( میزۆدێرم Mesoderm ).

- وێنەیەکی راستەقینەی مایکرۆ -سکۆپی هێلکاریەکەی سەرەوەیە.

- وێنەی خوارەوەش هێلکاریەکی تەواو بوونی پرۆسەکەیە.

بەپێی ئەو ووردەکارییانەی کە زانایانی کۆرپەلەزانی ئەمڕۆ باسیان کردووە زاراوەی (مضغة) بە تەواوەتی وەسفی ئەو کردارانە دەکات کە لەم قۆناغەدا روودەدەن، ئەو کردارانەی روودەدەن لەم قۆناغەدا بریتین لە:

١- پەیدابوونی چەند بارستەیەکی لەشیی (الفلقات Somites) لە چینی ناوەڕاستەوە (Mesoderm) پاش قۆناغی (العلقة) لە پشتی کۆرپەلەکەوە (کە پاشان ئێسقان و گۆشتی کۆرپەلەکە لەمانەوە پەیدا دەبێت)، پەیدابوونی ئەم تۆپەڵانە کە ژمارەیان وورده وورده زۆر دەبێت شکڵی پارووییەك دەدات بە کۆرپەلەکە کە ددان جوییبێتی (بڕوانە وێنەی ٥-٣)، کە دەرکەوتنیان بە خشتەیەکی زەمەنی ووردی دیاری کراو دەبێت بەشێوەیەك دەتوانرێت بەهۆی زانینی ژمارەی ئەم بارستە لەشییانەوە تەمەنی کۆرپەلەکە دیاری بکرێت (بڕوانە خشتەی ژمارە (١) لە بەشی پێشوودا)، بەردەوام شکڵی کۆرپەلەکە لەم قۆناغەدا بە خێرایی لە گۆڕاندایە (بە هاوشێوەی پاروو کە لەناو دەمدا بە بەردەوامی شکڵی دەگۆڕێت) بەڵام ئەو بارستە لەشییانە هەر دەمێنن کە شکڵی بەردەوامی گۆشت پارە دەدات بە کۆرپەلەکە بە درێژایی ئەم قۆناغە.




وێنەی (٥-٣): لەم هێلکارییانەدا دەبینین چۆن لەگەڵ بەرەوپێش چوونی تەمەنی کۆرپەلەکەدا لەشی دەچەمێتەوە و بارستە لەشییەکانیش دەست دەکەن بە دەرکەوتن و ژمارەیان بە تێپەڕبوونی کات بەرەو زیادبوون دەڕوات.

٢- شکڵی پارروو بەهۆی جوویینەوە بەردەوام دەگۆڕێت لە ناو دەمدا، بەهەمان شێوەش شکڵی کۆرپەلە لەم قۆناغەدا بەهۆی پەیدابوونی لق و پارچە و هەڵئاوساوی و نووشتانەوەی بەردەوام هەمیشە لە گۆڕاندایە بە تەواوەتی وەك پارروو لە کاتی جوویندا (**وێنەکانی: ژمارە ٥-٤ ، ٥-٥**).

٣- لەگەڵ ئەمانەشدا لە هەمان ئەم کاتەدا و لەژێر بەرزایی سەردا چەند ریزێك هەڵاوساوی پەیدا دەبن لە چینی ئیکتۆدێرمی دەرەوەدا کە ئەمانە کەوانەکانی قورگ (**Pharyngeal Arches**) پێکدێنن لە مرۆڤدا و هەر کەسێك سەیری دەکات وادەزانێت کە ٥ بارستەی لەشین و لە نێوانیاندا درز هەیە (**بڕوانە وێنەی ڕەنگاوڕەنگی: ١٠٦/ هـ**)، هەروەها بەهۆی چەمانەوەی سەر و کلك بۆ لای سکەوە و دەرکەوتنی بەشی پێشەوەی سەر و زیادبوونی هەڵئاوساوییەکانی هەموو لایەکی لەشی کۆرپەلەکەوە، کۆرپەلەکە شێوەی پارچەیەك گۆشتی لەت لەتکراو وەردەگرێت (**بڕوانەی وێنەی ٥-٤**).




**وێنەی (٥-٤): بارستە لەشییەکان و کەوانەکانی قورگ و هەڵاوساوی و بەرزی و نزمی لەشی کۆرپەلەکە شێوەی پارروویەکی جووراو (گۆشتپارە)ی دەداتێ.**

٤- گۆڕانکاریی لە باری لەشی کۆرپەلەکەدا ڕوودەدات بەهۆی گۆڕانی چەقی قورسایی لە لەشیدا، و دروست بوونی بەردەوامی شانەی نوێ، کە ئەمە لە گۆڕانکاری شکڵ و باری پاروو دەچێت کاتێک لەناو دەمدا دەجووڕێت، کەواتە کۆرپەلەکە لە پارچەیەك گۆشتی بێشکڵ دەچێت و لە مرۆڤ ناچێت و هیچ بەڵگەیەك نییە کە بیسەلمێنێت ئەمە کۆرپەلەیەکی مرۆییە (هەروەك موفەسیرەکانی قورئان کە بەم شێوەیە ڕاڤەی ووشەی (مضغة)یان کردووە).



وێنەی (٥-٥): لە لای ڕاست پارچەیەك گۆشتە کە شوێنەواری ددانەکانی مرۆڤی لەسەرە و لە لای چەپ کۆرپەلەیەکە لە قۆناغی گۆشتپارەدا (بڕوانە لێکچوونی تەواوی نێوانیان).

٥- هەروەکو چۆن لە کاتی قووتدانی پاروو بۆ ناو قورگ پاروەکە شکڵێکی نیو بازنەیی (وەکو پیتی Cی ئینگلیزی) وەردەگرێت، بە هەمان شێوەش کۆرپەلە لەم قۆناغەدا بە تەواوەتی لە شکڵی پیتی Cی ئینگلیزیدایە (بڕوانە وێنەی ٥-٦)، ئەمانەی لەسەرەوە باسمان کرد سەلمێنەری زانستییانەی مانای یەکەمی (مضغة)یە کە بە مانای پاروویەك یان (گۆشتپارە) دێت (بۆ ڕوونبوونەوەی زیاتر بڕوانە وێنە ڕەنگاوڕەنگەکانی: ١٠٧/ هـ ، ١٠٨/ هـ، ١٠٩/ هـ ، ١١٠/ هـ).

٦- درێژی کۆرپەلە لە کۆتایی ئەم قۆناغەدا دەگاتە (١سم) واتە زۆر بچووکە، ئەمەش سەلمێنەری مانای دووەمی (مضغة)یە کە بە مانای (شتێکی زۆر بچووك) دێت، کە لەم کاتەدا سەرەتاکانی هەموو ئەندامەکان دروست بوون بەڵام لە شێوەی چەکەرە و خونچەیەکدان، و لە قۆناغەکانی داهاتوودا ئەم ئەندامانە شکڵ و قەبارەی ئاسایی خۆیان وەردەگرن، کەواتە (مضغة) بچووکترین مرۆڤە کە سەرەتای هەموو ئەندامەکانی لەشی دروست بوون.

٧- مانای سێیەمی (مضغة) کە ڕاڤەکارانی قورئان باسیان کردووە، واتە بەمانای شتێك کە قەبارەکەی ئەوەندە بێت ددان بتوانێت بیجوێت، ئەم مانایە دەچەسپێت بەسەر قەبارەی کۆرپەلەدا چونکە وەك ووتمان زانایانی کۆرپەلەزانی دەڵێن: درێژی کۆرپەلە لەم قۆناغەدا (١سم) دەبێت (وێنەی: ١١١/هـ)، ئەمەش بچووکترین شتە کە ددان بتوانێت بیجوێت (بڕوانە وێنەی ٥-٧)، بەڵام لە قۆناغی پێشتردا واتە (العلقة) قەبارەی کۆرپەلە (٣,٥ملم) دەبێت، کە ئەوەندە بچووکە ددان ناتوانێت بیجوێت، قۆناغی (المضغة) تاوەکو کۆتایی هەفتەی شەشەمی سکپڕی دەخایەنێت.




وێنەی ( ٥-٦ ): چەند وێنەیەکی ڕاستەقینەی مایکرۆسکۆپی کۆرپەلەیە لە مانگی دووەمیدا، دەبینین چۆن لەشی دەچەمێتەوە بەسەر خۆیدا و شێوەی پیتی ( C )ی ئینگلیزی وەردەگرێت.




وێنەی (٥ - ٧): لە كۆتایی قۆناغی گۆشتپارەدا درێژی كۆرپەلەكە دەگاتە ١٢ میللیمەتر، كە بچووكترین شتێكە ددان بتوانێت بیجوێت، دەبینین سەری زۆر لە قۆناغەكانی پێشتر زیاتر گەشەی كردووە ...

وەك باسمان كرد گۆڕانی كۆرپەلەكە لە قۆناغی (العلقة)وە بۆ قۆناغی گۆشتپارە (المضغة) زۆر بە خێرایی دەبێت، كە لە ڕۆژی ٢٤دا (علقة)یە و یەكسەر لە ڕۆژی ٢٥دا دەبێت بە (مضغة)، ئەویش بەهۆی ئەوەوەیە كە لە یەك دوو ڕۆژی كۆتایی قۆناغی (العلقە)دا كۆرپەلەكە دەست دەكات بە وەرگرتنی خاسییەتەكانی گۆشتپارە (المضغة)، كە بارستە لەشییەكان (Somites) دەست دەكەن بە پەیدابوون بۆ ئەوەی لە دواییدا ببن بە

گرنگترین جیاکەرەوەکانی قۆناغی گۆشتپارە، قورئانی پیرۆز وەسفی ئەم خێرایی‌یەی کردووە لەم گۆڕانکاری‌یانەدا، کە لە ئایەتەکەی سوورەتی (المؤمنون)دا دەبینین نێوانی (العلقة) و (المضغة)ی بە پیتی (ف)ی پێکەوە بەستن گرێداوە (فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً)، کە وەك لە فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبی‌دا هاتووە بەکار هێنانی ئەم پیتە مانای ڕێکخستن و بەدوادا هاتنی خێرای ڕووداوەکان دێت (للترتيب والتعقيب).

بێجگە لە بوونی ئەو بارستە لەشی‌یانە چەند تەفاصیلێکی تری لەشی کۆرپەلەکە هەیە کە زاراوەی (مضغة)ی بەسەردا دەچەسپێنێت، لەناو کۆرپەلەکە خۆی‌دا بارستەی تر هەیە کە پێ‌یان دەووترێت پارچە لەشی‌یەکان (القطع البدنية Metameres)، کە لە ناویاندا بۆڕی‌یە سەرەتایی‌یەکانی گورچیلە دروست دەبێت، ئەمانە لەگەڵ پەیدا بوونی بارستە لەشی‌یەکان لە ناوچەی سەر و ملدا پەیدا دەبن، و پاشان بەرەو ناوچەی کلکیی کۆرپەلەکە (Caudal Portion) درێژ دەبنەوە بە هێڵێکی تەریب بۆ ئاراستەی بارستە لەشی‌یەکان.

هەروەها وەسفی پەروەردگار بۆ کۆرپەلە لەم قۆناغەدا بە زاراوە (مضغة) مانای ئەوە دەگەیەنێت کە لەشی کۆرپەلەکە لەوپەڕی نەرم و نیانی‌دایە، چونکە ئەو پارووەی دەجووڕێت نەرمە و بە تایبەتی نەرمتریش دەبێتەوە لەکاتی جووڕانی لەناو دەمدا، ئەگەر لە ڕووی کۆرپەلەزانی‌یەوە سەیری ئەو ماددەیە بکەین کە لەم کاتەدا لەشی کۆرپەلەکەی لێ‌پێك هاتووە، زانایان بۆمان باس دەکەن کە لە خانە و شانەیەك پێك هاتووە کە پێ‌یان دەووترێت شانەی میزەنکیمی (Mesenchymal Tissues)، کە زانایان لە وەسفی ئەم شانانەدا دەڵێن: بریتین لە چەند شانەیەکی نەرمی ڕێکبوو بەشێوەیەکی خاو و پێکهاتەیان پتەونی‌یە، ئەم نەرمی‌یە گرنگە بۆ ئەوەی کۆرپەلەکە بەسەر خۆی‌دا پێچ بخوات لە هەموو لایەکەوە و وورده وورده شکڵی ئاسایی

وەربگرێت، بە تایبەتی کە هەردوو دەقی قورئانی: ﴿أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ يُمْنَى{٣٧} ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّى{٣٨}﴾ (القيامة)، ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن سُلَالَةٍ مِّن طِينٍ، ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ، ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ﴾ (المؤمنون) ئاماژە بەوە دەدەن کە کۆرپەلەکە لە قۆناغی دوای گۆشتپارەوە رێك دەبێتەوە، ئەویش بەهۆی پتەو بوونی لەشی‌یەوە، کە ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە پێشتر لەشی نەرم و خاو بووە.

لە لایەکی ترەوە لە سەرەتادا ئەو توێپەڵە یان بارستە لەشی‌یانەی باسمان کرد جیانابنەوە بۆ دروست کردنی ئەندامەکان، بەڵکو لە دوایی‌دا ئەم کردارە دەست پێ‌دەکات، و دەبێتە هۆی دروست بوونی سەرەتای ئەندامەکان و خانە سەرەتایی‌یە دروست کەرەکانی ئەندامەکانی لەش، وەك:

{دڵ و مێشك و جگەری سەرەتایی کە لەم کاتەدا دروست بوونیان تەواو نابێت، سەرەتای کۆئەندمی سووڕانی خوێن، سەرەتای گورچیلە (Pronephron) و کۆئەندامی میز، و سەرەتای کۆئەندامی هەرس و هاوپێچەکانی، و خونچەی هەر چوار پەلەکە کە بە شێوەیەك دەردەکەون وەك یەکێك کە دەست و قاچی بڕابێتنەوە، پاشان سەرەتای پەنجەکانی تێ‌دا پەیدا دەبێت و دەستەکە تیشکدەر دەردەکەوێت و لە شێوەی سەوڵدا دەبێت لە کۆتایی قۆناغی (المضغة)دا، هەروەها هەیکەلی سەرەتایی چاوەکان و گوێچکەکان دەردەکەون، کە هەردوو چاو و هەردوو گوێ بە تەواوەتی لێرەدا دروست نابن و بەڵکو تەنها سەرەتاکانیان پەیدا دەبن و لە قۆناغەکانی داهاتوودا گەشەیان تەواو دەبێت}،کە لە کۆرپەلەزانی نوێ‌دا پێی دەووترێت قۆناغی دروست بوونی سەرەتای ئەندامەکان (Organogenesis) (بڕوانە وێنەکانی: ٥-٨ ، ٥-٩) (هەروەها وێنەی ڕەنگاوڕەنگی: ١١٢/ هـ).

المضغة مع ظهور الأقواس البلعومية الأولى و الثانية

المضغة مع ظهور الأقواس البلعومية الأولى و الثانية

النتوء الجبهي
النتوء الأنفي الوحشي وفتحة الأنف
النتوء الأنفي الأنسي
الفم البدائي
القلب
الكبد
صورة توضح الشكل الجنيني في الأسبوع الخامس

صورة لجنين توضح الكتل البدنية والعضلات حولها كما توضح بروز الطرف العلوي والسفلي

وێنەی ( ٥-٨ ): لە کۆتایی قۆناغی گۆشتپارەدا هەموو ئەندامەکانی کۆرپەلەکە دروست بوون، بەڵام هەندێکیان دروست بوونیان تەواو کامڵ بووە، و هەندێکیان لە داهاتوودا تەواو دەبێت، ئەمەش پڕاوپڕی مانای ئایەتەکەی سوورەتی ( الحج ٥ ): ﴿... ثُمَّ مِن مُّضْغَةٍ مُّخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ ......﴾.




وێنەی ( ٥-٩ ): کۆرپەلە لە قۆناغی گۆشتپارەدا شکڵی مرۆڤی نییە، لە داهاتوودا ئەو شکڵە وەردەگرێت.

کەواتە هەندێك لەو ئەندامانە بە تەواوەتی لە قۆناغی (المضغة)دا دروست دەبن و ئەوانی تر لە قۆناغەکانی داهاتوودا دروست دەبن، واتە لە قۆناغی (المضغة)دا تەنها بەشێکی ئەندامەکان بە تەواوەتی و بە کاملی دروست بوون و بەشەکەی تر هێشتا بە تەواوەتی دروست بوونیان تەواو نەبووە (کە لە زمانی زانستی کۆرپەلەزانی ئەمڕۆدا پێیان دەووترێت خانە جیاواز بوو و جیاواز نەبووەکان Differentiated & undifferentiated Cells) (هەروەها بڕوانە وێنەی ڕەنگاوڕەنگی: ١١٣/ هـ).

لێرەدا با بگەڕێینەوە بۆ ئەو ئایەتە پیرۆزەی پێشتر ئاماژەمان پێدا کە دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ من مُضْغَةٍ مُخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ لِّنُبَيِّنَ لَكُـم﴾، واتە: ئەو (مضغة)یە هەندێکی دروست بووە و هەندێکی تری هێشتا بە تەواوەتی دروست نەبووە (یان هەندێکی جیاواز بووە و هەندێکی نا)!!

زانای کۆرپەلەزانی ناودار (د. کیث مور) لە کتێبی (گەشە کردنی مرۆڤ یان مرۆڤی گەشە کردوو The Developing Human)دا دەربارەی ئەم بابەتە و لە وەسفی ماسولکەکاندا دەڵێت: (سەرەتای ماسولکەکان لەگەڵ پێکهێنەری ئێسکەکان و شانەکانی تر لە گرووپێکی بەکۆمەڵی سەرەتاییدا دەبن، هەموو ئەمانە لە چل ڕۆژی یەکەمدا دروست دەبن لە قۆناغی گۆشتپارە (المضغة)دا، بەڵام پێکهێنەرە سەرەتایییەکانی ماسولکە لەم کاتەدا هێشتا جیاواز نەبوون بۆ پێکهێنانی ماسولکە ڕاستەقینەکان).

زانایانی پێشینیش لەم ڕاستییە تێگەیشتبوون لە قورئان و فەرموودەکانەوە بۆیە چەند ووتەیەکیان ووتووە کە بریتییە لە ناوەڕۆکی دۆزینەوە زانستییەکانی ئەمڕۆ، بۆ نموونە موفەسیری قورئان زانا (إبن کثیر)[2] لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: (المضغة) بریتییە لە پارچەیەك گۆشت کە شکڵێك و ڕێکخستنێکی دیاری کراوی نییە، کە دوای ئەمە شکڵی

(2) ئەم زانا موسوڵمانە لە سەدەی (١٤) زایینیدا ژیاوە.

ڕێکدەخرێت، و سەر و دەستەکان و سنگ و سك و ڕانەکان و قاچ و سەرجەم ئەندامەکانی بۆ وێنە دەکرێت و دروست دەبێت[3].

بەڕاستی چەند ئاماژەیەکی سەرسوڕهێنەرن!! و ئیعجازێکی زانستی نایابن کە بە تەواوەتی ئەم زاراوانە تەعبیر لەو پرۆسەیە دەکەن کە پێشتر باسمان کرد، دەی ئەگەر ئەمە فەرموودەی خودا نەبێت کێ دەیتوانی پێش ١٤٠٠ساڵ لەمەوبەر ئەم قسە دامەزراوانە بکات، کە وەك پێشتر باسمان کرد یەکەم کەسێك کە وای دانا لەشی کۆرپەلە تۆپەڵ تۆپەڵە زانا (مارسیللۆ ماڵپێجی) بوو لە ساڵی (١٦٧٢ن)دا کاتێك کە چەند وێنەیەکی جووجکی مریشکی بڵاو کردەوە، بەڵام قورئانی پیرۆز ١٠٠٠ ساڵ پێش زانیاری مرۆڤەکانی داوەتەوە، چونکە ووتەی پەروەردگارە: ﴿قُلْ أَنزَلَهُ الَّذِي يَعْلَمُ السِّرَّ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِنَّهُ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ (الفرقان:٦)، ﴿أَفَلاَ يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ؟ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ اللّهِ لَوَجَدُواْ فِيهِ اخْتِلاَفًا كَثِيرًا﴾ (النساء:٨١)، ﴿لَا يَأْتِيهِ الْبَاطِلُ مِن بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ﴾ (فصلت:٤٢).

وێنەی (٥-١٠): سەرەتای هەموو ئەندامەکانی مرۆڤ لە قۆناغی گۆشتپارەدا دروست دەبێت.

(3) بڕوانە تەفسیری (إبن كثير)/ ج٤- لاپەڕە ٤٠٩/ سوورەتی (الحج) ئایەتی (٥).

## شەق کردنی ( دروست کردن و دەرهێنانی ) بیستن و بینین:

یەکێك لەو دیمەنە سەرنج ڕاکێشانەی کە مرۆڤ سەرسام دەکات بریتی‌یە لە ڕووداوی دروست بوونی چاوەکان و گوێکان لە کۆرپەلەدا، ئەمانە بە شێوەیەکی زۆر نائاسایی لەلای مرۆڤ دروست دەبن، و هیچ کەسێك ناتوانێت تەصەوری دروست بوونیان بکات ئەگەر بێتو بە چاوی خۆی نەیبینێت.

هەر بۆیە زۆر سەرسوڕهێنەرە کە پێغەمبەرمان (ﷺ) لە هەندێك پاڕانەوە و کڕنووش بردنی‌دا دەیفەرموو: ﴿عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ (رضي الله عنه) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)....... وَإِذَا سَجَدَ قَالَ « اللَّهُمَّ لَكَ سَجَدْتُ وَبِكَ آمَنْتُ وَلَكَ أَسْلَمْتُ، سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذِي خَلَقَهُ وَصَوَّرَهُ وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ تَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ »........﴾ رواه مسلم، واتە: پێغەمبەر (ﷺ) لە کاتی کڕنووش بردندا ئەم نزایەی دەخوێند: خوای گەورە بۆ تۆ کڕنووشم برد و باوەڕم بە تۆ هێناوە و خۆم تەسلیمی تۆ کردووە، روخسارم کڕنووشی برد بۆ ئەو کەسەی کە دروستی کردووە و وێنەی کێشاوە و بیستن و بینینی لێوە شەق کردووە و دروست کردووە، پاك و بێگەردی بۆ ئەو خودایەی کە باشترینی دروستکەرانە.

زۆر سەرنج ڕاکێشە کە دەبینین ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی ئەوەی پێ‌داوین کە بیستن و بینین لە روخسارەوە بە شێوەی شەقبوون دروست دەبێت، و خۆی لە خۆی‌دا بریتی‌یە لە ئیعجازێکی زانستی و ئیعجازێکی هەواڵدان، کۆرپەلەزانی نوێ بۆمان باس دەکات کە ۳ کرداری سەرەکی هەیە لە مێژووی دروست بوونی چاوەکان و گوێکاندا:

١- کردارێکی دروست بوون لەڕێی جیابوونەوەی ئەندامێك لە ئەندامێکی تر و دەرهێنانی لێ‌یەوە.

٢- کردارێکی دروست بوون لە ڕێی دروست بوونی چالاییەکەوە.

٣- کردارێکی لەتبوون و دووکەرت بوونی پەردەکان.

لە زمانی عەرەبیدا ئەو ووشەیەی کە تەعبیر لەم هەموو کردارانە دەکات و هەموو ئەو مانایانە کۆدەکاتەوە بریتییە لە ووشەی شەق کردن (شقّ)، لە فەرهەنگی (لسان العرب)دا هاتووە: (واشتقاق الحرف: أخذه منه) واتە: شەق کردن وەك لە شەق کردن و دەرهێنانی پیتێك لە پیتێکی تر مانای دەرهێنان دەگەیەنێت، هەروەها لە (معجم مقاييس اللغة)دا هاتووە: (شقّ: يدلُّ على انصداعٍ في الشَّيء) واتە: شەق کردن مانای دروست بوونی چاڵایی لەشتێکدا دەگەیەنێت، هەر لە (لسان العرب)دا هاتووە: (والشَّقُّ: الصَّدعُ البائن) واتە: شەق بریتییە لە چاڵاییەکی ئاشکرا، دەربارەی مانای سێیەم: لە (لسان العرب)دا هاتووە: (شقّ الثياب: مَزَّقَه تَمزيقاً) واتە: شەق کردنی جل بریتییە لە لەت و پەت کرنی، کەواتە هەر سێ مانا زانستییەکەی زاراوەی شەق کردن لە زمانی عەرەبیدا دەدرێتە پاڵ ووشەی (شقّ).

با ئێستا بچینە سەر درێژەی بابەتەکە، تا بزانین لە رووی کۆرپەلەزانییەوە ئەوەی کە روودەدات لە بواری دروست بوونی گوێکان و چاوەکان چییە و ئایا ئەو مانایانەی بەسەردا دەچەسپێت؟

**لە بواری دروست بوونی چاوەکاندا:**

یەکەم جار لە بەرزایی سەری کۆرپەلەکەدا دوو چاڵایی بچووك پەیدا دەبن کە ناودەبرێن بە چاڵایی بینین (الفجوة البصرية Optic Sulcus) لە بەشی پێشەوەی هەردوو لای بۆری دەماریی یان تویّی دەماری (الأنبوب العصبي Neural Folds) لە رۆژی ٢٢دا (واتە لە کۆتایی قۆناغی (العلقة) و سەرەتای قۆناغی (المضغة)دا)، کە پاشان هەردوو لای بۆری دەماریی یەکدەگرن و مێشکی پێشەوە (Forebrain)ی کۆرپەلەکە دروست دەکەن، لە هەمان کاتدا ئەو دوو چاڵاییەی کە لە هەردوولای بۆرییەکەدا بوون ئەستوور دەبن و هەر یەکەیان قاچێکی بینینی بەتاڵ (ساق بصرية مجوفة Optic Stalk) دروست دەکەن، کە هەریەکەیان نزیك دەبێتەوە لە سەر

رووی پێست لە هەردوو لای مێشکی کۆرپەلەکەوە، و پاشان بە شێوەی توورەکەی بینین دەردەکەون لەسەر رووی پێست، کۆتایی ئەم قاچە بەتاڵە بۆ ناوەوە دەچەمێتەوە، لێرەوە شێوە توورەکەیی‌یەکەی دەگۆڕێت بۆ چاڵایی‌یەك کە لە کووپ دەچێت و پێی دەووترێت کووپی یان کاسی بینین (الكأس البصرية Optic Cup) (وێنەی ٥-١١).



وێنەی (٥-١١)

ئەم وێنانە گەشە کردنی چاو روون دەکاتەوە، دەبینین کە چۆن بلقی هاوێنەی چاو لە چینی دەرەوەوە شەق دەبێت و جیادەبێتەوە و دەچێتە ناو چاڵایی کووپی بینینەوە.

لە هەمان کاتدا لە گەڵ چەمانەوەی کۆتایی ئەم قاچە بۆ ناوەوە کرداری لۆچ بوونی پێست (یان ئیکتۆدێرمی دەرەوە) بەسەر خۆیدا ڕوودەدات بۆ دروست کردنی بڵقی هاوێنەی چاو (عدسة العين Lens Vesicle) کە هەر بە نووساویی بە پێستەوە (یان ئیکتۆدێرمی دەرەوە Surface Ectoderm) دەمێنێتەوە، لە کردارێکی تردا ئەم بڵقە (هاوێنەیە) کە لە پێستەوە دروست بووە لێی جیادەبێتەوە شەق دەبێت و لە پێست دەهێنرێتە دەرەوە و دەچێتە ناو چاڵایی کووپی بینینەوە (بڕوانەوە وێنەی ٥-١١) (هەروەها وێنەی: ١١٤/ هـ).




وێنەی (٥-١٢) قۆناغەکانی دروست بوون، و دەرکەوتنی چاوەکان و گوێکان.

لەگەڵ ئەمانەشدا چینێك لە میزۆدێرم کە ئەم هاوێنەیە دادەپۆشێت و پێی دەووترێت پەردەی پارێزەری هاوێنەیی کووپی (المحفظة العدسية الوعائية Iridopupillary Membrane)، ئەم پەردە پارێزەرە لەت دەبێت و شەق دەبێت و کونێك دروست دەکات لە پێشەوەی هاوێنەدا (لەدواییدا (Iris)ی چاو دروست دەکات)[4] (بڕوانە وێنەی ڕەنگاوڕەنگی: ١١٥/هـ)، هەروەها پێڵووەکان کە لە هەفتەی دەیەمدا پێکەوە دەنووسێن، لە هەفتەی ٢٦دا لەت دەبن و شەق دەبن و دەکرێنەوە.

(4) کتێبی کۆرپەلەزانی پزیشکی (Medical Embryology)/ لاپەڕە (٣٢٦).

**لە بواری دروست بوونی گوێکاندا :**

گوێی مرۆڤی پێکەیشتوو لە سێ بەش پێکهاتووە: ١-گوێی ناوەوە (Inner Ear). ٢-گوێی ناوەڕاست (Middle Ear). ٣-گوێی دەرەوە (Outer Ear).

گوێی ناوەوە بەهەمان ڕێگەی دروست بوونی هاوێنەی چاو دروست دەبن، بەڵام لە بەشی پشتەوەی مێشکەوە (Hindbrain)، کە چاڵاییەکی بچووك بەناوی چاڵایی گوێ (Otic Pit) لە چینی ئێکتۆدێرمی دەرەوە دروست دەبێت، کە ئەم چینە بەسەر خۆیدا لوول دەخوات و دەبێتە هۆی جیابوونەوە و شەق بوونی بڵقێکی پێست کە لێیەوە دەردەهێنرێت و بەرەو ناوەوە کۆچ دەکات و توورەکەی یان بڵقی بیستن (Otic Vesicle) دروست دەکات، ئەم توورەکەیە پاشتر گەشە دەکات بۆ دروست کردنی پێکهاتەکانی گوێی ناوەوە: لوولەی پەردەیی (Membranous Labyrinth) و لوولەی ئێسکی (Bony Labyrinth) **(بڕوانە وێنەی ڕەنگاوڕەنگی: ١١٦/ هـ).**

ئێسکەکانی گوێی ناوەڕاستیش دروست دەبن و شەق دەبن لە: کرکڕاگەی یەکەم کەوانەوە (First Arch Cartilage) کە پاشان ئەم کەوانە ئێسکەکانی چەناگە دروست دەکات، هەروەها لە کرکڕاگەی کەوانی دووەمیشەوە (Second Arch Cartilage) کە بە چەند ڕێگەیەکی ئاڵۆز دروست دەبن **( بۆ ڕوونبوونەوەی دروست بوونی گوێکان و پێکهاتەکانی بڕوانە وێنەی ٥-١٢ ).**

گوێی دەرەوەش لە ئەنجامی زیاد بوون و گەشە کردنی خانەکانی چینی ئیکتۆدێرم بۆ ناوەوە دروست دەبێت، ئەم بارستە خانەیە چینێکی بەهێز و پتەو دروست دەکەن کە پێی دەووترێت (داخەری گوێی دەرەوە)، کە پاشان ئەم چینە داخەرە لەت وپەت دەبێت و ڕێڕەوێك دروست دەکات کە لە شەقێکی ئاشکرا دەچێت و پێی دەووترێت ڕێڕەوی یان کەناڵی گوێی دەرەوە (External Acoustic Meatus) **( بڕوانە وێنەی ڕەنگاوڕەنگی: ١١٧/ هـ ).**




Figure 17-2. Schematic transverse sections through the region of the rhombencephalon showing the formation of the otic vesicles. (*A*) 24 days, (*B*) 27 days, and (*C*) 4½ weeks. Note the appearance of the stato-acoustic ganglion.

دروست بوونی پێکهاتەکانی گوێی ناوەوە

قۆناغەکانی دروست بوونی گوێی ناوەوە

Figure 17-3. (*A* and *B*) Development of the otocyst showing a dorsal utricular portion with the endolymphatic duct, and a ventral saccular portion. (*C*, *D*, and *E*) The cochlear duct at 6, 7, and 8 weeks, respectively. Note the formation of the ductus reuniens and the utriculosaccular duct.

وێنەی (٥-١٢): قۆناغە سەرەتاییەکانی دروست بوونی گوێ و شەق بوونی لە چینی دەرەوە (بلقی بیستن)، هەروەها بە تایبەتی تر دروست بوونی پێکهاتەکانی گوێی ناوەوەش روون کراوەتەوە.

لێرەوە بە تەواوەتی بۆمان روون دەبێتەوە کە ماناکانی ووشەی (شَقّ) زۆر بە جوانی یەکدەگرێتەوە لەگەڵ کرداری دروست بوونی چاو و گوێ، کە جارێك بەوە یەکدەگرێتەوە لە ئەنجامی پەیدا بوونی چاڵاییەکەوە، و جارێکی تر لە ئەنجامی دروست بوونی ئەندامێك لە ئەندامێکی ترەوە، و جارێکی تریش لە ئەنجامی لەت بوون و پەرت بوونی پەردەکانەوە دەبێت، کە لە کۆتاییدا هەموو ئەم کردارانە بەلاغەت و فەصاحەتی پێغەمبەر (ﷺ) دەسەلمێنن و ئیعجازی زانستی لە فەرموودەکەیدا ئاشکرا دەکەن.

## جێگیر بوون:

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّنَ الْبَعْثِ فَإِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ مِن مُّضْغَةٍ مُّخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ لِّنُبَيِّنَ لَكُمْ وَنُقِرُّ فِي الْأَرْحَامِ مَا نَشَاءُ إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى ثُمَّ نُخْرِجُكُمْ طِفْلاً ثُمَّ لِتَبْلُغُوا أَشُدَّكُمْ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّى وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَى أَرْذَلِ الْعُمُرِ لِكَيْلَا يَعْلَمَ مِن بَعْدِ عِلْمٍ شَيْئاً وَتَرَى الْأَرْضَ هَامِدَةً فَإِذَا أَنزَلْنَا عَلَيْهَا الْمَاء اهْتَزَّتْ وَرَبَتْ وَأَنبَتَتْ مِن كُلِّ زَوْجٍ بَهِيجٍ﴾ (الحج:٥)، واتە: ئەی خەڵکینە ئەگەر ئێوە گومانتان لە زیندوو بوونەوە هەیە، ئەوە چاك بزانن کە ئێمە سەرەتا ئێوەمان لە خاك و خۆڵ دروستکردووە، لەوەودوا نەوەکان لە نوتفەیەك پەیدا بوون، پاشان نوتفەکەش دەبێتە خۆهەڵواسەرێك (علقة) لەناو منداڵداندا، لەوەودوا دەبێتە گۆشتپارەیەك کە هەندێکی دروست بووە و هەندێکی دروست نەبووە، هەموو ئەم شتانە دەهێنینەوە یادتان تا بۆتان روون بکەینەوە کە ئێمە ئاوا ئێوەمان دروست کردووە و دووبارە دروست کردنەوەشتان لامان ئاسانە، ئەوەش بمانەوێت لە منداڵدانەکاندا جێگیری دەکەین تا کاتێکی دیاری کراو، لەوەودوا بە ساوایی و بە بچووکیی دەرتاندەهێنین (لە سکی دایکتان)، دوایی بۆ ئەوەی گەورە بن و بگەنە ئەوپەڕی هێز و تواناتان، هەتانە دەمرێت بە گەنجی و هەشتانە دەگەڕێنرێتەوە بۆ پەرپووت ترینی تەمەنەکان بۆ ئەوەی کە هیچ شتێك

نەزانێ دوای ئەوەی کە جاران دەیزانی، (بەڵگەیەکی تریش لەسەر زیندوو بوونەوە ئەوەیە کە ئەی ئینسان) تۆ زەویش دەبینیت ووشك و برنگە، جا کاتێك ئاوی بارانمان بەسەردا باراند دادەچڵەکێت و دەلەرزێت و تۆوەکان چەکەرە دەکەن و رەگ و رەچەڵەك دەردەکەن و دەڕوێن، ئەوسا لە هەموو جۆرە گژوگیا و گوڵ و گوڵزارێکی جوان بە جووت دەڕوێنێت.




وێنەی ( ٥-١٤ ): چەند وێنەیەکی راستەقینەی کۆرپەلە لەناو مناڵداندا ( کە شوێنی جێگیر بوونێتی ).

لە فەرهەنگی (مختار الصحاح)دا هاتووە: (القرار في المكان الإستقرار فيه) واتە: قەرارگرتن لە شوێنێکدا بە مانای جێگیر بوون تێیدا دێت، هەروەها لە (لسان العرب)دا هاتووە: (وأَقَرَّت الناقة: ثَبَت حَمْلها) واتە: ووشترەکە قەراری گرت بە مانای جێگیر بوونی بارەکەی دێت، کەواتە (وَنُقِرُّ فِي الْأَرْحَامِ) بەمانای ئەوەی کە لە مناڵدانەکاندا ئەوەی بمانەوێت جێگیری دەکەین، لەم ووتەیەی پەروەردگاردا ئیعجازێکی زانستی ئاشکرا دەبینرێت، چونکە خوای گەورە قۆناغی جێگیر بوونی دوای قۆناغی گۆشتپارە باس کردووە، ئەمە ئەوە

دەگەیەنێت مەبەستی پەروەردگار ئەوەیە کە جێگیر بوونی یەکجارەکی کۆرپەلەکە دوای ماوەی گۆشتپارە دەست پێدەکات، و ریزبەندی زاراوەکان لە ئایەتەکەدا ئەم مانایەمان دەداتێ. هەر بۆیە لێرەدا خوای گەورە باسی قۆناغەکانی تری کۆرپەلەی نەکردووە کە لە ئایەتەکانی سوورەتی (المؤمنون)دا باس کراوە ﴿ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ، ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ﴾.

ئەوەی ئەم بۆچوونە بەهێز دەکات ئەوەیە کە خوای گەورە هەر لەم ئایەتەدا باسی ئەوەی کردووە کە ئەم حەملە جێگیر دەکات بۆ ماوەیەکی دیاری کراو (إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى)، کە بریتی‌یە لەو ماوەیەی کە پەروەردگار دیاری کردووە بۆ کۆتایی هاتنی سکپڕی (کە ٩ مانگە)، کەواتە ئەم جێگیر کردنە بۆ ماوەیەکی دیاری کراو هەموو ئەو قۆناغ و ماوانەی تر دەگرێتەوە تا کۆتایی سکپڕی، خوای پەروەردگاریش ئەم جێگیر بوونەی بەستووەتەوە بە ویستی خۆیەوە کە ئەوەی ئارەزووی لێبێت لە منداڵداندا جێگیری دەکات و ئەوەی ویستی لێی نەبێت جێگیر نابێت.

ئەوەش زانراوە کە ماوەی گۆشتپارە (الْمُضْغَةَ) لە هەفتەی چوارەمی سکپڕی‌یەوە دەست پێدەکات و لە کۆتایی هەفتەی شەشەمدا دوایی دێت، واتە دوای چل رۆژ لە پیتاندنی هێلکۆکەکەوە، لێرەوە دەگەینە ئەو راستی‌یەی کە ماوەی جێگیر بوونی سکپڕی لە هەفتەی شەشەمەوە بەرەو ژوور دەخایەنێت.




**وێنەی** (٥-١٥): **قۆناغی گۆشتپارە دوای قۆناغی ( عەلەقە ) و لە هەفتەی چوارەمەوە دەست پێدەکات.**

لە بواری زانستی نوێدا چەندین دۆزینەوەی جۆراوجۆر کراوە لەم بوارەدا کە یەکدەگرێتەوە لەگەڵ ئایەتە پیرۆزەکەدا، (دکتۆر ت. ف. ن. برسود)[5] ئەوەی روون کردەوە کە کۆرپەلە لە کاتی دروست بوونیدا بە ماوەیەکدا تێدەپەڕێت کە پێی دەووترێت ماوەی دروست بوونی ئۆرگانەکان و ئەندامەکان (Organogenesis)، کە لەم ماوەیەدا کۆرپەلەکە زۆر هەستیار دەبێت بۆ بچووکترین بەسەرهات کە روودەدات چونکە بچووکترین بەسەرهات لەوانەیە ببێتە هۆی روودانی تێکچوون و شێواندن لە دروست بوونی کۆرپەلەکەدا و لەوانەیە کوژەر بێت بۆی، رێژەی ئەم مەترسی‌یە لە بەرزترین پلەدا دەبێت کاتێك کۆرپەلەکە لە (علقة)وە دەگۆڕێت بۆ گۆشتپارە (مضغة)، ئەویش لەبەر ئەوەیە کە ئەندامەکان زیاتر چانسی ئەوەیان هەیە کە تووشی شێوان بن لە کاتی دەرچوونیان لە ماوەی دروست بوونی ئەندامەکانەوە، کە کاتێك ئەم ماوەیە تێدەپەڕێت (کە ماوەی کۆبوونەوەی دروست بوونە و ٤٠ رۆژە) ئیتر جێگیر بوون بۆ کۆرپەلەکە روودەدات، و لە هەمان کاتدا رێژەی بەرزی لەبارچوونیش کەم دەبێتەوە کە ئەم رێژەیە دەگاتە ٣,٢٪ لە کۆتایی ماوەی گۆشتپارەدا (واتە دوای ٤٠ رۆژ لە سکپڕی).

لە درێژەی ئەم بابەتەدا زانستی تیراتۆلۆجی (Teratology) کە گرنگی دەدات بە لێکۆڵینەوەی ئەو تێکچوون و شێواوی‌یانەی کە تووشی کۆرپەلە دەبێت لەگەڵ هۆکارەکانیاندا، ئەم زانستە ئەو ماوە خەتەرناکانەی کە بەسەر کۆرپەلەدا دەڕوات بۆمان تۆمار دەکات، هەروەها تیراتۆجین (Teratogen)یش بریتین لەو فاکتەرانەی کە دەبنە هۆی دروست بوونی شێوانەکانی دروست بوون لە کۆرپەلەدا یان چانسەکانی تووش بوون بەو شێواوی‌یانە زیاد دەکەن.

---

(5) ئەم بەڕێزە پسپۆڕە لە بواری توێکاری و کۆرپەلەزانی‌دا، کە ئەم بابەتەی بۆ (یەکەمین کۆنگرەی ئیسلامی پزیشکی جیهانی سەبارەت بە ئیعجازی پزیشکی لە قورئان و سوننەتدا) پێشکەش کرد لە بەرواری ٢٥/٩/١٩٨٥ز.

مەترسی لێرەدا لە هەستیاریی کۆرپەلەکەدایە بۆ ئەم فاکتەرە زەرەربەخشانە کە لەوانەیە ببنە هۆی فەوتاندنی یان لەباربردنی، لێرەدا ئاماژە دەدەین بەم فاکتەرە تیراتۆجینی‌یانە کە دەکرێن بە دوو گرووپەوە:

١- گرووپی فاکتەرە زیان بەخشەکانی دروست بوو لە ژینگەوە.

٢- گرووپی فاکتەرە زیان بەخشەکانی دروست بوو لە تێکچوون و شێوانی بۆماوەیی‌یەوە.

توێژینەوەکەی ئێمە پەیوەندی بە گرووپی دووەمەوە هەیە، لەبەر ئەوەی کە فاکتەرەکانی گرووپی یەکەم لەوانەیە لە هەر کاتێکدا پەیدا بن و کۆرپەلەکە هیچ جۆرە توانایەکی نی‌یە بۆ بەرەنگار بوونەوەیان، هەستیاریی کۆرپەلەکە بۆ ئەم فاکتەرانە لە دوو هەفتەی یەکەمی دروست بووندا (واتە لە قۆناغی نوتفەدا) زۆر کەم دەبێت، و هەر کاتێك کۆرپەلەکە بەهۆیانەوە کاری تێ‌بکرێت ئەوا لە زوربەی جارەکاندا دەبێتە هۆی لەبارچوونی و زۆر بە کەمی لەوانەیە ببێتە هۆی شێوانی دروست بوونەکەی.

بەلاّم لە قۆناغی گۆشتپارەدا، هەستیاریی کۆرپەلەکە دەگاتە لوتکە و کاریگەریی فاکتەرە تیراتۆجینی‌یەکان زۆر بەهێز دەبێت، کە ئەم هەستیاری‌یە بەستراوەتەوە بە رێژەی دابەش بوونی خانەکانی ئەندامە دروست بووەکانەوە، هەربۆیە ماوەی گۆشتپارە (کە ماوەی دروست بوونی ئەندامەکانە) ماوەیەکی زۆر گرنگ و شلۆقە و لەوانەیە کۆرپەلەکە تووشی چەند شێواوی‌یەکی مەترسیدار ببێت لە زوربەی کاتەکاندا، و لەوانەیە لەباریش بچێت **{بۆ بینینی هەندێك شێواوی بۆماوەیی بروانە وێنەی (٥-١٦)، هەروەها وێنە رەنگاورەنگەکانی: ١٢٠/ هـ}**.

بەلاّم لە قۆناغەکانی دوای گۆشتپارەدا (کە قۆناغی رێکبوونەوەیە) رادەی هەستیاریی کۆرپەلەکە هەر بە بەرزیی دەمێنێتەوە و زوربەی کات فاکتەرە تیراتۆجینی‌یەکان دەبنە هۆی روودانی شێوانی مەترسیداری کۆرپەلەکە و لە هەندێك جاری کەمدا لەوانەیە ببنە هۆی لەبارچوون.



شێواوی‌یەکانی پەلەکان و ڕوخساری کۆرپەلەکە

شێواوی‌یەکانی ڕوخسار و مێشک و کەللەی سەر

وێنەی (٥-١٦): هەندێک لە شێواوی‌یە بۆماوەیی‌یەکان کە بەهۆی فاکتەری جۆراوجۆرەوە ڕوودەدەن.

تێبینی ئەوە کراوە کە لەبارچوون بەستراوەتەوە بە زۆریی تێکچوون و شێواوی‌یە بۆماوەیی‌یەکان، زانا بۆوی (Bouet \1975) ڕێژەی لەبارچوون بەهۆی تێکچوونە بۆماوەیی‌یەکانەوە بە ٦١٪ی داناوە، بەڵام زانایان کار و جەدعون (Carr & Gedeon \1977) ئەم ڕێژەیەیان بە ٥٠٪ داناوە.

کەواتە تێکچوون و شێوانی بۆماوەیی زۆر بوار بە کۆرپەلەکە نادات کە دروست ببێت و گەشەی پەکدەخات، هەر لەبەر ئەوەیە کە لەبارچوون بە زۆریی لە قۆناغی گۆشتپارەدا ڕوودەدات (کە قۆناغی دروست بوونی ئەندامەکانە) و لە قۆناغەکانی تردا زۆر کەمتر ڕوودەدەن.

ئەوەی جێی سەرنجە ئەوەیە کە تێکچوون و شێوانی بۆماوەیی لەلای پێغەمبەر (ﷺ) ناسراو بووە، لە یەکێك لە نزا و پاڕانەوەکانی‌دا هاتووە کە پەنای گرتووە بەخودا لە نەخۆشی و ئازاری سەخت، ئەو پاڕانەوەیە ئەمەیە: عن ابن عباس (رضي الله عنه): ﴿أَنَّ النَّبِي (ﷺ) كَانَ يُعَلِّمُهُم مِنَ الحُمَّى وَالأَوْجاعِ كُلِّهـا أَن يَقُولوا: بِاسْمِ اللهِ الكَبِير، أَعُوذُ بِاللهِ العَظِيم، من شَرِّ كُلِّ عِرْقٍ نَعَّار، وَمِنْ شَرِّ حَرِّ النَّار﴾ أخرجه الترمذي وأحمد وابن ماجة وصححه الحاكم وأقره الذهبي، واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فێری هاوەڵانی دەکرد کە بەرامبەر هەموو نەخۆشی و ناڕەحەتی‌یەکدا بڵێن: بەناوی خوای گەورە، پەنا ئەگرم بە پەروەردگاری باڵادەست، لە شەڕ و خراپەی هەموو ڕەگێکی زیانبەخش و لە شەڕی گەرمیی ئاگری دۆزەخ.

مانای ڕەگ (عرق) وەك لە فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبی‌دا هاتووە، بە تایبەتی (ابن منظور) دەربارەی دەڵێت: (وعرق كل شيء: أصله)[6] واتە: بریتی‌یە لە ڕەگ و بنچینەی هەموو شتێك، هەروەها (نَعّار) بە مانای زەرەر و زیانبەخش دێت، کەواتە پێغەمبەر (ﷺ) پەنای دەگرت بەخوای گەورە لە

(6) بڕوانە فەرهەنگی (لسان العرب)/ ماددەی (عرق)، هەروەها (عرق) بە مانای کرۆمۆسۆمەکانیش دێت، هەروەك لە بەشی یەکەمدا ئاماژەمان پێدا.

شەڕ و زیانی هەموو رەگێکی زیانبەخش بۆ بنچینەی مرۆڤ کە کۆرپەلەکەیەتی، بە مانایەکی تر پەنای دەگرت لەو فاکتەرە نەخۆشییانەی کە دەبنە هۆی دروست بوونی تێکچوون و شێواندنی کۆرپەلەکە (کە بە زۆری فاکتەرە بۆماوەیییەکانن).

کەواتە ئەو ئاماژەیەی لەم فەرموودەیەدا هاتووە تێمان دەگەیەنێت کە پێغەمبەر (ﷺ) تێکچوون و شێوانی بۆماوەیی لەلای غەریب نەبووە، سەرەنجامی گشتی ئەم بابەتە دەگەینە راڤەی تەواوی ئایەتی (وَنُقِرُّ فِي الْأَرْحَامِ...) و مەبەستی پەروەردگار بەتەواوەتی تێدەگەین لەوەی کە بە ویستی ئەو کۆرپەلەکە بە یەکجاریی جێگیر دەبێت لە منالّدانـدا، و ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە ماوەی پێش ئەم جێگیر بوونە بریتییە لە ماوەیەکی ناسك و تۆکمە نییە بۆ دروست بوونی ئەندامەکان، ئەگینا سوودی جێگیر کردن چییە؟ کەواتە دروست بوونی ئەندامەکان لە قۆناغی گۆشتپارەدا دەبێت و دوای ئەم قۆناغەیە کە کۆرپەلەکە جێگیر دەبێت.

**کۆتایی:**

لە کۆتایی ئەم باسەدا زۆر بە گرنگی دەزانم کە گفتووگۆیەکی تر باس بکەم لە نێوان (پرۆفیسۆر عبدالمجيد الزنداني) و زانایەکی تری ناسراوی کۆرپەلەزانی رۆژگاری ئەمڕۆ کە ئەویش (پرۆفیسۆر د. مارشال جونسون)ە کە سەرۆکی پەیمانگای (دانیال) و مامۆستای توێکاری و کۆرپەلەزانییە لە زانکۆی (توماس جیفەرسۆن) لە (فیلادیلفیا)ی وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ئەم دوو زانایە لە کۆنگرەی پزیشکی هەشتەم کە لە (شانشینی سعودیە) سازدرا یەکتریيان بینی، و هەردووکیان لەم کۆنگرەیەدا خرانە لیژنەیەکی تایبەتەوە بۆ لێکۆڵینەوەی بابەتی ئیعجازی پزیشکی لە قورئان و سوننەتدا، ئەوەبوو (د. جۆنسۆن) لە (زیندانی) پرسی: بابەتی ئەم لیژنەیەی ئێمە چییە؟ ئەوەبوو (زیندانی) ووتی: بابەتی لیژنەکە بریتییە لە




لێکۆڵینەوەی ئەو پەیوەندی‌یانەی کە هەیە لە نێوان ئەو ئاماژانەی کە لە قورئان و سوننەتدا پێش ١٤٠٠ ساڵ هاتوون لەگەڵ دۆزینەوەکانی زانستی نوێدا، ئەوەبوو پرسی: وەك چی؟ (زینداني)یش ووتی: وەك ئەوەی کە زانستی کۆرپەلەزانی نوێ دەڵێت مرۆڤ بە قۆناغ دروست دەبێت و قورئانی پیرۆزیش باسی ئەم قۆناغانەی کردووە پێش ١٤٠٠ ساڵ!! (د. جۆنسۆن) بە سەرسوڕمانێکی زۆرەوە هەستایە سەر پێ و هاواری کردوو ووتی: نەخێر، نەخێر، نەخێر.

پاشان (زنداني) پێی ووت: دکتۆر دابنیشە، ئەویش ووتی: دانانیشم، ئەم قسانە چین تۆ دەیکەیت؟ (زنداني) دەڵێت: کاریگەری ئەو قسانەم لەسەر بینی چونکە ئەو زانایەکی ناسراوە و یەکێکە لە گەورە زانایانی ئەمریکا، و باش دەزانێت کە پاش دۆزینەوەی ووردبین (مایکرۆسکۆب) لە دوای سەدەی حەقدەیەمەوە وورده وورده نهێنی‌یەکانی زانستی کۆرپەلەزانی ئاشکرا بوون، و پێش ئەمە و بە درێژایی سەدەی شانزەیەم و حەقدەیەم زانایان وایان دەزانی کە کۆرپەلە بە تەواوەتی لەناو



سپێرمی پیاودایە و تەنها کاری ئافرەت بریتی‌یە لە گۆش گرتنی و گەورە کردنی، وەك لە وێنەکانی ئەو سەردەمانەدا دەردەکەوێت و ئەم بۆچوونە لای غەیری موسوڵمانان تا سەدەی هەژدەیەم بەردەوام بوو.

دوای ئەمەش کە هێلکەی ئافرەت دۆزرایەوە لە سەدەی هەژدەیەمدا بۆچوونێکی تر پەیدا بوو کە کۆرپەلە بە تەواوەتی لەناو هێلکەکەدایە و کاری سپێرم تەنها بریتی‌یە لە هاندانی گەورەبوونی کۆرپەلەی ناو هێلکەکە، ئەوەبوو سەدەی هەژدەیەم رۆڵی سپێرمی پشت گوێ خست دوای ئەوەی کە سەدەی حەڤدەیەم رۆڵی هێلکەی پشت گوێ خستبوو، و تەنها لە سەدەی نۆزدەیەمدا زانایان دەستیانکرد بە دۆزینەوەی قۆناغەکانی دروست بوونی کۆرپەلە.

هەربۆیە کاتێك بە پرۆفیسۆر (جۆنسۆن) ووترا کە ئەمە لە قورئاندا باس کراوە پێش ١٤٠٠ ساڵ، هەستایە سەرپێ و هاواری کرد: نەخێر، نەخێر، نەخێر، (زندانی) دەڵێت: منیش هەستام و قورئانێکم بۆ کردەوە و ئەم ئایەتانەم نیشاندا: ﴿مَّا لَكُمْ لَا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَارًا، وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا﴾ و ﴿يَخْلُقُكُمْ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ خَلْقًا مِن بَعْدِ خَلْقٍ فِي ظُلُمَاتٍ ثَلَاثٍ﴾، و کاتێك بۆم روون کردەوە کە چۆن قورئان ئەم دروست بوونەی روون کردووەتەوە، ئەوەبوو دانیشت و ووتی: ئەمە بەرای من سێ گریمان هەیە بۆ روون کردنەوەی:

**یەکەم: ئەوەیە کە ئەم ووتانە بە رێکەوت هاتبن**، (زنداني) دەڵێت: ئەوەبوو ٢٥ دەقی قورئانمان بۆ هێنا و پێمان ووت: ئەمانە هەمووی رێکەوتە؟! لەلایەکی تریشەوە قورئان ناوی لە قۆناغەکان ناوە وەك: ئەوەی ئەمە (نطفة)یە، و ئەوی تر (علقة)یە، و پاشان (مضغة) و (عظام) و داپۆشینی ئێسکەکان بە ماسولکە (كساء العظام باللحم) و دوایی گەشە کردن (النشأة)، کەواتە قورئان ناوی پراوپری ناوە لە قۆناغەکان، باشە ئەمانە هەمووی چۆن بە رێکەوت دەبێت؟! ئەویش ووتی: **بەڵێ رێکەوت نی‌یە**.

پاشان ووتمان: چیتر دەڵێیت؟ د. مارشال ووتی: لەوانەیە بووترێت: دەبێت محمد چەندین مایکرۆسکۆبی زەبەلاحی هەبووبێت تا ئەو وووردەکاری‌یانەی بینیبێت و بەو شێوەیە وەسفی کردبێت و پاشان ئەو ئامێرە پێشکەوتووانەی بۆ نەوەکانی دوای خۆی جێهێلابێت، (زنداني)یش پێی ووت: تۆ دەزانیت کە زانینی ئەم قۆناغانە و ئەو گۆڕانکاری‌یانەی کە بەسەر کۆرپەلەکەدا دێن و وووردەکاری‌یەکانیان و ئەوەی کە زانستی نوێ پێی گەیشتووە پێویستی بە بوونی ووردبینی (مایکرۆسکۆبی) زەبەلاح هەیە.

ئەو کەسەش کە ئەم ووردبینانەی لەلا بێت دەبێت خاوەنی تەکنۆلۆجیایەکی زۆر وورد و پێشکەوتوو بێت (بە تایبەتی بوونی هاوێنەی شووشە و شارەزایی هونەریی زۆر گرنگن بۆ دروست کردنیان، و هەندێك زانیاری هەیە کە بە ووردبینی ئەلیکترۆنی دەدۆزرێتەوە و پێویستی بە کارەبا و زانستێکی زۆر پێشکەوتوو هەیە)، کە ئەم پێشکەوتنە دەبێت لە هەموو ژیانی‌دا رەنگ بداتەوە وەك لە خواردن و خواردنەوە و جەنگ و ئاشتی‌دا، و پێویستە کە ئەمەی لە نەوەی پێش خۆی وەرگرتبێت و بۆ نەوەی دوای خۆی بەجێ بهێڵێت.

هەر د.مارشال خۆی لەم وەڵامە دەستی کرد بە پێکەنین و ووتی: من لە یەکێك لە پیشانگاکاندا یەکەم مایکرۆسکۆبم بینیوە کە لە کۆتایی سەدەی شانزەیەمی زایینی‌دا دروست کراوە کە دەتوانێت تەنها دە جار شت گەورە بکات و وێنەکەشی زۆر لێڵە، کەواتە نەخێر محمد ووردبینی زەبەلاحی لانەبووە و ئەم گریمانەش راست نی‌یە.

پاشان پرۆفیسۆر (جۆنسۆن) ووتی: تەنها ئەو گریمانە ماوە کە دان بنێین بەوەی کە ئەم قورئانە لە لایەن خوداوە هاتووە، و من وەکو زانایەك هیچ بەڵگەیەك نابینم کە ئەم راستی‌یانەی محمد رەت بکاتەوە، و دەبێت ئەم زانیاری‌یانەی لە سەرچاوەیەکی بەرزتر لە مرۆڤەوە وەرگرتبێت.

ئیتر پاش ئەم گفتوگۆیە (د. جۆنسۆن) تەبەننای ئەو توێژینەوانەی کرد دەربارەی ئیعجازی زانستی بە تایبەتی لە بواری کۆرپەلەزانیدا، و لە توێژینەوەکانیدا بە تایبەتی تەرکیزی لەسەر باس کردنی قۆناغەکانی دروست بوونی کۆرپەلە دەکرد کە لە قورئاندا هاتووە، لە یەکێك لە کۆنگرە زانستییەکاندا ووتی: قورئان لە ڕاستیدا شەرحی قۆناغەکانی دەرەوەی کۆرپەلەی کردووە بەڵام لە هەمان کاتدا تەئکیدی لەسەر قۆناغەکانی ناو لەشی کۆرپەلەکەش کردووە لە کاتی گەشە کردنیدا، و چەند ڕووداوێکی سەرەکی باس کردووە کە زانایانی سەردەم هەموویان لەسەری کۆکن.




A. Embryo

Actual size

B. Gum

کۆرپەلە

بنێشتی جووراو

(د. جۆنسۆن) زیاتر کاریگەر بوو بەو ئایەتانەی باسی (مضغة) دەکەن و ماناکانی بۆ ڕوون بووەوە، ئەوەبوو دەربارەی ئەمە ووتی: **قورئان لەو زاراوانەی هێناویەتی نەك تەنها گرنگی داوە بە شکڵی دەرەوەی کۆرپەلەکە لەو قۆناغەدا بەڵکو کردارەکانی ناو لەشیشی ڕوون کردووەتەوە**، ئەو شکڵەی کە دەیبینین بۆ گۆشتپارە زۆر زانستییە، چونکە کۆرپەلەکە چەماوەیە لەم کاتەدا و لە کۆتایی ئەم چەماوەیەدا چەند شوێنەوارێك هەیە و ئاوساوی و بەرزی و نزمی هەیە کە بە تەواوەتی وەك شوێنەواری ددان دەچێت لەسەر پارووی خواردن، ئەم گۆشتپارەیە

درێژییەکەی یەك سانتیمەترە، کاتێك قورئان دەڵێت کە کۆرپەلە لە گۆشت پارە دەچێت زانست سەلماندوویەتی کە شکڵی دەرەوەی و تۆپەڵەکانی پشتی کە وەکو شوێنەواری ددانەکان وایە لەسەر پاروو، و کە دەیبینیت پاروت بیر دەکەوێتەوە.

هەروەها ئەگەر ئێمە ناو لەشی کۆرپەلەکە توێکاری بکەین دەبینین کە زۆربەی ئەندامەکان دروست بوون، و لەناو ئەندامەکاندا دەبینین خانەکانی هەندێکی دروست بوون و هەندێکی دروست نەبوون، کە ئەگەر بمانەوێت وەسفی ئەم گۆشتپارەیە بکەین دەڵێین هەندێکی دروست بووە (کە ئەم وەسفە دەچەسپێت بەسەر ئەو بەشانەی کە دروست بوون) و هەندێکی تری دروست نەبووە (کە ئەم وەسفە دەچەسپێت بەسەر ئەو بەشانەی لەشی کە دروست نەبوون)، کەواتە لەناو لەشی کۆرپەلەکەشدا هەندێك لە ئەندامەکانی دروست بوون و هەندێکی دروست نەبوون، و پێویستە بەو شێوەیەی قورئان ووتوویەتی ئەم گۆشتپارەیە وەسف بکرێت، کە بەڕاستی جوانترین وەسف وەسفی قورئانە کە دەڵێت: ﴿ثُمَّ مِن مُّضْغَةٍ مُّخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ﴾.




پاشان پرۆفیسۆر (جۆنسۆن) ووتی: من وەکو زانایەك تەنیا دەتوانم هەڵس وکەوت لەگەڵ شتێکدا بکەم کە دەتوانم ببینم، من دەتوانم لە گەشە کردنی زانستی بایۆلۆجی و کۆرپەلەزانی تێبگەم و هەروەها دەتوانم لەو دەقانەی قورئان کە بۆم وەردەگێڕدرێت تێبگەم هەروەك چۆن پێشتر نموونەم بۆ هێنانەوە، ئەگەر وای دابنێین کە من خۆم بگوێزمەوە بۆ ئەو ماوە

زەمەنی‌یەی کە قورئانی تێدا دابەزیوە و لەو کاتەدا بتوانم وەسفی ئەو شتانە بکەم کە ئێستا باسی دەکەم، لێرەوە دەگەمە ئەو راستی‌یەی کە هیچ جۆرە رێگرێك نی‌یە، یان هۆکارێك یان بەڵگەیەك نی‌یە کە رەتی ئەوە بداتەوە کە دەبێت محمد (ﷺ) ئەم زانیاری‌یانەی لە شوێنێکی ترەوە وەرگرتبێت، هەربۆیە من باوەڕم وایە کە تەدەخول و دەست تێخستنی خودایی رۆڵی هەبووە لەم راگەیاندنانەدا.

ئەمە شایەتی یەکێکە لەو زانا سەر راستانەی کە یەکەم جار باوەڕی نەدەکرد و رەتی دەکردەوە، بەڵام کاتێك کە راستی‌یەکانی بۆ دەرکەوت بە تەواوەتی دانی پێدا ناو مل کەچی بوو، و بوو بە یەکێك لە پشتگیری کەرەکانی ئەم توێژینەوانە لە چەندین کۆنگرەی جیهانی‌دا*، و کاتێك کە پرسیاری لێکرا دەربارەی رای خۆی لەسەر ئەم راستی‌یانەی قورئان و سوننەت کە زانستی ئەمڕۆ دەریخستووە بە ئاشکرا ووتی: بەڵێ ئەوە نیگا و وەحی خودایی‌یە.

هیچ رێگەیەکیش نی‌یە لە بەردەم مرۆڤایەتی‌دا تەنیا ئەوە نەبێت کە وەك ئەم زانایانە دان بنێت بەوەدا کە قورئان کتێبێکە پەروەردگار بە نیگا و وەحی ناردوویەتی بۆ محمد (ﷺ) و زانیاری خودایی تێدایە، دەرکەوتنی ئەم راستی‌یانەش خۆی لە خۆی‌دا هاتنەدی ئەو بەڵێنەی پەروەردگارە لە رۆژگاری ئەمڕۆدا کە دەفەرموێت: ﴿وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُ بَعْدَ حِينٍ﴾ (ص: ٨٨)، ﴿لِّكُلِّ نَبَإٍ مُّسْتَقَرٌّ وَسَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾ (الأنعام: ٦٧).

---

* لێرەوە دەگەینە ئەو راستی‌یەی کە زانایان لە جیهاندا دوو جۆرن: کۆمەڵێکیان بریتین لەو زانا سەر راستانەی کە بەدوای زانستدا دەگەڕێن و پێوەی پابەندن و هەموو کاتێك گوێ لە ووتە و بۆچوونی راست دەگرن و دانی پێدادەنێن و لە قسە و فشاری ئەم و ئەو ناترسن، بەڵام کۆمەڵێکی تریان ئەوانەن کە ملکەچ دەبن بۆ فشارەکان و لەژێر کاریگەریی کەسانی تردا هەڵس و کەوت دەکەن و بەهۆی ئەمەوە راستگۆیی و سەرراستی‌یان لەدەست دەدەن!.

# قۆناغەکانی دروست بوونی کۆرپەلە بەدوای یەکدا تا قۆناغی گۆشتپارە




K 23 DAYS
amnion
body stalk
exocoelom
villi
chorion with villi
yolk sac
GROWTH OF AMNION
L 21 DAYS (BACK VIEW)
yolk sac
cut edge of amnion
neural fold
neural tube
somites
EMBRYO WITH AMNION CUT OPEN
M 23 DAYS
heart
cut edge of amnion
brain
somites
spinal cord
yolk sac
allantoic duct
umbilical blood vessels
EMBRYO WITH YOLK SAC AND AMNION CUT OPEN
N SIX WEEKS
amnion
villi
umbilical cord
exocoelom
yolk sac
villi
uterine cavity
chorion
cervical canal
EMBRYO WITHIN HALVED AMNION, CHORION, AND UTERUS
O SIX WEEKS
allantoic duct
villi
chorion
exocoelom
yolk sac
umbilical cord
amnion
FORMATION OF UMBILICAL CORD
P THREE MONTHS
placenta
intervillous space
chorion and amnion
villi
fetus
uterine cavity
umbilical cord
cervical canal
FETUS WITHIN HALVED AMNION, CHORION, AND UTERUS
©1994 Encyclopaedia Britannica, Inc.



# قۆناغەکانی دروست بوونی (ئێسك و گۆشت - العظام واللحم) لە کۆرپەلەی مرۆڤدا

قورئانی پیرۆز قۆناغەکانی دروست بوونی کۆرپەلەی مرۆڤی بە شێوازێکی روون وئاسان باس کردووه، هەر لە قۆناغی (النطفة)، (العلقة)، پاشان بۆ (المظغة)، دواتریش کۆرپەله دەچێته قۆناغێکی ترەوه کە بریتی‌یه لە قۆناغی (دروست بوونی ئێسك) و پاشان داپۆشینی ئێسکەکان بەگۆشت (ماسولکه)، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا﴾ (المؤمنون)، واتە: ئێمە ئەو گۆشتپارە (مضغة)یە دەگۆڕین و دەیکەین بە ئێسك، و پاشان ئەو ئێسکەمان بە گۆشت داپۆشی، هەروەها لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿... وَانظُرْ إِلَى العِظَامِ كَيْفَ نُنشِزُهَا ثُمَّ نَكْسُوهَا لَحْمًا ...﴾ (البقرة:٢٥٩)، واتە: بڕوانە ئێسکەکان کە چۆن دروستی دەکەینەوە (وەك پێشتر دروستمان کرد) و پاشان بە گۆشت دایدەپۆشین.

ئێمەش بە شێوازێکی سەردەمانە و بە پشت بەستن بە زاراوەکانی زانستی کۆرپەلەزانی نوێ دەچینە ناو بابەتەکەوە و بە کورتی باسیان دەکەین بۆ ئەوەی جارێکی تر هاوئاهەنگی قورئان و زانستی نوێ و ئیعجازی زانستی قورئان زیاتر دەربکەوێت.

## یەکەم: دروست بوونی ئێسك:

سەرچاوە نوێکانی زانستی کۆرپەلەزانی وەسفێکی دوور و درێژی دروست بوونی ئێسکەکان و ماسولکەکانی لەشی کۆرپەلەیان کردووە، ئێستا زانراوە کە ئێسکەکان هەمووی لەیەك کاتدا پەیدا نابن و دروست بونیان تەواو نابێت، بەڵکو خشتەیەکی زەمەنی هەیە بۆ دروست بوونیان، چونکە مرۆڤ بەردەوام لە گەشەکردن و گەورە بووندایە، یەکەم ئەو ئێسکانەی کە دروست بوونیان تەواو دەبێت ئێسکەکانی گوێی ناوەڕاستن (لەناو سکی دایکدا)، و کۆتاییینیان سەنتەرەکانی گەشەکردنە (Epiphysial Plates) لە ئێسکە درێژەکانی پەلەکانی خوارەوەدا (لە تەمەنی ٢٠ ساڵیدا یان زیاتر).

دەتــوانین پەیــدابوونی ســەرەتاکانی ئێســکەکان {واتــە کرکراگــەکان (Cartilages)} بـە هەفتـەی حەوتـەمی ژیـانی کۆرپەلەکـە دیـاری بکـەین، زانسـتی کۆرپەلـەزانی بۆمـان بـاس دەکـات کـە لـەم کاتـەوە شـێوەی نـاڕێکی گۆشتپارە (المضغة) (کـە سـیما و شـێوەی مرۆڤـی پێـوە دیـار نیـیە)، ووردە ووردە بەهۆی دروسـت بـوونی سـەرەتاکانی ئێسکەکان شێوەی چوارچێوەی یان پەیکەری ئێسکی (الهیکل العظمي) لەشی مرۆڤ وەردەگرێت.

پرۆسـەی دروسـت بـوونی ئێسـکەکان ئـەو خانـە سـەرەتاییانەی چـینی میزۆدێـرم (بەسـتەرە شـانەکان) دەگرێتـەوە کـە ئێسـکە پـەردەیی و ئێسـکە کرکراگەییـەکان دروسـت دەکـەن، کاتێـك کـە ئێسـك لـە نێـوان پەردەکانـدا دروست دەبن (وەك ئێسکەکانی شەویلگەی سەرەوە و خـوارەوە) ئـەم سـەرەتا ئێسـکییانەی کـە دروسـت بـوون لـە بەشـی ناوەڕاسـتی کۆرپەلەکـەوە (چینی میزۆدێـرم Mesoderm) چـڕ دەبنـەوە، وچـەند توێپەڵـە خانەیـەك دروسـت دەکەن کە جیادەبنەوە و ئێسکەخانەی سەرەتایی دروست دەکەن، ئەم خانانە بە دەوروبەری خۆیانـدا ماددەیـەکی ئەنـدامی ئێسك دروسـتکەر دەڕێـژن، کـە دەوڵەمەندە بە ماددەیەکی کەتیرەیی بەسـتەر و چواردەوری خانـەکان دەدات، ووردە ووردە کانزاکان دەگرێتە خۆی (بە تایبـەتی کالیسیۆم)، و ڕەق دەبێـت و ئێسك دروست دەکات.

ئێسکە کرکراگەییەکانیش بەهـەمان شێوە دروسـت دەبـن، ئـەو خانانـەی کە لە چینی ناوەڕاستەوە چڕدەبنەوە سـەرەتا ئەمانـە جیادەبنـەوە لـە شـێوەی ڕەگێکــی کرکراگــەیی‌دا کــە بــریتین لــە پێکهێنــەری ئەنــدامی ئێســکە کرکراگەییـەکان، لێـرەوە بۆمـان روون دەبێتـەوە کـە کۆئەنـدامی (پەیکـەری) ئێسکی سەرەتایی کۆرپەلە لە کرکراگە پێك دێت، و پاشـان ئێسـك جـێی ئـەم کرکراگانـە دەگرێتـەوە، بـەم شـێوەیە: چـینێك لـە شـانەی بەسـتەر (پێـیـان دەووترێـت پـەردەی کرکراگـە) دەوری ئـەم ئێسـکە سـەرەتاییانە دەدەن، کـە

پاشان رووپۆشى ئێسك (السمحاق **Periosteum**) دروست دەكەن، و وەك كۆگایەك وایە بۆ خانە بنەڕەتى‌یەكان لە كاتى گەشە كردنى ئەم شانانەدا، بۆ جێگرتنەوەى ئێسكەخانە لەناوچووەكان (وێنەى ٦-١).

**وێنەى (٦-١):** پەیدا بوونى سەرەتای ئێسكەكانى لەش لە كۆرپەلەدا، ئەم هێلكاری‌یە بە تایبەتى سەنتەرە سەرەتاكانى بەئێسك بوون ڕووندەكاتەوە لە كۆرپەلەى مرۆڤدا لە هەفتەى حەوتەمى‌دا. (بە تایبەتى لە پەلەكاندا).

لەگەڵ ئەوەدا كە سەرەتا خانەكانى ئێسك و ماسولكەكان لەگەڵ یەكدا دروست دەبن بە تایبەتى لە تۆپەلە لەشى‌یەكاندا (الفلقات **Somites**)، بەڵام لەدوایی‌دا لەیەك جیادەبنەوە و جیاواز دەبن، پاش دروست بوونى ئێسكە سەرەتایی‌یەكان ئینجا خانە ماسولكەیی‌یە سەرەتایی‌یەكان بەناو بەشە جیاوازەكانى لەشدا بڵاو دەبنەوە بۆ داپۆشینى پەیكەرى ئێسكى سەرەتایى كۆرپەلەكە، كە ئەم بڵاوبوونەوەى خانە ماسولكەیی‌یەكان بەناو لەشدا تەنها

لەدوای دروست بوونی پەیكەری (هەیكەلی) كرکڕاگەیی لەش دەبێت، ئەمەش سەلمێنەری ئەو راستی‌یە قورئانی‌یەیە كە ئێسك پێش گۆشت (ماسولكە) دروست دەبێت.

ئێسكە درێژەكانی لەش لەو خانانای چینی ناوەڕاستەوە دروست دەبن كە چڕ دەبنەوە لە پەلەكاندا لەو شوێنانەی كە ئێسكی تێدا دروست دەبێت، لەم بارستە چڕەی خانەكانەوە كرداری دروست بوونی شانەكان دەست پێدەكات، و جیادەبنەوە لە شێوەی رەگی ئێسكی‌دا، ئەم رەگە خانانە وەك باسكرا پێكهێنەرەكانی دروست بوونی كرکڕاگە پاشان ئێسك دەرێژن بەدەوری خۆیاندا، لە ئەنجامی ئەم كرداری بوون بە كرکڕاگەیەدا نموونەی چوارچێوەیەكی كرکڕاگەیی دروست دەبێت كە شێوەی پەیكەری ئێسكی (الهیكل العظمي)، وشێوەی تایبەتی مرۆڤ بە كۆرپەلە دەبەخشێت، ئەم خانانە لە بەستەرە شانەكان جیادەبنەوە و پاشان لەدەوری ئەم چوارچێوە كرکڕاگەیی‌یەدا زنجیرێك ئێسكە خانە

وێنەی (٦-٢): پەیدابوونی سەرەتا ئێسكی‌یەكان لە كەللەی سەر و پەلەكاندا.

دروست دەبێت و چواردەوریان دەدات، شانەی کرکراگەیی بێلوولەی خوێن جیادەبێتەوە و ئەم کردارە ووردە ووردە دەبێتە هۆی نەگەیشتنی خۆراك بۆ کرکراگەکان و مردنیان و پاشان دروست بوونی مۆخی ئێسقان لێیانەوە.

دوای ئەم کردارە بڵاوبوونەوەی خانەکانی بەستەرە شانەکان و شانە لوولە خوێنـدارەکان ڕوودەدات لـە بەستەرەشـانەکانی دەوروبـەرەوە، ئـەم خانـە بڵاوبووانـە بەشـێوەی ڕەگـی ئێسـکی کۆدەبنـەوە و چـواردەوری خۆیـان بـە ڕەگێکی ئێسکی-کرکراگـەیی تـازە دروسـت بوو دەدەن، بەم شێوەیە ئێسـکە خانەکانی ئێسکە تازە دروست بووەکە (کە پێشتر نموونەیـەکی کرکراگـەیی بووە) پەیدا دەبن (**بڕوانە وێنەکانی: ٦-١ ، ٦-٢**).

لەگـەڵ ئـەوەدا کـە دروسـت بـوونی ئێسـکەکان لـە لەشـی کۆرپەلـەدا لەیـەك کاتدا نابێت، و شانە ئێسکی‌یەکان بەدوای یەکدا پەیـدا دەبن، بـەڵام هەفتـەی حەوتـەم بڵاوبوونـەوەی پەیکـەری ئێسـکی لـە لەشـی کۆرپەلـەدا بەخۆیـەوە دەبینێـت، و ئێسـکەکانی پەلـەکان ووردە ووردە لـەناو چـەکەرەی پەلـە سـەرەتایی‌یەکاندا لەگـەڵ درێـژ بوونیانـدا گەشـە دەکـەن لـەناو شـانەی چینی ناوەڕاسـتدا، سـەرەتا ئێسـکی‌یەکان لـە پەلـەکانی خـوارەوەدا (لـە ڕانـدا بـە تایبـەتی) لەهەفتـەی حەوتەمـدا پەیـدا دەبـن، لەسـنگ وشـەویلگەکاندا لـە هەفتەی ٨و٩دا پەیدا دەبن (**بۆ ڕوونبوونـەوەی چۆنێتی دروست بـوونی ئێسکەکان بڕوانە وێنە ڕەنگاوڕەنگەکانی: ١٢١/ هـ ، ١٢٢/ هـ ، ١٢٣/ هـ ، ١٢٤/ هـ**).

پرۆسەی دروست بوونی ئێسك لە کۆرپەلەی مرۆڤدا لەم دەیانەی دواییدا زۆر بـە باشـی بـاس کـراوە و تۆمـار کـراوە، بـە تایبـەتی لەگـەڵ بـەرەو پـێش چـوونی زانسـتەکانی کۆرپەلـەزانی، و زانسـتی شـانەزانی (علـم الأنسـجة Histology)، تـوانراوە زۆر بـە ووردی لێکۆڵینـەوە بکرێـت لـە شـانەی ناوەڕاسـت و ڕەگـە ئێسـکی‌یەکان، قۆناغـەکانی نیشـتنی کرکراگـەکان و کانزاکـان، و خانـە ئێسـك دروسـت کـەرەکان وخانـە ئێسـك شـکێنەرەکان، کـە ئەمە بـووە هـۆی ئاسـان کردنـی ناسینی قۆناغەکانی نیشتنی کرکراگەکان و

بەکانزا بوونیان لە کۆرپەلەدا، بە تایبەتی پاش جێبەجێ کردنی کردارەکانی رەنگ کردنی تایبەت بە کرکراگە و ئێسکەکان.

لەگەڵ ئەوەدا کە خانە ماسولکەیی‌یە سەرەتایی‌یەکان لە دەوری ئێسکە پێگەیشتووەکان هەن، بەڵام وەك باسکرا جیابوونەوەیان وەك ریشاڵ و بەستەرەوەی ماسولکەیی هەیکەلی کە ئێسکەکان دادەپۆشێت و گرێ دەدات، ئەم کردارە تەنیا لە پاش پرۆسەی پەیدابوونی ئێسك لە پەیکەرە کرکراگەیی‌یەکاندا دەبێت.

**دووەم: زاراوەی ئێسك:**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا﴾، ئەم دەستەواژە قورئانی‌یە بۆمان روون دەکاتەوە کە قۆناغی ئێسك دروست بوون پاش قۆناغی گۆشتپارە(مضغة) دێت، و ئەم گۆشتپارەیە بناغەیەکی پەیکەریی (هەیکلی) بۆ دروست بووە، لە قورئانی پیرۆزدا چەند زاراوەیەکی دیاری کراو هاتووە بۆ وەسفی قۆناغە جیاجیاکانی گەشەکردنی کۆرپەلە کە زانستی نوێی ئەمڕۆ بەهۆی هۆکارە پێش کەوتووەکانی‌یەوە سەلماندوویەتی کە شێوەی دەرەکی کۆرپەلە بەتەواوەتی ئەو زاراوانەی بەسەردا دەچەسپێت لەهەموو قۆناغەکاندا، بۆ نموونە:

کۆرپەلە لە (نطفة)وە دەبێت بە (علقة) کاتێك کە شێوەی تنۆکە ئاوی‌یەکەی لەدەست دەدات، هەروەها لە (علقة)وە دەبێت بە (مضغة) کاتێك کە شێوەی پارچەیەك خوێنی وەستاوی هەڵواسراو لەدەست دەدات، ئەو قۆناغەی کە دوای ئەمانە دێت پێی دەووترێت قۆناغی ئێسك (العظام) چونکە کۆرپەلەکە لە شێوەی گۆشتپارەیەکی نارێك وپێکەوە شێوەیەکی ئێسکیی رێکوپێك وەردەگرێت، ئەویش بە بڵاوبوونەوەی پەیکەرێکی ئیسکی بەناو لەشی‌دا، پیتی (فـ) لە ئایەتە پیرۆزەکەدا ئەوە دەگەیەنێت کە قۆناغی ئێسکی پاش ماوەیەکی کورت لە قۆناغی گۆشتپارەوە دەست پێ‌دەکات، کە زانستی کۆرپەلەزانی بۆمان باس دەکات: قۆناغی (المضغة) بەردەوام دەبێت

تاوەکو هەفتەی شەشەم و یەکسەر لە هەفتەی حەوتەمدا قۆناغی ئێسك دەست پێدەکات بە دروست بوونی پەیکەری کرکراگەیی، کە شێوەی مرۆڤ دەدات بە کۆرپەلەکە (وێنەی ٦-٣).

**وێنەی (٦-٣)**: لەگەڵ پەیدا بوونی پەیکەری ئێسکی کۆرپەلەکەدا وورده وورده شێوەی مرۆڤ وەردەگرێت وەك لە هێلکارییەکاندا دەبینرێت، لەخوارەوەش وێنەیەکی راستەقینەی کۆرپەلەیەك دەبینین لەناو پەردەکانیدا ( لە رۆژی ٤٤ )دا، کە ئێسکەکانی بۆ دروست بووە و خەریکە شێوەی جیاکەرەوەی مرۆڤ وەردەگرێت.



سەبارەت بەم بابەتە فەرموودەیەکمان هەیە کە (حذيفة ابن أسيد الغفاري) ڕەزای خوای لێبێت بۆمان دەگێڕێتەوە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿إذا مَــرَّ بالنُّطْفَة ثنْتان وَأَرْبَعونَ لَيْلَة، بَعَث اللهُ إلَيْها مَلَكاً فَصَوَّرَها وَخَلَقَ سَمْعَها وَبَصَرَها وَجِلْدَها وَلَحْمَها وَعِظامَها﴾ اخرجه مسلم والطبراني وأبو داود، واتە: کاتێك کە (نطفة) دەگاتە ٤٢ڕۆژ پەروەردگار فریشتەیەکی بۆدەنێرێت بۆ ئەوەی شێوەی مرۆڤی پێبدات وبیستن وبینین وپێست وگۆشت وئێسکی بۆ دروست بکات.

بینراوە کە کۆرپەلە لەسەرەتای قۆناغی ئێسکدا شێوەی مرۆڤ وەردەگرێت کە جیای دەکاتەوە لە کۆرپەلەی زیندەوەرانی تر هەروەك چۆن فەرموودەکە ئاماژەی پێداوە بە ووشەی (فَصَوَّرَها: واتە شکڵ وشێوەی مرۆڤی پێدەدات)، زۆر گرانە پێش ڕۆژی ٤٢ی ژیانی کۆرپەلەیی (واتە هەفتەی حەوتەم) کۆرپەلەی مرۆڤ لە کۆرپەلەی زۆرێك لە زیندەوەرانی تر جیابکرێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە شێوەکەی زۆر تایبەتییە و لەم کاتەدا خانە جیانەبووەکان دەست دەکەن بە جیاوازبوون، بۆ ئەوەی خانەی تایبەتی و پاشان ئەندام و کۆئەندامە تایبەتەکان دروست بکەن و ئامادەی کەن بۆ ژیانی دەرەوەی منداڵدان، لەم کاتەدا ڕووی دەرەوەی لەشی کۆرپەلەکە زیاتر تەخت دەبێت لە قۆناغی ئێسکدا و شێوەیەکی ڕێکتر وەردەگرێت، هەروەك پەروەردگار لە ئایەتێکی تردا زۆر بە موعجیزەیی ئاماژەی پێداوە کە دەفەرموێت:

﴿الَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّاكَ فَعَدَلَكَ﴾ (الإنفطار:٧)، واتە: ئەو پەروەردگارەیە کە دروستی کردوویت، و ڕێك و پێکی کردوویت و لەشتی ڕێك کردەوە.

## ژمارەی ئێسکەکانی لەشی کۆرپەلە:

دوای ئەوەی کە باسی پەیدا بوونی ئێسکەکانمان کرد، لێرەدا باسی بابەتێکی تری گرنگ دەکەین کە لە لایەنی ئیعجازییەوە لەمەی پێشتر کەمتر نییە، ئەویش لەبەر ئەوەی ووردەکارییەکی زیاتری تێدایە لەو ئیعجازە خەبەرییەی کە پێشتر لێوەی دواین. لێرەدا دەپرسین: دەبێت ژمارەی ئێسکە دروست بووەکانی لەشی کۆرپەلەکە چەند بن؟!

پێغەمبەری خودا (ﷺ) وەلامی ئەم پرسیارەمان لە فەرموودەیەکیدا دەداتەوە کە دەفەرموێت: عَن عَبْدُ اللَّهِ بْنُ فَرُوخَ أَنَّهُ سَمِعَ عَائِشَةَ تَقُولُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ﴿« إِنَّهُ خُلِقَ كُلُّ إِنْسَانٍ مِنْ بَنِي آدَمَ عَلَى سِتِّينَ وَثَلاَثِمَائَةِ مَفْصِلٍ فَمَنْ كَبَّرَ اللَّهَ وَحَمِدَ اللَّهَ وَهَلَّلَ اللَّهَ وَسَبَّحَ اللَّهَ وَاسْتَغْفَرَ اللَّهَ وَعَزَلَ حَجَراً عَنْ طَرِيقِ النَّاسِ أَوْ شَوْكَةً أَوْ عَظْماً عَنْ طَرِيقِ النَّاسِ وَأَمَرَ بِمَعْرُوفٍ أَوْ نَهَى عَنْ مُنْكَرٍ عَدَدَ تِلْكَ السِّتِّينَ وَالثَّلاَثِمِائَةِ السُّلاَمَى فَإِنَّهُ يَمْشِي يَوْمَئِذٍ وَقَدْ زَحْزَحَ نَفْسَهُ عَنِ النَّارِ »﴾ رواه مسلم. واتە: لە عائشەی خێزانی پێغەمبەرەوە دەگێڕنەوە: کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: خوای پەروەردگار هەموو مرۆڤێکی لە سێ‌سەد و شەست جومگە دروست کردووە، هەر کەسێك رۆژانە (الله أكبر، الحمد لله، لا الە الا الله. سبحان الله، استغفر الله) بڵێت، یان بەردێك لەڕێی خەڵك لاببات یان درکێك یان ئێسقانێك لاببات، یان فەرمان بە چاکەیەك بکات یان بەرگری لە خراپەیەك بکات، بەقەد ژمارەی ئەو سێ‌سەد و شەستە ئەوا ئەو کەسە کە ئێوارەی بەسەردا هات خۆی لە ئاگری دۆزەخ پاراستووە و دوورخستۆتەوە.

سەرەتا با بزانین ئەم فەرموودە پیرۆزە باسی ڕەووشتی بەرز دەکات، کە چۆن پێویستە هەموو موسوڵمانێك بەردەوام خەریکی کاری چاکە بێت و ڕەووشت بەرزی خۆی بنوێنێت لە یارمەتی دانی خەڵکیدا، و بزانیت کە هۆکارێکی سەرەکی رزگاربوونی لە سزای دۆزەخ و بەدەست هێنانی بەهەشت و ڕەزامەندی خودا بریتی‌یە لەم کردەوە چاکانە، لەهەمان کاتدا دەبینین ئەم فەرموودەیە ئاماژەیەکی زانستی زۆر سەرسوڕهێنەری تێدایە کە زۆر مەحاڵە لەو رۆژگارەی پێغەمبەردا (ﷺ) ئەو راستی‌یە لەرووی زانستی‌یەوە بزانرایە، کە ئەویش ئەوەیە دەفەرموێت: مرۆڤ کە دروست دەبێت لەشی لە ٣٦٠جومگە پێك دێت.

کەواتە لە لەشی کۆرپەلەدا (٣٦٠) جومگە یان دەتوانین بڵێین ٣٦٠ ئێسقان هەیە، بەڵام کە سەیری ژمارەی ئێسکەکانی لەشی مرۆڤێکی بالغ و

پێگەیشتوو بکەین دەبینین تەنها ٢٠٦ ئێسك هەیە لە لەشی‌دا، ئەمە بێجگە لە ئێسکە وەتەری‌یەکانی پەنجە گەورەکانی دەست و پێ (کە ئەگەر ئەمانەی بخرێتە سەر کۆی گشتی دەبێتە ٣١٦ ئێسك)، باشە بۆچی دەبێت ئەم جیاوازی‌یە هەبێت؟

دەبینین پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرموودەکەدا باسی دروست بوونی مرۆڤ دەکات لە رابوردوودا (إِنَّهُ خُلِقَ كُلُّ إِنْسَانٍ مِنْ بَنِي آدَمَ ....)، کەواتە مەبەست لە کۆرپەلەی مرۆڤە کە لە کاتی دروست بوونی‌دا پەیکەری لەشی لە (٣٦٠ ئێسك) پێکهاتووە، بابزانین زانست لەم بارەیەوە چی دەڵێت؟

لە هەموو ئێسکێکی پەلەکانی مرۆڤدا (تەنانەت ئێسکە بچووکەکانی پەنجەکانی پێ و دەستیش) ناوچەیەکی ناوەندیی هەیە کە لەوێدا بە ئێسك بوون روودەدات و شانە کرکراگەیی‌یەکان ووردە ووردە دەبن بە ئێسك لەگەڵ گەشەکردنی کۆرپەلەکەدا (کە پێیان دەووترێت سەنتەرەکانی بەئێسك بوون)، هەروەها کۆتایی هەموو ئێسکێکی درێژ بە شانەیەکی کرکراگەیی دێت کە دوایی بە هێواشی زیاد دەکات و دەبێت بە ئێسك (واتە پاش لەدایك بوونی کۆرپەلەکە و لەگەڵ درێژبوونی باڵای‌دا).

ئەم شانە کرکراگەیی‌یانەی کۆتایی ئێسکەکان بە (سەنتەرە لاوەکی‌یەکان یان سەرەتایی‌یەکانی بە ئێسك بوون) ناودەبرێن، کە ژمارەیان لەگەڵ پەیدا بوونی ئێسکەکاندا دەگاتە ١٤٤ سەنتەری بەئێسك بوون، بوون بە ئێسکی ئەم سەنتەرانە بە سیستمێکی دیاری کراوی تۆکمە دەبێت کە لەگەڵ پێویستی‌یەکانی گەشە کردندا دەڕوات بە تێپەڕبوونی کات تا تەمەنی ٢٠ساڵی، کاتێکیش ئەم سەنتەرانە دەبن بە ئێسك دەگۆڕێن بۆ شانەیەکی ئێسکی و یەکدەگرن لەگەڵ پاشماوەی ئێسکەکەی نزیکی و دەبن بە یەك ئێسك، سەرەنجامی ئەم کردارانەی یەکگرتن بریتی‌یە لەوەی کە ئەو ٣٦٠ ئێسکەی کە کۆرپەلەکەی لەسەر دروست دەبێت دەبن بە ٢٠٦ ئێسك (پاش

ئەوەی کە سەنتەرەکانی بە ئێسك بوون هەمووی دەبێت بە ئێسك)، ئەمەش لە نزیك تەمەنی ٢٠ساڵی‌دا دەبێت.

دەتوانین ئێسکەکانی لەش دوای تەواو بوونی گەشە کردن بە ٢٠٦ دانە دیاری بکەین کە ئەمانەن:

٢٨ ئێسك لە سەردا، ٧ بڕبڕەی مل، ١٢ بڕبڕەی سنگ، ٥ بڕبڕەی سك، ٥ بڕبڕەی کۆتایی، ٤ بڕبڕەی کلێنچکە، ٢٤ پەراسوو، ٣ ئێسکی سنگ، ٢ ئێسکی دەفەی شان، ٢ ئێسکی تەرقوە، ٢ ئێسکی باسك، ٤ زەند و کەوەرە، ١٦ ئێسکی مەچەکەکان، ١٠ ئێسکی دەستەکان، ٢٨ئێسکی پەنجەکانی دەستەکان، ٦ ئێسکی حەوز، ٢ ئێسکی ران، ٤ قامیش و تەڵەزم لە قاچەکاندا، ١٤ ئێسکی بچووکی پاژنەی پێکان، ٢٨ ئێسکی پەنجەکانی پێکان، ئەگەر ئێسکە وەتەری‌یەکان بخەینە سەریان: (٢×٢) لە پەنجە گەورەکانی دەستەکاندا، (٣×٢) لە پەنجە گەورەکانی پێکاندا، کە کۆیان دەکاتە ١٠دانە، و هەروەها سەنتەرە سەرەتایی‌یەکانی بە ئێسك بوون کە وەك وتمان ژمارەیان ١٤٤ دانەیە، ئەوا کۆی گشتی ئەو ئێسکانەی کە کۆرپەلەکەی لەسەر دروست دەبێت بریتی‌یە لە:

٢٠٦ + ١٠ + ١٤٤ = ٣٦٠ ئێسك.

سەبارەت بە ئاماژەیەکی تری فەرموودەکە کە دەڵێت مرۆڤ لە ٣٦٠ جومگە دروست دەبێت، بریتین لەمانە:

(١٤٧) جومگە لە بڕبڕەی پشتدا (٢٥ دیسك لە نێوان بڕبڕەکان خۆیاندا + ٧٢ لە نێوان پەراسووەکان و بڕبڕەکاندا + ٥٠ لەنێوان پەراسووەکان لە ڕێگەی بەستەرە لاتەنیشتەکان).

(٢٤) لە سنگدا (٢ ئێسکی پێشەوەی سنگ + ١٨ لە نێوان ئەم ئێسکە و پەراسووەکاندا + ٢ لەنێوان تەرقوە و ئێسکی دەفەی شان + ٢ لەنێوان دەفەی شان و سنگدا).

(٤٣×٢) پەلـەکانی سـەرەوە (جومگـەی شـان + ٣ باسـك + ٤ مەچـەك + ٣٥ ئێسکەکانی دەست).

(٤٤×٢) پەلـەکانی خـوارەوە (جومگـەی ران + ٣ ئـەژنۆ + ٣ پاژنـە + ٣٧ ئێسکەکانی پێ).

(١٣) حەوز (٢ ئێسکی سمت + ٤ بڕبڕەکانی کلێنچکە + ٦ ئێسکی حەوز + ١ بەرزایی دواوە).

(٢) جومگە لە شەویلگەدا.

- کۆی گشتی = ١٤٧ + ٢٤ + (٤٣×٢) + (٤٤×٢) + ١٣ + ٢ = ٣٦٠ جومگە.

فەرموودە پیرۆزەکە کە باسی ژمارەی جومگەکانی لەشی مرۆڤ دەکات، مەبەستی ئەوەشە کە لە مرۆڤی باڵغ و پێگەیشتووشدا هەمان ژمارەی جومگە هەیە و بەدرێژایی پاشماوەی ژیانی مرۆڤەکە ئەم ژمارەیە ناگۆڕێت، کە ئەم هەواڵدانە لە رووی زانستییەوە زۆر راستە و گۆڕانکاری بەسەردا نایەت، زانستی توێکاری لەشی مرۆڤ (علم التشريح-Anatomy) لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا ووردەکارییەکانی پێك هاتنی لەشی مرۆڤی بۆ روون کردووینەتەوە، دکتۆرێکی موسوڵمان لەسەر بناغەی راستییەکانی زانستی توێکاری لەساڵی ١٩٨٥دا هەستا بە ژماردنی جومگەکانی لەشی مرۆڤی پێگەیشتوو و گەیشتە هەمان ئەو راستییەی کە لە لەشی مرۆڤی پێگەیشتوودا ٣٦٠جومگە هەیە.

ئەو کەسەش (دکتۆر السباعی حماد) بوو کە مامۆستا و سەرۆکی بەشی توێکاری و شانەزانی و کۆرپەلەزانی بوو لە کۆلیجی پزیشکی (زانکۆی أنبار) لە عێراق، کە بە هاوکاری خێزانەکەی (د.شادیە أحمد) هەستان بەم توێژینەوەیە و کاتێك کە بڵاویان کردەوە بووە مایەی خۆشحاڵی موسوڵمانان و رێزلێنانیان لە ووڵاتە ئیسلامییەکاندا.




Figure 5-3. Primary ossification centers in the human embryo during the seventh week (Reprinted with permission from Patten, 1968)

Figure 5-4. Primary ossification centers in the sternum during weeks eight through nine (Reprinted with permission from Patten, 1968)

Figure 5-5. Primary ossification centers in the maxilla during weeks eight through nine (Reprinted with permission from Patten, 1968)

**وێنەی** (٦-٤): **ئێسکە سەرەتاییەکانی پێکهێنەری لەشی کۆرپەلە لە هەفتەکانی ( ٨,٧ )دا.**

دیاری کردنی ژمارەی ئێسکەکان و جومگەکان لە کۆرپەلەدا و لە مرۆڤی پێگەیشتووشدا بەم شێوەیە خۆی لەخۆی‌دا موعجیزەیە، چونکە ئەگەر ئێمە بە خەیاڵ بیر لەم گریمانە بکەینەوە، ئەوا چانسی ئەوەمان نابێت بگەینە ژمارەی راستی ئێسکەکان و جومگەکان، چونکە سەدان بەڵکو هەزاران گریمان و ژمارە بە خەیاڵماندا دێت، لەگەڵ ئەمانەشدا زانینی ژمارەی ئێسکەکان و جومگەکانی کۆرپەلە زۆر گرانترە لە زانینی ئەم ژمارەیە لە مرۆڤی پێگەیشتوودا، چونکە ژماردنی ئێسکی بچووك لە جەستەیەکی بچووکدا گرانترە لە ژماردنی ئێسکی گەورە لە جەستەیەکی گەورەدا، هەروەها ئەم کرداری سەرژمێری کردنە پێویستی بە دەستکەوتنی چەندین کۆرپەلە هەیە کە توێکاری بکرێن بەهۆی چەندین ئامێری تایبەتی‌یەوە کە ئێسکەکان لە ماسولکەکان (گۆشت) جیابکاتەوە، کە ئەم تەکنیکانە لە سەردەمی

پێغەمبەردا (ﷺ) نەزانرابوون و لەبەر دەستدا نەبوون، چونکە نیوە دورگەی عەرەبی لەژێر باری قورسی نەزانی و نەفامی‌دا دەینالاند بە تایبەتی لە بواری زانیاری‌یەکانی دروست بوون و گەشە کردنی کۆرپەلەی مرۆڤ لە سکی دایکی‌دا.

گەیشتن بەم حەقیقەتە بەڵگەیەکی ترە لەسەر موعجیزەی زانستی سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ)، کە چۆن و بە چ شێوازێك پێغەمبەر توانی لەشی مرۆڤ توێکاری بکات و بۆی دەرکەوت کە لەناو لەشدا ٣٦٠جومگە هەیە؟! لە رۆژگارێکدا کە وەك ووتمان زانستی پزیشکی ئەوەندە دواکەوتوو بوو کە خەڵکی و پزیشکانیش لەو سەردەمەدا وایان دەزانی تەنیا هۆکاری تووش بوون بە نەخۆشی بریتی‌یە لە چوونە ژوورەوەی جنۆکە و شەیتانەکان بۆ ناو لەشی مرۆڤەکان، دیارە پێغەمبەریش (ﷺ) خۆی ئەمەی نەدەزانی ئەگەر بە نیگا و وەحی لەلایەن دروست کەری مرۆڤەوە لەم بابەتە ئاگادار نەکرایەتەوە، بەڕاستی ئەمانەی باسکران بەڵگەن بۆ کەسێك کە بیەوێت بۆی دەرکەوێت سوننەتی پێغەمبەریش (ﷺ) هەر وەحی‌یە و لەلایەن خوای بەدەسەڵاتەوە بۆ مرۆڤەکان نێردراوە.

## سێیەم: دروست بوونی گۆشت (ماسولکەکان):

زوربەی خانە سەرەتایی‌یەکانی ماسولکەکانی کۆئەندامی جووڵە لە بارستە لەشی‌یەکاندا (الفلقات) دروست دەبن هەربۆیە ماسولکەکان بەشێوەی پارچە پارچە دروست دەبن، کە دابەش بوونی دەمارە پێستی‌یەکان لە مرۆڤی پێگەیشتوودا ئاماژە بۆ ئەم بەش بەشی‌یە دەدەن و هەروەها ئەم بەش بەشی‌یە ماسولکەیی‌یەش ئاماژە دەدات بە بەش بەشیی لەشی کۆرپەلەکە، لە کۆتایی هەفتەی پێنجەم و سەرەتای هەفتەی شەشەمی گەشەی کۆرپەلەدا خانە سەرەتایی‌یەکانی ماسولکە دوور دەکەونەوە لە ناوچەی بارستە لەشی‌یەکان و لەگەڵ خانە پێستی‌یەکان بەناو لەشدا بڵاو دەبنەوە، پاشان ئەم خانانە گەشە دەکەن و بۆند دەبن بە خانەکانی دەوروبەریانەوە،

گەشەکەیان ڕووەو سك دەبێت بۆ پێك هێنانی پارچە ماسولکەیی‌یەکان، ئەم پارچە ماسولکەیی‌یانە دابەش دەبن بۆ دوو بەشی سەرەکی: دەرەکی یان پشتی (Epimeric) و بەشی ناوەوە یان سکی (Hypomeric) کە هەریەکێکیان لقێکی دەمارە پەتك دەچێتە ناوی، بەشی دەرەکی لە داهاتوودا ماسولکەکانی پشت دروست دەکات و بەشی ناوەوە ماسولکەکانی دیواری سك وماسولکەی پەراسووەکان دروست دەکات (**وێنەی ٦-٥**).






**وێنەی (٦-٥)**: 1- دابەش بوونی دەمارەکانی پێست لە مرۆڤێکی پێگەیشتوودا نەو ڕێڕەوە ڕوون دەکاتەوە کە ماسولکەکانی لەسەر دروست دەبن.
2, 3- چەند برگەیەکی کۆرپەلەیە کە دروست بوون و گەشە کردنی کۆئەندامی ماسولکە لە قۆناغی (گۆشت- اللحم)دا ڕوون دەکاتەوە بۆ ئەوەی کە لە دواییدا ئێسکەکان دا پۆشن.

کرداری دروست بوونی ماسولکەکان لەم دەیانەی پێشوودا زۆر بە باشی لێکۆڵینەوەی لێکراوە، و دەرکەوتووە کە خانە سەرەتایی‌یەکانی ماسولکە یەکدەگرن و پێکهاتووی فرەناوك دروست دەکەن کە شێوەی لوولەی ماسولکەیی (Myotubes) وەردەگرن، گەشە کردن بەردەوام دەبێت بەهۆی ئەم یەکگرتنانەی خانە و لوولە ماسولکەیی‌یەکانەوە، لە کاتی یان یەکسەر لەدوای ئەم یەکگرتنانە ڕیشاڵە ماسولکەیی‌یەکان (Myofilaments) دروست دەبن لەناو ئەم خانانەدا و ووردە ووردە ڕێکدەبن، لە سەرەتادا ئەم ڕیشاڵە ماسولکەیی‌یانە ڕێك نین بەڵام بە هێواشی ڕیز دەبن لە چەپکە ڕیشاڵی ماسولکەیی‌دا (وەك لە شانەی ماسولکەیی هەیکەلی ئێسکی مرۆڤی ئاسایی پێگەیشتوودا دەبینرێت)، پاشان ئەم خانە ماسولکەیی‌یانە و ڕیشاڵەکانیان دەبەسترێنەوە بە ڕووپۆشی ئێسکە پێگەیشتووەکان لەم شوێنانەدا و دەبنە هۆی دروست بوونی ئەو شانە ماسولکەیی‌یانەی کە ئەم ئێسکانە دادەپۆشن، ئەم کردارە لەکۆتایی هەفتەی حەوتەم وسەرەتای هەفتەی هەشتەمدا ڕوودەدات وەك زانستی کۆرپەلەزانی بۆمان باس دەکات، دەتوانرێت بە ئاشکرا ماسولکەکانی سەر و لەش و پەلەکان لەم کاتەدا ببینرێت، و هەروەها لەم کاتەدا کۆرپەلە دەتوانێت چەند جووڵەیەك بە پەلەکانی بکات، پێش ١٤٠٠ساڵ لەمەوبەر قورئانی پیرۆز پێشدەستی کردووە لە باس کردنی دروست بوونی ئێسك لە کۆرپەلەدا و پاشان داپۆشینی ئەم ئێسکانە بە گۆشت (ماسولکە)، وەك پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا﴾ (المؤمنون:١٤)، واتە: پاشان ئێسکەکانمان بە گۆشت داپۆشی، وەك باسمان کرد ڕیشاڵە ماسولکەیی‌یە پێك هاتووەکان خۆیان دەبەستنەوە بە ڕووپۆشی ئێسکەکانەوە، ئەویش بەهۆی گورزەیەکی شانەی بەستەرەوە یان وەتەری ماسولکەیی (أوتار عضلية) کە زۆر بەتوندی ماسولکە و ڕووپۆشەکانیان دەبەستێتەوە بە ڕووپۆشی ئێسکەکانەوە کە پێشتر دروست بووە (بڕوانە وێنە ڕەنگاوڕەنگەکانی: ١٢٥/ هـ ، ١٢٦/ هـ ، ١٢٧/ هـ ، ١٢٨/ هـ).

زانستی گەشەکردنی ژیان (علم الحیاة النمائیة) کە گرنگی دەدات بە زنجیرە کردارەکانی گەشەکردن کە لە کاتی دروست بوونی ئێسك و ماسولکەکاندا روودەدەن، بۆمان باس دەکات کە دەتوانین کرداری گەشەکردنی ئێسك وماسولکە بەزنجیرە رووداوێك کورت بکەینەوە بەم شێوەیە:

(کاتێك کە ئێسکەکانی هەیکەلی لەش دروست دەبن چینە خانەی ناوەڕاستی کۆرپەلە کە ماسولکەکان دروست دەکەن دەست دەکەن بە کۆبوونەوە لە شێوەی تۆپەڵی لەشیدا لە پشت وسکدا، کە پاشان ئەم ماسولکە دروست بووانە هەڵدەستن بە داپۆشینی بەشەکانی پەیکەرە ئێسکی‌یە دروست بووەکە) * .

**چوارەم: زاراوەی دا پۆشین بەگۆشت:**

ئێسکەکان و ماسولکەکان شێوەی ئاشکرا وناسراوی خۆیان وەرناگرن لە ٤٠ رۆژی یەکەمی ژیانی کۆرپەلەدا، بەڵکو لە هەفتەی حەوتەمدا ئەم شێوە ئاسایی‌یە وەردەگرن و لێرەوە کۆرپەلە بە ئاشکرا پێوەی دیارە کە چووەتە قۆناغێکی ترەوە و پێکهاتەکەی لە قۆناغی پێشتری (المضغة) زۆر جیاوازە، دوای ئەمە قۆناغی داپۆشینی ئێسکەکان بە ماسولکە لە هەموو لاکانیانەوە دێتەپێش، کە لێرەدا شێوەی مرۆڤانەی کۆرپەلە دەردەکەوێت و ئەندامەکانی لەشی ووردتر رێك دەبن، پاشان کۆرپەلە دەست دەکات بە جووڵە لە کۆتایی هەفتەی هەشتەمدا، کە جیاکەرەوەیەکی تری قۆناغی ماسولکەیە لە قۆناغی ئێسك لە پێکهاتە و شێوە و هاوسەنگی و توانای کۆرپەلەدا بۆ جووڵان (**بڕوانە وێنەی رەنگاورەنگەکانی: ١٢٩/ هـ ، ١٣٠/ هـ**).

ئەم قۆناغی داپۆشین بە ماسولکەیە لە کۆتایی هەفتەی حەوتەم و سەرەتای هەفتەی هەشتەم دەست پێ‌دەکات کە یەکسەر لەدوای قۆناغی

---

* Patten; Human Embryology, 3rd Edition-1968, P 248.

دروست بوونی ئێسکەوە دێت، هەربۆیە داڕشتە قورئانی‌یەکە پیتی (فـ)ی بەکارهێناوە بۆ بەستنەوەی ئەم دوو قۆناغە کە مانای بەدوای یەکی و پێکەوە بەستنەوە دەگەیەنێت، هەروەها ئایەتە پیرۆزەکە ئاماژە بەوە دەدات کە قۆناغی داپۆشین بە گۆشت کۆتایی قۆناغێکی گەشەکردنی کۆرپەلەکەیە، کە بەدوای‌دا قۆناغێکی تر دەست پێ‌دەکات کە قۆناغی کامڵ بوون و گەشە کردنە (النشأة)، کە ئەمەیان ماوەیەك دەخایەنێت، هەربۆیە پیتی (ثُمَّ)ی بەکارهێناوە بۆ بەستنەوەی ئەم دوو قۆناغە کە مانای ڕێکخستن وماوە پێچوون و خاوی دەگەیەنێت (الترتيب والتراخي)، هەموو ئەم مانا بەرز و ئیعجازانە لەم ئایەتە پیرۆزەدا بەدی دەکەین: ﴿فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً، فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا، فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا، ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ﴾.

## ڕێك کردنەوە و شێوە پێدان (التسوية والتصوير):

- خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ يُمْنَى، ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّى﴾ (القيامة: ٣٧-٣٨) واتە: ئایا کاتی خۆی ئادەمیزاد نوتفەیەك نەبووە لە بەشێکی مەنی‌یەوە کە دەڕژێنرایە شوێنی خۆی (واتە ئایا ئەو لەسەرەتاوە کە دروستمان کرد بەشێکی تنۆکێك ئاو نەبووە)؟! پاشان بوو بە خۆهەڵواسێنەر (علقة) کە دوایی دروستمان کرد، و ئینجا ئەندازەمان بۆ دانا و ڕێکمان کردەوە، هەروەها دەفەرموێت: ﴿سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى، الَّذِي خَلَقَ فَسَوَّى﴾ (الأعلى: ١-٢) واتە: خوای پەروەردگاری پایە بەرزی خۆت یادبکە و بەرز ڕایگرە، ئەو خودایەی کە زیندەوەرەکان دروست دەکات و پاشان ڕێکیان دەکاتەوە و لەشیان ڕێك وپێك دەکات (هەر زیندەوەرە و بە شێوەی خۆی).

- هەروەها لە ئایەتێکی تریشدا دەفەرموێت: ﴿الَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّاكَ فَعَدَلَكَ﴾ (الإنفطار:٧)، واتە: ئەو پەروەردگارەیە کە دروستی کردوویت، و ڕێك و پێکی کردوویت و لەشتی ڕێك کردەوە، لە ئایەتێکی تریشدا دەفەرموێت: ﴿هُوَ الَّذِي يُصَوِّرُكُمْ فِي الأَرْحَامِ كَيْفَ يَشَاءُ ...﴾ (آل عمران:٦)، واتە: هەر پەروەردگارە کە وێنەتان دەکێشێت لە مناڵدانەکاندا بەو شێوەیەی کە وویستی لێ‌بێت ...

- لە فەرموودەیەکی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە: ﴿إذا مَرَّ بِالنُّطْفَةِ ثِنْتان وَأَرْبَعونَ لَيْلَة، بَعَثَ اللهُ إِلَيْها مَلَكاً فَصَوَّرَها وَخَلَقَ سَمْعَها وَبَصَرَها وَجِلْدَها وَلَحْمَها وَعِظامَها﴾ أخرجه مسلم والطبراني وأبو داود، واتە: کاتێك کە (نطفة) دەگاتە ٤٢ڕۆژ پەروەردگار فریشتەیەکی بۆدەنێرێت بۆ ئەوەی شێوەی مرۆڤی پێبدات وبیستن وبینین وپێست وگۆشت وئێسکی بۆ دروست بکات.




وێنەی (٦-٦): وێنەکانی لای ڕاست وێنەی ڕاستەقینەی کۆرپەلەن و ئەوانەی لای چەپ هێلکارین، کە هەموویان ئەوەمان بۆ ڕوون دەکەنەوە دوای دروست بوونی ئێسکەکان و لە هەفتەی حەوتەم بەرەو سەر کۆرپەلەکە شێوەی مرۆڤ وەردەگرێت.

لەم ئایەت و فەرموودە پیرۆزانەی سەرەوەدا باسی چەند ڕووداوێك کراوە کە لە کاتی گەشە کردنی کۆرپەلە لە سکی دایکیدا ڕوودەدەن، ئەویش پاش ئەوەی کە کۆرپەلەکە لە دروست بووندایە (تسویة و تعدیل) دەکرێت و

وێنـەی مرۆڤـی پێدەبەخشـرێت و (تصـویر) دەکرێـت، و هـەروەها ئێسـك و گۆشـت و چـاو و گـوێ و ئەندامـەکانی تـری بـۆ دروسـت دەبێـت، ئێسـتا پـێم خۆشە کەمێك بەدرێژی لەم ڕووداوانە بدوێم:

پێشتر باسی دروست بوونی ئێسك و گۆشتمان کرد لە کاتی گەشە کردنی کۆرپەلەکەدا، دەربارەی (تسویة): لە فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبیدا بەگشتی بە مانای ڕێك و ڕەوانی و ڕێکبوونەوە دێت و لە ڕەگی (سَوّی)وە هاتووە، و کۆی ماناکانی (سَوّی) بریتین لە:

١- بـە مانـای ئـەوەی کـە شـتێك ڕێـك وڕەوان ببێـت (أن یکـونَ الشـيء مستقیماً)، بەڵگەشمان لەسەر ئەمە ئەم ئایەتەیە کە دەفەرمەوێت: ﴿أَفَمَن یَمْشِي مُكِبّاً عَلَى وَجْهِهِ أَهْدَى أَمَّن یَمْشِي سَوِیّاً عَلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِیمٍ﴾ (الملك:٢٢)، واتە: جا ئایا ئەو کەسەی کە دەمە و ڕوو کەوتووە و بەو حاڵە دەڕوات، چاکتر ڕێگە دەزانێت؟ یان ئەو کەسەی کە بەسەر شەقامێکی ڕاست و ڕەواندا بەڕێك و پێکی دەڕوات بەڕێوە؟! (سَوِیّاً) واتە: (مستقیماً) ڕێك و ڕەوان.

٢- هەروەها بە مانای ئەوە دێت کە شتێك ڕێك بێت بێبەرزی و نزمی.

٣- واتـە شـتێك ڕێـك وپێـك بکرێـت، وەکـو چـۆن دانـایی و حیکمـەت وادەخوازێت، بەواتای ئەوەی کە مرۆڤەکە بخرێتە سەر شێوەی تەواو ڕێك و کامڵی مرۆڤانە، بەڵگەش لەسەر ئەمە ئەم ئایەتانەیە: ﴿فَاتَّخَذَتْ مِن دُونِهِمْ حِجَاباً فَأَرْسَلْنَا إِلَیْهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَراً سَوِیّاً﴾ (مریم:١٧)، واتە: ئینجا لەنێوان خـۆی و ئەوانـدا پەردەیـەکی رایـەڵ کـرد (تـا دوور لـە خـەڵکی بەسـۆزەوە خواپەرسـتی بکـات) ئێمـەش جـوبرائیلی فریشـتەمان نـارد بـۆ لای، وەکـو بەشەرێکی ڕێك و تەواو (خۆی خستە بەر چاوی)، ﴿قَالَ لَهُ صَاحِبُهُ وَهُوَ یُحَاوِرُهُ أَكَفَرْتَ بِالَّذِي خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ سَوَّاكَ رَجُلاً﴾ (الکهف:٣٧)، واتە: هاوەڵە ئیماندارەکەی لە کاتێکدا کە گفتوگۆی لەگەڵدا دەکرد پێی ووت: ئایا بـاوەڕت نـەماوە بـەو زاتـەی کـە سـەرەتا تـۆی لـە خـاك دروسـت کـردووە؟! لەوەودوا نوتفەیەك بوویت و پاشان کردیتی بە پیاوێکی ڕێك و تەواو.

لەو فەرمووده پیرۆزەی پێغەمبەردا (ﷺ): ﴿عَن عَبْدُ اللّٰه بن مَسْعود (رضي الله عنه) قال: حَدَّثَنَا رَسُولُ اللّٰه (ﷺ) وَهُوَ الصَّادِقُ الْمَصْدُوقُ قَالَ: « إِنَّ أَحَدَكُمْ يُجْمَعُ خَلْقُهُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ أَرْبَعِينَ يَوْماً ....﴾ رواه مسلم، واتە: هەریەکێك لە ئێوە کۆبوونەوە و دروست بوونی لە ٤٠ رۆژدا تەواو دەبێت ...

لێرەدا فەرموودەکە قۆناغی دروست بوونی بنەڕەتی کۆرپەلەکەی بە ٤٠رۆژ دیاری کردووە، و بەپێی ئایەتە پیرۆزەکانی سەرەوەش دوای ئەم دروست بوونە بنەڕەتی‌یە قۆناغێکی تر دەست پێ‌دەکات کە بریتی‌یە لە (تەسویە) و رێکبوونەوە، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّى﴾، لێرەدا دەپرسین: چۆن دەتوانین وای دابنێین کە رێکبوون (تەسویە) پاش ٤٠ رۆژ دەست پێ‌دەکات؟

وەڵام: هەموو دەقەکانی قورئان و سوننەت و بەڵگە زانستی‌یە نوێکان لەگەڵ یەکتری‌دا یەکدەگرنەوە، هەموویان ئەو مانایە دەبەخشن کە قۆناغی دروست بوونی سەرەتایی تەواو دەبێت و رێکبوون دەست پێ‌دەکات، ئەوەتا ئەو فەرمودەیەی سەرەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە قۆناغی دروست بوونی سەرەتایی پاش ٤٠رۆژ تەواو دەبێت.

هەروەها دەرئەنجامە زانستی‌یەکانیش بەڵگەن لەسەر ئەوەی قۆناغی گۆشتپارە (کە زوربەی زۆری ئەندامەکانی لەشی تێ‌دا دروست دەبێت) لە هەفتەی شەشەمدا تەواو دەبێت (واتە پاش ٤٢رۆژ) (**وێنەکانی: ٦-٦ ، ٦-٧**).

هەروەها ئەگەر بێت و بەراوردی ئەم دوو ئایەتە بکەین: ﴿أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ يُمْنَى، ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّى﴾ (القيامه: ٣٧-٣٨)، ﴿ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ، ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً، فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا، فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا﴾ (المؤمنون: ١٣-١٤)، ئەوا ئەم دەرەنجامانەمان دەست دەکەوێت کە لە خشتەی ژمارە (٢)دا دیارە:

## خشتەی ژمارە (٢)

| سوورەتی (القیامة) | سوورەتی (المؤمنون) | دەرەنجامەکان |
|---|---|---|
| أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ يُمْنَى | ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ | ئەم ئایەتانە مەبەستیان لە قۆناغی نوتفەیە. |
| ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً | ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً | ئەم ئایەتانە مەبەستیان لە قۆناغی عەلەقەیە. |
| فَخَلَقَ | فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً | یەکگرتنەوەی ئەم دوو ئایەتە ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە کە قۆناغی گۆشتپارە (مُضْغَة) بریتییە لە قۆناغی دروست بوونی بنەڕەتی ئەندامەکان. |
| فَسَوَّى | فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا | ئەم ئایەتانەش ئەوەمان بۆ روون دەکەنەوە کە قۆناغی ڕێکبوون (تسویة) خۆی لەخۆیدا هەردوو قۆناغی (کردنی گۆشتپارەکە بە ئێسك، و پاشان داپۆشینی ئەم ئێسکانە بە ماسولکە) بەدوای یەکدا دەگرێتەوە. |
| | فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا | |




**وێنەی (٦-٧)**: لەم وێنانەوە ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە دوای ٤٢ ڕۆژەی گەشە کردنی کۆرپەلەکە بە تەواوەتی شکلی مرۆڤ وەردەگرێت، بە تەواوەتی وەك فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ): ﴿إذا مَرَّ بِالنُّطْفَةِ ثِنْتان وَأَرْبَعونَ لَيْلَة، بَعَثَ اللهُ إِلَيْها مَلَكاً فَصَوَّرَها ....﴾ .

کەواتە قۆناغی دروست بوونی بنەڕەتی کۆرپەلەکە بریتی‌یە لە قۆناغی گۆشتپارە (مُضْغَة)، چونکە لێرەدا سەرەتای هەموو ئەندامەکان دروست دەبن، ئەمەش ئەو بۆچوونەیە کە ڕاڤەکاری بلیمەتی قورئان (أبو السعود) بۆی چووە کە دەڵێت: ﴿ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً﴾ واتە بە قودرەتی خوای گەورە دروست دەبێت (ثُمَّ خَلَقْنَا اَلنُّطْفَةَ عَلَقَةً)، ﴿فَخَلَقَ﴾ واتە: خوای گەورە تەقدیری کرد بەوەی کە کردی بە گۆشتپارەیەکی دروست بوو (مُضْغَة مُخَلَّقَة)**.

قۆناغی ڕێکبوونیش (تەسویە) هەردوو قۆناغی (کردنی گۆشتپارەکە بە ئێسك، و داپۆشینی ئەم ئێسکانە بە ماسولکە) دەگرێتەوە، ئەویش لەبەر ئەوەی ئەم کردارانە بریتین لە جۆرێك لە تەصویر و وێنەدان بە کۆرپەلەکە، بە مانایەکی تر ڕێکبوونەوەی ئەندامەکانە، کە خۆی لەخۆی‌دا خاڵی نی‌یە لە کرداری دروست بوون، بەڵام ئەم دروست بوونە بریتی نی‌یە لە کرداری دروست بوونی ئەندامەکان لە سەرەتاوە تا کۆتایی بەڵکو تەنها دروست بوونێکی تەواوکەرە، و جۆرێکە لە دروست بوونی سنووردار، چاوەکان و گوێکان دروست بوون و شەق بوونیان لە هەفتەی چوارەمەوە دەست پێ‌دەکات، لە ماوەی دروست بوونی بنەڕەتی ئەندامەکاندا، بەڵام ڕێکبوونیان و وەرگرتنی وێنەی مرۆیی تەنها لە هەفتەی هەشتەمدا دەبێت (واتە لە کۆتایی ماوەی ڕێکبوون و تەسویەدا).

بەڵگەشمان لەسەر ئەمە ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەرە (ﷺ) کە دەفەرموێت: ﴿إِذا مَرَّ بِالنُّطْفَةِ ثِنْتان وَأَرْبَعونَ لَيْلَة، بَعَثَ اللهُ إِلَيْها مَلَكاً فَصَوَّرَها، وَخَلَقَ سَمْعَها وَبَصَرَها وَجِلْدَها وَلَحْمَها وَعِظامَها﴾ اخرجه مسلم والطبراني وأبو داود، واتە: کاتێك کە (نطفة) دەگاتە ٤٢ڕۆژ پەروەردگار فریشتەیەکی بۆدەنێرێت بۆ ئەوەی شێوەی مرۆڤی پێ‌بدات وبیستن وبینین وپێست وگۆشت وئێسکی بۆ

** بڕوانە تەفسیری (أبو السعود)/ ج٩– ص٦٩.

دروست بکات، کەواتە ئەم قۆناغە بریتی‌یە لە قۆناغی ڕێکبوون و شکڵپێدان و تەصویری کۆرپەلەکە، دەبینین کە چاوەکان و گوێکان وێنەی مرۆڤ وەردەگرن لە هەفتەی هەشتەمدا کە خۆیان سەرەتا لە ڕۆژی ٢٢دا دروست بوونیان دەستی پێکردووە (بڕوانە وێنەی ڕەنگاوڕەنگی: ١٣١/ هـ).

زانای کۆرپەلەزانی (لارس هامبێرگەر) دەڵێت: (گوێی دەرەوە شێوەی خۆی وەردەگرێت لەگەڵ سەرەتای هەفتەی هەشتەمدا ...)***

ئەگەر بچینە سەر درێژەی ماناکانی (سَـوَّى) و ڕوون کردنەوەی لە ڕووی ڕاستی‌یەکانی کۆرپەلەزانی‌یەوە:

١- سەبارەت بە مانای یەکەم (بە مانای ئەوەی کە شتێك ڕێك وڕەوان ببێت): بەکارهێنانی ئەم ووشەیە لەم ئایەتەدا دەلالەتێکی تایبەتی خۆی هەیە، ئەویش لەبەر ئەوەیە کە ئەوە دەگەیەنێت کۆرپەلە پێش ئەم قۆناغە لەشی ڕێك نەبووە (واتە چەماوە بووە) و لێرەوە ڕێك دەبێتەوە، کە ئەمە خۆی لەخۆیدا ئیعجازێکی هەواڵدانە، ئەم قۆناغی ڕێکبوونەوەیە هەردوو دیاردەی دروست بوونی ئێسك و داپۆشینیان بە ماسولکە دەگرێتەوە، کە لەگەڵ دروست بوونی ئێسکدا لەشی کۆرپەلەکە ڕەق و بەهێز دەبێت و ئیتر شێوە چەماوەیی‌یەکەی (کە پێشتر لە قۆناغی گۆشتپارەدا لە شێوەی پیتی Cی ئینگلیزی‌دا بووە) لەدەست دەدات و ڕێکدەبێتەوە (بڕوانە وێنەی ڕەنگاوڕەنگی: ١٣٢/ هـ).

٢- مانای دووەم: ئەوەی کە شتێك ڕووەکەی ڕێك ببێت بێ‌بەرزی و نزمی، کە وەك باسمان کرد لەم کاتەدا بە هێواشی بەرزی و نزمی و ئاوساوی و چاڵایی لەشی کۆرپەلەکە نامێنێت بەهۆی ڕەقبوونی ئەندامەکان و دروست بوونی ئێسك و داپۆشینیان بە ماسولکە، ئیتر بەهۆی ئەمانەوە ڕووی لەشی کۆرپەلەکە تەواو ڕێك دەبێتەوە.

*** بڕوانە کتێبی (A Child is Born)/ لاپەڕە (١١٤).

٣- **مانــای ســێیەم:** واتــە شــتێك رێــك وپێــك بکرێــت، وەکــو چــۆن دانــایی و حیکمــەت وادەخوازێــت، بــەواتای ئــەوەی کــە مرۆڤەکــە بخرێتــە ســەر شــێوەی تــەواو رێــك و کــاملی مرۆڤانــە، بینــراوە کــە لــە کۆتــایی هەفتــەی هەشــتەمدا کۆرپەلەکە دەبێتە بارستەیەکی مرۆیـی تـەواو و کامڵ، (د. لارس هامبێرگەر) دەڵێـت: دوای هەشـت هەفتـە درێـژی کۆرپەلەکـە تـەنها ٤ سـانتیمەتر دەبێـت، بەڵام لەناو ئەم لەشە بچووکەی‌دا هەموو ئەندامـەکان لـە شـوێنی خۆیانـدان، و هەموو ئەو شتانەی کە پێویستە بوونیان هەبێت لە مرۆڤێکی کامڵدا دروست بوون. (لە کتێبی A Child is Born وەرگیراوە/ لاپەڕە ٩١).

لـەم قۆناغـەدا کلکـی کۆرپەلەکـە نامێنێـت و گـوێی دەرەوە شـکڵی خـۆی وەردەگرێـت لـە ئـەنجامی کـامڵ بـوونی پێچـەکانی گـوێی نـاوەوە، و گـوێی نـاوەوە بـە تـەواوەتی دروسـت دەبێـت، چـاوەکانیش بـەهۆی پەیـدا بـوونی پێڵووەکانەوە وێنەی ئاسایی خۆیان لە رووخساردا وەردەگرن (**بڕوانە وێنـەی ڕەنگاوڕەنگی: ١٣٣/ هـ**)، پەنجەکانی دەست و پێ بە ئاشکرا پەیدادەبن، و لووت دەردەکەوێت، لێرەوە وێنەی کۆرپەلەکە لە وێنەی مرۆیی‌یەوە نزیك دەبێتـەوە و بـە شـێوەیەك رێکدەبێتـەوە کـە مرۆڤـی لێ‌جیابکرێتـەوە ئـەویش بـەهۆی جیاوازبوونی ئەندامەکانی‌یەوە، بەمەش مانای سێیەمی رێکبوون و ووشـەی (سَـــوَّی)ی ئایەتـە پیرۆزەکـە دەردەکـەوێت، و هـەروەها راسـتیی زاراوەی (فَصَوَّرَها) واتە وەرگرتنی وێنەی مرۆڤ کە لە فەرموودەکەی پێغەمبـەردا (ﷺ) هاتووە بە تەواوەتی ئاشکرا دەبێت (**بڕوانە وێنەی ڕەنگاوڕەنگی: ١٣٤/ هـ**).

کەواتە قۆناغی رێکبوون سیفەتێکی تایبەتی هەیە بەوەی کە وێنـەی مرۆڤ دەبەخشـێت بـە کۆرپەلەکـە، ئـەوەی جـێی ئامـاژە پێکردنیشـە ئەوەیـە کـە رێکبـوون (تەسـویە) بریتی‌یـە لـە حاڵـەتی پەیـدابوونی سـیفاتی دەرەکـی کۆرپەلەکـە و چـەند شـتێك دەگرێتـەوە (رێکبوونـەوەی لـەش، ئامـادەکردنی ئەندامەکان، و .....)، بەڵام کردارەکانی دروست بوونی ئێسك و داپۆشینی بە

ماسولکە بریتین لە چەند پرۆسەیەکی ناوەکی کە لەناو لەشی کۆرپەلەکەدا روودەدەن و دەبنە هۆی ئاشکرا بوونی سیفاتە دەرەکی یەکانی تەسویە و رێکبوونەوە و شکڵپێدان (هەروەها بڕوانە وێنە ڕەنگاوڕەنگەکانی: ١٣٤/ هـ ، ١٣٥/ هـ ، ١٣٦/ هـ ).

## تەواو بوونی دروست بوونی سەرەتایی ( إتمام الخلق ):

لە بەشەکانی پێشتردا باسی ماوەی لەبارچوونی سەرەتاییمان کرد (Spontaneous Abortion)، و روونمان کردەوە کە منداڵدان لەوانەیە لەم کاتەدا کۆرپەلەکە وەرنەگرێت کاتێك کە دەکەوێتە ناوی، پاشتر باسی ماوەی جێگیر بوونمان کرد بۆ کۆرپەلەکە و روونمان کردەوە کە ماوەی دوای قۆناغی گۆشتپارە بریتی یە لە کاتێکی جێگیر بوون و سکپڕی یەکە بەزۆری تێ ی دا دادەمەزرێت.

با ئێستاش باسی ماوەی تەواو بوونی دروست بوونی سەرەتایی (إتمام الخلق) بکەین کە ئاماژەیە بۆ ئەوەی ماوەی شڵۆقی و ناجێگیری بۆ کۆرپەلەکە کۆتایی هاتووە، و قۆناغێك دەستی پێ کردووە بۆ تەواو بوون و کامڵ بوونی دروست بوونی سەرەتایی، بە مانایەکی تر ئەو ماوەیەی تر کە دێت هیچ شتێکی ئەوتۆی تێ دا نی یە کە رێگربێت لە گەشە کردنی کۆرپەلەکە بە ویستی پەروەردگار.

دروست بوون و گەشە کردنی کۆرپەلەکە بۆ ئەوەی ببێت بە مرۆڤێکی پێگەیشتوو بەستراوەتەوە بە کەوتنە ناوی بۆ ناو منداڵدان، هەروەك لەو فەرموودە پیرۆزەدا هاتووە: ﴿عن عبدالله بن مسعود (ﷺ) قال: إِذَا وَقَعَتِ النُّطْفَة فِي الرَّحِم، بَعَثَ اللهُ مَلَكاً فَقال: يا ربّ مُخَلَّقة أو غير مُخَلَّقة؟ فَإن قال: غَيْر مُخَلَّقة، مَجَّتْها الأَرْحامُ دَماً .....﴾ رواه الطبري والطبراني بإسناد صحيح، هەروەها جێگیر بوونی کۆرپەلەکە لەناو منداڵداندا بەستراوەتەوە بە تەواو بوونی دروست بوونی گۆشتپارەکەوە، پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَإِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن

نُّطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ مِن مُّضْغَةٍ مُّخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ لِّنُبَيِّنَ لَكُم، وَنُقِرُّ فِي الْأَرْحَامِ مَا نَشَاءُ إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى﴾ (الحج:٥).

هەروەها لە لایەکی ترەوە تەواو بوونی دروست بوونی سەرەتایی و کامڵ بوونی بەستراوەتەوە بە جیابوونەوەی شکڵی دەرەوەی کۆرپەلەکە بەگشتی و شکڵی ئەندامەکانی زاووزێی دەرەوەی هەروەك لە فەرموودەیەکی پیرۆزی پێغەمبەردا ئاماژە بۆ ئەمە دراوە: ﴿عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: « وَكَّلَ اللَّهُ بِالرَّحِمِ مَلَكاً فَيَقُولُ: أَيْ رَبِّ نُطْفَةٌ؟ أَيْ رَبِّ عَلَقَةٌ؟ أَيْ رَبِّ مُضْغَةٌ؟ فَإِذَا أَرَادَ اللَّهُ أَنْ يَقْضِيَ خَلْقَهَا قَالَ: أَيْ رَبِّ ذَكَرٌ أَمْ أُنْثَى؟ أَشَقِيٌّ أَمْ سَعِيدٌ؟ فَمَا الرِّزْقُ؟ فَمَا الأَجَلُ؟ فَيُكْتَبُ كَذَلِكَ فِي بَطْنِ أُمِّهِ »﴾ رواه البخاري، واتە: خوای گەورە فریشتەیەکی دیاری کردووە کە ئاگای لە منداڵدان بێت، کاتێك کە کۆرپەلەکە دروست دەبێت، ئەم فریشتەیە نازانێت کەی دەبێت بەچی و پرسیار دەکات: ئەی پەروەردگار نوتفەیە؟ ئەی پەروەردگار بووە بە (علقة)، ئەی پەروەردگار بووە بە گۆشتپارە (مضغة)؟ کاتێکیش کە پەروەردگار ویستی دروست ببێت (واتە دروست بوونی سەرەتایی تەواو و کامڵ ببێت) فەرمان بە فریشتەکە دەکات، ئەویش دەڵێت: خوایە نێرە یان مێیە؟ ئایا خۆش بەختە یان زەرەرمەند؟ رۆزی چی‌یە؟ ئەجەلی کەیە؟ خوای گەورە پێی دەڵێت و فریشتەکە بۆی دەنووسێت، ئاوا لە سکی دایکی‌دا.

دەستەواژەی (يَقْضِيَ خَلْقَهَا) کە لە فەرموودەکەدا هاتووە بەمانای تەواو بوون و کامڵ بوونی دروست بوونی سەرەتایی (يُتِمّ خَلْقَها) دێت، کەواتە ئاماژە بە سەرەتای دروست بوون نادات بەڵکو بە تەواو بوونی دروست بوون دەدات بە مەبەستی گەیشتن بە پلەی کامڵێتی لەچاو بارەکانی پێش خۆی‌دا، ئەویش لەبەر ئەوەیە کە دروست بوون پێش ئەمە دەستی پێکردووە بە تایبەتی لە قۆناغی گۆشتپارەدا ﴿فَإِنَّا خَلَقْنَاكُم .... مِنْ مُّضْغَةٍ مُّخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ﴾.

لـه فەرهـەنگی (لسـان العـرب)دا هـاتووە: (القضـاء: ... إنقطـاع الشّـيء وتمامـه) واتـە: بریتی‌یـە لـە تـەواو بـوونی شـتێك و کـامڵ بـوونی، هـەر لـەم فەرهەنگەدا دەربارەی ئایەتی ﴿فَلَمَّا قَضَيْنَا عَلَيْهِ الْمَـوْتَ ...﴾ (سبأ:١٤) دەڵێت: (اللّيـث) ووتوویـەتی: بـە مانـای ئـەوەی (مردنیمـان تـەواو کـرد) هـاتووە، نموونەشمان زۆر هەیە لـە قورئانـدا کە کرداری (قَضَى) بە مانای تەواو بوون دێت، لەوانە: ﴿فَإِذَا قَضَيْتُم مَّنَاسِكَكُمْ فَاذْكُرُواْ اللّـهَ كَـذِكْرِكُمْ آبَـاءكُمْ أَوْ أَشَـدَّ ذِكْراً....﴾ (البقرة: ٢٠٠)، واتـە: جا هـەر کاتێك ئەرك و مەناسیکەکانتان بەجێ هێنا و تەواوتان کرد، ئەو کاتە یادی خوا بکەن هەروەکو چۆن یادی باو و باپیرانتان دەکەن، یاخود زۆر زیاتریش لـەوان، (القرطبي) دەڵێت: (قَضَـيْتُم) لێرەدا بەمانای (تەواوتان کرد و لێبوونەوە) دێت، هەروەها ئایەتی: ﴿فَقَضَاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ فِي يَوْمَيْنِ ....﴾ (فصلت:١٢)، (القرطبي) دەڵێت: واتـە تـەواوی کردن و لە دروست بوونی ئاسمانەکان بووەوە لە ٢ ڕۆژدا.

ئـەوەی شـایەتی زیـاتر بـۆ ئـەم مانایـە دەدات گێڕانەوەیـەکی تـری فەرموودەکەیە کە لە (مسند الطيالسي)دا بەم شێوەیە هاتووە: ﴿إِنَّ اللّه (عَـزَّ وَجَلَّ) يوَكِّلُ بالرَّحِمِ مَلَكاً فَيَقُولُ: يا رَبِّ نُطْفَةٌ؟ يا رَبِّ عَلَقَةٌ؟ يا رَبِّ مُضْغَةٌ؟ فَـإِذَا أَرَادَ اللَّهُ (عزَّ وَجَلَّ) أَنْ يُتِمَّ خَلْقَهَا قَالَ: يا رَبِّ ذَكَراً أَمْ أُنْثَى؟ شَقِيٌّ أَمْ سَعِيدٌ؟ فَيُكْتَبُ ذَلِـكَ فِي بَطْنِ أُمِّهِ﴾، کە لێرەدا لە جیاتی (يَقْضِيَ خَلْقَهَا) بـە دەستەواژەی (يُتِمَّ خَلْقَهَـا) هاتووە، کەواتە مانای فەرموودەکە بەم شێوەیەی لێ‌دێت: هـەر وەختێك کاتی تـەواو بـوونی دروسـت بـوونی سـەرەتایی کۆرپەلەکـە هـات، ئـەو کاتـە بـە تەواوەتی وێنەی مرۆڤ وەردەگرێت و بە تایبـەتی شێوەی جینسـی دەرەوەی جیادەبێتەوە و ئاشکرا دەبێت بە وویستی پەروەردگار.

ئـەوەی جـێی ئامـاژە پێکردنـە ئەوەیـە کـە تـەواوبوونی دروسـت بـوونی سـەرەتایی کۆرپەلەکـە (إتمـام الخلـق) دوای قۆنـاغی گۆشتپارە بـاس کـراوە،

بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە یەکسەر دوای گۆشتپارە دێت، ئەویش تەنها لەبەر ئەوەی بەبێ بوونی بەین لە نێوانیاندا لە فەرموودەکەدا باس کراوە*، بابزانین ئەمە بریتی‌یە لە شێوازێکی بەلاغەت و رەوانبێژی پێغەمبەرایەتی کە لە زۆرێك لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا (ﷺ) پیادە کراوە، کە بەهۆیەوە پێغەمبەر (ﷺ) ووتەکان کورت دەکاتەوە و سەرنجی بیسەر بۆ رووداوە دیار و ئاشکراکە رادەکێشێت، هەروەك لەم فەرموودەیەشدا دەیبینین: ﴿إذا مَرَّ بالنُّطْفَة ثنتان وَأَرْبَعونَ لَيْلَة، بَعَث اللهُ إلَيْها مَلَكاً فصَوَّرَها، وَخَلَقَ سَمْعَها وَبَصَرَها وَجِلْدَها وَلَحْمَها وَعِظامَها، ثُمَّ قَال: يا رَبِّ أَذَكَر أَمْ أُنْثَى؟﴾ أخرجه مسلم والطبراني وأبو داود، واتە: کاتێك کە (نطفة) دەگاتە ٤٢رۆژ پەروەردگار فریشتەیەکی بۆدەنێرێت بۆ ئەوەی شێوەی مرۆڤی پێبدات وبیستن وبینین وپێست وگۆشت وئێسکی بۆ دروست بکات، و پاشان دەپرسێت: ئەی پەروەردگار نێرە یان مێ‌یە؟

وەك باسمان کرد لە راستی‌دا کۆرپەلەکە وەك نوتفە نامێنێتەوە تا ٤٢ رۆژ، و کرداری شێوەدان و وێنەپێدانی مرۆڤ یەکسەر دوای قۆناغی نوتفە روونادات، بەڵام دەبینین پێغەمبەر (ﷺ) باسی رووداوەکان و قۆناغەکانی دوای نوتفەی نەکردووە و تەنها باسی قۆناغە بنەڕەتی‌یەکەی کردووە (کە قۆناغی نوتفەیە)، ئەمەش بە مەبەستی ئەوەیە کە سەرنجی بیسەر بۆ لای کردارە گرنگەکە رابکێشێت کە کرداری وێنەپێدان و شکڵپێدانە (تەصویر) بۆ گوێ و چاو و .....هتد.

ئەم شێوازی کورت کردنەوەیە چەندین سوودی تریشی هەیە (بێجگە لەم مەبەستی سەرنج راکێشانەی بیسەر بۆ بابەتێکی وویستراو)، لەوانە:

* بەڵام ریزبەندی تەواو وەك لە فەرموودە و ئایەتەکانی تردا هاتووە بەم شێوەیەیە: قۆناغی گۆشتپارە، جێگیربوون (الإقرار)، رێکبوون (التسوية) کە دروست بوونی ئێسك و ماسولکەش دەگرێتەوە، پاشان تەواوبوونی دروست بوونی سەرەتایی (قضاء الخلق).

١- باس نەکردنی قۆناغەکانی نێوان قۆناغی یەکەم و قۆناغەکانی دوایی بۆ ئاگادار کردنەوە و وریاکردنەوەی بیسەرە، و بۆ زیندوو کردنەوەی توانای گەڕان و لێکۆڵینەوەیە بە مەبەستی پڕکردنەوەی بۆشاییەیە بە ئەنقەست دروستکراوە لە فەرموودەکاندا، و بەستنەوەی هەموو قۆناغەکانی دروست بوونە بەیەکەوە، و لێکۆڵینەوەی فەرموودەکانە بە شێوەیەکی قووڵتر و وردتر، ئەمانەش هەمووی بۆ ئەوەیە کە هەموو ڕووداوێك حەقی خۆی بدەینێ لە توێژینەوە و لێکۆڵینەوە، کە بەهۆی ئەمەوە چەندین مانای نوێ دەردەکەوێت کە ئێمە پێشتر لێی بێئاگا بووین.

٢- دەرخستنی موعجیزەی دروست بوونی مرۆڤ بە شێوەیەکی ئاشکراتر، ئەویش لەبەر ئەوەیە کە بۆ نموونە باس کردنی قۆناغی نوتفە یەکسەر بەرامبەر بە قۆناغی وێنە پێدان و دروست بوونی بیستن و بینین و ئێسك و گۆشت و پێست، ئەو گۆڕانکاری و جیاوازییە گەورەیە دەردەخات کە دروست دەبێت لە قەبارە و پێکهاتەی نوتفەکەدا کە لە شێوەدا زۆر سادەیە بەڵام لە پێکهاتەدا زۆر ئاڵۆز دەبێت و گوێ و چاو و ئێسك و ماسولکەی بۆ دروست دەبێت، ئەم شێوازی بەلاغەت و کورت کردنەوەیە کاریگەریی زیاتری دەبێت لەسەر بیسەر، وەك لەوەی کە شتەکەی بە دووروودرێژی بۆ باس بکەیت و قۆناغە دوای یەکەکان بە تەفصیل باس بکرێن کە نزیکن لەیەکەوە و لەیەکدەچن وەك ئەوەی کە لە چەند فەرموودەیەکی تردا وا هاتووە.

٣- کورت کردنەوە بە مەبەستی سادە و ئاسان کردنی بابەتی دروست بوونی مرۆڤ بۆ بیسەر و ئاسان کردنی تێگەیشتنی بابەتەکە بۆ هەموو توێژەکانی کۆمەڵگا و تاکەکانی، جا خوێنەوار بن یان نەخوێندەوار، گەنج بن یان بەتەمەن، چونکە یەکێك لە خاستییەتە جیاکەرەوەکانی ئەم ئاینە پیرۆزە ئەوەیە کە (جیهانییە)، واتە ڕوودەکاتە هەموو خەڵکی بە توێژە جیاواز و

ڕۆشنبیری‌یە جۆراو جۆرەکانیانەوە ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا كَافَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيراً وَنَذِيراً وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ (سبأ:٢٨).

کەواتە ڕووداوی سەرەکی لە فەرموودەکەی پێشتردا کە تەرکیزی خراوەتە سەر بریتی‌یە لە: (فَإِذَا أَرَادَ اللَّهُ أَنْ يَقْضِيَ خَلْقَهَا) کە کرداری تەواوکردنی دروست بوونی سەرەتایی‌یە و مەبەستیش لەو ئوسلوبە ڕەوانبێژی‌یە سەرنج ڕاکێشانی بیسەرە بۆلای ئەم کردارە.

لە فەرموودەکەوە شتێکی تریشمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە ئەوەیە کرداری تەواوبوونی دروست بوونی سەرەتایی لەگەڵ جیاواز بوونی شکڵی دەرەوەی ئەندامەکانی زاووزێی کۆرپەلەکەدا دێتەدی، هەروەها بینیشمان (لە باسی بابەتی جێگیربووندا) کە هەستیاریی کۆرپەلەکە بۆ کارتێکەر و فاکتەرە شێوێنەرەکان (تیراتۆجینی‌یەکان) و فاکتەرە زیان گەیەنەرەکان زۆر بەرز دەبێت لە قۆناغی گۆشتپارەدا، کە لەوانەیە ببێتە هۆی شێوان و تێکچوونی خەتەرناك لە کۆرپەلەکەدا لە زوربەی کاتەکاندا، و لەوانەیە بشبێتە هۆی لەبارچوونی کۆرپەلەکە.

بەڵام لە قۆناغی ڕێکبوون (تەسویە)دا کە بەدوای قۆناغی گۆشتپارەدا دێت، هەستیاریی کۆرپەلەکە بۆ ئەو فاکتەرە شێوێنەرانە هەر بە بەرزیی دەمێنێتەوە و لە زوربەی کاتەکاندا ئەم فاکتەرە تیراتۆجینی‌یانە دەبنە هۆی شێوان و تێکچوونی خەتەرناك لە کۆرپەلەکەدا، و کەمتریش لەوانەیە ببنە هۆی لەبارچوونی کۆرپەلەکە.

بەڵام لە قۆناغی دوایی‌دا کە قۆناغی گەشە کردن (النشأة)یە کە بەدوای قۆناغی ڕێکبوون (التسوية)دا دێت (کە تێ‌ی‌دا ڕەگەزی دەرەکی کۆرپەلەکە بۆ نێر و مێ جیادەبێتەوە)، لەم قۆناغەدا هەستیاریی کۆرپەلەکە و کاریگەریی فاکتەرە تیراتۆجینی‌یەکان کەم دەبێتەوە، لە کاتی دەست پێ‌کردنی جیاواز بوونی شکڵی دەرەوەی ئەندامەکانی زاووزێی کۆرپەلەکەدا هیچ ئەندامێکی

ئەوتۆ نامێنێت كە هەستیار بێت بۆ كارتێكەرە دەرەكی یە زیانبەخشەكان تەنیا كۆئەندامی دەمار نەبێت، هەربۆیە لە زۆربەی كاتەكاندا هیچ رێگرێك نابێت لەبەردەم گەشە كردنی كۆرپەلەكەدا كە ببێتە هۆی شێوان و تێكچوونی خەتەرناك یان لەبار بردنی.

هەروەك لە (**خشتەكەی وێنەی رەنگاوڕەنگی: ١٣٧/ هـ**)دا دەبینین ماوەی ئەگەری رووداني شێواندنه سەرەكی یەكان كۆتایی دێت لە دەوروبەری سەرەتای هەفتەی نۆیەمدا (واتە دوای تەواو بوونی ماوەی قۆناغی رێكبوون بە چەند رۆژێك و دەست پێكردنی قۆناغی گەشە كردن)، هەروەك دەشزانین كە جیاواز بوونی شكڵی دەرەوەی ئەندامەكانی زاووزێی كۆرپەلەكە پاش تەواو بوونی ماوەی رێكبوون (تەسویە) بە چەند رۆژێك دەبێت، ئەویش بەپێی فەرموودەی پەروەردگار: ﴿أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ يُمْنَى{٣٧} ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّى{٣٨} فَجَعَلَ مِنْهُ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْأُنثَى{٣٩}﴾ (القيامة).

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت كە لەگەڵ دەست پێكردنی قۆناغی دەركەوتنی نێرینەیی و مێینەیی دەرەكی لە كۆرپەلەكەدا چانسێكی كەم هەیە بۆ رووداني شێواندنی خەتەرناك، و هەر كاتێكیش كە فاكتەرە زیانبەخشەكان روویدەن و بوونیان هەبێت ئەوا لەوانەیە ببنە تێكچوونی كرداریی یان شێواندنێكی كەم لە كۆرپەلەكەدا، كە ئەمانەی دوایی نابنە هۆی رێگرتن لە گەشە كردنی كۆرپەلەكە، و بەربەست نابن لە بەردەم تەواو بوون و كامڵ بوونی دروست بوونی كۆرپەلەكەدا، ئەمەش بە تەواوەتی ئەو راستی یەیە كە فەرموودە پیرۆزەكەی: ﴿فَإِذَا أَرَادَ اللَّهُ أَنْ يَقْضِيَ خَلْقَهَا قَالَ: أَيْ رَبِّ ذَكَرٌ أَمْ أُنْثَى؟﴾ زۆر بە جوانی ئاماژەی پێداوە.

پاك و بێگەردی بۆ ئەو خودایەی كە ئاگای لە هەموو ووردەكاری یەك و نهێنی یەكی پرۆسەی دروست بوونی مرۆڤە ﴿أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ﴾ (الملك: ١٤).

## بەکورتی:

بەکارهێنانی هەردوو زاراوەی ئێسك (پەیکەری ئێسکی)، و گۆشت (ماسولکەکان) بە ئاشکرا سیفاتە جیاکەرەوەکانی هەردوو هەفتەی حەوتەم و هەشتەمی گەشە کردنی کۆرپەلەکە بەدوای یەکدا دەردەخات، کە ئەم دوو هەفتەیە جیادەکرێنەوە بەوەی دوو ماوەی دروست بوونی ئێسکەکان و ماسولکەکانن لە کۆرپەلەکەدا، ئەم دوو زاراوەیە زۆر بە ئاشکرا و زمانێکی ئاسان و دوور لە ئاڵۆزی و شاررواوەیی وەسفی ئەم دوو قۆناغەی گەشە کردنی کۆرپەلە دەکەن، پاشان باس کردنی رێکبوونەی کۆرپەلەکە و رۆیشتنی بە قۆناغێکدا کە چەند کردارێکی تێدا روودەدات و وای لێدەکات لەشی رێك ببێتەوە (تەسویە ببێت) و وێنەی مرۆیی وەربگرێت، خۆی لەخۆیدا زۆر سەرنج راکێشە!!




لەگەڵ ئەوەشدا کە (ئەرستۆ) و هەندێك لە زانایانی کۆن پێشکەوتنێکی کەمیان لەم بوارەدا بەدەست هێنا و ئاماژەیان بە بۆچوونی زنجیربەندی داوە، بەڵام زۆرێك لەو تێبینییانەیان پشتی بەستبوو بە وەسف کردنی گەشەی کۆرپەلەی باڵندەکان، کە زۆر جیاوازە لە گەشەی کۆرپەلەی مرۆڤ لە قۆناغە سەرەتاییەکاندا، هەروەها مرۆڤایەتی نەگەیشتە

ئەو راستی‌یەی کە دروست بوونی مرۆڤ لە منالّداندا بە چەند قۆناغێکی جیاواز دەڕوات تەنیا لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەمدا نەبێت.

مرۆڤ دەتوانێت لە قورئانی پیرۆزدا بگەڕێت بۆ ئەوەی کە یەکەم وەسفی دووردرێژی کۆرپەلەی دەست بکەوێت بەپێی قۆناغەکانی دروست بوون و گەشە کردنی، کە چەندین سەدە پێشی ئەو زانیاری‌یانەی داوەتەوە کە تەنیا پاش هەوڵ و کۆششێکی گەورەی زانایان و توێژەروان بەدەست هاتوون، و پاش بەکارهێنانی ووردترین و پێشکەوتووترین ئامێری زانستی کە بۆ مرۆڤی ئەمڕۆمان لەبەر دەستدایە.




لێرەشدا پێم باشە شایەتی یەکێك لە گەورە زانایانی رۆژئاوا بێنمەوە کە (د. مۆریس بوکای)یە کە یەکێکە لە گەورە پزیشکان و نەشتەرکارە بەناوبانگەکانی رۆژئاوا کە خوای گەورە هیدایەتی‌دا بۆ ئیسلام و موسوڵمان بوونی خۆی ئاشکرا کرد پاش قەناعەت کردنێکی زانستی‌یانە.

(د. بوکای) توێژینەوەیەکی دووردرێژی دەربارەی قورئان سازدا، کە بە لێکۆڵینەوەی وەرگێڕانەکانی قورئان بۆ زمانە رۆژئاوایی‌یەکان دەستی پێکرد، و سەرەنجام خۆی فێری زمانی عەرەبی کرد و بە شێوەیەکی راست و

دروست و زانستی‌یانە خۆی لە قورئان تێگەیاند، ئەوەبوو لەم بارەیەوە چەندین نووسراوی دەرکرد و لە ساڵی (١٩٦٧ز)دا موحازەرەیەکی پێشکەش کرد لە ئەکادیمیای زانستی فەرەنسی لە (پاریس)، کە ژمارەیەکی زۆر لە زانایان ئامادەی بوون.

پاش ئەوەی کە (د. بوکای) راستی‌یەکانی قورئانی خستەروو لە چەندین بواری زانستی جۆراوجۆردا یەکێك لە زانایان لە کۆتایی‌دا پرسیاری کرد: دەکرێت پێم بڵێن کە محمد لە کوێوە ئەم زانستە نوێ‌یەی هێناوە؟ کە هەر خۆتان ئەی زانایانی رۆژهەڵات و رۆژئاوا دوای چەندین گفتووگۆی دوورودرێژ ئەوەتان دووپات کردەوە کە ئەوەی لە تەورات و ئینجیلدا هاتووە پێچەوانەیە لەگەڵ زانستی نوێ و بۆچوونەکانی‌دا، هەربۆیە وازتان لەوان هێناوە و بەجێتان هێڵاون بۆ خەیاڵی باوەڕدارانی ئەو ئاینانە!! ئەی باشە محمد ئەم زانستەی لەکوێوە هێناوە؟! ئەوەبوو هەموو بێدەنگ بوون و کەس وەڵامی نەدایەوە، پاشان (د. بوکای) ووتی: بە دڵنیایی‌یەوە کەستان وەڵامی پێ‌نی‌یە، کە وەڵامی ئەمە لای منە کە من باوەڕم وایە لەلایەن



Figure 5-8. Distribution of the cutaneous nerves in the adult body indicating the metameric (segmented) fashion in which musculature formed. (Reprinted with permission from Patten, 1968)

خوداوەیە و محمد نێردراو و پێغەمبەری خودایە، ئەم موحازەرەیە هەرایەكی راگەیاندنی نایەوە لە هەموو ئەوروپادا، كە سەلماندی ئەم راستی‌یە زانستی‌یانە بەڵگەیەكی ئاشكرایە لەسەر پێشدەستی قورئان لە بەرامبەر زانستە نوێكانی وەك كۆرپەلەزانی و غەیری ئەمیشدا ....



# باسی دروست بوونی کۆرپەلەی مرۆڤ لە قۆناغی گەشە کردن (النشأة) دا

**سەرەتا:**

قورئانی پیرۆز ئەوە بۆ ١٤سەدە زیاتر دەڕوات کە بەرامبەرکێی لەگەڵ بێباوەڕاندا ڕاگەیاندووە، بەوەشەوە نەوەستاوە بەڵکو ئەم تەحەددایەی درێژە پێداوە تا مانەوەی مرۆڤ لەسەر زەویدا و بەئاشکرا رایگەیاندوە: ﴿قُل لَّئِنِ اجْتَمَعَتِ الإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَى أَن يَأْتُواْ بِمِثْلِ هَـذَا الْقُرْآنِ لاَ يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا﴾ (الإسراء:٨٨)، ئەم بەرامبەرکێیە خۆی لەخۆیدا موعجیزەیەکی گەورەیە چونکە مرۆڤەکانی دەستەوسان کردووە لەوەی کە بتوانن وەڵامی بدەنەوە، و دەیسەلمێنێت کە قورئانی پیرۆز زۆر لە سەروو توانای مرۆڤەکانەوەیە، و یەکێك ئەم قورئانەی ناردووە کە بەدەسەڵاتترین و بەتواناترین کەسە، و هەر ئەویشە کە دروست کەر و پەروەردگاری هەموو جیهان و راگری ووردەکارییەکەیەتی.

ئیعجازی زانستی لە قورئان وسوننەتدا یەکێکە لەو تەحەددا گەورانە و سەلمێنەرە ئاشکرایانە بۆ راستی قورئان وسوننەتی پیرۆز، چونکە باس کردن و ئامارژە هێنان بۆ چەندین راستی سەلمێنراو و یاسای زانستی لە بوونەوەر و گەردووندا لەپێش ١٤٠٠ساڵ و دەرکەوتنی راستی ئەو فەرموودانە لە رۆژگاری ئەمڕۆدا گەورەیی ئیعجازی قورئان و سوننەت و بەرزیی سەرچاوەکەیان دەردەخات.

یەکێك لەو ئامارژە و راستییانەی کە لە زۆر شوێنی قورئان و سوننەتدا ئیشارەتی بۆ کراوە بریتییە لە سەرچاوە و چۆنێتی دروست بوونی کۆرپەلەی مرۆڤ، کە لە رۆژگاری ئەمڕۆدا بە زانستی کۆرپەلەزانی ﴿علم الأجنة -Embryology﴾ ناسراوە، ئێمە لە بابەتەکانی ئەم کتێبەدا هەوڵمانداوە باسی ئەو ئایەت و فەرموودە پیرۆزانەی پێغەمبەر (ﷺ) بکەین کە ئەو ئامارژانەی تێدایە و لایەنە زانستییە سەلمێنەرەکانیشی لە چەند کتێبێکی زانستی کۆرپەلەزانی باوەڕپێکراوی چەند زانایەکی ناسراوی ئەم زانستە لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا وەگرتووە.

پێشتر بە درێژی باسی سەرەتاکانی پەیدابوونی زانستی کۆرپەلەزانیمان کرد و پاشان قۆناغەکانی دروست بوونی کۆرپەلەمان یەك لەدوای یەك خستەروو لەژێر رۆشنایی ئایەتەکانی قورئان وفەرموودەکانی پێغەمبەردا(ﷺ)، یەکێك لە گرنگترین ئەو ئاماژانە بریتییە لەم چەند ئایەتە: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن سُلَالَةٍ مِّن طِينٍ، ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ، ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ﴾ (المؤمنون:١٢-١٤).

هەر لە دروست بوونی کۆرپەلەی مرۆڤ لە قۆناغی سەرەتایی (النطفة)دا، پاشان دروست بوونی کۆرپەلەی مرۆڤ لە قۆناغەکانی (العلقة) و (المضغة)دا، دوایی هاتینە سەر باس کردنی قۆناغەکانی ئێسك (العظام) و گۆشت (اللحم) و لەم بابەتەدا کۆتایی ئەم باسە دەهێنین بە باس کردنی کۆتاییەکانی دروست بوونی کۆرپەلە.

کۆرپەلەی مرۆڤ لە کۆتایی هەفتەی هەشتەیەمدا خاسیەتە جیاکەرەوەکانی مرۆڤی بۆ دروست دەبێت، لێرەدا ئێسکەکان بە ماسولکە (گۆشت) و پێست داپۆشراوە و هەموو ئەندامەکانی تریش بە ئاشکرا پێك هاتوون و هەندێکیان دەستیان بەکار کردووە.

قۆناغی گەشەکردن و پێکهاتنی تەواوەتی (النشأة) لە هەفتەی نۆیەمەوە دەست پێدەکات و رێژەی گەشەکردنەکە هێواش دەبێت تا سەرەتای هەفتەی ١٢، لەم کاتەدا کۆرپەلەکە دەچێتە قۆناغێکی نوێی گەشەکردنی خێرا و گۆڕانکاری گەورە {بڕوانە (وێنەی ٧-١) (هەروەها وێنەی ڕەنگاوڕەنگی: ١٢٨-A/ هـ) بۆ تێبینی کردنی رێژەی گەشەکردنی کێشی کۆرپەلەکە}، قورئانی پیرۆز ئەم قۆناغەی لەم ئایەتانەدا باس کردووە: ﴿ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ﴾ (المؤمنون:١٤). واتە: دوایی پاش دروست بوونی ئێسك وگۆشت ئێمە گەشە بە کۆرپەلەکە دەدەین و دروست کراوێکی تەواوی تری لێدروست دەکەین،

پاك وبێگەردی بۆ ئەو خودایەی کە باشترین دروست کەرە، لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَنُقِرُّ فِي الْأَرْحَامِ مَا نَشَاء إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى ثُمَّ نُخْرِجُكُمْ طِفْلًا ثُمَّ لِتَبْلُغُوا أَشُدَّكُمْ﴾ (الحج:٥)، واتە: ئەوەش بمانەوێت لە منداڵدانەکاندا جێگیری دەکەین تا کاتێکی دیاری کراو، لەوەودوا بە ساوایی و بە بچووکیی دەرتاندەهێنین (لە سکی دایکتان)، دوایی بۆ ئەوەی گەورە ببن و بگەنە ئەوپەڕی هێز و تواناتان.

**پێناسەی زاراوەکە:**

ووشەی (نَشْأَة) لە کرداری (نَشأَ)وە وەرگیراوە و لە فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبیدا چەند مانایەکی هەیە، لەوانە:

١-بمعنى (بَدَأَ)، واتە: بەمانای (دەستی پێکرد) دێت.

٢-بمعنى (نَما)، واتە: بەمانای (گەشەی کرد) دێت.

٣-(إِرْتَفَعَ ، رَبَا) بەمانای (بەرز بووەوە ، سەرکەوت) دێت[1].

لەلایەن زانایانی تەفسیریشەوە ئەم ئایەتە پیرۆزە بەم دوو شێوەیە راڤە کراوە:

١-گەشەکردنی کۆرپەلە بۆ زیندەوەرێکی قسەکەر و بیسەر و بینەر[2].

٢-کردنی رۆح (گیان) بە بەری کۆرپەلەکەدا[3].

بۆ بەستنەوەی قۆناغی (النشأة) بە قۆناغەکانی پێش خۆی لە ئایەتەکەی سەرەوەدا ئامرازی (ثُمَّ) بەکارهاتووە، کە لە زمانی عەرەبیدا مانای رێکخستن و بوونی ماوەیەك دەگەیەنێت لە نێوان ئەو دوو کردارەدا (التراخي)، واتە ئایەتەکە دەفەرموێت: لە پاش قۆناغی داپۆشینی ئێسکەکان بە ماسولکە قۆناغی (النشأة) وورده وورده دەست پێدەکات و ماوەیەك دەخایەنێت، زانایانی کۆرپەلەزانی بۆمان باس دەکەن کە قۆناغی گەشەکردن (النشأة) لە هەفتەی نۆیەمەوە دەست پێدەکات (کە پێی دەڵێن قۆناغی کۆرپەلەیی-

(1) بڕوانە فەرهەنگەکانی: (لسان العرب)، (المعجم الوسيط)، (الصحاح)، (تاج العروس)/ ماددەی (نَشأَ).

(2) بڕوانە تەفسیرەکانی: (إبن كثير)، (روح المعاني للآلوسي).

(3) بڕوانە تەفسیرەکانی: (القرطبي)، (فتح القدير).

المرحلة الجنينية Fetus)، بەلاّم ووردە ووردە و پاش ماوەیەك ئەم قۆناغە ئاشکرا دەبێت و تەنانەت گەشەی هەندێك لە ئەندامەکان لە دوای هەفتەی پانزەیەمەوە دەردەکەوێت، و ئەم گەشەکردنانە تاوەکو کۆتایی سکپڕی دەخایەنێت (واتە تاوەکو هەفتەی ٣٨)، لێرەدا جارێکی تر تێبڕوانە ئەو ئاماژە پڕ ئیعجازەی قورئان کە ئامرازی (ثُم)ی بەکار هێناوە بۆ ئیشارەت دان بەو ماوە زۆرەی ئەم قۆناغە دەیخایەنێت و پێی دەچێت.




وێنەی (٧-١): وێنەیەکی پێوانەیی بۆ گۆڕانکارییەکان لە قەبارەی کۆرپەلە لە قۆناغی گەشە کردندا، تێبینی گەشەی زۆر خێرا بکە لە هەفتەی (١٢)وە تا کۆتایی سکپڕی (٣٨هەفتە).

## خاسیەتەکانی قۆناغی (النشأة):

### ١- گەشەکردنی ئەندام و کۆئەندامەکان:

قۆناغەکانی یەکەمی کۆرپەلە (کە پێشیان دەووترێت قۆناغی حەمیل- مرحلة الحَميل Embryo) بەوە جیادەکرێنەوە کە سەرەتای ئەندام و کۆئەندامەکانی تێدا پەیدادەبێت، بەلاّم قۆناغی کۆتایی (قۆناغی کۆرپەلەیی- المرحلة الجنينية Fetus) بەوە جیادەکرێتەوە کە ئەم کۆئەندام و ئەندامانە

گەشە پێدەکات و ئامادەیان دەکات بۆ هەستان بە کارە ئاسایییەکانیان لە داهاتوودا (بڕوانە خشتەی ژمارە ٣) و (وێنەی ٧-١)، ئەمەش بریتییە لەو مانایەی کە موفەسیرەکانی قورئان ئاماژەیان پێداوە: (مرۆڤ دەبێتە زیندەوەرێکی بینەر و بیسەر و قسەکەر)، کەواتە بابزانین کەوا کۆتایی قۆناغی داپۆشینی ئێسکەکان بەماسولکە بریتییە لە جیاکەرەوەی قۆناغە سەرەتاییەکان لەگەڵ قۆناغی کۆتاییدا (جیاکەرەوەی قۆناغی حەمیل لە قۆناغی کۆرپەلە).

**٢- کردنی ڕۆح (گیان) بە بەری کۆرپەلەکەدا:**

فەرموودەکانی قورئان[4] و سوننەت[5] ئاماژە بەوە دەدەن کە ڕۆح دەکرێت بە بەری کۆرپەلەکەدا لەناو سکی دایکیدا، ئەمە مانای ئەوەیە کە ئەو ژیانەی پێش ڕۆح بەبەرا کردندا هەیە ژیانێکە لە جۆرێکی تر، زانایانی موسوڵمان ئەم ژیانەیان بە (ژیانی ڕووەکی- الحياة النباتية) ناو بردووە.

هەندێك فەرموودەی قورئان و سوننەت ئاماژە بەوە دەدەن کە (ڕۆح) لەش بەجێ دێڵێت لە کاتی نوستندا و بە ئاگادار بوونەوە دەگەڕێتەوە ناو لەش، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿اللَّهُ يَتَوَفَّى الْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَالَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَا فَيُمْسِكُ الَّتِي قَضَى عَلَيْهَا الْمَوْتَ وَيُرْسِلُ الْأُخْرَى إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ

---

(4) خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ﴾ (المؤمنون: ١٤)، واتە: دوایی پاش دروست بوونی ئێسك و گۆشت ئێمە گەشە بە کۆرپەلەکە دەدەین و دروست کراوێکی نوێ و تەواوی تری لێدروست دەکەین.

(5) لە فەرموودەیەکدا ئیمامی (موسلیم) بۆمان دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ﴿إنَّ أَحَدَكُم يُجْمَعُ خَلْقُهُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ أَرْبَعينَ يَوْماً، ثُمَّ يَكُونُ فِي ذَلك عَلَقَةً مثْلَ ذَلك، ثُمَّ يَكُونُ فِي ذَلك مُضْغَةً مثْلَ ذَلك، ثُمَّ يُرْسَل المَلَك فَيَنْفُخُ فِيه الرُّوح وَيُؤمَر بأَرْبَع كَلمات: بِكَتْب رِزْقه وَأَجَله وَعَمَله وَشَقِيّ أَو سَعيد﴾ رواه مسلم، واتە: هەریەکێك لە ئێوە کۆبوونەوە و پەیدا بوونی ئەندامەکانی لەشی لەسکی دایکیدا لە چل ڕۆژدا تەواو دەبێت، کە هەر لەم چل ڕۆژەدا (علقة) دەبێت، کە پاشان هەر لەم چل ڕۆژەدا قۆناغی (المضغة) تەواو دەکات، و پاشان پەروەردگار فریشتەیەکی بۆ دەنێرێت کە ڕۆح بکات بە بەریدا و فەرمانی پێدەکات کە چوار شتی بۆ بنووسێت ...

لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ (الزمر:٤٢)، واتە: خوای پەروەردگار رۆح لەوکەسانە وەردەگرێتەوە کە دەمرن و ئەوانەش کە نەمردوون و نوستوون، ئەوانەی کە مردوون گیانەکانیان ناداتەوە بەڵام ئەوانەی نوستوون گیانەکانیان دەداتەوە تا کاتێکی دیاری کراو (تاوەکو ئەوانیش دەمرن).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ الَّذِي يَتَوَفَّاكُم بِاللَّيْلِ وَيَعْلَمُ مَا جَرَحْتُم بِالنَّهَارِ ثُمَّ يَبْعَثُكُمْ فِيهِ لِيُقْضَى أَجَلٌ مُّسَمًّى ثُمَّ إِلَيْهِ مَرْجِعُكُمْ ثُمَّ يُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ (الأنعام:٦٠)، واتە: خوای پەروەردگارە کە شەوان رۆحەکانتان لێوەردەگرێتەوە و دەشزانێت بە رۆژ چیدەکەن، کە بەخەبەر دێنەوە رۆحەکانتان دەداتەوە تا کاتێکی دیاری کراو، پێغەمبەریش (ﷺ) لەکاتی بەخەبەر بوونەوەیدا دەیفەرموو: ﴿الحَمْدُ للهِ الَّذِي أَحْيَانَا بَعْدَ مَا أَمَاتَنا وَإِلَيْهِ النُّشُور﴾ رواه البخاري، واتە: سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە زیندووی کردینەوە لەپاش مردنمان لەخەودا و گەڕانەوە هەر بۆ لای ئەوە.

لێرەوە دەتوانین بڵێین کە دیاردەی نوستن بەڵگەیە لەسەر بوونی رۆح و کردنی رۆح بە بەری کۆرپەلەکەدا، کە پێویستە توێژینەوەی زیاتر بکرێت لەبارەی گەشەکردنی کۆئەندامی دەماری لە کۆرپەلەدا بۆ دیاری کردنی کاتی گەشەکردن و جۆرەکانی نوستنی کۆرپەلە، چونکە لەوانەیە بەهۆی ئەمەوە قۆناغی رۆح بە بەراکردن دیاری بکرێت، هەروەها کاتێك کۆرپەلە دەست دەکات بە جووڵەی خۆویست لەناو سکی دایکیدا دەتوانین ئەمەش وەکو بەڵگەیەك دانێین لەسەر بوونی رۆح لە کۆرپەلەکەدا (بڕوانە وێنەی ڕەنگاوڕەنگەکانی: ١٣٨- B/ هـ ، ١٣٩/ هـ).

**٣- گۆڕانکاری لە پێوانەکانی لەشی کۆرپەلەکە و وەرگرتنی وێنەی کەسێتی (إكتساب الصورة الشخصية):**

ئەم کردارانە بەو شێوەیە روو دەدات کە ئەم ئایەتە باسی کردووە: ﴿الَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّاكَ فَعَدَلَكَ، فِي أَيِّ صُورَةٍ مَّا شَاءَ رَكَّبَكَ﴾ (الإنفطار: ٧-٨).




وێنەی (٧-٢): ئەم هێلکارییە گۆڕانکاری لە بەشەکانی لەشدا لە قۆناغی گەشە کردندا روون دەکاتەوە، دەبینین لە هەفتەی نۆیەمدا چێوەی سەر بەقەدەر چێوەی سک دەبێت و لە دوایی‌دا چێوەی سک زیاد دەکات. قورئانی پیرۆز زاراوەی (تعدیل-رێک کردنەوە)ی بۆ ئەم کردارە بەکارهێناوە، کە زۆر بەجوانی لەم وێنانەدا بۆمان روون دەبێتەوە.



وێنەی (٧-٣): چەند دیمەنێکی کۆرپەلە لە قۆناغی گەشە کردندا، دەبینین کە چۆن رێکبوونەوەی لەشی دەستی پێکردووە، و چاوەکان و گوێکان چوونەتە شوێنی خۆیان.

ووشەی (فَسَوَّاكَ) لە ئایەتەکەدا بە مانای (ڕێك کردنەوە و ڕاست کردنەوەی شتێك) دێت بۆ ئەوەی ئامادە بێت بۆ بەجێ هێنانی ئەرکەکانی، ووشەی (فَعَدَلَكَ) بەمانای (گۆڕینی شێوە و پێکهاتەی بۆ پێکهێنانی شتێکی دیاری کراو) دێت، کرداری ڕێك بوونەوە (تسوية) وەك پێشتر باسمان کرد لە کاتی قۆناغی دروست بوونی ئێسك و لە کۆتایی‌یەکەی‌دا دەبێت، بەکار هێنانی پیتی (فَـ) پێش ووشەی (عَدَلَكَ) مانای بەدوای یەکدا هاتنی ڕاستەوخۆی ئەم کردارانە دەگەیەنێت، واتە مانای ئایەتی (الَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّاكَ فَعَدَلَكَ) بەم شێوەیە لێ‌دێت: ئەو خودایەیە کە دروستی کردیت و ڕێکی کردیت و لەدوای ڕێك بوونەوەی لەشت شێوەشتی ڕێك کردەوە، ئەم مانایە ئایەتەکەی دوای بە تەواوەتی ڕوونی دەکاتەوە: (فِي أَيِّ صُورَةٍ مَّا شَاءَ رَكَّبَكَ) واتە: شێوەشت لەسەر چ وێنەیەك بیەوێت ئاوای لێ‌دەکات و دایدەمەزرێنێت.

زانایانی کۆرپەلەزانی بۆمان باس دەکەن کە لە قۆناغی (النشأة)دا پێوانەکانی لەش دەگۆڕێن و شێوەی دەم وچاو سیمای مرۆڤی بۆ دروست دەبێت، بۆ نموونە گوێکان لە ملەوە دەجولێن بۆ ئەملاولای سەر، لووت لە دەم جیادەبێتەوە و لێوی سەرەوە بە ئاشکرا دەردەکەوێت، و چاوەکان دێنە پێشەوەی دەم وچاو و پەلەکانی خوارەوە درێژ تر دەبن بە بەراورد بە لەشی کۆرپەلەکە، ئەم کردارانە بە ڕێکبوونەوەی شێوە(تَعديل) ناو دەبرێت یان (تَقْويم)، هەروەها ووشەی (صورة) کە لە ئایەتی دووەمدا هاتووە مانای شکڵ و شێوە دەگەیەنێت (بڕوانە وێنەکانی ٧-٢ ، ٧-٣) (هەروەها وێنە ڕەنگاوڕەنگەکانی: ١٤٠/ هـ ، ١٤١/ هـ).

کەواتە بە کورتی ئایەتەکان ئەمە دەگەیەنن: {دوای دەست پێ‌کردنی کرداری ڕێك بوونەوە(تسوية) ڕاستەوخۆ گۆڕانکاری بەسەر کۆرپەلەکەدا دێت و پێوانە ئاسایی‌یەکانی مرۆڤ وەردەگرێت و ڕێك دەبێتەوە (التَّعديل أو التَّقْويم)، هەروەها وەرگرتنی شکڵ و شێوەی مرۆڤ و وێنەی کەسێتی (الصورة الشخصية) ڕوو دەدات (التصوير)}، ئەم کرداری ڕێك بوونەوە

وشـێوە وەرگرتنـە تـا کـاتی لـەدایك بـوون و تەنانـەت دوای لـەدایك بـوونی کۆرپەلەکەش هەر بەردەوام دەبێت.

**٤- وەرگرتنی هاوسەنگیی:**

ووشەی (عدل) مانای رێك بوونـەوە و گونجاویی و هاوسـەنگیی لـە نێوان چەند شـتێکدا دەگرێتـەوە(6)، لـە تەفسـیری (النسـفي)دا دەربـارەی (فَعَــدَلَكَ) هـاتووە: واتـە رێکـی کردیتـەوە و دروسـت کردنتـی موناسـیب و گونجـاو کـرد بـەبێ جیـاوازی لـە بەشـەکانی‌دا (دەسـتێکی درێـژ نـەکردیت و دەسـتەکەی تـر کـورت، یـان چـاوێك فـراوانتر بێـت لـەوی تـر)، کەواتـە قۆنـاغی (النشـأة) کـە (تعدیل)یشی پێ‌دەووترێت بریتی‌یە لە حاڵەتێکی گونجاویی و هاوسەنگی بۆ هەموو ئەندامەکانی لەش بەشێوەیەك کە هەموو ئەنـدامێك گونجاوبێت لەگەڵ پاشماوە و بەشەکانی تری لەشدا.

پرۆسەی تەعدیل زۆر بە ووردیی دەبینرێت لە پاش قۆناغی (تەسویە) کە لێرەدا ئەندامەکان ناهاوسەنگن، بۆ نموونە قەبارەی سەر زۆر گەورەتر دەبێت لەچاو قەبارەی لەشدا، کە لەم قۆنـاغی تەعدیلـەدا پێوانـەکانی لـەش دەگـۆڕێن بەشێوەیەك کە هەردوو پەلی خـوارەوە درێـژتر دەبـن لەچـاو لەشـدا، و گەشـەی سـەر خاودەبێتـەوە لەچـاو گەشـەی لەشـدا، لێـرەوە قـەبارەی سـەر و پەلـەکان هاوسەنگیی خۆیان وەردەگـرن (بڕوانە وێنەی ڕەنگاوڕەنگی: ١٤٠/ هـ ، ١٤١/هـ)، و پێوانەکانی لەشی کۆرپەلەکە گونجاو دەبێت بەپێی شێوە و وێنـەی مرۆیـی، بەمەش مانای هاوسەنگیی و گونجاویی کە لە ووشەی (عدل)دایە دێتەدی (بۆ روون بوونەوەی رێکبوونی رووخسار بڕوانە وێنە ڕەنگاوڕەنگەکانی: ١٤٢/ هـ ، ١٤٣/ هـ).

**٥- دروست بوونی پێست:**

لــە قۆنــاغی (تەعــدیل)دایــە کــە پێســت دروســت دەبێــت، لــە بارســتە لەشـی‌یەکانەوە چـەند پارچـەیەك جیادەبنـەوە کـە پێیـان دەووترێـت بەشـە

(6) بڕوانە فەرهەنگی (لسان العرب)/ ماددەی (عدل).

پێستی- ماسولکەیی‌یەکان (Dermomyotomes)، کە لەمانەوە سەرەتای ماسولکەکان (Myotomes) جیادەبنەوە و ئەوەی دەمێنێتەوە (کە ناسراوە بە بەشی پێستی Dermatome) لەژێر چینی دەرەوەی خانەکانی کۆرپەلەکەدا (Surface Ectoderm) بڵاودەبێتەوە و لەگەڵ هەندێك لە خانەکانی چینی ناوەڕاستدا خانە سەرەتایی‌یەکانی پێست پێکدێنن، لە هەفتەی حەوتەمدا (واتە پاش ئەو ٤٢ ڕۆژەی لە فەرموودەکەدا هاتووە) لە خانەکانی چینی دەرەوەی کۆرپەلەکەوە چینێك خانەی تەخت (Periderm) دەردەدرێت.

ئیتر لێرەوە کرداری دروست بوون و وێنە کردنی پێست دەست پێ‌دەکات و دروست کردنی چینەکانی بەردەوام دەبێت، لە نێوان ڕۆژانی (٤٠-٥٠)دا خانە ڕەنگدارەکانی پێست (Melanocytes) پەیدا دەبن، لە هەفتەی یانزەدا چینێکی چڕ لە خانە دەرەکی‌یەکان دروست دەبێت کە دەبێتە هۆی دروست بوونی هەیکەلێکی دەرەکی بۆ پێست (بڕوانە وێنەی ڕەنگاوڕەنگی: ١٤٤/ هـ)، بەم شێوەیە و بەدوای یەکدا بەشە سەرەکی‌یەکانی پێست لە کۆرپەلەدا دروست دەبن، کە تەنها لە هەفتەی بیستەمدا دەبێت کە ئیتر دروست بوونی بەشەکانی پێست بە تەواوەتی کامڵ دەبێت.

٦- دیاری کردنی ڕەگەزی کۆرپەلەکە:

لە قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەردا (ﷺ) سێ هەنگاو دیاری کراوە بۆ چۆنێتی گەشەکردنی سیفاتە جنسی‌یەکان (نێرینەیی یان مێینەیی):

هەنگاوی یەکەم: لە قۆناغی سەرەتایی‌دا (واتە دیاری کردنی ڕەگەز لە ڕووی بۆماوەیی‌یەوە لە قۆناغی النطفة)دا ڕوودەدات، ئەم بابەتە لە زنجیرەکانی پێشتردا بەدرێژی باس کراوە.

**هەنگاوی دووەم:** بریتی یە لە جیابوونەوە و دروست بوونی رژێنەکانی زاووزێ (گونەکان لە نێرینەدا و هێلکەدانەکان لە مێینەدا)، ئەم کردارە لە قۆناغی داپۆشینی ئێسکەکان بە ماسولکە لە هەفتەی نۆیەمدا روودەدات.

**هەنگاوی سێیەم:** بریتی یە لە جیابوونەوە و دروست بوونی ئەندامە دەرەکی یەکانی زاووزێ کە لە قۆناغی (النشأة)دا روودەدات، لە فەرموودەیەکدا هاتووە: عن حذيفة (رضي الله عنه) ان رسول الله (ﷺ) قال: ﴿إِذَا مَرَّ بِالنُّطْفَةِ ثِنْتَانِ وَأَرْبَعُونَ لَيْلَةً بَعَثَ اللَّهُ إِلَيْهَا مَلَكاً فَصَوَّرَهَا وَخَلَقَ سَمْعَهَا وَبَصَرَهَا وَجِلْدَهَا وَلَحْمَهَا وَعِظَامَهَا، ثُمَّ قَالَ: يَا رَبِّ أَذَكَرٌ أَمْ أُنْثَى، فَيَقْضِي رَبُّكَ مَا شَاءَ وَيَكْتُبُ الْمَلَكُ﴾ رواه مسلم، واتە: کاتێك ٤٢ڕۆژ بەسەر کۆرپەلەکەدا دەڕوات، خوای گەورە فریشتەیەکی بۆ دەنێرێت شێوەی مرۆڤی دەداتێ و بیستن وبینین وپێست وگۆشت وئێسقانی بۆ دروست دەکات، پاشان دەڵێت: خوایە نێرە یان مێیە، لێرەدا خوای گەورە چۆن وویستی بێت دیاری دەکات و فریشتەکە دەینووسێت.




**وێنەی (٧-٤):** لەسەرەتادا ئەندامەکانی زاووزێی نێر و مێ یەك پێکهاتە و شێوەیان هەیە تا هەفتەی حەوتەم، پاشان دەست دەکەن بە جیاواز بوون و هەر ئەندامەی ڕێڕەوی گەشە کردنی تایبەتی خۆی دەگرێت. لە هێلکاریەکەدا ئەم گەشە کردنە زۆر بە روونی دەبینرێت.

فەرموودەکـە ئـەوە دەگەیـەنێت کـە فریشـتەکە مۆڵـەت لـە پـەروەردگار وەردەگرێت کە ئایا کۆرپەلەکە بە نێرینە یان مێینە بنووسێت، ئەویش پاش دروسـت بـوونی بیسـتن وبیـنین وگۆشـت وئێسـك وپێست، خـوای گـەورەش مۆڵـەتی دەدات، ئـەم کـردارەش بـە دروسـت بـوونی ئەندامـە دەرەکی‌یـەکانی زاووزێ دیاری دەکرێت و لێرەدا جیابوونەوەی رەگەزەکان تەواو دەبێت، ئەمە لـە هەفتـەی١٢دا روودەدات، چـونکە تـا هەفتـەی نۆیـەمیش ئەندامـەکانی زاووزێی نێر ومێ لەیەك دەچن لەگەڵ ئەوەشدا کە هەر لە سەرەتاوە رەگـەزی کۆرپەلەکە دیاری بووە بەهۆی جۆری کرۆمۆسۆمەکانەوە.

دەربارەی گەشە کردنی کۆئەندامی زاووزێی کۆرپەلە، زانایان بۆمان باس دەکەن کە لە سەرەتادا هەردوو رەگەزەکە وەکو یەکن و لـە یـەك جیاناکرێنـەوە کە پێی دەووترێت قۆناغی جیاواز نـەبوون (Indifferent Stage) (وێنەی ٧-٤)، پێکهێنـەرە سـەرەتاییەکانی نێـر و مـێ لـە شـێوەی دوو بۆریـدان لـەملاولای بۆشـایی سـکدا کـە لەمانـەوە ئەندامـەکانی زاووزێ دروسـت دەبـن، سیستمی زاووزێ سەرەتایی لە نێر و مێدا لە دوو کەناڵ پێکهاتووە:

١- کەناڵ یان بۆری مولـەر (Mullerian duct): کـە دوایـی تایبەتمەند دەبێـت بـۆ دروسـت کردنـی کۆئەنـدامی زاووزێی مێینـە: مناڵـدان، دوو بۆری‌یەکەی مناڵدان، ملی مناڵدان، و بەشی سەرەوەی زێ.

٢- کـەناڵ یـان بـۆری وۆلـف (Wolffian duct): کە ئـەمیش تایبەتمەند دەبێـت بـۆ دروسـت کردنـی پێکهاتـەکانی کۆئەنـدامی زاووزێی نێرینـە: گونەکان، بەربەخ، بۆری سـپێرم (Vas Deference)، لەگـەڵ توورەکـەکانی سپێرم (Seminal Vesicles).

سـەبارەت بـە گەشـە کردنـی کۆئەنـدامی زاووزێی نێرینـە بینـراوە لەگـەڵ پەیـدا بـوونی خانـەکانی سێرتۆلی لـە گونـدا (Sertolli cells) ئـەم خانانـە هۆرمۆنێك دەرێژن بەناوی (AMH: Anti Mullerian Hormone) کە

بەهۆی ئەمەوە ئەو خانانەی کە سپێرمەکان دروست دەکەن جیادەبنەوە، و لە هەفتەی هەشتەمدا خانەکانی لایدیگ (Leydig)یش لە گوندا پەیدا دەبن، کە ئەمانەن بەرپرسن لە ڕشتنی هۆرمۆنی نێرینە (تێستۆستیرۆن Testosterone) کە دەبێتە هۆی لەناوبردنی کەناڵی مولەر (Muller)، لە هەفتەی دەیەمیشدا هێڵە سێکسی‌یەکانی دەرەوە (Tractus Genital) و ئەندامەکانی دەرەوە ئاشکرا دەبن.

سەبارەت بە مێینەش ڕێڕەوی کۆرپەلەکە بۆ وەرگرتنی سیفاتی مێینە پاش ٦٠ڕۆژ دەست پێدەکات، لە هەفتەی ١٦دا خانە سەرەتایی‌یەکانی حەوز پەیدا دەبن و بەهۆی ئەمەوە کەناڵی وۆلف (Wolf) دەپووکێتەوە، و هێڵە سێکسی‌یەکان (Tractus Genital) دەگۆڕێن بۆ دروست کردنی خانەکانی کۆئەندامی زاووزێی مێینە (بڕوانە وێنە ڕەنگاوڕەنگەکانی: ١٤٦/ هـ ، ١٤٧/هـ).

ئەم ئەنجامە زانایان تەنها لەدوای ساڵی (١٩٤٧ز)ەوە لەسەر دەستی زانا (Alfred Jost) پێی گەیشتن کە تاقی‌کردنەوەی لەسەر کۆرپەلەی کەروێشك ئەنجامدەدا، واتە نزیکەی پاش ١٤ سەدە لە دابەزینی وەحی بۆ سەر پێغەمبەرمان (ﷺ) کە دەفەرموێت: ﴿فَجَعَلَ مِنْهُ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْـأُنثَى﴾ (القيامة:٣٩) واتە: ئێمە پاشان نێر و مێی کۆرپەلەکەی لێوە دیاری دەکەین، کە مەبەستی ئەوەیە یەکەم جار هەردوو پێکهێنەرەکانیان یەك شتە بەڵام دوایی جیادەبێتەوە و جیاواز دەبن، و بە وویستی پەروەردگار نێر و مێی لێوە دروست دەبێت.

لێرەدا پرسیارێك دێتە ئاراوە کە ئایا بۆ پەروەردگار فریشتەیەك رادەسپێرێت کە ڕەگەزی کۆرپەلەکە جیابکاتەوە و سیفاتەکانی نێرینە یان مێینە بە کۆرپەلەکە ببەخشێت؟ ئەی ئێمە ناڵێین کە نێر و مێی کۆرپەلە هەر لە یەکەم خانەوە (لە هێلکەی پیتێنراوەوە) دیاری دەکرێت، ئەی ئیتر چ پێویست دەکات کە فریشتەکە لە دوای ٤٢ ڕۆژ ڕاسپێردرێت بە پێدانی

رەگـەزێکی دیـاری کـراو بـە کۆرپەلەکـە، خـۆ ئـەو لـە جیناتـەکانیدا پێشـتر رەگەزەکەی دیاری کراوە؟!

وەڵامی ئەم پرسیارە پێشکەوتنی زانستی ئەمڕۆ دەریخستووە کە جیاواز بـوون و گەشـە کردنـی ئەندامـەکانی زاووزێ زۆر جـار جیـاوازە لـە رەگـەزی بۆمـاوەیی کۆرپەلەکـە، و بـۆی سـەلماندوین لەگـەڵ ئـەوەدا کـە کۆرپەلەکـە لـە مـاددە بۆماوەییەکـەیدا رەگـەزەکی بـە شـێوەیەك دیـاری کـراوە بـەڵام ئەندامـەکانی زاووزێی بـە پێچـەوانەوە گەشـە دەکـەن، واتـە جـاری واهەیـە کۆرپەلەکە نێرینەیە (XY) بەڵام ئەندامـەکانی زاووزێی مێینـە دەردەچێت، یـان کۆرپەلەکـە مێینەیـە (XX) بـەڵام ئەندامـەکانی زاووزێی نێرینـەی بـۆ دەردەچێت، کەواتە ئەم فەرموودەیە تیشك دەخاتە سەر بابـەتێکی زۆر نـوێی زانسـتیی کـە ئـەوەیـە: لەوانەیـە رەگـەزی بۆمـاوەیی (Genetic Sex) کۆرپەلەکە جیاواز بێت لە رەگـەزی تـوێکـاری (Phenotypic Sex) دیاری دەرەوەی لەشی.

ئـەم حاڵەتـە هـۆکـاری زۆری هەیـە لەوانـە: نـەبوونی کاریگـەریی تـەواوی هۆرمـۆنی نێرینە (تێستۆستیرۆن) لە لەشدا کە دەبێتـە هـۆی دروسـت بـوونی ئەنـدامی زاووزێی مێینـە لـە کۆرپەلەیـەکی بـە بۆمـاوەیی نێرینـەدا، هـەروەها بـوونی بـەرگری لـە دژی هۆرمـۆنی نێرینـە لەلایـەن ئەندامـەکانی زاووزێـوە، بـەهۆی بـوونی عـەیبێك لـە میکـانیزمی وەرگـری هۆرمـۆنی نێرینـەدا (Androgen Receptor Mechanism)، کـە ئەمـە وادەکـات ئـەم هۆرمۆنـە نەناسـرێتەوە و کاریگـەریی نابێت لەسـەر ئەندامـەکانی زاووزێ بـۆ ئەوەی ببێت بە نێرینە، لێرەوە کۆرپەلەکە مێینە دەردەچێت.

هۆکـارێکی تـر بریتـییە لـە نوقسـانی بۆمـاوەیی لـە رژانـدنی هۆرمـۆنی تێستۆستیرۆن لە کۆرپەلـەی بـە بۆمـاوەیی نێرینـەدا، ئـەویش لەبەرئەوەی کە ئەندامەکانی زاووزێ توانای رژاندنی ئەو هۆرمۆنەیان نییە، بەهۆی کاریگەر

نەبوونی گونەکان بە هۆرمۆنی (LH) کە لە ژێرمێشکە رژێنەوە دەردەدرێت و لێرەوە بەبێ بوونی تێستۆستیرۆن ئەندامەکانی زاووزێ مێینە دەردەچێت (وەك بوونی زێ و ئەندامەکانی دەرەوەی مێینە) لە نێرینەیەکی بۆماوەیی‌دا، لەوانەیە لە نێرینەی بۆماوەیی‌دا هۆرمۆنی رێگر لە گەشە کردنی کەناڵی مۆلەر (MIS: Mullerian Inhibiting Substance) کەم بێتەوە، کە ئەم هۆرمۆنە گەشەی ئەو بۆری‌یانەی کە مناڵدان و بۆری‌یەکانی لێوە دروست دەبێت سەرکوت دەکات، سەرەنجام دەبێتە هۆی ئەوەی کە کۆرپەلەکە ئەندامەکانی دەرەوەی نێرینە بێت بەڵام لە هەمان کاتدا لەگەڵ بوونی مناڵدان و بۆری مناڵدان لە ناوەوە.

لەوانەیە حاڵەتەکە بە پێچەوانەوە بێت، واتە کۆرپەلەکە لە رووی بۆماوەیی‌یەوە مێینە بێت (XX)، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ئەندامی زاووزێی نێرینەی بۆ دروست دەبێت، بۆ نموونە لە هەندێك حاڵەتدا کوێرە رژێنی سەر گورچیلە (Suprarenal gland) هەڵدەستێت بە رژاندنی رێژەیەك لە هۆرمۆنی نێرینە، کە لەگەڵ کەڵەکە بوونی‌دا کارێکی وا دەکات رێڕەوی ئەندامەکانی زاووزێ بەرەو نێرینە گەشە بکات و کۆرپەلەکە سیفاتی نێرینە وەردەگرێت لەگەڵ بوونی هێلکەدان و مناڵدان لە ناوەوە.

ئەوەی لە فەرموودەی (پرسیاری فریشتەکەوە لە پەروەردگار) تێدەگەین ئەوەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) زانیاری هەبووە دەربارەی ئەوەی لە لەشی کۆرپەلەکەدا روودەدات، لە کاریگەریی هۆرمۆنەکان لە دروست بوونی ئەندامەکانی زاووزێی دەرەوەدا، کە ئەمەش خۆی لەخۆی‌دا موعجیزەیە، چونکە زانینی مەفهومی هاوسەنگیی هۆرمۆنی و کاریگەریی پێچەوانەی هۆرمۆنەکان لەسەر ئەوەی لە کرۆمۆسۆمەکاندا بڕیار دراوە نەزانرا تەنها لە سەدەی بیستەمدا نەبێت، ئەویش پاش دۆزینەوەی کاریگەریی جینەکان لەسەر دەرکەوتنی رەگەزی کۆرپەلەکە و رۆڵی هۆرمۆنەکان لە دروست کردنی ئەندامەکانی زاووزێی دەرەوەدا.

## ماوەی مانەوەی ئافرەتی تەڵاقدراو و بێوەژن (العدّة):

ئەم بابەتەش پەیوەندی بەم قۆناغی گەشەکردن (النشأة)وە هەیە، بیرو بۆچوونی دروست بوونی لەخۆوە (التوالد الذاتي) هەر لە سەردەمی (ئەرستۆ)وە رەواجی هەبووە، بە تایبەتی کە دەیانووت منالْ لە خوێنی حەیزەوە دروست دەبێت ئەویش بە پشت بەستن بەو بینینەیان کە دەیانووت کەڕوو لەخۆیەوە و بەبێ هۆ دروست دەبێت؟!پاش دۆزینەوەی مایکرۆسکۆب و پاش چەندین قۆناغ ئەم بۆچوونە بە تەواوەتی لە ساڵی (١٨٦٤ز)دا لەسەر دەستی زانای فەرەنسی (لویس پاستۆر) هەڵوەشایەوە کە سەلماندی کەڕوو کردن و بۆگەن کرد هۆکارەکەی بریتی‌یە لە زیندەوەری ووردی جۆراوجۆر، کە ئەمە بیروبۆچوونی دروست بوون لەخۆوەی لەناوبرد، ئیتر زانیاری مرۆڤ وورده وورده زیادی کرد و میکانیزمی منالْبوون و پەیوەندی نێوان سووڕی منالْدان (یان عادەی مانگانە) بە سووڕی هێلکەدانەوە دۆزرایەوە و سەلما کە پیتاندن لە ناوەڕاستی سووڕەکەدا ڕوودەدات، کە هیچ کەسێك لە سەردەمی هاتنە خوارەوەی قورئاندا زانیاری لەم مەسەلانەدا نەبوو!!

بەشێوەیەك لەدواوە بوون وایاندەزانی ڕوودانی سووڕی مانگانە (حەیز) ڕێگر نی‌یە لە دروست بوونی سکپڕی! کەواتە هیچ کەسێك کاتی پیتاندنی نەدەزانی و زانیاری‌یان نەبوو کە دەرکەوتنی سکپڕی بە زۆریی لەدوای ڕوونەدانی سێ سووڕی مانگانەدا تەئکید دەبێت، و هەروەها ئافرەتی دووگیان لەپاش زیاتر لە ٤ مانگ ئیتر هەست بە جووڵەی منالّەکەی دەکات، لە یاسا و تەشریعێکی دانا و بێوێنەدا قورئانی پیرۆز هەندێك حالّەتی کۆمەلآیەتی چارەسەر دەکات و کاتەکانی دەرکەوتنی نیشانەکانی سکپڕی دیاری دەکات و بەڵگەکان لەسەر نەبوونیشی (یان لە زاراوەی شەرعزانانندا بە پاکیی و خاڵێتی منالْدانەکان (براءة الأرحام) ئاماژەی بۆ کراوە) دیاری دەکات و دابەشیان دەکات بەپێی باری تایبەتی ئافرەتەکان، کە ئەمانەش لایەنێکی تری ئیعجازی زانستی قورئانمان بۆ دەردەخات.

بەڵگەشمان لەسەر ئەوەی کە ئەم ماوانەی مانەوە مەبەست لێیان بریتی‌یە لە دڵنیا بوون لە خاڵێتی مناڵدانەکان ئەوەیە کە ئەو ئافرەتەی تەڵاق دەدرێت پێش گوێزانەوەی هیچ جۆرە ماوەیەکی وەستان و عیددەی نی‌یە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَكَحْتُمُ الْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا ...﴾ (الأحزاب:٤٩)، واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، کاتێك ئافرەتانی ئیماندارتان مارە کرد، لەوەودوا جیابوونەوە و تەڵاقتان دان پێش ئەوەی بچنە لایان، ئەوا هیچ عیددە و ماوەیەکیان ناوێت تا حیسابی بۆ بکەن (ماوەی چاوەڕوانی ناوێت بۆ ئەوەی شووبکات بە کەسێکی تر)، بەڵام لە هەمان کاتدا لە کاتی سکپڕی‌دا ئەم ماوەیە درێژ دەبێتەوە تا کاتی مناڵبوون ﴿وَأُوْلَاتُ الْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ ...﴾ (الطلاق:٤)، واتە: ئەو ئافرەتانەش کە سکیان هەیە ماوەکەیان ئەوەندەیە تا سکەکەیان دادەنێن ....

لە هەمان کاتدا لەبەر گرنگی بابەتەکەیە کە پەروەردگار زۆر تەئکیدی لەسەر ئەم عیددانە کردووەتەوە، ئەوەتا دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاء فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا الْعِدَّةَ ..... وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ ...﴾ (الطلاق:١)، واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ (بە ئوممەتەکەت رابگەیەنە) کاتێك ژنتان تەڵاق دەدەن لە کاتی دیاری کراویاندا تەڵاقیان بدەن و حیسابی عیددە و ئەو کاتەش بە ووردی بکەن ..... ئا ئەوەیە سنووری خودا لەبارەی تەڵاق و عیددەوە... ئەم ووردەکاری‌یەش لە حیساب کردن و وەستاندا هۆکارەکەی بریتی‌یە لە: ﴿...لَا تَدْرِي لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَلِكَ أَمْرًا﴾ (الطلاق:١)، واتە: تۆ نازانیت لەوانەیە خوای گەورە بارودۆخێکی تر پێش بهێنێت (وەك سەلماندنی بوونی سکپڕی و پاشان مناڵبوون یان ئاشت بوونەوە و رێکەوتنیان)، کەواتە بریتی‌یە لە پاراستنی خێزان لە داڕووخان و دەستەبەر کردنی لانەی چاك بۆ گەشە و پەروەردەی مناڵەکان.

١- حاڵەتی ئەو تەڵاقدراوانەی کە سووڕی ڕێك وپێکیان هەیە: پێشتر لە باسی نوتفەدا حیکمەتی وەستانی ئافرەتی تەڵاقدراومان کرد بۆ ماوەی سێ حەیز و سێ پاکبوونەوە (بە مەبەستی دڵنیا بوون لە خاڵیّتی منداڵدانی) پێش ئەوەی کە شوو بکاتەوە وەك لە ئایەتەکەدا هاتووە: ﴿وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلاَثَةَ قُرُوَءٍ﴾ (البقرة: ٢٢٨)، کە وەك ووتمان حەیزی یەکەم و دووەم لەوانەیە ئافرەتەکە بە حەیزی تێبگات بەڵام هۆکارەکەی لە ڕاستیدا بریتی بێت لە کاریگەریی کۆرپەلەکە لەسەر منداڵدان، بەڵام کە حەیزی سێیەم رووی‌دا ئیتر گومان نامێنێت لەوەدا کە ئافرەتەکە سکپڕ نییە، هەربۆیە ئەمەش دانراوە بۆ ئەوەیە کە ئافرەتی دووگیانی تەڵاقدراو تا کاتی منداڵبوون هەر مێردە پێشووەکەی لێی بەرپرسیار بێت و خەرجی خۆی و منداڵبوونەکەی و پاشان کۆرپەلەکەش (ئەگەر زیندوو بوو) بدات.

٢- حاڵەتی ئەو تەڵاقدراوانەی کە بێئومێد بوون (واتە گەیشتوونەتە تەمەنی بێئومێدی (سن اليأس) کە ئیتر سووڕی مانگانەیان دەوەستێت) لە ڕوودانی سووڕی مانگانە و سکپڕی و هەروەها ئەو منداڵانەی کە هێشتا سووڕەکەیان بۆ نەهاتووە: قورئانی پیرۆز دەفەرموێت ﴿وَاللَّائِي يَئِسْنَ مِنَ الْمَحِيضِ مِن نِّسَائِكُمْ إِنِ ارْتَبْتُمْ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَاثَةُ أَشْهُرٍ وَاللَّائِي لَمْ يَحِضْنَ ...﴾ (الطلاق:٤)، واتە: ئەو ئافرەتانەی کە نائومێد بوون لە عادەتی مانگانە لە هاوسەرەکانتان، ئەگەر کەوتنە گومانەوە کە ئاخۆ عادەتی مانگانەیان مابێت یان نا ئەوا عیددەکەیان سێ مانگ چاوەڕوانییە، هەروەها ئەوانەش کە بەهۆی کەم تەمەنییەوە هێشتا نەکەوتوونەتە عادەوە، ئەوانیش هەر دەبێت ٣ مانگ چاوەڕێ بکەن.... زانستی نوێ سەلماندوویەتی کە لەمانەدا سکپڕی ئەگەرێکی زۆر کەمی هەیە و نادیرە هەر بۆیە دەبینین قورئانی پیرۆز وەك ئیحتیاتێك ماوەی ٣ مانگی داناوە بۆیان کە بووەستن کە هاوشێوەی وەستانەکەی پێشووە کە سێ حەیز و سێ پاکبوونەوەیە.

٣- سەبارەت بە عیددە و ماوەی مانەوەی ئافرەتی بێوەژن کە مێردەکەی دەمرێت: بە شێوەیەکی جیاواز هاتووە لە قورئاندا کە پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا﴾ (البقرة:٢٣٤)، واتە: ئەو پیاوانەتان کە دەمرن و هاوسەران بەجێ دەهێڵن، پێویستە ئەو هاوسەرانە چوار مانگ و دە ڕۆژ خۆیان بگرن و چاوەڕێ بکەن (شوو نەکەنەوە)، لێرەدا ماوەکە زیادکراوە بۆ دڵنیا بوون لە خاڵێتی منداڵدان، حیکمەتیش لەم زیادکردنە بۆ ئافرەتی بێوەژن ئەوەیە کە ئافرەتی سکپڕ لە کۆتایی هەفتەی نۆزدەیەمدا دەست دەکات بە هەست کردن بە جووڵە خۆویستەکانی منداڵەکە، بەڵام پێش ئەمە جووڵەکان زۆر دیاری کراون و وا لە دایکەکە ناکەن کە هەست بکات کۆرپەلەکەی زیندووە.

بەڵگەشمان لەسەر ئەوەی کە مەبەستی ئایەتەکە لە وەستانی ئافرەتی بێوەژن بۆ ماوەی چوار مانگ و دە ڕۆژ بۆ ئەوەیە کە دڵنیا ببێت کۆرپەلەکەی زیندووە ئەوەیە کە پێش هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە ماوەکە یەك ساڵی تەواو بووە بە مەبەستی چاودێری بێوەژنەکە وەك لە ئایەتێکی تردا فەرمانی پێکراوە کە دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا وَصِيَّةً لِّأَزْوَاجِهِم مَّتَاعًا إِلَى الْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍ فَإِنْ خَرَجْنَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِي مَا فَعَلْنَ فِيَ أَنفُسِهِنَّ مِن مَّعْرُوفٍ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ (البقرة:٢٤٠)، واتە: ئەو پیاوانەتان کە دەمرن و هاوسەران بەجێ دەهێڵن، (دەبێت بە فەرمانی خودا) وەسیەت بکەن بۆ هاوسەرانیان کە تا ساڵێك بمێننەوە و لە ماڵی هاوسەریاندا ڕێزیان لێبگیرێت و بەخێو بکرێن و دەرنەکرێن .....

ئەوەبوو پاش ئەم ئایەتە ئایەتی میرات گرتن دابەزی: ﴿وَلَهُنَّ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّكُمْ وَلَدٌ﴾ (النساء:١٢)، واتە: بۆ خێزانتان دەبێت چارەکی ئەو میراتییەی بەجێتان هێشتووە بیاندرێتێ ئەگەر منداڵیان نەبوو، ئیتر لێرەوە بەدیلی بۆ دروست بوو لە مانەوەی لە ماڵی کەس وکاری مێردەکەی بەوەی

میراتی بدرێتێ، بەمەش بۆ ئەوەی کە مەسەلەی مانەوەی لە ماڵی کەس وکاری مێردەکەی تەواو ئاسان بکرێت، ئەو ئایەتەی پێشتر باسمان کرد هاتە خوارەوە کە دەفەرموێت تەنها ماوەی چوار مانگ و دە رۆژ چاوەڕێ بکات، کە ئەمەش بۆ زانینی خاڵی بوونی سکێتی و بۆ دڵنیا بوونە لە زیندوێتی کۆرپەلەکە، چونکە ئەگەر مەبەست و حیکمەت لە هێلانەوەی ئەم چوار مانگ و دە رۆژەدا ئەمە نەبووایە ئەوا بە تەواوەتی ئەو ساڵە هەمووی لادەبرا، چونکە هیچ مەبەستێك و حیکمەتێکی تر نابینرێت لە مانەوەی چوار مانگ و دە شەوەکەدا.

لە تەفسیری (إبن کثیر)یشدا رایەك هاتووە کە ئەم بۆچوونە بەهێز دەکات، کە دەڵێت: {زۆربەی زانایان دەڵێن ئایەتی (وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا وَصِيَّةً لِّأَزْوَاجِهِم مَّتَاعًا إِلَى الْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍ...) حوکمەکەی هەڵوەشاوەتەوە (مَنْسوخَةٌ) بە ئایەتی (يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا)، لە (إبن عباس)ەوە دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: پێشتر کە پیاو دەمرد و ژنی بەجێ دەهێلا ماوەی ساڵێك لە ماڵی مێردەکەی دەمایەوە و خەرجی بۆ دەکرا لە ماڵەکەی، بەڵام پاشان خوای گەورە ئایەتی (وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا) ناردە خوارەوە، کە ئیتر ئەمە بووە عیددەی بێوەژن ئەگەر سکپڕ نەبێت.

بەڵام کە سکپڕ بوو عیددەکەی ئەوەیە کە مناڵەکەی ببێت، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٌ فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَ مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِينَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ وَلَهُنَّ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّكُمْ وَلَدٌ فَإِن كَانَ لَكُمْ وَلَدٌ فَلَهُنَّ الثُّمُنُ مِمَّا تَرَكْتُم مِّن بَعْدِ وَصِيَّةٍ تُوصُونَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ ...) کە لێرەدا میراتی ئافرەتی روون کردووەتەوە و وازی لە وەسیەت و نەفەقە کێشان هێناوە}.

ئەگەر بێتو ئەو چوار مانگ و دە رۆژە تێپەڕین و ئافرەتەکە هەستی بە جووڵەی کۆرپەلەکە نەکرد ئەوا دڵنیا دەبێت لەوەی کە کۆرپەلەکە لە سکیدا مردووە[7]، ئیتر دەتوانێت هەوڵ بدات بە ڕێگەی پزیشکی دەریبهێنێت، هەر کاتێکیش دایکەکە هەستی بە جووڵە کرد ئەوا عیددەکەی بریتییە لە دانانی سکەکەی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأُوْلَاتُ الْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾ (الطلاق:٤)، واتە: ئەو ئافرەتانەی کە دووگیانن ماوەی مانەوەیان (کە ئەگەر مێردەکەیان مرد یان تەڵاق دران) بریتییە لە دانانی سکەکانیان، لە هەندێك حاڵەتدا لەوانەیە کە ئافرەتەکە حاڵەتی سکپڕی درۆینەی بەسەردا بێت کە ئەمە لە ڕووی پزیشکییەوە ناسراوە، هەربۆیە لەگەڵ تەواو بوونی عیددەکەی (چوار مانگ و دە رۆژ) ئەگەر هەستی بە جووڵەی کۆرپەلەکە نەکرد ئەوا بۆی دەسەلمێت کە حاڵەتەکەی سکپڕی ئاسایی نییە، و زوو فریای خۆی دەکەوێت و دەچێتە لای پزیشك بۆ زانینی حاڵەتەکەی، و بۆی دەردەکەوێت دووگیان نییە و ئیتر لەگەڵ تەواو بوونی ئەم ماوەیەدا عیددەکەشی تەواو دەبێت.

لەمانەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو ماوانەی قورئانی پیرۆز دیاری کردوون بریتییە لە ئیعجازێکی زانستی، چونکە کەمترین ماوە دیاری دەکات کە ئافرەتی دووگیان تێیدا دەتوانێت هەست بە جووڵەی کۆرپەلەکەی بکات، باشە چۆن پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم ماوە وردەی زانی لە سەردەمێکدا کە زانیارییەکی ئەووتۆ لەم بارەوە نەبووە؟! ئەمە بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرایە لەسەر ئەوەی کە ئەو کەسەی ئەم زانیارییەی پێداوە لەسەروو دەسەڵاتی مرۆڤەکانەوەیە و ئەمە وەحی و نیگایەکی خوداییە.

---

(7) لە هەندێك حاڵەتدا لەوانەیە کۆرپەلەکە لە سکی دایکیدا بمرێت و رەق ببێت و تەکەلوس بکات (واتە خوێکانی کالیسیۆمی تێدا دەنیشێت) و بۆماوەی چەند ساڵێك بمێنێتەوە، ئەم حاڵەتە لە زانستی پزیشکیدا ناسراوە و پێی دەووترێت لەبارچوونی لەبیرچووەوە یان شاراوە (Missed Abortion).

لێرەدا خوێنەری خۆشەویست بابزانین زانستی ئەمڕۆ لەمبارەیەوە بەهۆی توێژینەوە ووردە زانستی‌یەکانەوە بەچی گەیوە:

زانایان ناوەندی ماوەی سکپڕی‌یان بە (٣٨) هەفتە دیاری کردووە لە کاتی پیتاندنی هێلکەکەوە تا کاتی لەدایك بوون (واتە ٢٦٦ رۆژ)*، زانایان ناوەندی (متوَسِّط Mean)ی ئەو ماوەیەی کە دایکەکە تیَ‌ی‌دا هەست بە جوولەی کۆرپەلەکەی دەکات بە ١٤٧ رۆژی سکپڕی دیاری کردووە، لەگەڵ بوونی چانسی لادانی پێوانەیی (Standard Deviation) بەبڕی ١٥رۆژ، کەواتە ئەگەر بمانەوێت سەرەتای دەست پیَکردنی دایکەکە بە هەست کردن بە جوولەی کۆرپەلەکە دیاری بکەین، دەبێت ئەم ١٤٧ رۆژە دەربکەین لە سەرجەمی ماوەی سکپڕی‌یەکە کە ٢٦٦ رۆژە، کەواتە ناوەندی دەست پیَکردنی ئەو هەست کردنە بە جوولەی منداڵەکە دەکاتە: ٢٦٦-١٤٧= (١١٩)یەمین رۆژی سکپڕی.

لەبەر ئەوەی کە جیاوازی هەیە لەنێوان ژناندا لەلایەنی هەست کردن بە جوولەی کۆرپەلەکانیانەوە بەهۆی چەندین فاکتەری جیاوازەوە، هەربۆیە چانسی ئەوە هەیە کە دایکەکە هەست بە جوولەکە بکات لەپێش یان دوای ئەم ماوەیە، بۆیە تا ماوەی سکپڕی‌یەکە زیاتر نزیك بێت لەو کاتە دیاری کراوە ئەوا چانسی هەست کردن بە جوولەی منداڵەکە زیاتر دەبێت. کەواتە چانسی هەست کردنی دایکەکە بە جوولەی کۆرپەلەکە بەپیَ‌ی یاسایەکی ژمێریاری دابەش کردن (Normal Distribution) دەبێت، لەگەڵ ناوەندێك (متوَسِّط Mean) کە برەکەی ١١٩ رۆژە لە رۆژی پیتاندنەوە و لادانێکی پێوانەیی بە بڕی ١٥رۆژ.

---

* بڕوانە کتێبی: گەشە کردنی مرۆڤ یان مرۆڤی گەشە کردوو (The Developing Human) دانراوی پرۆفیسۆر (کیث ل. مور)/ لاپەڕە ٩.

قورئانی پیرۆزیش ماوەی مانەوەی (عیددەی) ئافرەتی بێوەژن بە چوار مانگ و دە رۆژ دیاری دەکات، کە ٤ مانگ دەکاتە ١١٨ رۆژ و نیو بە نزیکەیی (٢٩،٦×٤= ١١٨،٤)[8]، کە بە نزیکەیی بریتی‌یە لە هەمان ئەو ماوە ناوەندی‌یەی کە ئافرەتی دووگیان تێ‌یدا هەست بە جوولەی کۆرپەلەکەی دەکات لە رۆژی پیتاندنەوە کە ١١٩ رۆژە!!!

ئەم دیاری کردنەی عیددەی ئافرەت (٤مانگ و ١٠رۆژ) قورئان بەڕەهایی وەك ئیحتیاتێك هێناوی‌یەتی، بە مەبەستی درێژ کردنەوەی ماوەی دڵنیا بوون لە خاڵێتی منداڵدان و جێگیر بوونی سکپڕیی زیندوو بە دڵنیایی‌یەوە، کە ئەم ماوەیە بە کەمترین ماوەی ناوەندی دادەنرێت لای زوربەی ژنانی دووگیان بۆ هەست کردن بە جوولەی کۆرپەلەکانیان، ئەم راستی‌یە لە تەفسیری (البحر المحیط)دا ئاماژەی پێدراوە کە دەڵێت: (خوای گەورە بۆیە ١٠ی زیاد کردووە چونکە دڵنیا دەبین لە پەیدا بوونی جوولەی کۆرپەلەکە، یان موراعات کردنی کەم کردنی مانگەکان، یان دەرخستنی خێرایی یان خاویی پەیدا بوونی جووڵە لە کۆرپەلەکەدا)[9].

لێرەوە دەبینین کە قورئانی پیرۆز پێش زانایانی داوەتەوە لە دۆزینەوەی ئەم ماوەیەدا بە ١٤ سەدە، با ئەوەش بزانین کە قورئانی پیرۆز کتێبێکی پزیشکی نی‌یە بەڵکو دەستوور و یاسایەکە بۆ بیروباوەڕ و پەرستنی پەروەردگار و پەیوەندی مرۆڤەکان بەیەکەوە، کاتێکیش هەندێ نموونەی

---

(8) ئەوەی پێویستە لێرەدا بزانرێت ئەوەیە کە ژماردنی رۆژەکان دەبێت بەپێی مانگی کۆچی (مانگی هەیڤی) بێت، نەك بەپێی مانگی زایینی (مانگی خۆری) کە موسوڵمانان عادەتیان پێوە گرتووە بەکار کردن بەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الأَهِلَّةِ قُلْ هِيَ مَوَاقِيتُ لِلنَّاسِ وَالْحَجِّ ...﴾ (البقرة: ١٨٩)، واتە: پرسیارت لێدەکەن دەربارەی هەیڤی مانگەکان کە دەردەکەون، تۆ پێیان بڵێ: ئەوانە بریتین لە دیاری کردنی کات بۆ خەڵکی و بۆ ئەنجامدانی حەج، لێرەوە بۆمان دەردەچێت کە ناوەندی مانگی کۆچی بریتی‌یە لە ٢٩،٦ رۆژ بە نزیکەیی.

(9) بڕوانە تەفسیری (البحر المحیط)/ دانراوی (أبي حيّان الأندلسي)/ ج٢–لاپەڕە ١٤٩.

زانستی دێنێتەوە تەنها مەبەستی پێی بریتی‌یە لە دەرخستنی هاوئاهەنگی زانستی پزیشکی لەگەڵ زانستی شەرعی‌دا، و بۆ زیاد بوونی باوەڕ و بۆ پەند وەرگرتنە، و بۆ دەرخستنی ئەو راستی‌یەیە کە دانەری ئەم یاسایە ئەو پەروەردگارە تاك و تەنهایەیە کە ئاگاداری نهێنی و ئاشکرای هەموو شتێکە، لێرەدا دەگەینە راستی‌یەکی گرنگ کە ئەوەیە: زانستی تاقیکاری لەگەڵ ئەو هەموو پێشکەوتنەی کە پێی گەیشتووە بریتی‌یە لە سەلمێنەری راستی‌یەکانی قورئان و دەرخستنی ناوازەیی ئاینی ئیسلام.

## قۆناغ و بەشەکانی گەشە کردن (النشأة):

ئەمانەی خوارەوە دەگرێتەوە:

### ١- گەشەکردن بۆ دروست کراوێکی جیاواز (النشأة خلقاً آخَر):

ئەم قۆناغە لە هەفتەی نۆیەمەوە دەست پێدەکات و تا هەفتەی ٢٢ دەخایەنێت، لە کۆرپەلەکەدا ئەم سیفاتانەی خوارەوە دەردەکەوێت:

**أ-گەشەی خێرا:** زیادکردنێك کە لەگەڵ مانای (النشأة)دا دەگونجێت کە پێشتر باسمان کرد، کۆرپەلە لەدوای قۆناغی ماسولکە (واتە هەفتەی نۆیەم) بە هێواشی گەشە دەکات تاوەکو هەفتەی دوانزەیەم، لێرەوە گەشەی کۆرپەلەکە زۆر خێرا دەبێت و لەماوەیەکی کەمدا بارستایی‌یەکەی چەند جارە دەبێتەوە (بڕوانە *خشتەی ژمارە ٣*) و (وێنەی ٧-١).

**ب-گۆڕانی پێکهاتەی کۆرپەلەکە و گەشە کردنی ئەندامەکانی:** پەیکەری ئێسکی کۆرپەلەکە لە پەیکەرێکی کرکڕاگەیی نەرمەوە دەگۆڕێت بۆ پەیکەرێکی ئێسکیی پتەو، لە هەفتەی دوانزەیەمدا سەنتەرەکانی بەئێسك بوون (مراکز التعظم **Epiphysis**) لە زوربەی ئێسکەکانی لەشدا دروست دەبێت و پەلەکان بەئاشکرا لە یەکتری جیادەکرێنەوە، دەتوانرێت نینۆك لەسەر پەنجەکانی ببینرێت، هەریەك لە سەر و لەش و پەلەکان قەبارەی ئاسایی خۆیان وەردەگرن بە تایبەتی لە نێوان هەفتەی نۆیەم ودوانزەیەمدا.

گەندەموو لەسەر پێست دەردەکەوێت و پێست خۆی دەبێت بەدوو چینی سەرەوە و خوارەوە (Dermis & Epidermis)، قەبارەی کۆرپەلەکە بەشێوەیەکی گشتی زۆر بەپەلە زیاد دەکات و دەتوانرێت بەئاشکرا ئەندامەکانی زاووزێی دەرەوە جیابکرێتەوە لە هەفتەی دوانزەیەمدا.

ماسولکە خۆویست وخۆنەویستەکان گەشە دەکەن و کۆرپەلەکە لەم قۆناغەدا چەند جوولەیەکی کەمی ئاسایی دەنوێنێت، هەروەها چەند گرژ بوونێکی ماسولکەیی دەنوێنێت ئەگەر بێتوو بە ئاگادار کەرەوەیەکی دەرەکی کاری تێبکرێت.

بە شێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین: گەشەکردنی ئەرك و کارەکانی کۆئەندامی دەمار شان بەشانی گەشەکردنی مێشك و بڕبڕەی پشت و دڕکە پەتك دەبێت، پەیدابوونی جووڵە خۆڕسکەکانیش (الحركات الغريزيَّة) وەك: شت گرتن ومژین پاش ماوەیەکی زۆر دەبێت.

لەگەڵ ئەمانەشدا ئەم قۆناغەی دروست بوون و گەشەکردنی کۆرپەلە (قۆناغی النشأة) قۆناغێکی گوێزەرەوەی گرنگە، چونکە ئەم وەڵامە جووڵەیی‌یە وورده گرنگانە بە هێواشی گەشە دەکەن و وورده وورده بەهێزتر دەبن، لەگەڵ ئەمەشدا چەندین گۆڕانکاری زۆر و وورد لە کۆرپەلەکەدا روو دەدەن کە وای لێدەکەن لە قۆناغە سەرەتایی‌یەکانی دروست بوونیەوە (مرحلة الحَميل EMBRIO) بچێتە قۆناغی کۆتایی دروست بوونی‌یەوە (مرحلة الجنين FETUS) (بڕوانە وێنەکانی: ٧-٥ ، ٧-٦).

لە کۆتایی ئەم قۆناغەدا هەموو ئەندامەکانی کۆرپەلەکە بە تەواوەتی کامڵ بوون و ئامادەن بۆ هەستان بە کارەکانیان، بەتەواوەتی وەك ئەوەی قورئانی پیرۆز ئاماژەی پێداوە: کە دەبێت بە دروستکراوێکی نوێ و جیاواز ﴿ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ﴾.




وێنەی ( ٧-٥ ): چەند وێنەیەکی راستەقینەی مایکرۆسکۆپی کۆرپەلە لەناو منالْداندا و لە قۆناغی گەشە کردن ( النشأة )دا. دەبینین چۆن هەموو ئەندامەکانی ئاشکرا بوون و مۆرکی مرۆیی‌یان پێوە دیارە. و جووڵەی سەرەتایی ئەنجام دەدات.

1

جنين في الشهر الرابع أن الأذن تشبه أذن الطفل المولود

2

الجنين في الشهر السابع (صورة بالموجات فوق الصوتية)

3

4

الشهر الخامس : لقد تكامل نمو اليدين والرجلين منذ فترة ، يستطيع الجنين في هذة المرحلة أن يقوم بمص أبهامة




الجنين في بداية الشهر السادس
صورة بالموجات فوق الصوتية

وێنەی (٧-٦): چەند وێنەیەکی راستەقینەی کۆرپەلە لەناو سکی دایکی‌دا کە بە ئامێری سۆنەر گیراوە:

١- گوێیەکی پێگەیشتووی کۆرپەلەیەکی ٤ مانگ.

٢- کۆرپەلەیەکی ٧ مانگ پەنجەی دەمژێت!.

٣- دەستێکی پێگەیشتووی کۆرپەلەیەکی ٥ مانگ.

٤- قاچی پێگەیشتووی کۆرپەلەیەکی ٥ مانگ.

٥- کۆرپەلەیەک لە سەرەتای مانگی شەشەمی‌دا.

**تێبینی:**

دەتوانین مانایەکی تری ئەو ئایەتە پیرۆزە: ﴿ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ﴾ لەوەدا ببینینەوە کە زانایانی زیندەوەرزانی بۆمان باس دەکەن کە: لە قۆناغە سەرەتاییەکانی دروست بوونی کۆرپەلەی زیندەوەرە شیردەرەکان (الحيوانات الثديية Mammals) و هەندێ زیندەوەری تردا بینراوە کە بە تەواوەتی کۆرپەلەی ئەم زیندەوەرانە لەو قۆناغە سەرەتاییانەدا لەیەك دەچن لە پێکهاتەی لەشیان و تەنانەت شێوەی دەرەوەی کۆرپەلەکانیشیان (بڕوانە وێنەکانی ژمارە: ٧-٧ ، ٧-٨)، کەواتە دەتوانین مانایەکی تری ئەو ئایەتە پیرۆزە بەوە دابنێین کە دەفەرموێت: ئێمە کۆرپەلەی مرۆڤ لەم قۆناغەدا گەشە پێدەکەین بۆ زیندەوەرێکی جیاواز لەهەموو زیندەوەرێکی تر و بە تەواوەتی ئەو لێك چوونە لە دوای ئەم قۆناغەوە نامێنێت.

لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا زانایەکی ئەڵمانی بەناوی (فۆن بایەر) کە چەندین توێژینەوەی لە بواری کۆرپەلەزانیدا ئەنجامدا، گەیشتە چەند ڕاستییەکی زانستی لەم بوارەدا کە بەهۆیەوە یاسایەکی دانا کە لەلایەن زانایانی کۆرپەلەزانییەوە پەسەند کراوە، و بەناوی خۆیەوە (واتە یاسای فۆن بایەر)ەوە ناونراوە، ئەم یاسایە دەڵێت:

١- قۆناغە سەرەتاییەکانی گەشەی کۆرپەلەی ئاژەڵان هەموویان لە یەکتری دەچێت (هەروەها بڕوانە وێنەی ڕەنگاوڕەنگی: ١٤٨/ هـ).

٢- دوای ئەوەی کە کۆرپەلەکە گەورە دەبێت، دەبێت بە دروستکراوێکی جیاواز لە کۆرپەلەی ئاژەڵانی تر، و پێکهاتە و شێوەی تایبەت بە جۆری خۆی دەبێت، ئەم ڕاستییە لە قورئانی پیرۆزدا پێش ١٤٠٠ ساڵ باسکراوە کە دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ﴾ (المؤمنون:١٢-١٤).

بەڕاستی ئەم ئامارە زۆر و سەرسوڕهێنەرانە لەم چەند ئایەتە کەمەدا مانای گەورەیی موعجیزەی قورئانی پیرۆزە بەگشتی.




وێنەی (٧-٧): لە قۆناغە سەرەتاییەکانیاندا کۆرپەلەی مرۆڤ و زۆرێك لە زیندەوەران هەمان شێوەیان هەیە، و پاشان هەریەکە و بۆ شێوەی تایبەتی خۆی جیاواز دەبێت.

## کەمترین ماوەی سکپڕی:

کۆرپەلەی مرۆڤ لە دوای قۆناغی (النشأة) دەبێت بە دروست کراوێکی نوێ و تەواو کە دەتوانێت لەدەرەوەی مناڵدانی دایکی بژی، ئەمەش لەپاش تەواو بوونی مانگی شەشەمەوەیە، ئەم مانایە یەکدەگرێتەوە لەگەڵ ئەوەی لەم ئایەتانەی قورئاندا هاتووە:

- ﴿وَحَمْلُهُ وَفِصَالُهُ ثَلَاثُونَ شَهْرًا﴾ (الأحقاف:١٥)، واتە: سکپڕی تا بڕینەوەی منداڵ لە شیر هەمووی ٣٠مانگ دەخایەنێت.

- لە ئایەتێکی تردا هاتووە: ﴿... وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ ...﴾ (لقمان:١٤)، واتە: شیردانی منداڵ دوو ساڵ دەخایەنێت، هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَادَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ ...﴾ (البقرة:٢٣٣)، واتە: دایکان دەبێت شیر بدەن بە منداڵەکانیان بۆ ماوەی دوو ساڵی تەواو.

کەواتــە لــەم ئایەتانــەوە بۆمــان دەردەکــەوێت کــە کــەمترین مــاوەی ســکپڕی بریتــی‌یە لە ٦مانگ چونکە ئەگەر ماوەی سکپڕی و شیردان ٣٠مـانگ بێت، و ماوەی شیر دان بە تەنها دوو ساڵ (واتە ٢٤مانگ) بێت، ئەوا کەمترین ماوەی سکپڕی ٦مانگ دەبێت، هەر لەبەر ئەوەش بوو کە ئیمامی عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) بەم شێوەیە فەتوای‌دا کاتێك کە موسوڵمانێك گومانی لـە خێزانەکەی کرد کاتێك کە دوای ٦مانگ لە ژن هێنـانی منـداڵێکی زینـدووی بـوو، ئەویش بە پشت بەستن بەم ئایەتانە وتی کە ئەوە منـداڵی خۆتـە چونکە کەمترین ماوەی سکپڕی ٦مانگە[10].

هــەموو هاوەڵــەکانیش لــەم رایــەدا لەگــەڵی‌دا بــوون و موفەســیرەکانی قورئانیش هەمان قسەیان کردووە.

پزیشـکی فەرەنسـی (شـارل ڕۆ)[11] ئـەم ڕاسـتی‌یەمان بۆ شـی‌دەکاتەوە لـە ڕووی زانســتی‌یەوە و دەڵێـت: کۆرپەلــە لــە سـکی دایکـی‌دا لــە ناوەنــدێکی ئاوی‌دا دەژی و هەر لەویشەوە ئۆکسجین وەردەگرێت (کۆرپەلەکە ئۆکسجین لــە دایکەکــەوە وەردەگرێــت لــەرێی ناوکــە پەتکــەوە و خۆیشــی لــە ناوەندێکی ئاوی‌دایە).

کۆرپەلە بۆ ئەوەی بتوانێت لە دەرەوەی منداڵدان بژی پێویستی بەوە هەیە کە ئۆکسـجین لـەرێی هەناسـەدانەوە وەربگرێـت لـەبری ئـەوەی لـە دەوروبـەرە ئاوی‌یەکەیەوە دەریبهێنێت، ئەمەش پشت دەبەستێت بە پێگەیشتن و کامڵ بوونی سی‌یەکانی‌یەوە، و هـەروەها پێگەیشتنی ئەو سەنتەرە دەماری‌یانەی کە لە دڕکەپەتك و مێشکی‌دا هەن و کۆنترۆڵی هەناسەدان دەکەن.

---

(10) بڕوانە: (زاد المسیر لإبن الجوزي)/ (٧:٣٧٧).

(11) ئەم بابەتەی لە (کۆنگرەی پزیشکی ئیسلامی جیهانی یەکەم دەربارەی ئیعجازی پزیشکی لە قورئان و سوننەتدا) پێشکەش کرد.




وێنەی (٧-٨): لەم وێنانەشدا بڕوانە لێکچوونی نێوان کۆرپەلەی مرۆڤ و کۆرپەلەی هەندێك زیندەوەری تر لە قۆناغەکانی (١ ، ٢)دا، کە سەرەتای دروست بوون و گەشە کردنیانە، تەنها لە کۆتایی‌دا نەبێت شێوەیان جیاواز نابێت.

پێگەیشتنی تەواوی سی‌یەکانیش دوای هەشت مانگ لە سکپڕی دەبێت بەڵام توانای دەست کردن بە هەناسەدان زۆر پێش ئەمە دەست پێ‌دەکات، ئەویش لەبەر ئەوەیە کە پێگەیشتنی پشت بە دوو فاکتەری سەرەکی دەبەستێت کە بریتین لە:

١- پێگەیشتنی توورەکەکانی هەوا یان سیکڵدانۆچکەکان (Alveoli) کە بریتین لە کیسی زۆر بچووك لە هەردوو سی‌یەکاندا، لێرەدایە کە ئاڵوگۆڕی گازیی لە سی‌یەکاندا روودەدات.

٢- موولوولەکانی خوێن (Vascular Capillaries): ئەو خوێنەیان تێ‌دایە کە گازەکان دەگوێزێتەوە.

دروست بوونی سیکڵدانۆچکەکان لە مانگی شەشەمی سکپڕی‌دا دەبێت و تا کۆتایی سکپڕی بەردەوام دەبێت، کە لەوانەیە ئەم ماوەیە تا ساڵی یەکەمی دوای لەدایك بوون بخایەنێت، موولوولەکانی خوێنیش لە مانگی شەشەمدا بە توند و تۆڵی بە سیکڵدانۆچکەکانەوە دەبەسترێنەوە، ئیتر بەهۆی ئەمانەوە بە شێوەیەکی تیۆری دەتوانین بڵێین کە کۆرپەلەکە توانای ژیانی هەیە لە دەرەوەی مناڵدان (ئەویش لەبەر ئەوەیە کە توانای هەناسەدانی هەیە بەهۆی دروست بوونی پێکهێنەرە سەرەکی‌یەکانی هەناسەدان)، هەربۆیە دەبێت تەواو بوونی مانگی شەشەم بە کەمترین ماوەی سکپڕی دابنرێت کە کۆرپەلەکە واچاوەڕوان دەکرێت بتوانێت تێ‌یدا بژی.

فاکتەری سەرەکی بۆ بەردەوام بوونی هەناسەدان بریتی‌یە لە ماددەی سێرفاکتەنت (Surfactant) کە لەلایەن سیکڵدانۆچکەکانەوە دەردەدرێت، ئەم مادده پرۆتینی چەوریدارە (Lipoprotein) وا لە سیکڵدانۆچکەکان دەکات کە لە کاتی هەناسە وەرگرتندا بەشێوەیەکی جێگیر بکشێن و لەکاتی هەناسەدانەوەدا رێ لە قەپات بوون و تێکشکانیان دەگرێت، دەردانی ماددەی سێرفاکتەنت لە هەفتەی بیستەمەوە دەست پێ‌دەکات، کە بڕەکەی زۆر کەمە

لەو منالأنەدا کە پێش کاتی خۆیان لەدایك دەبن و ئاگاتە راددەیەکی پەسەند کراو تەنیا لە کۆتایی سکپڕی‌دا نەبێت.

ئەو فاکتەرە سەرەکی‌یەی وا لەو منالأنە دەکات کە پێش کاتی خۆیان لەدایك دەبن بتوانن بژین، ئەوە نی‌یە کە کۆمەڵێك توورەکەی تەنکی لاپەڕی هەبێت (Thin Terminal Sacs)، بەڵکو بریتی‌یە لە گەشە کردنێکی پەسەندی لوولە خوێنەکانی سی‌یەکان و بوونی ڕێژەیەکی پێویستە لە ماددەی (سێرفاکتەنت)، هەربۆیە ئەو کۆرپەلانەی کە لە نێوان ٢٤-٢٦ هەفتەی سکپڕی‌دا لەدایك دەبن دەتوانن بژین ئەگەر بێتو ئاگاداری‌یەکی زۆر تایبەتی‌یان بۆ بکرێت، و لەناو شووشەکانی نەبەکامدا بهێڵرێنەوە.




**وێنەی** (٧-٩): گەشە کردنی سی‌یەکان و بۆری‌یەکانی هەناسە لە کۆرپەلەدا، لە وێنەی سەرەدا بڕوانە سەرەتای هەموو ئەندامەکان و لە خوارەوەش گەشە کردنی سیستمی هەناسەدان روون کراوەتەوە.

بەڵام چانسی ئەوەش هەیە کە ئەو کۆرپەلانەی تەمەنیان لەنێوان ٢٢-٢٥ هەفتەدایە و لەدایك دەبن بمرن لەو کاتە زۆر زووەدا، لەبەر ئەوەی کە

کۆئەندامی هەناسەیان پێنەگەیشتووە، بەڵام ئەو کۆرپەلانەی کە دوای ئەم ماوەیە لەدایك دەبن بەزۆری چانسی ژیانیان هەیە، ئەویش لەبەر ئەوەیە کە کۆئەندامی هەناسەدانیان دەتوانێت کرداری هەناسەدان ئەنجام بدات، هەروەك دەشزانین کە مانگی کۆچی (مانگی هەیڤی) لە ٢٩,٦ رۆژ پێکدێت، و شەش مانگی هەیڤی دەکاتە:(٦ × ٢٩,٩ = ١٧٧,٦ رۆژ)، کە یەکسانە بە ٢٥ هەفتە و دوو یان سێ رۆژ.

کەواتە ئەو ماوەیەی کە قورئانی پیرۆز دیاری کردووە بریتی‌یە لە کەمترین کاتی پراکتیکی بۆ سکپڕی لە مرۆڤدا (کە بریتی‌یە لە ٢٥ هەفتە و بەرەو ژوور 25 Weeks +)، و ئەو مندالأنەی کە لەم کاتەدا و پێش کاتی ئاسایی خۆیان لەدایك دەبن دەتوانن بژین.

ئەوەی ئەم بۆچوونە بەهێزدەکات کە ٢٥ هەفتە و بەرەو ژوور بریتی‌یە لەو ماوە پراکتیکی‌یەی کە کۆرپەلەکە دەتوانێت تیٚ‌یدا هەناسە بدات و بێ‌بوونی نەخۆشی ترسناك بژی، چەند شتێکە لەوانە:

١- هەندێك سەرچاوەی پزیشکی رێژەی ئەو مندالأنەی کە لە کاتی شەش مانگی هەیڤی یان ٢٧ هەفتە لە یەکەم رۆژی عادەی ئاسایی مانگانەی ئافرەتەکەوە (LNMP: Last Normal Menstrual Period) لەدایك دەبن و بە زیندوویی دەمێننەوە بە ٧٢٪ دیاری کردووە بۆ ساڵانی ١٩٧٠-١٩٨٨ بە پشت بەستن بە لێکۆڵینەوەیەك لەسەر تەمەنی کۆرپەلەکە، هەروەها بە ٩٠٪ لە نێوان ساڵانی ١٩٩٥-١٩٩٦ بە پشت بەستن بە لێکۆڵینەوەیەك لەسەر کێشی منالەکان (کە کێشی ئەو منالەی بە تەمەنی ٢٧ هەفتەیی لەدایك دەبێت بریتی‌یە لە ١٠٠٠ گرام بەپێی لێکۆڵینەوەیەکی سەرچاوەیی کە لە ساڵی ١٩٩٦دا ئەنجامدرا)، هەروەها بە ٩٠٪ دیاری کرا بەپێی توێژینەوەیەکی ساڵی ٢٠٠١ کە پشتی بەستبوو بە تەمەنی کۆرپەلەکە.

کەواتە ئەو ماوەیەی کە ئاماژەمان پێدا بەپێی ئەو ئامارانەی سەرەوە بریتی‌یە لەو ماوەیەی کە بەزۆری کۆرپەلەکە تێیدا دەژی، بۆ زانیاریش ئەو ماوەی ۲۷ هەفتەیەی کە ووتمان لە یەکەم رۆژی عادەکەوە حیساب دەکرێت هەمان ئەو ماوەیەیە کە ئایەتەکانی قورئان ئاماژەیان پێداوە (شەش مانگی کۆچی یان ۲۵ هەفتە)، کە دوو هەفتەی سەرەتای ۲۷ هەفتەکە بریتی‌یە لە ماوەی نێوان یەکەم رۆژی عادەی مانگانەکە تا کاتی دەرپەڕانی هێلکەکە لە هێلکەدانەوە. کە لەگەڵ ۲۵ هەفتەی تردا حیساب دەکرێت (کە ئەمیان لە کاتی دەرپەڕانی هێلکەکەوە دادەنرێت تا لەدایك بوونی کۆرپەلەکە)، قورئانی پیرۆزیش حیسابەکەی پشتی بەستووە بە یەکەم رۆژی سکپڕی و ئەمە بە سەرەتای تەمەنی کۆرپەلەکە دادەنێت، چونکە ئایەتە قورئانی‌یەکە باسی سکپڕی کردووە ﴿وَحَمْلُهُ وَفِصَالُهُ ثَلَاثُونَ شَهْرًا﴾، و باسی ووشەکانی (دەورە-سوور) یان (حەیز) و لەو شێوانەی نەکردووە، ئەگەر بە شێوەیەکی لۆجیکیش بیری لێبکەینەوە دەبینین کە حیسابی تەمەنی کۆرپەلەکە لە رۆژی پیتاندنی هێلکەکەوە بکرێت باشتر و مەنتیقی ترە، چونکە کۆرپەلەکە لەو دوو هەفتەیەی پێشتردا هەر بوونی نی‌یە.

۲- دەقەکانی قورئانی پیرۆز ئەو دەست تێوەردانە پزیشکی‌یانە ناگرێتەوە (بە پێدانی کۆرتیزۆن و سێرفاکتەنت) بەو کۆرپەلانەی کە پێش شەش مانگی کۆچی لەدایك دەبن، و ئەم ماددانە رۆڵیان هەیە لە مانەوەی کۆرپەلەکەدا کە بە نزیکەی (۲۰٪) دیاری کراوە بۆ ئەو منداڵانەی کە کێشیان لەخوار ۱۰۰۰ گرامەوەیە، ئەویش لەبەر ئەوەیە کە دەقەکانی قورئان جیهانین و بۆ هەموو مرۆڤایەتین و بۆ هەموو کاتێکن، و هەموو گەل و نەتەوەکانی سەر زەوی توانای ئەم تەکنەلۆجیا پێشکەوتووانەیان نی‌یە، و لە رابووردووشدا بابەتی لەو جۆرە بوونی نەبووە.

٣- لەبەرئەوەی ئەو منداڵانەی پێش ٢٥هەفتە لەدایك دەبن (واتە کێشیان لە خوار ١٠٠٠ گرامەوەیە) تووشی نەخۆشی جۆراوجۆر دەبن، وەك: نەخۆشی‌یە درێژخایەنەکانی سی‌یەکان (بە تایبەتی نەخۆشی پەککەری RDS: Respiratory Distress Syndrome)، و هەوکردنی کۆڵۆنی ریخۆڵەیی خوراو (Necrotizing Enterocolitis)، و خوێن بەربوونی ناو مێشك (Intraventricular Hemorrhage) لە پلەی سێیەم و چوارەم، هەندێکیان بەپێی توێژینەوە نوێکان تووشی ئەمانە دەبن: شەلەلی مێشك و بێهێزی جووڵە، یان گیروگرفتیان دەبێت لە ئەندامەکانی بیستن و بینین، دواکەوتنی گەشە کردن، و قسە کردن، و دابەزینی رادەی ژیریی، رێژەی تووش بوون بەم نەخۆشی و دواکەوتنانە بە تایبەتی بۆ منالانی ناو شووشە (خُدَّج) کە کێشیان ئێجگار نزمە لە کاتی لەدایك بووندا (Extremely Low Birth Weight) دەگاتە نزیکەی نیوە تا ٣\٢ی هەموو حاڵەتەکان و نەخۆشی‌یەکان.

٤- ئایەتەکە پەیوەندی نی‌یە بەو حاڵەتە شاز و ناوازانەی کە جار جار روودەدەن و تێ‌یدا کۆرپەلەکە لەنێوان ٢٠-٢٥ هەفتەدا لەدایك دەبێت لەگەڵ نزیکە کامڵ بوونی کۆئەندامی هەناسەی‌دا، ئەمەش وەك زانایان باسی دەکەن پەیوەندی هەیە بە دووچار بوونی دایکی کۆرپەلەکە یان ووێلاشی منالەکە یان کۆرپەلەکە خۆی بۆ ناڕەحەتی‌یەك یان بار گرانی‌یەك.

خاڵێکی گرنگ هەیە کە لێرەدا ئاماژەی پێبدەین ئەوەیە کە دەقەکانی قورئان کە باسی شەش مانگیان کردووە وەك کەمترین ماوەی سکپڕی لەبری باس کردنی نۆ مانگ کە ماوەی ئاسایی‌یە، بریتی‌یە لە دەرخەر و سەلمێنەری ئیعجازی گەورەی قورئان، چونکە شەش مانگ شارراوەترین ماوەی سکپڕی‌یە لەلای عەرەبەکانی ئەو سەردەمە و شتی وایان نەزانیوە پێشتر، تەنانەت هاوەڵەکانیش سەریان سوڕما لە حاڵەتی ئەو ئافرەتەی کە تاوانبار

کرابوو بە داوێن پیسی کە بە شەش مانگی منداڵی بووبوو، کە حاڵەتەکەیان بۆ روون نەبووەوە تەنها بە پشت بەستن نەبێت بە دەقەکانی قورئان کە بە ئاشکرا باسی ماوەی شارراوەی سکپڕی‌یان کردووە، بەهۆی ئەم رووداوانەوە خوای پەروەردگار نەخوێندەواری و نەزانیی کۆمەڵگای عەرەبی ئەو سەردەمە دەردەخات و بەهۆی ئەمەوە گەورەیی و بەرزیی یاساکانی قورئان دەردەکەوێت بەسەر بیروبۆچوونە باوەکانی ئەو سەردەمەدا، و لەمڕۆشماندا دەرخەرێکی ئیعجازی زانستی قورئانە بەپێی دەقی ئایەتی: ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ (فصلت:٥٣).

هەروەها سوودێکی تری باس کردنی شەش مانگ ئەوەیە: کە ئەو ئایەتە قورئانی‌یە لە باسی منەت و گەورەیی دایك و روونکردنەوەی رادەی هیلاکی لە سکپڕی و شیرداندا هاتووە، کە ئێمە پێویست دەکات زۆر باش بین لەگەڵی‌دا و هەمیشە سوپاسگوزاری ببین، خوای گەورە وەسفی ئەو کەسانەی بە چاکە کردووە کە گەورەیی و فەزڵی دایك و باوکی دەزانێت و دوعای خێریان بۆ دەکات: ﴿وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ إِحْسَانًا حَمَلَتْهُ أُمُّهُ كُرْهًا وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا وَحَمْلُهُ وَفِصَالُهُ ثَلَاثُونَ شَهْرًا حَتَّى إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُ وَبَلَغَ أَرْبَعِينَ سَنَةً قَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِي أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ الَّتِي أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَى وَالِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَالِحًا تَرْضَاهُ وَأَصْلِحْ لِي فِي ذُرِّيَّتِي إِنِّي تُبْتُ إِلَيْكَ وَإِنِّي مِنَ الْمُسْلِمِينَ﴾ (الأحقاف: ١٥)، واتە: ئێمە فەرمانمان بە ئادەمیزاد داوە کە چاکەکار و چاك رەفتار بێت لەگەڵ دایك و باوکی‌دا، دایکی بە ئازارەوە هەڵیگرتووە و بەدەم ئێش و ئازارەوە بوویەتی، کە سکپڕبوون و لە شیر بڕینەوەی سی دانە مانگی خایاندووە، هەتا کاتێکیش ئینسان دەگاتە حاڵەتی توند و تۆڵی و توانایی و تەمەنی چل ساڵی (ئەوسا حەق وایە کە ئەم دوعایە بکات) و بڵێت: پەروەردگارا! کۆمەکیم بکە و یارمەتیم بدە تا شوکرانەبژێر و سوپاسگوزاری ئەو ناز و نیعمەتانە بم کە بە من و دایك و

باوکمت بەخشیوە، هەروەها یارمەتیم بدە لەو جۆرە کار و کردەوە چاکانە ئەنجام بدەم کە تۆ پێی رازیت، دواکاریشم چاکە بڕوێنیت لەناو نەوەکانمدا لەبەر قازانجی خۆم (چونکە چاکەی هەر کەس بەشی دایك و باوکی تێدایە) بەڕاستی من گەڕاومەتەوە بۆلای تۆ، تا لە گوناهەکانم خۆش ببیت و من لە موسوڵمانانی گوێڕایەڵ و فەرمانبەردارم.

هەربۆیە ئەگەر سوپاسگوزاری دایك لەسەر ماوەی شەش مانگی سکپڕی پێویست بێت کە کەمترین ماوەیە، ئەوا بۆ ماوەی تەواوی سکپڕی کە ٩مانگە زۆر پێویستترە و دەبێت گەورەتر و باشتر بێت، چونکە دایکەکە تووشی ئەشکەنجە و ناڕەحەتی‌یەکی زۆر زیاتر دەبێت، و دەبێت دوور کەوینەوە لە بچووکترین بێگوێیی بۆ دایك و باوك، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَضَى رَبُّكَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلاَهُمَا فَلاَ تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلاَ تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلاً كَرِيمًا﴾ (الإسراء:٢٣) واتە: پەروەردگاری تۆ بڕیاری داوە کە جگە لەو کەسی تر نەپەرستن، هەروەها بڕیاری داوە کە چاکەکاریش بن لەگەڵ دایك و باوکتاندا، هەر کاتێکیش یەکێکیان یان هەردووکیان بە پیری کەوتنە لای تۆ (تەنانەت) ئۆفیان لەدەست مەکە و هەرگیز پیایاندا هەڵمەشاخێ و هاواریان بەسەردا مەکە، بەردەوامیش قسە و گفتوگۆت لەگەڵیاندا با چاك و جوان و بەجێ بێت.

ئەوەشمان بیرنەچێت کاتێك پەروەردگار باسی شەش مانگی کردووە مەبەست لێی گشتگیری‌یە بۆ هەموو ئافرەتێکی دووگیان، چونکە هەموو ئەوانەی کە منداڵیان دەبێت کۆرپەلەکەیان شەش مانگی تەواو کردووە (چونکە شەش مانگی کەمترین ماوەی دووگیانی‌یە)، بەڵام ئەگەر باسی حەوت یان هەشت یان نۆ مانگی بکردایە ئەوا لەوانە بوو هەندێك ئافرەتی دووگیانی نەگرتایەتەوە، بەم شێوازە پڕ بەلاغەتە ئایەتەکە گشتگیرە و ئیعجازێکی زانستی بێوێنەی تێدایە، کە تێکەڵ دەبێت بە حیکمەتی سوپاسگوزاری بە ڕەوانبێژترینی دەربڕین.

## ٢- ماوەی بەخێوکردن و گۆش گرتن لە منداڵداندا:

لە ئایەتەکانی پێشووەوە بۆمان دەرکەوت کە کەمترین ماوەی سکپڕی بریتی‌یە لە ٦مانگ، بەڵام لە باری ئاسایی‌دا منداڵبوون بەگشتی دوای ٩مانگ دەبێت، کەواتە ئەو سێ مانگەی کە منداڵ دوای پێگەیشتن لەناو منداڵداندا دەمێنێتەوە دەتوانین ناوی بنێین ماوەی بەخێوکردن وگۆش گرتن لە منداڵداندا (فترة الحضانة الرحمية) و ماوەی ئەو ٦مانگە کافی‌یە کە کۆرپەلەکە دوای ئەمە بە زیندوێتی بمێنێتەوە.




وێنەی (٧-١٠): زوربەی کاتی مانەوەی لەناو منداڵداندا کۆرپەلە تەنها لە قەبارەدا زیاد دەکات، وەك لەم وێنانەدا دەبینین کەواتە ماوەی ٦مانگی کۆتایی تەنها ماوەیەکی گۆشگرتنە لەناو منداڵداندا.

لێرەوە دووبارە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەوەی قورئانی پیرۆز بڕیاری داوە و موفەسیرەکان باسیان کردووە هەر ئەوەیە کە زانستی نوێی ئەمڕۆ بڕیاری داوە، کە کۆرپەلە پێش ٦مانگی ناتوانێت بە زیندوویی لەدایك ببێت و

مەحاڵە بتوانێت پێش هەفتەی ٢٤ی ژیانی کۆرپەلەیی هەناسە بدات چونکە کۆئەندامی هەناسەدانی هێشتا بە تەواوەتی گەشەی نەکردووە و توانای کرداری هەناسەدانی نییە، لەو خاڵانەی سەرەوە کە باسمان کرد ئەمانەمان بۆ دەردەکەوێت:

أ- ووردەکاری قورئان لە دیاری کردنی کەمترین ماوەی پێویست بۆ مانەوەی کۆرپەلە لەسکی دایکیدا، کە دوای ئەمە ئەگەر لەدایك ببێت لەوانەیە بە زیندوویی بمێنێتەوە.

ب- دەتوانین سێ مانگی کۆتایی مانەوەی کۆرپەلە لەسکی دایکیدا بە ماوەیەکی گەورە بوون وبەخێو کردن دابنێین لە مناڵدانندا (ماوەی گۆش گرتنی ناو مناڵدان).

٣- لەدایك بوون:

ئەگەر ئێمە بڕوانینە مێژووی کۆرپەلەکە لە کاتی پیتاندنی هێلکەکە لەلایەن سپێرمەوە بۆ کاتی کامڵ بوون و دەرچوونی لە مناڵدانی دایکییەوە دەبینین کە ئەگەر سۆز و بەزەیی پەروەردگار نەبێت ئەوا بەهیچ شێوەیەك نەیدەتوانی لەم مناڵدانەوە بێتە دەرەوە (وێنەی ٧-١١)، ئەویش لەبەر ئەم هۆیانە و چەندین هۆی تریش:

١- بڕێکی زۆر لە ماددەی بەڵغەمی دەرکەی مناڵدانیان گرتووە لە کاتی سکپڕیدا بە مەبەستی پاراستنی کۆرپەلەکە لە هێرشی میکرۆب لە دەرەوە، بەڵام دەبینین پێش هیچ موقەددیمەیەك لە پێش هاتنی کاتی مناڵبووندا ئەم ماددەیە دەکەوێتە خوارەوە.

٢- چەندین هۆرمۆن و ماددەی یاریدەدەر و ماددەی خاوکەر بۆ کۆئەندامی بەرگری دەڕێژرێن کە ڕێ دەگرێت لەوەی کۆرپەلەکە لەلایەن کۆئەندامی بەرگری دایکەکەوە ڕەفز بکرێت و بکرێتە دەرەوە، ئەم ماددانە کارێکی وا دەکەن کە کۆرپەلەکە لە دەوروبەرێکی نەرم و نیان و هێمندا گەشە

کردنی تەواو بکات، کە هەر لەگەڵ تەواو بوونی ئەو ماوەیەدا بە کتوپڕی چەندین گۆڕانکاری لە رێژە و کاریگەریی ئەم هۆرمۆنانەدا روودەدەن و چەندین هۆرمۆنی تر دەڕێژن کە بە هەموویان کارێکی وادەکەن کە کۆرپەلەکە فڕێبدرێتە دەرەوەی مناڵدان و لەدایك ببێت.



وێنەی (٧-١١): لەگەڵ گەورە بوونی کۆرپەلە لەناوسکدا پەستان دەخاتە سەر ئەندامەکانی تری ناولەش!

ماوەی بەخێو کردن و گۆش گرتن لە مناڵداندا بە لەدایك بوونی کۆرپەلەکە تەواو دەبێت، ئەم کردارە لە قورئاندا باس کراوە لەم ئایەتەدا: ﴿ثُمَّ السَّبِيلَ يَسَّرَهُ﴾ (عبس:٢٠)، واتە: پاشان پەروەردگار رێگا بۆ کۆرپەلەکە خۆش دەکات بۆ ئەوەی لەدایك ببێت، لە ماناکانی ئەم ئایەتە رێگا ئاسان کردنە بۆ کۆرپەلەکە لەکاتی لەدایك بووندا، چونکە رێڕەوی مندالبوون لە حاڵەتی ئاساییدا زۆر ئەستەمە کۆرپەلە بتوانێت پێیدا تێپەڕێت (تیرەی سەری کۆرپەلەکە لە کاتی لەدایك بووندا ١٢سم دەبێت کە سێ ئەوەندەی تیرەی ئاسایی رێڕەوی زێی ئافرەتە)، بەڵام چەندین فاکتەر هەیە کە دەبنە ئاسان کردنی کرداری لەدایك بوون (بڕوانە وێنە رەنگاورەنگەکانی: ١٥٩/هـ، ١٦٠/هـ، ١٦١/هـ).

لە راستیدا لەدایك بوونی منداڵ بەو قەبارە و بارستاییە (کە دەگاتە ٢,٥-٤,٥کغم) بەناو ئەو رێڕەوە تەسك و پێچاو پێچ و باریکەدا خۆی لەخۆیدا کارێکی زۆر سەرسوڕهێنەر و موعجیزەیەکی خوداییە، چونکە دەرکەی دەرەوەی مناڵدان لە حاڵەتی ئاساییدا داخراوە، و زێ و رێڕەوی

منداڵی ئافرەت لە غەیری کاتی منداڵبووندا زۆر بچووکن لەچاو قەبارەی منداڵی تازەبوودا، کێیە وا لەم ڕێژەوانە دەکات کە ئەوەندە فراوان ببن بەشی ئەوە بکات منداڵێکی تازەبووی پێدا تێپەڕێت؟ ئایا ئەم کردارە چۆن ڕوودەدات؟ ئەمانە نهێنی خوداین کە ئێمە کەمێکیمان لێزانیوە و زۆری هێشتا هەر بە نهێنی ماونەتەوە (وێنەکانی: ٧-١٢ ، ٧-١٣).




وێنەی (٧-١٢): ماسولکە و بەستەرە شانەی لەناو ئەم سنوقە ئێسکییە تۆکمەیەدا بەهێز منداڵدان لە شوێنی خۆیدا جێگیر دەکەن؛ کۆرپەلە دەپارێزرێت و گەشە دەکات.




لەم وێنانەدا دەبینین کە چۆن منداڵدان لەو قەبارە بچووکەیەوە لە حاڵەتی ئاساییدا دەگاتە ئەو قەبارە ئێجگار گەورەیە، ئەویش تەنها بۆ ئەوەی لانکەی ڕەحەتی جێگیر بوونی کۆرپەلەکە بێت.

لێرەدا پێم باشە کەمێك لەو نهێنی‌یانە باس بکەین کە دەبنە هۆی ئاسان کردنی پرۆسەی منالبوون و هاتنە دەرەوەی کۆرپەلەکە:

بەپشت بەستن بەو زانیاری‌یە نوێ‌یانەی رۆژگاری ئەمرۆ دەتوانین کاری هەریەکێك لەم فاکتەرانەی خوارەوە لە کرداری منالبووندا دیاری بکەین:




وێنەی (٧-١٤): شوێنەوارەکانی گەورەبوونی منالدان لەسەر سك بەپێی تەمەنی کۆرپەلەکە روون دەکاتەوە.

أ- هۆرمۆنەکان: لە مانگەکانی کۆتایی سکپڕی‌دا هۆرمۆنە مێینەیی‌یەکان بە خەستی‌یەکی زۆر لە خوێنی دایکەکەدا دەبینرێت، ئەم هۆرمۆنانەن کە فاکتەری سەرەکیی مانەوەی سکپڕین و ئاسانکەری منالبوونن، هۆرمۆنی تریش لە چەند شوێنێکی جیاوازەوە دەڕێژرێن و دەبنە هۆی ئاسان بوونی منالبوون، لەو شوێنانە: وێلاشی منداڵەکە، منداڵەکە خۆی جا ئەگەر کوڕ بێت یان کچ، هێلکەدانی دایکەکە و هەندێکی تریشیان لە رژێنی سەر گورچیلە و ژێرمێشکە رژێنەوە دەردەدرێن.

یەکێك لەو هۆرمۆنە گرنگانە بریتی‌یە لە: هۆرمۆنی (ریلاکسین Relaxine) کە هۆرمۆنێکە هەردوو هێلکەدانی دایکەکە و وێلاشی منداڵەکە دەری دەدەن، دەبێتە هۆی خاوبوونەوەی بەستەرەکانی جومگەکانی ئێسکەکانی حەوزی دایکەکە، و نەرم کردنی ملی منالدان و ناوچەی زێ و ئامادە کردنیان بۆ فراوان بوون، هەروەها دەبنە هۆی خاوبوونەوەی ماسولکە خۆویستەکانی کۆئەندامی هەرس و میزەڕۆ وەکو کارێکی لاوەکی، پاش لەدایك بوون و بەهۆی شیردانی دایك بۆ منداڵەکەی هۆرمۆنی شیردان

(پرۆلاکتین Prolactin) لە ژێرمێشکە رژێنەوە دەردەدرێت و دەبێتە هۆی ئەوەی کە منالّدان و ئەم ماسولکە و جومگە و بەستەرانە بگەڕێنەوە باری ئاسایی خۆیان لە کاتی شیرداندا.

ب- کرژ بوونەکانی منالّدان (تقلصات الرحم Uterine Contractions): لە بەشی سەرەوەی منالّدانەوە دەست پێدەکات، ئەم بەشە پێك هاتووە لە ماسولکەی بەهێزی جووڵاوی گرژ بوو کە هێزی پێویست دروست دەکەن بۆ پاڵ پێوەنانی کۆرپەلەکە بە بەشی خوارەوەی منالّداندا کە بەشێکی نەرم و وەستاوە، ئەم کرژبوونانە لەگەڵ نزیك بوونەوەی منداڵبووندا ژمارەیان زیاد دەکات و ماوەی نێوانیان کورت دەبێت، ئەم کرژبوونانە دەبنە هۆی پاڵ پێوەنانی سەری منداڵەکە (لەحاڵەتی لەدایك بوونی ئاساییدا منداڵەکە سەر بەرەو خوارە لەسکی دایکیدا) بەرەو ناوچەی ملی منالّدان و زێ و دەبێتە هۆی فراوان بوونیان (**بڕوانە وێنەی: ٧-١٥**).

ج-پەردەکانی دەوری کۆرپەلەکە: بریتی‌یە لەو توورەکە ئەمینیۆنی‌یە ئاوی‌یەی کە چواردەوری کۆرپەلەکەی داوە و یارمەتی خلیسکاندنی کۆرپەلەکە دەدات، ئەم پەردانە کە پڕن لە شلەنی‌یەکی کەمێك خەست لەسەر شێوەی توورەکەی ئاوین و لەکاتی کرژ بوونی منالّداندا لەناو ملی منالّدانەوە دەردەپەڕن و یارمەتی کشان و گەورە بوونی ئەم ناوچەیە دەدەن، ئەم پەردانە دوای ئەوەی کە دەدڕێن دەبنە ڕێڕەوێکی نەرمی پاراو بۆ ئەوەی کۆرپەلەکە بەسەریاندا بخلیسکێت بۆ دەرەوەی منالّدان.

د- ماسولکەکانی لەشی دایکەکە: ڕۆڵێکی گەورەیان هەیە لە ئاسان کردنی منالّبووندا، بە تایبەتی: ماسولکەکانی پەردەی ناوپەنچك، ماسولکەکانی پشت، ماسولکەکانی پێشەوەی سك و ماسولکە بەهێزەکانی ناوچەی حەوز کە لەگەڵ گرژ بوونیاندا پاڵ بە منداڵەکەوە دەنێن بۆ ئاسان بوونی چوونە دەرەوەی لە منالّدان و لەدایك بوونی.

وێنەی (٧-١٥): ئەم هێلکارییانە پرۆسەی لەدایك بوونی کۆرپەلە روون دەکاتەوە، پاش دابەزینی سەری و فشار خستنە سەر ملی منداڵدان و ڕێڕەوی لەدایك بوون چەند کردارێکی سووڕانەوە و خول خواردن ئەنجام دەدات و بە یارمەتی گرژ بوونەکانی منداڵدان سەرە نجام لە ڕێڕەوی تەسکی منداڵبوونەوە دێتە دەرەوە.

*The position of the baby in the womb prior to labour can influence the sort of birth you have. The most common position is the cephalic presentation in which the part of the baby that will be born first — the presenting part — is the head. If the baby is in the breech position (buttocks first), the doctor will give you a pelvic examination to determine whether or not the baby should be delivered by Caesarian section. If the baby is in the cephalic position but facing forward (posterior presentation — right), the bony skull will press against your sacrum and this can cause back pain and result in an erratic and prolonged labour.*

*During the last four weeks of pregnancy, the presenting part engages in the pelvic cavity ready for birth. When labour starts — no one knows quite why — the tough, fibrous cervix must first soften and thin out, a process known as effacement. Uterine contractions then continue to widen the cervix.*

*This is called dilatation of the cervix and it is measured in centimetres — at ten centimetres (four inches) the cervix is said to be fully dilated. You are then at the end of the first stage of labour and ready to push the baby out into the world. Medical staff will calculate the extent of dilatation by internal examination at regular intervals throughout your labour.*






*During effacement the cervix thins out and is drawn up around the baby's head. Pushing at this stage may damage the cervix.*

*When effacement is complete, further contractions dilate the cervix. You can now help your baby on its way by pushing.*

*When the cervix is fully dilated, the baby moves down through the pelvis. A mirror will allow you to see your baby's head.*

*The head rotates so that the baby is born facing the mother's rectum. It turns again to the side before the shoulders and body are born.*

لەدایك بوونی کۆرپەلە خۆی لەخۆیدا بە ٤ قۆناغدا دەڕوات:

١- قۆناغی فراوان بوونی ملی منالّدان و گرژ بوونی ماسولکەکانی منالّدان: کە وەك پێشتر ووتمان چەندین فاکتەر هەیە رۆڵ لەم کردارەدا دەبینن، ئەم قۆناغە (٧-١٢) سەعات دەخایەنێت.

٢- قۆناغی هاتنە دەرەوەی کۆرپەلەکە: کە ئەمیان نزیکەی (٣٠-٥٠) خولەك دەخایەنێت، رێڕەوی منالّدان ئەوەندە فراوان دەبێت کە بواری کۆرپەلەکە بدات بەناویدا بڕوات.

٣- قۆناغی هاتنە دەرەوەی وویلاّش: کە پاش هاتنە دەرەوەی منداڵەکە وویلاّشیش بەدوایدا دێتە دەرەوە و پاش خۆی کلۆیەك خوێنی مەییو دروست دەبێت، ئەم قۆناغە (١٥خولەك) دەخایەنێت.

٤- قۆناغی گرژبوونی منالّدان: بە مەبەستی کەم کردنەوەی خوێن بەربوون پاش هاتنە دەرەوەی وویلاّش گرژبوونێکی بەهێزی منالّدان روودەدات، کە دەتوانرێت لە بەشی خوارەوەی سکی دایکەکەدا وەك تۆپێك هەستی پێبکرێت، ئەم قۆناغە لەوانەیە بۆ ماوەی (٢سەعات) بەردەوام بێت.

ه- قەبارەی کۆرپەلەکە وەك ووتمان زۆر گەورەترە لە قەبارەی دەرکەی منالّدان، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە کرداری دەرچوونی کۆرپەلەکە پرۆسەیەکی زۆر قورس و ناڕەحەت و بە ئازارە، و ئەوەی کە ئەم کردارە ئاسان دەکات بریتییە لە بەرز بوونەوەی رێژەی هەندێك هۆرمۆنی هێمن کەرەوە لە خوێندا، کە ئەگەر بەهۆی ئەمانەوە نەبووایە ئەوا دایکەکە و کۆرپەلەکەی بەرگەی ئەو فشارە زۆرەیان نەدەگرت کە لە ئەنجامی پرۆسەی هاتنە دەرەوە و لەدایك بووندا دروست دەبێت.

ووتەیەکی (د. لارس هامبێرگەر) ئەم حاڵەتەمان زۆر بە جوانی بۆ وێنە دەکات کە دەڵێت: (هیچ کاتێك لەوەودوا لە ژیانی منداڵەکەدا ئەوەندە هۆرمۆنی دژە ئازار لە لەشیدا ناڕژێنرێت، کە ئەمە رادەی ئازاری لەدایك

بوونمان بۆ دەردەخات، و هەروەها رادەی ئامادەباشی کۆرپەلەکەشمان بۆ ئەم ئازارە سەختە بۆ دەردەخات)[11].



Fig. 1.16 The fetal skull. Superior and lateral views

وێنەی (٧-١٦): ئێسکەکانی کەللەی سەری کۆرپەلە کە لە کاتی لەدایك بووندا بەسەر یەکدا دەخزێن.

**میکانیزمی لەدایك بوون:**

باری کۆرپەلـە لـەکاتی رۆیشـتنی بەناو بۆشایی حـەوزدا کـە شێوەیەکی نـا رێـك وپێکـی هەیـە دەگۆڕێـت، بـە مەبەستی ئاسان بوونی رۆشتنی بەناو ئـــەم قەفـــەزە ئێســـکی‌یەدا، ئـــەو گۆڕانکاری‌یانەی دێت بەسەر شوێن و باری لەشـی کۆرپەلەکـەدا بـریتین لـە: هاتنـــە خـــوارەوە، پـــێچ خـــواردن، ســـووڕانەوەی نـــاوخۆیی، درێـــژ بوونەوە، وەرگرتنـەوەی باری ئاسـایی لـەش، پاشـان سـووڕانەوەی دەرەکـی، ئەم کردارە سەرەکی‌یانەی کـە باسمـان کـرد بەچـەندین شـێوە دەبنــە هــۆی ئاسان کردنی رۆیشتنی کۆرپەلـە بەناو رێـڕەوی منالبووندا و پاشـان لـەدایك بوونی بەشێوەیەکی ئاسایی (**وێنەی ٧-١٧**)، کردارێکی گرنگی تر بریتی‌یـە لـە خلیسـکانی ئێسـکەکانی کەللـەی سـەری منداڵەکـە بەسـەر یەکدا (ئـەم کـردارە تەنها لەکاتی منالبووندا روودەدات) کـە دەبێتـە هۆی چوونەوەیەکی کەللـەی سەر و بچووك بوونەوەی قەبارەکەی لەکاتی منالبووندا (**وێنەی ١٦-٧**).

ئەمانە هەمووی چەندین فاکتـەری جۆراوجـۆرن بـۆ ئاسـان کردنـی کرداری رۆیشـتنی کۆرپەلەکـە بـەناو رێـڕەوی لـەدایك بوونـدا و هاتنـە نـاوەوەی بـۆ

(11) لە کتێبی منالێك لەدایك بوو (**A Child is Born**)دا / لاپەڕە ١٥١.

دونیایـەکی فراوانـی تـری نەناسـراو بـۆی، بەڕاسـتی پـەروەردگار راسـتی فەرمووە: ﴿ثُمَّ السَّبِيلَ يَسَّرَهُ﴾.

لە ئایەتێکی تری قورئاندا ئاماژە بۆ ئەم کرداری لەدایك بوونە کراوە کە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾ (النساء:١)، واتـە: ئەی خەڵکینە لە خوا بترسن و پارێزگاری بکەن لە سزای خودا، ئەو کەسەی کە ئێوەی لە یەك نەفسەوە (کە ئادەمە) دروستکردووە، پاشان هەر لەخۆی خێزانیشی بۆ دروست کرد (کە دایکە حەوایـە)، و دوایـی لـە نەوەکانیانـەوە (بـەهۆی ژنهێنـان و زاووزێ و منداڵبوونەوە) ژمارەیەکی زۆر پیاو و ئافرەتی لێخستنەوە ........

دەتوانین بڵێین (بَثَّ) کە بە مانای پەخش کردن دێت مەبەست پـێی کاتی لەدایك بوونی منداڵە، چونکە دروستکراوێکی نوێ لە دایکەکەوە جیادەبێتەوە و دەبێت بە زیندەوەرێکی سەربەخۆ، مەبەست لە (رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاء) بریتییە لە نێر و مێ بە ڕەهایی نەك بە تەنها پیاو و ئافرەتی پێگەیشتوو، حیکمەتێك لە جیاوازی دەربڕینەکەدا بۆ نێر و مێ، کە دوای ووشەی (رِجَـالاً) وەسفی (كَثِيرًا) هاتووە، مەبەست پـێی (خواش باشتر دەزانێت) بریتییە لە تەئکید کـردن لـە زۆری ژمـارەی رەگـەزی نێرینـە لـە کـاتی لـەدایك بوونـدا لـە چـاو مێینەکاندا، کە موبالەغەیەکی ئاشکرایە لە ئایەتەکەدا کراوە.

ئـەم ئایەتـە ڕێـژەی جـۆر (نسـبة النـوع) لـە کـاتی لـەدایك بوونـدا روون دەکاتەوە، ئەمەش خۆی لەخۆیدا ئیعجازێکی زانستییە چونکە پێشکەوتنی زانسـتی و ئامـارە پزیشـکییەکان لـەمڕۆدا هـەمان ووتـەیان هەیـە، کـە دەرکەوتووە ئەمە سوننەتێکی خواییە لە دروستکراوەکانیدا و راستییە زانستییەکان سەلماندوویانە، کە لە کاتی لەدایك بووندا ژمارەی نێرینە لە ژمارەی مێینە زیاترە بە ڕێژەی ١,٠٥ بۆ ١، واتە هەموو ١٠٥ لەدایك بوویەکی نێرینـە بەرامبـەر ١٠٠ لـەدایك بـووی مێینەیـە، ئـەم جیاوازییـەش خـۆی

لەخۆیدا حیکمەتێکی خودایی‌یە، چونکە بینراوە لە ساڵی یەکەمی دوای لەدایك بووندا چانسی ژیانی منداڵە مێینەکان باشترە لەچاو منداڵە نێرینەکاندا، کە ئەمە وادەکات رێژەکە ببێتەوە بە ١ بۆ ١ (واتە ١٠٠ نێرینە بەرامبەر ١٠٠ مێینە لە کاتی پێگەیشتنی جنسیدا).




وێنەی (٧ - ١٧)

ئەم وێنانە لەدایك بوون و رۆشتنی کۆرپەلە بەناو رێڕەوی منداڵبووندا روون دەکاتەوە، کە بە زاراوەی ئیسلامی بە (تَيسِير السَّبِيل) ناوبراوە:

A, B: فراوان بوونی ملی منداڵدان لە قۆناغی یەکەمی پرۆسەکەدا.

C, D, E: رۆشتنی کۆرپەلەکە بەناو رێڕەوی منداڵبوون و زێدا لە قۆناغی دووەمی لەدایکبوون.

F: گرژ بوونی منداڵدان لە قۆناغی سێیەمی لەدایك بووندا و فڕێدانی وویلاش بۆ دەرەوە.

ئەمەش باشترین گەرەنتی یە بۆ مانەوەی جۆری مرۆڤ بە یەکسانی، بەڵام لە تەمەنە گەورەکاندا ئەم ڕێژەیە پێچەوانە دەبێتەوە، کەواتە ئایەتە پیرۆزەکە سوننەتێکی خودایی دەربارەی دروست بوون روون دەکاتەوە، کە بریتی یە لە زۆری ڕێژەیی ژمارەی نێرینەکان لە چاو مێینەکاندا لەکاتی لەدایك بووندا، کە خۆی لەخۆیدا حیکمەتی ئەم جیاوازی یە بریتی یە لە پاراستنی جۆرەکان بە وویستی پەروەردگار، و گەرەنتی کردنی ئاوەدان کردنەوەی زەوی لەلایەن مرۆڤەوە بە بەردەوامی.




**وێنەی (٧-١٨):** چەند دیمەنێکی راستەقینەی هاتنە دونیای مرۆڤێك و دروستکراوێکی نوێ.

**کورتە:**

لەمانەی سەرەوە بۆمان روون بووەوە کە وشەی (أَنشَأْنَاهُ) بەو شێوەیەی کە لە قورئاندا بەکار هاتووە هەموو ئەو گۆڕانکاری‌یە ئاشکرایانە دەگرێتەوە کە بەسەر شکڵی دەرەوە و پێکهاتەی ناوەوەی کۆرپەلەکەدا دێت لە کاتی قۆناغی شەشەمی گەشەکردنی کۆرپەلەی مرۆڤدا.

هەر سێ ماناکەی وشەی (نشأة) زۆر بە ووردی و ئاشکرا بەسەر ئەم قۆناغەدا دەچەسپێت، بەمانای دەستی پێکرد (بدأ) وەسفی سەرەتای کاری ئەندام و سیستەمە جۆراوجۆرەکانی لەش دەکات، دەبینین گورچیلەکان دەستیان کردووە بەکار و دروست کردنی میز، مۆخی ئێسقانیش دەستی کردووە بە دروست کردنی خڕۆکەکانی خوێن کە پاشان لە هەفتەی دوانزەوە سپڵیش دەست دەکات بە دروست کردنی، و سەلکەکانی موو دەست دەکەن بە پەیدا بوون لە هەفتەی دەیەمدا.

بە مانای گەشەی کرد (نما) ئەو گەشە کردنە خێرا و هەمەلایەنەمان بۆ روون دەکاتەوە کە لە هەموو ئەندامەکان و کۆئەندامەکانی لەشی کۆرپەلەکەدا روودەدەن لەم ماوەیەدا، بۆ نموونە: کێشی کۆرپەلەکە دەبێت بە ٣٤٠٠ گرام لە کۆتایی سکپڕی‌دا پاش ئەوەی کە کێشی تەنها ٨ گرام بووە لە هەفتەی نۆیەمی سکپڕی‌دا (واتە زیاد کردنێکی سەرسوڕهێنەر کە دەگاتە ٤٠٠ ئەوەندە!)، بە هەمان شێوەش هەموو ئەندامەکانی کۆرپەلەکە گەشە دەکەن.

مانای سێیەم: بەمانای بەرز بووەوە و سەرکەوت (إِرْتَفَعَ و رَبَا) وەسفی ئەو زیادبوونە خێرا و بەرچاوەمان بۆ دەکات کە لە درێژی و کێشی کۆرپەلەکەدا روودەدات، و لە هەفتەی دوانزەیەمەوە دەست پێ‌دەکات، ئەوەیە کە کۆرپەلەکە لە سەرەتای سکپڕی‌دا تەنها بارێکی سووکبووە (لە قۆناغەکانی: نوتفە و عەلەقە و گۆشتپارە و ئێسك و ماسولکەدا)، بەڵام ئێستا ئەم حەملە دەستی کردووە بە گەشە و بەرز بوونەوە و بووە بە بارێکی

قورس، ئەمەش ئەو ڕاستی‌یەیە کە ئایەتێکی قورئان ئاماژەی بۆ داوە کە دەفەرموێت: ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَجَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا لِيَسْكُنَ إِلَيْهَا فَلَمَّا تَغَشَّاهَا حَمَلَتْ حَمْلاً خَفِيفًا فَمَرَّتْ بِهِ فَلَمَّا أَثْقَلَت دَّعَوَا اللَّهَ رَبَّهُمَا لَئِنْ آتَيْتَنَا صَالِحاً لَّنَكُونَنَّ مِنَ الشَّاكِرِينَ﴾ (الأعراف:١٨٩)، واتە: خوا ئەو زاتەیە کە ئێوەی لە یەك نەفس و یەك شت دروست کردووە و هەر لەویش جووتەکەی بەدی هێناوە، بۆ ئەوەی ئارامی لەلا بگرێت، جا کاتێك پیاوەکە چووە لای هاوسەرەکەی ئەویش سکی پڕبوو بە کۆرپەلەیەکی سووك (لە سەرەتادا)، و ئافرەتەکەش تێپەڕی کرد بەو ماوەیەدا[12]، ئینجا کاتێك کە باری (سکپڕی‌یەکەی) بەرەو قورسی و سەنگینی دەچێت ئەو ژن و مێردە لەخوا دەپاڕێنەوە و دەڵێن:

(12) ئەو ئامرازی (هاء)ی لە (بە)ی ئایەتی (فَمَرَّتْ بِهِ)دا هاتووە دەگەڕێتەوە بۆ سکپڕی و حەملەکە (حَمْلاً خَفِيفًا)، ووشەی (مَرَّتْ) لە ئایەتەکەدا بە مانای (اسْتَمَرَّت) واتە بەردەوام بوون دێت، (إبن كثير) دەڵێت: (قال مجاهد: استمرت بحمله. وروي عن الحسن وابراهيم النخعي والسدي نحوه) واتە: چەندین زانای تەفسیر ئەو ڕایەیان هەیە کە بە مانای بەردەوام بوونی ئەم سووکی‌یە بۆ ماوەیەك دێت، کەواتە لە ئایەتەکەوە ئەو تێدەگەین کە ئافرەتی دووگیان ماوەیەك بەو سکپڕی‌یە سووکەوە دەمێنێتەوە، کە ئەمە ئاماژەیەکی ئیعجازی‌یە لە ئایەتەکەدا، چونکە ئەم شتە بۆ خەڵکی ئاشکرا نەبووە لە پێشتردا، و زانینی سکپڕی لە هەفتەکانی سەرەتادا تا ئەم دواییانە ئاشکرا نەبووە، و خەڵکی وایان دەزانی کە ئەو کاتە ئافرەتەکە دووگیان دەبێت یەکسەر سکی بەرز دەبێتەوە و قورس دەبێت، هەربۆیە وەك لە ئایەتەکەدا هاتووە ئەو کاتە لە پەروەردگار دەپاڕانەوە کە ئافرەتە دووگیانەکە قورس دەبوو بە سکپڕی‌یەکەی (فَلَمَّا أَثْقَلَت دَّعَوَا اللَّهَ رَبَّهُمَا لَئِنْ آتَيْتَنَا صَالِحاً لَّنَكُونَنَّ مِنَ الشَّاكِرِينَ)، ئەوەی کە شایەتیش لەسەر ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە دەدات بیردۆزی دروست بوونی پێشتر و کامڵ بووە، کە وای دادەنێت کۆرپەلە بە بچووك کراوەیی لەسەری سپێرم یان لەناو هێلکەدایە!! کە تا سەدەی هەژدەیەمی زایینی ڕەواجی تەواوی هەبوو، ئەم بیردۆزە وای دانانێت کە پێویست بە تێپەڕ بوونی ماوەیەك بکات تا سکپڕی قورس ببێت بەڵکو یەکسەر دوای سکپڕی منداڵی ناو سپێرمەکە دەست دەکات بە هەڵاوسان و گەورە بوون و سکپڕی‌یەکە قورس دەردەکەوێت، لەمەوە تێدەگەین کە ئایەتە پیرۆزەکە دەست پێشخەری کردووە لە باس کردنی بەردەوام بوونی سکپڕی سووك بۆ ماوەیەك (کە چەند هەفتەیەك دەخایەنێت) لە کاتێکدا کە خەڵکی هیچ زانیاری‌یەکیان لەم بارەوە نەبووە.

خوایە سوێند بەتۆ ئەگەر منداڵێکی باش و بێعەیبمان پێببەخشیت، ئەوە بە ڕاستی لە سوپاس گوزارانی تۆ دەبین.

ئیمـامی (إبـن کـثیر) زۆر بـەجوانی ئەمـەی روون کردووەتـەوە لـە تەفسیرەکەیدا و دەڵێت: ﴿حَمَلَتْ حَمْلاً خَفِيفًا﴾ واتـە لـە سـەرەتای سـکپڕیدا کە ئافرەتەکە هیچ جۆرە ئازاری پێوە نابینێت کە بریتین لە (نوتفە پاشان عەلەقە و پاشان گۆشتپارە)، بەڵام ڕاستتر ئەوەیە کە بۆ قسەکەی (إبن کثیر) قۆناغـەکانی (ئێسـك و ماسـولکە)ش زیـاد بکـەین چـونکە هـەموویان پـێش قۆنـاغی گەشـە کـردن و زیـادبوون دێـن، لـە ڕاستیشـدا درێـژی کۆرپەلەکـە (Crown Rump length) لە هەفتەی نۆیەمدا تەنها (٥٠ملم) دەبێت، کە پاشان زیاد دەکات بۆ زیاتر لە حەوت ئەوەندە و لە کۆتایی سکپڕیدا دەگاتە نزیکەی (٣٦٠ملم) (بڕوانە وێنەی ٧-١٩).

کەواتـە بۆمـان روون بـووەوە کـە زاراوەی (نشـأة) بـە تـەواوەتی و بـە شێوەیەکی وورد و گونجاو وەسفی قۆناغی کۆرپەلـەیی (المرحلـة الجنينيـة Fetal period) دەکات.

لێرەشدا پرسیارێك دێتە کایەوە کە ئایا بۆ پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ثُـمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ﴾ واتە: ئێمە دەیکەین بە دروستکراوێکی تر؟

لـە وەڵامـدا دەڵێین: ئـەو ئایەتـە پیرۆزە کاتێك باسـی دروسـتکراوێکی تـر دەکـات، بەڵگەیـە لەسـەر بـوونی قۆنـاغێکی نـوێ بـۆ کۆرپەلەکـە کـە سـیفاتی جیاواز و جیاکـەرەوەی تایبـەتی هەیـە لـە قۆناغـەکانی پـێش خـۆی، ئـەویش لەبەر ئەم هۆکارانە:

١- زۆر گرانـە کـە کۆرپەلـەی مـرۆڤ لـە قۆناغـەکانی پـێش (نشـأة)دا لـە کۆرپەلەی زۆرێك لە گیاندارانی تر جیابکرێتەوە، کە بەهۆی ئەو کرداری وێنە پێدانەی کە فریشـتەکە بۆی ئـەنجام دەدات لـە کۆرپەلـەی زینـدەوەرەکانی تـر جیاواز دەبێت و وێنەی جیاکەرەوەی مرۆیی وەردەگرێت.

٢- کۆرپەلەکە لەم کاتەدا زۆر چالاك دەبێت (کە دایکەکە هەست بە جم وجووڵی دەکات) پاش ئەوەی کە پێشتر بارستەیەکی وەستاو بووە، لەم قۆناغەدا ئەندامەکانی ناوەوەی کۆرپەلەکە دەست بەکار دەکەن و کۆرپەلەکە خۆیشی دەست بە جووڵە دەکات.

٣- ئەم قۆناغە بە دیاردەیەکی نوێ جیادەکرێتەوە، کە بریتی‌یە لە: دیاردەی گەشەی ئەندامەکان و ئامادە کردنیان بۆ هەستان بە کارەکانیان، پاش ئەوەی لە قۆناغەکانی پێشتردا دەستی بە دروست بوون کردووە.

کەواتە قۆناغی داهاتوو بریتی‌یە لە قۆناغی گەشە کردن بەڵام قۆناغی پێشتر بریتی بووە لە قۆناغێکی دروست بوون، کە ئەم دووانە زۆر جیاوازن لە یەکتری لە ووردەکاری‌یەکانیاندا.

پاش لەدایك بوون و هاتنە دەرەوەی منداڵەکە و پاش بڕینی ناووکە پەتك کە پێشتر ئەو ڕێڕەوە بووە کە کۆرپەلەکە پشتی پێ‌دەبەست بۆ دەسخستنی خۆراك و ئۆکسجین، ئیتر لێرەوە قۆناغێکی تری ژیان دەست پێ‌دەکات، پاك و بێگەردی بۆ ئەو پەروەردگارەی کە دەفەرموێت: ﴿وَقُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ سَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ فَتَعْرِفُونَهَا وَمَا رَبُّكَ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ (النمل:٩٣).

لە سەدەکانی رابوردوودا فیکری ڕۆژئاوایی لە جەنگێکی بەهێزدا دەژیا لە نێوان ئاین و زانستدا کە تاوەکو ڕۆژگاری ئەمڕۆمان ئەو جەنگە هەر بەردەوامە، زۆر ئەستەمە بیریارێکی ڕۆژئاوایی ئەو بۆچوونە قبوڵ بکات کە ئاین و زانست یەکدەگرنەوە لەبەر ئەوەی لە تەوراتی ئێستادا (کە پیرۆزە لەلای گاورەکان) هاتووە:

ئەو دارەی کە ئادەمی باوکی مرۆڤایەتی لێ‌ی قەدەغە کرا بیخوات بریتی بوو لە داری زانست و زانین!! بەڵام کە ئەو سەرپێچی کرد و لە بەری دارەکەی خوارد بەرچاو ڕۆشن بوو!




**Figure 9-1.** Development begins at fertilization, about 14 days after the onset of the last menstruation. On a daily basis, the nutfah stage, involving cleavage of the zygote in the uterine tube and implantation of the blastocyst, and the lakhliq stage, involving early development of the embryo until the 8th week, are shown. Development in the fetal or nash'ah stage is shown in weeks 9 and 10. Finally, the growth in the nash'ah stage is shown for the remainder of the pregnancy. (Reproduced with permission from Moore, Keith L., *The Developing Human, Clinically Oriented Embryology*, 4th edition, W.B. Saunders Co., Philadelphia, 1988)

ئەوەبوو لە سەدەکانی ناوەڕاستدا کاتێك کە زانست و زانیاری لەوپەڕی برەودا بوو لە وڵاتە ئیسلامی‌یەکاندا، و ئەم زانستە وردە وردە بۆ ئەورووپا دەگوێزرایەوە، سەرانی کڵێسا و قەشەکان ئەم زانستانەیان بە یەکەم تاوانی مرۆڤ دادەنا (بە پشت بەستن بە دەقەکانی تەورات کە ئادەم بەهۆی خواردنی داری زانیاری‌یەوە خودا لێی تووڕە بوو و لە بەهەشت کردی‌یە دەرەوە!)، و ئەوەبوو رەتیان دەکردنەوە و دەیانوت دەبێت بدرێتەوە بەسەر موسوڵمانانندا، و قەدەغەیان کرد لەسەر شوێنکەوتووانیان کە بەم کارەوە سەرقاڵ ببن، بەڵام هەرچۆنێك بوو چرای زانست و زانیاری لە ئەورووپادا نەکوژایەوە و زیاتر درەوشایەوە و پەرەی سەند، تاوەکو لە کۆتایی‌دا بۆچوونە زانستی‌یەکان بەسەر بیروباوەڕەکانی کڵێسادا سەرکەوتن.

کاتێکیش زانایانی زانستە تاقیکاری‌یەکان جڵەویان گرتە دەست و گرەویان بردەوە لە ئەورووپادا، ویستیان کە تۆڵە بسەننەوە لە سەرانی کڵێسا بە کاردانەوەیەکی پێچەوانە، ئەوەبوو بە تێکڕا ئاینیان رەت کردەوە و هەوڵیاندا کە بۆچوونە ئاینی‌یەکانی کڵێسا لە ریشەوە هەڵتەکێنن، و زیادڕەوی زۆریان کرد و توانیان کە کڵێسا لە تەسکترین بازنەدا گیربدەن، هەر لەبەر ئەمەیە کە ئەگەر لەگەڵ رۆژئاوایی‌یەك دەربارەی ئاین و زانست بدوێیت یەکسەر دەڵێت: تۆ چی دەڵێیت، چۆن ئاین و زانست یەکدەگرنەوە؟!

ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە ئەوان تەنها ئاینی دەستکاری کراوی جوولەکە و گاوریان ناسیوە، و ئیسلامیان نەناسیوە، و نازانن کە ئیسلام رێزی تەواوی لە زانایان ناوە و خوای گەورە لە قورئانەکەی‌دا پاش خۆی و فریشتەکانی زانایانی کردووە بە شایەت لەسەر تاك و تەنهایی پەروەردگاری ئاسمان و زەوی کە دەفەرموێت: ﴿شَهِدَ اللَّهُ أَنَّهُ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ وَالْمَلاَئِكَةُ وَأُوْلُواْ الْعِلْمِ ...﴾ (آل عمران:١٨)، هەروەها دەفەرموێت: ﴿فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ ...﴾ (محمد:١٩)،

واتە: بزانە بۆ ئەوەی بۆت دەرکەوێت کە پەروەردگار تاك و تەنهایە (کەواتە بە زانیاری و وەرگرتنی زانست مرۆڤ فێری یەکتاپەرستی دەبێت).

هەروەها ناشزانن ئەو سیفەتەکەی کە بەهۆیەوە خوای گەورە ئادەمی رێزدار کرد بەسەر فریشتەکاندا بریتیبوو لە سیفەتی عیلم و زانیاری، و هەروەها ناشزانن کە چیرۆکی ئادەم لای ئێمە بە پێچەوانەی ئەوەیە کە لای ئەوانە (ئەویش لەبەر ئەوەی کە دەستکاری تەورات و ئینجیلیان کردووە)، زانست هۆکاری رێزلێنانی ئادەم بوو نەك هۆکاری دەرکردنی، ئەمەش ئەو راستییەیە کە قورئانی پیرۆز ئاشکرای کردووە، هەربۆیە کاتێك کە دەیان دوێنیت دەربارەی ئاین و زانست وادەزانن باسی شتێکی هاوشێوەی ئاینەکەی خۆیان و هەڵوێستی قەشەکانیان دەربارەی زانست بۆ دەکەیت، بەڵام بە تەواوەتی سەریان دەسوڕمێت کاتێك کە راستییەکانی ئیسلامیان بە ئاشکرا بۆ دەردەکەوێت.

یەکێك لەو کەسانەی کە لەم بارەوە سەری سوڕما پرۆفیسۆر (جولی سمسۆن) بوو، کە مامۆستای نەخۆشییەکانی ژنان و مناڵبوونە لە زانکۆی (نۆرث وێست) لە (شیکاگۆ)ی وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، کاتێك کە پرۆفیسۆر (عبدالمجيد الزنداني) چاوپێکەوتنێکی لەگەڵدا سازدا و دەقەکانی قورئان و سوننەتی بۆ باس کرد دەربارەی کۆرپەلەزانی، کاتێك ئەو دەقانەی بینی کە باسی بۆماوەزانی و بڕیاردانی سیفاتەکان دەکات لە قۆناغە سەرەتاییەکانی کۆرپەلەدا کاتێك کە نوتفەیەکە.

هەروەها ووردی ئەو وەسفانەی بینی و بۆی دەرکەوت کە چۆن قورئان روونی کردووەتەوە بڕیاردانی دروست بوونی مرۆڤ پاش بەیەك گەشتنی ئاوی پیاو و ئافرەت دەبێت، کە لێرەدا پرۆگرامی بۆماوەیی ناو کرۆمۆسۆمەکان بۆ کۆرپەلەکە دیاری دەکرێت (ئەو کرۆمۆسۆمانەی کە

ووردەکاری ئەو مرۆڤەی تێدایە کە لەدایك دەبێت لە: رەنگی چاو، رەنگی پێست، رەنگی قژ، و هەموو ووردەکاری‌یەکانی تر)، ئەم کرۆمۆسۆمانەش لە قۆناغی نوتفەدا دیاری دەکرێن، کەواتە مرۆڤ کاتێك کە نوتفە دەبێت ئەندازەی هەموو شتێکی بۆ دیاری دەکرێت، بەتەواوەتی وەك ئەوەی کە پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿قُتِلَ الْإِنسَانُ مَا أَكْفَرَهُ، مِنْ أَيِّ شَيْءٍ خَلَقَهُ، مِن نُّطْفَةٍ خَلَقَهُ فَقَدَّرَهُ﴾ (عبس:١٧-١٩).

کۆرپەلەش لە کاتی ٤٠ رۆژی یەکەمی‌دا هەموو ئەندامەکان و سیستەمەکانی لەشی کۆدەبنەوە و دروست دەبن، بەلاّم بەدوای یەکدا، کەواتە هەموو ئەندامەکان دەستیان کردووە بە دروست بوون و لەشیشی چەماوەتەوە بەسەر خۆی‌دا، وەك ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ﴿إِنَّ أَحَدَكُم يُجْمَعُ خَلْقُهُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ أَرْبَعِينَ يَوْماً .....﴾ رواه مسلم.

ئەوەبوو پرۆفیسۆر (سمسۆن) سەرنجی زۆری‌دا لەم فەرموودەیە و فەرموودەیەکی تریش کە دەفەرموێت: ﴿إذا مَرَّ بِالنُّطْفَة ثِنْتان وَأَرْبَعونَ لَيْلَة، بَعَثَ اللهُ إِلَيْها مَلَكاً فَصَوَّرَها ....﴾ أخرجه مسلم، و ئەوەبوو دەستی کرد بە بەراورد کردنی ئەم دوو فەرموودەیە لەگەڵ زانستی کۆرپەلەزانی نوێ‌دا و هەروەها لەو حەددە جیاکەرەوەی کۆڵی‌یەوە کە فەرموودەکان دیاری‌یان کردووە، ئەوەبوو پاش دەرکەوتنی ئەم ووردەکاری‌یانە بۆی لە یەکێك لە کۆنگرە زانستی‌یەکاندا هەستا و رای خۆی دەربڕی و ووتی:

دەتوانین لەم دوو فەرموودەیەوە خشتەیەکی ووردی دیاری کراو دەربارەی گەشە کردنە سەرەکی‌یەکانی کۆرپەلە لە پێش ٤٠ رۆژی گەشە کردنی‌دا دەربهێنین، ئەم فەرموودە پیرۆزانە دەیانتوانی سەرمەشقی هەموو زانیاری‌یە زانستی‌یەکانی ئەو سەردەمانە بوونایە، هەربۆیە من دەبینم کە ئەم فەرموودانە ئاوێنەی زانستی پەروەردگارن.

لێرەدا پرۆفیسۆر (سمسۆن) دەڵێت کە ئەم ئاینەی ئێمە لە توانای‌دایە سەرمەشق و رێبەرایەتی زانست بکات بە سەرکەوتوویی، بەڵێ وایە چونکە ئەمە وەك ئەوە وایە کە کەسێك بچێتە ناو کارگەیەکەوە و لەگەڵ خۆی‌دا کەتەلۆگی ئەو کەسەی پێبێت کە کارگەکەی دروست کردووە، لێرەوە بە ئاسانی لە کارکردنی تێ‌دەگات، بە پێچەوانەی ئەوەی کە دەچێت و کەتەلۆگەکەی پێ‌نی‌یە، کە ئەم کردارە زۆر قورس دەبێت لەسەری.

پرۆفیسۆر (جولی سمسۆن) بەردەوام دەبێت لەسەر قسەکانی و دەڵێت: من لێرەوە باوەڕم وایە کە هیچ جۆرە ناکۆکی و جیاوازی‌یەك نی‌یە لە نێوان زانیاری‌یە زانستی‌یەکان و وەحی خودایی‌دا، تەنانەت من رام وایە کە وەحی پشتگیری هۆکارەکانی دۆزینەوەی زانستی دەکات، و قورئانی پیرۆزیش پێش چەندین سەدە هاتووە پشگیری ئەوە بکات کە ئێمە باسمان کرد، کە ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی قورئان ووتەی خودایە.

ئەمە شایەتی زانایەکی بەرزی رۆژئاوایە لەسەر راستێتی قورئان و سوننەت و توانای پێشەوایەتی کردنیان بۆ جووڵە و چالاکیی زانستی، کەواتە موسوڵمانان دەتوانن رابەرایەتی و سەرمەشقیی جووڵانەوەی زانستی بکەن لەم رۆژگارە، بەو مەرجەی کە دەست بگرن بە بەرنامەکەی پەروەردگاریانەوە و زانست بخەنە شوێن و پایەی شیاو و راستی خۆیەوە کە بریتی‌یە لە بەڵگەیەك بۆ سەلماندنی دەسەڵاتی پەروەردگار و باوەڕهێنان پێ‌ی، و هەروەها سەلمێنەرێکی راستی پەروەردگارێتی ئەو ووتانەی کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ (فصلت:٥٣).

## خشتەی ژمارە (٣): ڕێڕەوی پرۆسەی دروست بوون لە قۆناغی (النشأة)دا

| تەمەن بە هەفتە | درێژی لە سەرەوە بۆ بنی پێ (درێژی کۆرپەلەکە CR) (ملم) | درێژی پێ (ملم) | کێشی کۆرپەلەکە (گرام) | جیاکەرەوە سەرەکی‌یەکانی دەرەوە |
|---|---|---|---|---|
| کۆرپەلەکە پێش ئەوەی کە توانای ژیانی هەبێت لە دەرەوەی منداڵدان | | | | |
| ٩ | ٥٠ | ٧ | ٨ | چاوەکان داخراون یان بەرەو داخران دەڕۆن، کەللەی سەر خڕتر دەبێت، لەم کاتەدا ناتوانرێت کە ئەندامەکانی زاووزێی دەرەوە جیابکرێنەوە (نێرینەیە یان مێینە)، ریخۆڵەکان لەناو ناوکە پەتکدا دەبن. |
| ١٠ | ٦١ | ٩ | ١٤ | ریخۆڵەکان دەچنەوە ناوسک، نینۆکەکانی پەنجە سەرەتایی‌یەکان دروست دەبن. |
| ١٢ | ٨٧ | ١٤ | ٤٥ | دەتوانرێت رەگەزی کۆرپەلەکە لە دەرەوە جیابکرێتەوە و ملی زۆر ئاشکرا و دیاری کراو دەبێت. |
| ١٤ | ١٢٠ | ٢٠ | ١١٠ | رێکبوونەوەی سەر و گەشە کردنی پەلەکانی خوارەوە زۆر بە باشی. |
| ١٦ | ١٤٠ | ٢٧ | ٢٠٠ | دەرکەوتنی گوێکانی دەرەوە لەملاولای سەرەوە. |
| ١٨ | ١٦٠ | ٣٣ | ٣٢٠ | بوونی رووپۆشێکی چەوری. |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٢٠ | ١٩٠ | ٣٩ | ٤٦٠ | دەرکـەوتنی مـووی سـەر و لـەش (گەندەموو). |
| کۆرپەلەیەك کە توانای ژیانی هەبێت لە دەرەوەی منالْدان | | | | |
| ٢٢ | ٢١٠ | ٤٥ | ٦٣٠ | چرچ بوونی پێست و سوور بوونی. |
| ٢٤ | ٢٣٠ | ٥٠ | ٨٢٠ | دروسـت بـوونی نینۆکـەکانی پەنجەکانی هەردوو دەست، لەشی کۆرپەلەکە لاواز و باریك دەبێت. |
| ٢٦ | ٢٥٠ | ٥٥ | ١٠٠٠ | چاوەکان بە شێوەیەکی ناتـەواو و جـوزئی کراونەتـەوە، لەگـەڵ بـوونی برژانگـەکان لەسـەر پێڵووەکـانی هەردوو چاو. |
| ٢٨ | ٢٧٠ | ٥٩ | ١٣٠٠ | چاوەکانی کۆرپەلەکـە کراونەتـەوە، لەگەڵ بوونی قژی سەر لە زۆرێك لە حاڵەتەکاندا، چرچ بوونی پێست بە رێژەیەکی کەم. |
| ٣٠ | ٢٨٠ | ٦٣ | ١٧٠٠ | پەیدابوونی نینۆکی پەنجەکانی پێ، پڕبوونـەوە و خڕبوونـەوەی لـەش، و هاتنـە خـوارەوەی گونـەکان بـۆ نـاو توورەکـەی گـون لـە کۆرپەلـەی نێرینەدا. |
| ٣٢ | ٣٠٠ | ٦٨ | ٢١٠٠ | نینۆکـەکانی پەنجـەکانی دەسـت دەگەنـە سـەرە پەنجـەکان (کۆتاییەکـەی)، لەشـی کۆرپەلەکـە نەرمە و رەنگی پەمەیی دەبێت. |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٣٦ | ٣٤٠ | ٧٩ | ٢٩٠٠ | لەش پڕبووەتەوە، و گەندە مووەکان نزیکە بە تەواوەتی دیار نەمێنن، گەشە کردنی نینۆکی پەنجەکانی پێ و نوشتانەوەی پەلەکان، لەگەڵ بوونی مشتێکی بەهێز قونجاو. |
| ٣٨ | ٣٦٠ | ٨٣ | ٣٤٠٠ | دەرکەوتنی سنگ و مەمکەکان، گونەکان لەناو تورەکەی گوندا دەبن، گەشە کردنی نینۆکی پەنجەکانی دەست بۆ دەرەوەی سەرە پەنجەکان. |

- ئەم پێوانانە مامناوەندین و لەوانەیە بەسەر هەندێك حاڵەتدا جێبەجێ نەبن، هەروەها جیاوازی دووری‌یەکانی کۆرپەلەکە لەگەڵ زیاد بوونی تەمەنی‌دا زیاد دەکەن.

- حەددێکی جێگیر نی‌یە بە دروست بوون، یان تەمەن، یان کێشێك کە کۆرپەلەکە بتوانێت تێ‌ی‌دا بژی، یان مەترسی نەمێنێت لە مانەوەی‌دا.

- تاقی کردنەوەکان سەلماندوویانە کە زۆر دەگمەنە کۆرپەلەیەك بتوانێت بژی کە کێشی لەشی لە (٥٠٠ گرام) کەمتر بێت، یان تەمەنی لە کاتی پیتاندنەوە لە ٢٢ مانگ کەمتر بێت.

- ئەو کۆرپەلانەی لە تەمەنی نێوان ٢٦-٢٨ هەفتە لەدایك دەبن دەتوانن بژین بەڵام بە قورسی، ئەویش لەبەر ئەوەی کە جیاواز بوونی تەواو رووینەداوە لە نێوان کۆئەندامی هەناسەدان و کۆئەندامی دەماردا، زاراوەی (لەبارچوون)یش هەموو ئەو حاڵەتانە دەگرێتەوە کە دەکەونە خوارەوە پێش تەواو بوونی ماوەی بوونی توانای ژیانی کۆرپەلەکە لە دەرەوەی مناڵدانا.

# هاوپێچی وێنە ڕەنگاوڕەنگەکانی

# بەشەکانی (٤ ، ٥ ، ٦ ، ٧)






جنين في اليوم الرابع والأربعين والسادس والأربعين

معجزة اليوم الثاني والأربعين

قارن بين الصورتين وانظر في حديث النبي ﷺ: إذا مر بالنطفة ثنتان وأربعين ليلة بعث الله إليها ملكاً فصورها وخلق سمعها وبصرها وجلدها ولحمها وعظامها.. الحديث رواه مسلم

# وێنەکانی بەشی «٤»




وێنەی (٨٢/هـ): لە ڕۆژی پێنجەمدا کۆرپەلەکە لە دوو بارستەخانە پێکدێت: ١- بارستەخانەی دەرەوە و ٢- بارستەخانەی ناوەوە.




وێنەی (٨٣/هـ): هەر لە ڕۆژی پێنجەمدا بارستەخانەی دەرەوە بەهۆی گەندە پێکانییەوە خۆی دەنووسێنێت بە دیواری منداڵدانەوە و پاشان هەڵیدەکۆڵێت.







لەم هێلکاریيانەدا دەبینین کە بارستە خانەی دەرەوە لەناو دیواری منالْدانْدا بلاو دەبێتەوە و کۆرپەلەکە جیگیر دەکات.




برگەیەک کە نیشانی دەدات لە ڕۆژی نۆیەمدا بارستە خانەی ناوەوە دەست دەکات بە جیابوونەوە لە بارستە خانەی دەرەوە و دیسکی کۆرپەلەیی دروست دەکات.




برگەیەکی کۆرپەلەیەک لە ڕۆژی (١٣)دا، دەبینرێت کە چۆن دیسکی کۆرپەلە لە بارستە خانەی دەرەوە جیادەبێتەوە بەهۆی دروست بوونی بۆشایی ئەمنیۆنی سەرەتایی یەوە.

## وێنەی ژمارە (٨٤-A/هـ)

لەم دیمەنانەدا خۆچاندنی تەواوی کۆرپەلەکە لەناو دیواری منالْدانْدا، و پاشان جیابوونەوە و جیاوازبوونی بارستە خانەی ناوەوە بۆ دروست کردنی کۆرپەلەکە دەبینین.




هێلکارییەک کە برگەیەکی کۆرپەلەیەک لە ڕۆژی (١٣)دا نیشان دەدات، دەبینرێت کە چۆن دیسکی کۆرپەلەکە لە بارستە خانەی دەرەوە جیا دەبێتەوە بەهۆی دروست بوونی پەردە و بۆشایی ئەمنیۆنی.




لە ڕۆژی (١٤)دا دەبینین کە چۆن قاچێک لەنێوان کۆرپەلەکە و بارستە خانەی دەرەوەدا پەیدابووە و بووەتە هۆی هەڵواسینی کۆرپەلەکە لەناو مناڵدانەدا.

## وێنەی ژمارە (٨٤ – B/هـ)

ئەم هێلکارییانە تەواوکەری هێلکارییەکانی وێنەی ژمارە (٨٤–A)ن، کە کۆتایی پرۆسەی هەڵواسینی کۆرپەلەکە لەناو دیواری مناڵداندا دەبینین، بە تەواوەتی وەک ئەوەی پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً ...﴾ (المؤمنون:١٤).




## وێنەی ژمارە (٨٥/هـ)

لە سەرەوە وێنەی ڕاستەقینەی کۆرپەلەیەکی ١٤ ڕۆژە کە بە ووردبینی ئەلیکترۆنی گیراوە و لـە خوارەوەش گەورە کردنی هەمان وێنەیە کە تێیدا قاچی هەڵواسەر بە ڕوونی دەرکەوتووە.




وێنەی (٨٦/هـ): لەم وێنانەدا دەبینین کە چۆن لە نە نجامی هەلکۆلینی دیواری منالدان لەلایەن کۆرپەلەوە دەبێتە هۆی ڕوودانی خێنبەربوون لە لوولەکانی خوێنی دیوارەکەوە و پەنگ خواردنی خوێن لە دەوری کۆرپەلەکە کە شێوەی لە کلۆیەك خوێن دەچێت.




وێنەی (٨٧/هـ): بڕوانە لێکچوونی نێوان کرمی زەروو و کۆرپەلە لە قۆناغی (العلقه)دا.




وێنەی (٨٨/هـ): هەروەك لە وێنەکەی سەرەوەدا دەبینین کرمی زەروو لەشی پارچە پارچەیە بە هەمان شێوەش لێرەدا لەشی کۆرپەلەکە دەبینین کە لە پارچە پارچە پێکهاتووە.

تعلق الجنين في بطانة الرحم
التجويف السابيائي الذي ينمو ليحيط بالجنين
الجنين
المح
خلايا يتكون منها المشيمة
مخاطية الرحم
أوعية دموية

Uterine gland
Endometrial capillary
Syncytio-trophoblast
Amnion
Amniotic cavity
Endometrial epithelium
Epiblast
Cytotrophoblast
Exocoelomic cavity
Exocoelomic membrane
Hypoblast

Embryo
Veins
Arteries
Chorion
Amnion
Chorionic villi
Heart tubes
Umbilical arteries and vein
Veins and arteries in yolk sac
Yolk sac

Spiral artery
Venous return
Secondary and tertiary villi
Outer cytotrophoblast shell
Intervillous space
Chorionic plate (extra-embryonic mesoderm)
Chorionic cavity (extra-embryonic cavity)
Decidua capsularis

لەناو لەشی کۆرپەلەکەدا خوێن و لوولەکانی دروست بوون بەڵام هێشتا وەستاون، کەواتە کۆرپەلەکە خوێنێکی گەشی وەستاوە.




## وێنەی ژمارە (٨٩/هـ):

لەم وێنانەدا بە تەواوەتی ماناکانی ووشەی ( علقة )مان بۆ دەردەکەوێت، کە بریتییە لە پارچەیەك خوێنی هەڵواسراوی گەشی وەستاو، و خۆیشی بە خوێن دەورە دراوە وەك کلۆیەك خوێن.

3

لەم وێنەیەدا دیمەنێکی ڕاستەقینەی سەرێکی یەکێك لە گەندە پێکانی ووێلاش دەبینین، و کرداری وەرگرتنی خۆراك وئۆکسجینیش روون دەکاتەوە، سەرەتا خوێنی هاتوو لە کۆرپەلەوە بە رەنگی شین دەبینین، پاش ئەوەی کە لە خوێنی دایکەکەوە ( لە دەورو بەری ) خۆراك و ئۆکسجین وەردەگرێت رەنگی دەبێتەوە بە سوورێکی کاڵ و دەگەڕێتەوە بۆ ناو لەشی کۆرپەلەکە. کەواتە هەروەك چۆن کرمی زەروو بە مژینی خوێنی ئاژەڵان دەژی بەهەمان شێوەش کۆرپەلە خۆی دەژێنێت.



2

1



وێنەی (٩٠/هـ): ١- هێلکارییەکە بۆمان روون دەکاتەوە چۆن کۆرپەلە لەسەر خوێنی دایکی دەژی، و خۆراك و ئۆکسجین بەهۆی گەندە پێکانی ووێلاشەوە ( Chorionic Villi ) لە خوێنی دایکەکەوە وەردەگرێت. ٢- وێنەیەکی ڕاستەقینەی یەکێکە لەو گەندە پێیانەی ووێلاش.




**Figure 2:** We can see in this diagram the suspension of an embryo during the *alaqah* stage in the womb (uterus) of the mother. (*The Developing Human*, Moore and Persaud, 5th ed., p. 66.)




**Figure 3:** In this photomicrograph, we can see the suspension of an embryo (marked B) during the *alaqah* stage (about 15 days old) in the womb of the mother. The actual size of the embryo is about 0.6 mm. (*The Developing Human*, Moore, 3rd ed., p. 66, from *Histology*, Leeson and Leeson.)










وێنەی (٩١/هـ): کۆرپەلە لەرۆژی (١٦)دا لەناو منالْدانْدا بەهۆی قاچێکەوە هەڵواسراوە و بەشلەیەکی لینج دەورە دراوە (وەك لە هێلکارییەکاندا دەرکەوتووە)، لەلای راستیش وێنەیەکی راستەقینەیەتی.




وێنەکەی لای چەپە وردەکارییەکانی لەشی کۆرپەلەکە ڕوون دەکاتەوە

وێنەکەی لای ڕاستە وردەکارییەکانی لەشی کۆرپەلەکە ڕوون دەکاتەوە

وێنەی (٩٢/هـ): لەم وێنانەوە دەبینین چۆن بە تەواوی کۆرپەلە لە کرمی زەروو دەچێت (لە ناوەڕاستدایە)، ئەویش چونکە سەری گەورەیە وەك کرمی زەروو (عەلەقە)، و لەشی پارچە پارچەیە، و کلکی باریکە و نوشتانەوەیەکی کەمی تێدایە، وەك ئەوەی ئایەتە پیرۆزەکە ئاماژەی پێداوە:

{ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً ...} (المؤمنون: ١٤).



کۆرپەلەکە خۆی دەچێنێتە ناو دیواری مناڵدانەوە کە دەوڵەمەندە بە لوولەی خوێن.




**وێنەی (٩٣/هـ):** لە ڕۆژی (٢١)دا (واتە پێش تەواوبوونی ماوەی عەلەقە بە ٣ ڕۆژ)، سیستمی سووڕانی خوێنی کۆرپەلەکە دروست بووە و ئینجا دڵی سەرەتایی دەست دەکات بە ناردنی خوێن و لە ڕۆژی (٢٢)وە کۆرپەلەکە بەهۆی گەندەپێکانی وویلاشەوە خۆراك و ئۆکسجین لە خوێنی دایکەکەوە دەمژێت، دەبینین چۆن ئەو هەموو لوولە خوێنەی ناو لەشی کۆرپەلەکە شێوەی خوێنێکی زۆر سووری دەدەنێ.




**وێنەی (٩٤/هـ)**: لە کۆتایی هەفتەی دووەمدا لەشی کۆرپەلەکە درێژ دەبێتەوە وەك دیسکێك و لە کۆتایی‌یەکەشی‌دا شریتی سەرەتایی پەیدا دەبێت.




**وێنەی (٩٥/هـ)**: لە رۆژی (١٨)دا لەشی کۆرپەلەکە وەك هەرمێ لێدێت ولە کۆتایی شریتی سەرەتایی‌دا گرێی سەرەتایی پەیدا دەبێت، (وێنەی لای راست وێنەیەکی راستەقینەیە).

وێنەی (٩٦/هـ):
ئەم وێنانە چۆنێتی دروست بوونی چینی ناوەڕاست (میزۆدێرم) لە خانەکانی شریتی سەرەتاییەوە ڕوون دەکەنەوە، ئەویش بە کرداری چاڵ بوونی شریتەکە و کۆچ کردنی خانەکانی بۆ نێوان دوو چینەکەی لەشی کۆرپەلەکە.




لە ڕۆژی (١٦)وە شریتی سەرەتایی چاڵ دەبێت و خانەکانی کۆچ دەکەن و بڵاو دەبنەوە بە نێوان دوو چینەکەی تری کۆرپەلەکەدا بە مەبەستی دروست کردنی چینی ناوەڕاست (میزۆدێرم).

لە ئەنجامی کۆچ کردنی بەردەوامی خانەکانەوە چینی ناوەڕاست دەردەکەوێت.




تەواو بوونی دروست بوونی چینی ناوەڕاست لە کۆتایی هەفتەی سێیەمدا.




**وێنەی (۹۷/ هـ): لە دوای کامڵ بوونی پێکهاتە و جیابوونەوەی چینەکانی لەشی کۆرپەلەکەدا (بە هاندانی سەرەکی شریتی سەرەتایی)، پرۆسەی جیاواز بوون و دروست کردنی ئەندامەکانی لەشی کۆرپەلەکە دەست پێدەکات (بە تایبەتی پشتە پەت Notochord).**




**وێنەی (٩٨/هـ): وێنەیەکی راستەقینەی کۆرپەلەیەك لە رۆژی (١٦)دا، کە لە بەشی خوارەوەیدا شریتی سەرەتایی (Primitive Streak) دەردەکەوێت.**




**وێنەی (٩٩/هـ): لەم وێنە راستەقینانەدا کۆرپەلە دەبینین لە مانگی دووەمیدا کە بۆری دەماریی بۆ دروست بووە لە ئەنجامی چالاکیی شریتی سەرەتاییەوە.**




# وێنەی (١٠٠/ هـ)

**A: لەو هێڵکارییانەدا دەبینین کە چۆن بەشی دواوەی کۆرپەلەکە تویّ دەبێت بۆ ئەوەی سەرەنجام کلکێك دروست بکات بۆ کۆرپەلەکە.**

**B, C: وێنەیەکی گەورە کراوی کلك دەبینین لە کۆرپەلەدا، کە تێیدا سەرەنجامی شریتی سەرەتایی (Primitive Streak) دەبینرێت کە پووکاوەتەوە لە کۆتایی کلکدا.**




**وێنەی ژمارە (١٠١/ هـ)**

وێنەیەکی گەورەکراوی ڕاستەقینەی کۆرپەلەیەک لە مانگی دووەمیدا، لە ناوەڕاستی لەشیدا بۆری دەماریی دروست بووە، بەهۆی کاریگەریی شریتی سەرەتایی کە سەرەنجام لە ناوچەی کلکدا دەپووکێتەوە.




**وێنەی ژمارە (١٠٢/ هـ)**

١- وێنەیەکی ڕاستەقینەی کلکێك کە بۆ کۆرپەلەکە دروست دەبێت لە هەفتەی چوارەمدا.

٢- لم وێنەیاندا دەبینین کە چۆن کلکەکە نامێنێت لە هەفتەی حەوتەمدا.




قال رسول الله صلى الله عليه وسلم : ( إذا مر بالنطفة إثنتان وأربعون ليلة بعث الله ملك فصورها وخلق سمعها وبصرها وجلدها ولحمها وعظامها )




## وێنەی ژمارە (١٠٣/هـ)

١ ، ٣ : دوو وێنەی ڕاستەقینەی كۆرپەلـە لـە كۆتایی قۆناغی خۆهەڵواسەر ( عـەلـەقـە )دا كـە بـۆری دەمـار لـە كـۆتـایی دروست بوون و داخراندایە.

٢- هێڵكاری‌یەك كە پێكهاتەی ئێسكـەكانی بڕبڕەی پشت لـە مرۆڤێكی پێگـەیشتوودا ڕوون دەكـاتـەوە، و شـوێنی ئێسكی كلێنچكە لە كۆتایی بڕبڕەكەدا بە ئاشكرا دیارە.



## وێنەی ژمارە (١٠٤/هـ):

placenta
rectum

ئەم ٣ وێنەیە بۆمان ڕوون دەکەنەوە کە ٣ تاریکایی هەیە دەوری کۆرپەلەی داوە، جا ئەگەر لە ڕوویەکی فراوان یان ڕوویەکی تەسکەوە سەیری بابەتەکە بکەین:

**یەکەم تاریکایی: پەردەکانی دەوری کۆرپەلەکەن.**

**دووەم تاریکایی: ئەو مناڵدانەیە کە دەوری کۆرپەلەکەی داوە.**

**سێیەم تاریکایی: سکی دایکەکەیە.**




### لە ناوەوە بۆ دەرەوە:

- یەکەم چین (Endometrium) کە یەکەم تاریکایی مناڵدان پێکدێنێت.
- دووەم چین (Myometrium) کە دووەم تاریکایی مناڵدان پێکدێنێت.
- سێیەم چین (Perimetrium) کە سێیەم تاریکایی مناڵدان پێکدێنێت.

Amnion
Intervillous space
Uterine cavity
Villous chorion
Yolk sac
Decidua basalis
Smooth chorion
Decidua capsularis
Site of internal os of uterus
Decidua parietalis
Mucous plug

### لە ناوەوە بۆ دەرەوە:

- یەکەم پەردەی دەوری کۆرپەلە بەناوی (**Amnion**)، بریتی‌یە لە یەکەم تاریکایی.
- دووەم پەردەی دەوری کۆرپەلە بەناوی (**Chorion**)، بریتی‌یە لە دووەم تاریکایی.
- سێیەم پەردەی دەوری کۆرپەلە بەناوی (**Decidua**)، بریتی‌یە لە سێیەم تاریکایی.

# وێنەکانی بەشی «٥»




کۆرپەلەکە لە کۆتایی قۆناغی ( عەلەقە )دا ( وێنەکانی سەرەوە ) یەکسەر دەبێت بە گۆشتپارە ( وەك لە وێنەکانی خوارەوەدا ).

**وێنەی (١٠٥/ هـ):** لە کۆتایی قۆناغی ( عەلەقە )دا و لەگەڵ پەیدابوونی بارستە لەشییەکاندا کۆرپەلە شێوەی پارووییەك وەردەگرێت ( واتە دەبێت بە گۆشتپارە وەك لەم وێنە ڕاستەقینانەدا دەردەکەوێت ).






**وێنەی (١٠٦/هـ)**: دوو وێنەی ڕاستەقینەی ووردبینی‌یە بۆ کۆرپەلە لە قۆناغی (المضغة)دا لە سەرەوە زۆر بە جوانی دەبینرێت لەسەر پشتی بارستە لەشی‌یەکان دروست بوون، و لە خوارەوەش کەوانەکانی قورگ، هەروەها بوونی ئەو هەموو هەڵئاوساوی و بەرزی و نزمی‌یەی لەشی شێوەی پارووی دەدەنێ، کە پڕاوپڕی مانای ئایەتەکەیە: ﴿فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً .....﴾.



وێنەی (١٠٧/هـ): وێنەیەکی ڕاستەقینەی ووردبینی ئەلیکترۆنی کۆرپەلەیەک لە قۆناغی گۆشتپارەدا، کە بە تەواوەتی لە پارووێەک دەچێت، بەهۆی ئەمانەوە:

١- بوونی بارستە لەشیەکان لەسەر پشتی وەک شوێنەواری ددان وایە لەسەر پاروو.

٢- بوونی هەڵاوساوی و کەوانە قوڕگیەکان و بەرزی و نزمیەکانی سەر لەشی و گۆڕانی شکڵی بە بەردەوامی، هەروەک پاروو چۆن لەکاتی جویندا بە بەردەوامی شکڵی لە گۆڕاندایە.

٣- شێوەی چەماوەی لەشی کە وەک پیتی (C)ی ئینگلیزی وەهایە بەهەمان شێوەی پارووە لەکاتی قووتداندا.




وێنەی (١٠٨/ هـ): بەراوردێك لە نێوان کۆرپەلە لە قۆناغی گۆشتپارەدا (ڕۆژی ٢٨) لەگەڵ بنێشتێکی جووراودا کە دەریدەخات تەواو لەیەك دەچن.

وێنەی (١٠٩/هـ): لەم هێلکاریيانەدا دەبينين چۆن لەشی کۆرپەلەکە دەست بە چەمانەوە دەکات و شێوەی پیتی (C)ی ئینگلیزی وەردەگرێت، هەروەك پاروو لەناو دەمدا کە دەچەمێتەوە.

**وێنەی (١١٠/ هـ):** بەراوردێکی تری نێوان کۆرپەلە لە قۆناغی گۆشتپارەدا و بنێشتێکی جووراودا، بۆ زیاتر دەرخستنی لێکچوونی نێوانیان و سەلماندنی تەواوی مانای (مـضـغـة) هەروەك لـە ئایەتەکاندا هاتووە.



Figure 5: Photograph of a 28-day-old embryo at the *mudghah* stage. The embryo at this stage is similar in appearance to a chewed substance, because the somites at the back of the embryo somewhat resemble teeth marks in a chewed substance. The actual size of the embryo is 4 mm. (*The Developing Human*, Moore and Persaud, 5th ed., p. 82, from Professor Hideo Nishimura, Kyoto University, Kyoto, Japan.)




Figure 6: When comparing the appearance of an embryo at the *mudghah* stage with a piece of gum that has been chewed, we find similarity between the two.

A) Drawing of an embryo at the *mudghah* stage. We can see here the somites at the back of the embryo that look like teeth marks. (*The Developing Human*, Moore and Persaud, 5th ed., p. 79.)

B) Photograph of a piece of gum that has been chewed.



Actual size 11.0 mm

**وێنەی (١١١/هـ):** قەبارەی راستەقینەی کۆرپەلە دەردەخات لە قۆناغی گۆشتپارەدا (کە ١١ میللیمەترە) و بچووکترین شتێکە کە ددان بتوانێت بیجوێت.






وێنەی (۱۱۲/هـ): لە هێلکاری‌یەکەی سەرەوەدا کۆرپەلەیەک دەبینین لەڕۆژی (۳۲)دا، تێبینی ئەوە دەکەین زۆربەی ئەندامەکانی دەرکەوتوون لەگەڵ ئەوەشدا کە دروست بوونیان تەواو نەبووە، وەک: دڵ، هەردوو پەلەکانی سەرەوە و خوارەوە، و چاڵایی چاو، و پەردەی بیستن، لە خوارەوەش دوو وێنەی ڕاستەقینەی هەمان ماوەیە، کە کۆرپەلەکە وا دەردەکەوێت هەردوو دەست و قاچی بڕابنەوە، چونکە دروست بوونیان تەواو نەبووە، کەواتە کۆرپەلەکە هەندێکی دروست بووە و هەندێکی نەخێر، بە تەواوەتی وەک ئایەتەکە کە دەفەرموێت: ﴿مِنْ مُضْغَةٍ مُخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ ....﴾.




وێنەی (١١٣/هـ): لە هێڵکارییەکەدا دەبینین کە چۆن سەرەتای هەموو ئەندامەکانی لەشی کۆرپەلەکە دەستیان کردووە بە پەیدابوون، بەڵام وەك چەکەرەیەك کە لە داهاتوودا دروست بوونیان تەواو دەبێت، کەواتە قۆناغی گۆشتپارە بریتییە لە کاتی دروست بوونی پێکهاتەکانی لەشی کۆرپەلەکە بەڵام بە ناتەواوی.




وێنەی (١١٤/هـ): لەم هێلکارییانەدا دەبینین چۆن تۆوڕەکەی بینین لە چینی دەرەوە جیادەبێتەوە و شەق دەبێت و نوقم دەبێت لەناو چاڵایی بینینەدا، وەک فەرموودەکەی پێغەمبەر دەفەرموێت: ﴿وشق سمعه وبصره ...﴾

وێنەی (١١٥/هـ): لەم هێلکارییانەدا دەبینین کە چۆن پەردەی داپۆشەری ڕەشێنەی چاو شەق دەبات و دەگرێتەوە و نامێنێت لە هەفتەی (٢٠)دا.




وێنەی (١١٦/هـ): قۆناغە سەرەتاییەکانی دروست بوونی گوێ: لە چینی دەرەوە تووورەکەی بیستن (Otic Vesicle) جیادەبێتەوە و شەق دەبێت، بە پێی فەرموودەی: ﴿وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ .....﴾.




وێنەی (١١٧ / هـ): لەتبوون و شەقبوونی داپۆشەری گوێی دەرەوە و کرانەوەی لە سەرەتای دروست بوونیدا.




وێنەی (١١٨/ هـ): چەند دیمەنێکی ڕاستەقینەی دروست بوونی چاوەکان لەڕۆی شەقبوونەوە.




وێنەی (١١٩/هـ): چەند وێنەیەکی ڕاستەقینەی قۆناغەکانی دروست بوونی بینین و بیستن.




دیمەنێکی پشتەوەی کۆرپەلەیەکی دیمەنێکی پێشەوەی کۆرپەلەیەکی بێسەر (واتە مێشکی بۆ دروست نەبووە)، بێسەر (Anencephaly). بە زۆری دوای چەند رۆژێک لە لەدایک بوون ئەم کۆرپەلانە دەمرن.



دوو وێنەی دووانەی بەیەکدا نووساو، کە بریتی‌یە لە جۆرێک لە شێواوی زگماکی کۆرپەلە.

**وێنەی (۱۲۰/ هـ): چەند وێنەیەکی راستەقینەی هەندێک شێواوی و تێکچوونی بۆماوەیی لە کۆرپەلەدا، چانسی روودانی ئەم شێواوی‌یانە لە قۆناغی گۆشتپارەدا لە هەموو قۆناغەکانی تر زیاترە، چونکە بریتی‌یە لە قۆناغی دروست بوونی ئەندامەکان (Organogenesis).**

# وێنەکانی بەشی «٦»




**وێنەی (١٢١/ هـ)**: لە هێلکاری‌یەکانی سەرەوەدا دەبینین کە چۆن کۆرپەلە کە لە سەرەتادا دروست دەبێت ئەندامەکانی هیچ جۆرە ئێسکێکی تێدا نی‌یە (A , B)، پاشان خانە میزەنکیمی‌یەکان چڕدەبنەوە و خەیاڵی ئێسکەکان پەیدا دەبێت (C)، لەدوای ئەمە کرداری بوون بە کرکڕاگە دەست پێدەکات و بەهێواشی نموونەیەکی کرکڕاگەیی پەیدا دەبێت بۆ ئەو ئێسکانەی کە لە داهاتوودا دروست دەبن (D)، لە کۆتایی هەفتەی شەشەم و سەرەتای هەفتەی حەوتەمدا نموونەیەکی کرکڕاگەیی لە هەموو لەشدا بڵاودەبێتەوە.
لە خوارەوەش وێنەیەکی راستەقینەی پەیکەری کرکڕاگەیی کۆرپەلەیەك لە هەفتەی هەشتەمدا دەبینین.

Ilium
Femur
Pubis
Tibia
Fibula
Foot plate cartilages
A

Pubis
Tibia
Ilium
Femur
Fibula
Tarsal cartilages
B

Pubis
Ilium
Ischium
Tarsal cartilages
Metatarsal cartilages
C

وێنەی (١٢٢/ هـ): چەند هێلکارییەکی پەلی خوارەوەی کۆرپەلە کە ڕوونی دەکاتەوە چۆن ئێسکە کرکراگەیی‌یەکان لە کۆتایی هەفتەی شەشەمدا بە تەواوەتی دروست دەبن.




وێنەی (١٢٣/ هـ): پەیدابوونی سەرەتا ئێسکی‌یەکان لە ئێسکەکانی کەللەی سەردا.

How bones grow

وێنەی (١٢٤/ هـ): لەگەڵ بەرەوپێش چوونی سکپڕیدا ئێسکەکان دروست دەبن و شوێنی کرکراگەکان دەگرنەوە. (چەند وێنەیەکی ڕاستەقینەی پەیدابوونی ئێسکەکان بۆ کۆرپەلە لەناو سکی دایکیدا).



خانەکانی دروستکەری ئێسك
Sclerotome cells
خانەکانی دروستکەری پێست
Dermatome
Myotome
خانەکانی دروستکەری ماسولکە
Nephrotome
Intraembryonic coelom
Somatic mesoderm layer
Splanchnic mesoderm layer

**وێنەی (١٢٦/ هـ):** لەم هێلکارییەدا بڕگەیەکی لەشی کۆرپەلە دەبینین کە بارستە لەشییەکان (Somites)ی تێدا پەیدا بووە، لەملاولای ئەو شوێنەی بڕبڕەی پشتی تێدا دروست دەبێت دەبینین ئەو خانانەی کە لە داهاتوودا ئێسك دروست دەکەن (Sclerotome) دەکەونە ژێر ئەو خانانەی لە داهاتوودا ماسولکە دروست دەکەن (Myotome)، و ئەمانیش دەکەونە ژێر ئەو خانانەی لە داهاتوودا پێست دروست دەکەن (Dermatome)، کەواتە پێست دەکەوێتە سەر ماسولکە و ئەمانیش بەسەر ئێسکەکانەوەن و دایان دەپۆشن، ئەمەش ئەوەیە کە لە دەقە شەرعییەکانی دروست بوونی مرۆڤەوە تێیدەگەین.

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿وَٱنظُرۡ إِلَى ٱلۡعِظَامِ كَيۡفَ نُنشِزُهَا ثُمَّ نَكۡسُوهَا لَحۡمٗاۚ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥ قَالَ أَعۡلَمُ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ٢٥٩﴾ [سورة البقرة: ٢٥٩]



## المعجزة

اضطرب الأطباء لسنوات عديدة: أيهما ينشأ في الجنين أولاً اللحم أو العظام أو أنهما متزامنان في النشأة، وبقدر التطور الهائل في وسائل المراقبة الجنينية في بطون الأمهات وبعد توالي الملاحظات البالغة الدقة عاد الأطباء إلى كتابة كتبهم تارة أخرى.

لقد ثبت أن العظام تبدأ في كل عضو أولاً. وبعد حيز زمني بالغ القصر تبدأ العضلات في كسوة هذه العظام الناشئة. فثبتت بذلك معجزة كبرى للقرآن، فبينما كان الأطباء في زمننا هذا ورغم التقنيات الحديثة منهمكين في النزاع الطويل حول أسبقية اللحم على العظام أو التزامن على أقل الفروض كان القرآن الكريم يفصل في القضية فصل عليم مطلع.

**وێنەی (١٢٧/هـ):** بابەتی دروست بوونی ئێسك پێش ماسولکە یان ماسولکە پێش ئێسك مایەی گفتوگۆیەکی درێژی نێوان زانایان بوو، تا ئاوەڕاستی سەدەی بیستەم کە لەوێوە تەواو ئاشکرابوو بەهۆی توێژینەوە دوور و درێژەکانەوە کە پەیکەری ئێسکیی لەش پێش دروست بوونی ماسولکەکان پەیدا دەبێت، و ئینجا ماسولکەکان دایان دەپۆشن و بەم شێوەیە کۆرپەلەکە شکلی مرۆڤانە وەردەگرێت و ڕێکدەبێتەوە.

وێنەی (١٢٨/هـ): قۆناغەکانی پەرت بوونی بارستە لەشی‌یەکان بۆ خانەکانی: ئێسك و ماسولکە و پێست، و قۆناغەکانی کۆچ کردنی ئەو خانانە:

چاڵایی دەماریی Neural groove

A

Ventral somite wall

بارستە لەشی‌یەکان

Notochord

لەم هێلکاری‌یەدا برگەیەکی کۆرپەلە دەبینین کە شوێنی بارستە لەشی‌یەکا نمان بۆ روون دەکاتەوە لەملاولای چاڵایی دەماریی‌دا، و پێك هاتوون لە چەندین جۆر خانە.

بۆریی دەماریی Neural tube

ئەو خانانەی ئێسك Sclerotome دروست دەکەن

intraembryonic coelom

B

Dorsal aorta

لەم هێلکاری‌یەدا دەبینین ئەو خانانەی بارستە لەشی‌یەکان کە ئێسك دروست دەکەن پەرت دەبن و جیادەبنەوە و کۆچ دەکەن پێش ئەو خانانەی کە لە داهاتوودا ماسولکە و پێست دروست دەکەن، کەواتە دروست بوونی ئێسکەکان پێش دروست بوونی ماسولکەکان دەکەوێت.

ئەو خانانەی پێست Dermomyotome دروست دەکەن

ئەو خانانەی ماسولکە Myotome دروست دەکەن

ئەو خانانەی ئێسك Sclerotome دروست دەکەن

C

Dorsal aorta

لەم هێلکاری‌یەدا دەبینین ئەو خانانەی بارستە لەشی‌یەکان کە لە سەروو خانەکانی ئێسکەوەن جیاواز دەبن دوای کۆچ کردنی خانەکانی ئێسك بۆ ئەوەی ئەو بارستە خانەیە دروست بکەن کە لە داهاتوودا ماسولکە دروست دەکەن، پاشان دەکشێن و کۆچ دەکەن و پاش دروست بوونی ئێسك دروستبوونی ماسولکەی بەدوادادێت.

Neural tube

Sclerotome

Myotome ئەو خانانەی ماسولکە دروست دەکەن

D

لەم هێلکاری‌یەدا دەبینین ئەو خانانەی کە لە سەروو ماسولکەوەن و لە داهاتوودا پێست دروست دەکەن، پەرت دەبن دوای ئەوەی خانەکانی ماسولکە کۆچ دەکەن بۆ ئەوەی لە رووی دەرەوەی کۆرپەلەکەدا جێگیر ببن کەواتە بۆمان دەردەکەوێت کە دروست بوونی ئێسك پێش دروست بوونی ماسولکە دەکەوێت و ئەمیش پێش دروست بوونی پێست دەکەوێت هەروەك لە دەقە شەرعی‌یەکاندا هاتووە.





**وێنەی ژمارە (١٢٩/ هـ):**
دوو وێنەی ڕاستەقینەی پەنجەکانی دەستەکان و پێکان کە بە ئاشکرا ئێسکەکانی دەرکەوتووە و ماسولکە دایپۆشیوە، بە تەواوەتی وەك ئایەتی: ﴿فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا ....﴾ دەفەرموێت، ئەمەش لە هەفتەی هەشتەمدایە.




کۆرپەلە لە تەمەنی ٣٥ ڕۆژیدا




کۆرپەلە لە تەمەنی ٣٨-٤٠ ڕۆژیدا

3

کۆرپەلە لە تەمەنی ١٣ هەفتەییدا

**وێنەی (١٣٠/ هـ):** لەم وێنە ڕاستەقینانەی کۆرپەلەدا دەبینین کە چۆن دوای دروست بوونی ئێسك و داپۆشینی بە ماسولکە بە هێواشی لەشی ڕێك دەبێتەوە، وەك لە وێنەی (٣)دا دەبینین کە پەیدابوونی ئێسك و پاشان ماسولکە بووەتە هۆی دەرکەوتنی قاچ و ڕانی کۆرپەلەکە بە شێوەیەکی ئاسایی.







وێنەی (١٣١/هـ): دوو وێنەی ڕاستەقینە بۆ بەراورد کردنی کۆرپەلە پێش و لەدوای ٤٠ رۆژی، دەبینین بە ئاشکرا شکڵ و ڕوخساری مرۆڤ وەردەگرێت لە دوای ٦ هەفتە.

وێنەی (١٣٢/هـ): لەدوای رۆژی (٤٢)وەوە لەشی کۆرپەلەکە ڕێك دەبێتەوە، کە پێشتر چەماوە بووە، کە ئەمەش یەك دەگرێتەوە لەگەڵ مانای (فَسَوَّى) کە لە ئایەتەکەدا هاتووە: ﴿ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّى﴾ (القيامة:٣٨).




کۆرپەلە لە رۆژی (٤٢)دا



کۆرپەلە لە رۆژی (٤٨)دا

کۆرپەلە لە رۆژی (٥٢)دا





**وێنەی (١٣٣/ هـ):** لەم کۆمەڵە وێنە ڕاستەقینەی کۆرپەلەدا دەبینین کە چۆن چاوەکانی دەست دەکەن بە دەرکەوتن لە هەفتەی پێنجەمدا، پاشان لە هەفتەی هەشتەمدا شێوەی ئاسایی خۆیان وەردەگرن، ئەویش بە پێی فەرموودەی: ﴿إذا مَرَّ بِالنُّطفَةِ ثِنتان وَأَربَعونَ لَيلَة، بَعَثَ اللهُ إِلَيها مَلَكاً فَصَوَّرَها وَخَلَقَ سَمْعَها وَبَصَرَها ....﴾.




**وێنەی (١٣٤/هـ): موعجیزەی دوای ڕۆژی (٤٢):** لەم وێنە ڕاستەقینانەی کۆرپەلەی مرۆڤدا دەبینین لە ڕۆژانی ( ٣٦-٣٨ )دا هیچ جۆرە سیمایەکی مرۆڤی پێوە دیار نییە، بەڵام لە ڕۆژی ( ٤٢ ) بەدواوە ئیتر کۆرپەلەکە شێوەی مرۆڤ وەردەگرێت، ئەمەش سەلمێنەری ڕاستیی فەرموودەکەی پێغەمبەرە ( ﷺ ) کە دەفەرموێت: ﴿إذا مَرَّ بِالنُّطفَةِ ثِنتان وَأَربَعونَ لَيلَة، بَعَثَ اللهُ إِلَيها مَلَكاً فَصَوَّرَها ....﴾ ( رواه مسلم ).




**وێنەی (١٣٥/هـ):** هێلکارییەك کۆرپەلە لە هەفتەی هەشتەمدا دەردەخات، کە هەموو ئەندامەکانی لەشی دروست بوون، و شێوەکەشی بووە بە شێوەیەکی مرۆیی، لە خوارەوەش وێنەیەکی ڕاستەقینەی کۆرپەلەیەکە لە هەفتەی هەشتەمدا.



# معجزة اليوم الثاني والأربعين

عن حذيفة ... أن رسول الله ﷺ قال: إذا مر بالنطفة ثنتان وأربعون ليلة بعث الله إليها ملكا فصورها وخلق سمعها وبصرها
وجلدها ولحمها وعظامها، ثم قال يارب أذكر أم أنثى فيقضي ربك ما شاء ويكتب الملك. صحيح مسلم
وقد أظهرت الدراسات الجنينية والصور الحقيقية أن الجنين يكتمل شكله الآدمي وكل ما ورد ذكره في الحديث بعد مضي اليوم الثاني والأربعين




الصورتان الحقيقيتان مأخوذتان من كتاب From Conception to Brith

## وێنەی (١٣٦/ھ)

ئەم وێنە ڕاستەقینانە و وێنەکانی پێشتریش ئەو ڕاستی‌یەمان بۆ دووپات دەکەنەوە کە هیچ جۆرە جیاوازی و دووبەرەکی و بەربەرەکانی‌یەک نی‌یە لە نێوان فەرموودە شەرعی‌یەکان و دۆزینەوەکانی زانستی نوێدا بە تایبەتی لە بواری ڕاستی‌یەکانی زانستی کۆرپەلەزانی‌دا، کاتێک پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت کۆرپەلە دوای (٤٢) ڕۆژ شکڵ و شێوەی مرۆڤ وەردەگرێت، دۆزینەوەکانی کۆرپەلەزانیش هەمان ڕاستیمان بۆ دووپات دەکەنەوە.

Main Embryonic Period (in weeks)
Fetal Period (in weeks)
1
2
3
4
5
6
7
8
9
16
32
38
Period of dividing zygote, implantation, and bilaminar embryo
Morula
Blastocyst
Embryonic disc
Amnion
Embryonic disc
Not susceptible to teratogenesis
Death of embryo and spontaneous abortion common
Neural tube defects (NTDs)
Mental retardation
CNS
TA, ASD, and VSD
Heart
Amelia/Meromelia
Upper limb
Amelia/Meromelia
Lower limb
Cleft lip
Upper lip
Low-set malformed ears and deafness
Ears
Microphthalmia, cataracts, glaucoma
Eyes
Enamel hypoplasia and staining
Teeth
Cleft palate
Palate
Masculinization of female genitalia
External genitalia
Common site(s) of action of teratogens
Less sensitive period
Highly sensitive period
TA—Truncus arteriosus; ASD—Atrial septal defect;
VSD—Ventricular septal defect
Major congenital anomalies
Functional defects and minor anomalies

وێنەی (١٣٧/هـ): ئەم خشتەیە هەستیاریی کۆرپەلەکەمان بۆ دەردەخات بەرامبەر کارتێکەرە دەرەکییەکان لە هەموو قۆناغەکانی گەشە کردنیدا: لە قۆناغی نوتفەدا لەوانەیە تووشی لەبارچوون ببێت (وەك لە فەرموودەیەکی پێغەمبەردا هاتووە)، دوای ئەمەش قۆناغێك دێت کە لەوانەیە کۆرپەلەکە تێیدا تووشی شێواوی خەتەرناك ببێت تا هەفتەی شەشەم و زۆربەی کات لەوانەیە ببێتە هۆی لەبارچوونی، دوای ئەمە قۆناغێك دێت کە لەوانەیە کۆرپەلەکە تێیدا تووشی شێواوی خەتەرناك ببێت بەڵام زۆربەی کات نابێتە هۆی لەباربردنی، ماوەی مانەوەی کۆرپەلەکە لە دوای هەفتەی نۆیەمەوە بە ماوەیەکی جێگیر بوون و تەواو بوون بۆی دادەنرێت کە بە زۆری تێیدا کۆرپەلەکە تووشی شێواوی و تێکچوون نابێت.

## وێنەکانی بەشی ﴿٧﴾




**وێنەی (١٢٨- A/ ه): ئەم وێنە ڕاستەقینانەی کۆرپەلە کە لە چەند هەفتەیەک و چەند قۆناغێکی جیاوازی تەمەنیدا بۆی گیراوە بۆمان ڕوون دەکاتەوە کە چۆن کۆرپەلە بە خێرایی گەشە دەکات لە قۆناغی گەشە کردندا (النشأة)، ئەمەش سەلمێنەری یەکێکە لە ماناکانی وشەی (نشأ) کە لە ئایەتی: ﴿ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقاً آخَرَ...﴾ (المؤمنون:١٤)دا هاتووە.**




وێنەی (١٣٨- B/ هـ): ئەم هێلکاری‌یانە زیاد کردنی خێرای درێژی کۆرپەلەمان بۆ روون دەکاتەوە بە پێی هەفتە، کە روونکردنەوەی مانای سێ‌یەمی ووشەی (نشا)یە کە لە ئایەتەکەدا هاتووە.

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ۝٨٥﴾ [سورة الإسراء: ٨٥]

المعجزة الربانية إذ تنفخ الروح في اللحم الميت فإذا به يتدفق بالحياة.

قلب ينبض وعين تطرف ويد تسبح. هذا هو السر الذي بقي غيبا مجهولا. سر الله تعالى في نفخ الروح، وكم حاول الإنسان عبثا الوقوف على هذا السر الغامض، الروح.. وجاء القرآن بالجواب الحاسم.

## وێنەی ژمارە (١٣٩/هـ):

یەکێك لە نیشانەکانی دەسەڵاتی گەورەی پەروەردگار خۆی لە ژیان بەخشیندا بە کۆرپەلە دەبینێتەوە، خاسی‌یەتێکی گەورەی قۆناغی (نشاة) بریتی‌یە لەو چالاکی و گەشە کردنە خێرایەی کە سیفەتێکی جیاکەرەوەی کۆرپەلەیە لەم ماوەیەدا وەك بڵێیت پێشتر مردوو بێت و لێرەدا رۆح بکرێت بە بەریدا و تروسکەی ژیان بچێتە ناو لەشە مردووەکەیەوە!




وێنەی (١٤٠/ هـ): لە وێنەکەی لای ڕاستدا دەبینین کە چۆن سەری گەورەی کۆرپەلەکە لە قۆناغی ڕێکبوونەوە (تەعدیل)دا بچووك دەبێتەوە و لە هەمان کاتدا قاچە بچووکەکان درێژتر دەبن، ئەمەش ئەوەیە کە ئایەتی: ﴿... فَعَدَلَك ....﴾ (الإنفطار:٧) ئاماژەی پێداوە.




وێنەی (١٤١/ هـ): لەم وێنانەدا ڕێکبوونەوەی ڕوخساری کۆرپەلە دەبینین تاوەکو هاوسەنگی خۆی وەردەگرێت و شکلی مرۆڤ بە ئاشکرا دەردەکەوێت، هەروەها گۆڕانکارییەکانی ڕوخسار بە پێی تەمەنیش دەردەخات.




وێنەی (١٤٢/ هـ): لەم زنجیرە هێلکارییەدا دەبینین کە چۆن لووت لە قۆناغی ڕێکبوونەوە (تەعدیل)دا بەرێژەیی نزم دەبێتەوە و چاوەکان دێنە پێشەوە بۆ ناوەڕاستی ڕوخسار و گوێکانیش لەملاولاوە بەرز دەبنەوە، بەگشتی ڕوخساری کۆرپەلەکە هاوسەنگی ئاسایی خۆی وەردەگرێت.




**وێنەی (١٤٣/ هـ): لەگەڵ بەرەوپێش چوونی تەمەنی کۆرپەلەکەدا ڕووخساری ڕێك دەبێتەوە و شێوەی هاوسەنگی مرۆڤانە وەردەگرێت، ئەم هێڵکارییانەی سەرەوە موعجیزەی ئەو ئایەتەمان بۆ ڕوون دەکەنەوە کە باسی ئەوە دەکات لە سەرەتا کۆرپەلە لەناو منداڵداندا شێوەی مرۆڤی نییە بەڵام لە دواییدا ئەو ڕوخسارە تایبەتییەی مرۆڤ وەردەگرێت، خوای گەورە دەفەرموێت:**

﴿هُوَ الَّذِي يُصَوِّرُكُمْ فِي الأَرْحَامِ كَيْفَ يَشَاء .......﴾




**وێنەی (١٤٤/هـ): ئەم هێلکاری‌یانە گەشە کردنی پێست روون دەکەنەوە، کە تێ‌یدا دەبینین لە هەفتەی یانزەهەمدا زوربەی جیاکەرەوەکانی پێست لە (خانە رەنگکەرەکان Melanoblast) و (کەوانەکانی چینی دەرەوەی پێست Epidermal Ridges) و چینێکی ئەستوور لە (خانەکانی چینی ناوەند Intermediate Layer) و شانەی لاستیکیی (Collagenous and Elastic Fibers) ئەمانە هەمووی دروستبوون، کە ئەمە دوای دروست بوونی ئێسك و ماسولکەکان پەیدا دەبن، و پێش ماوەیەکی کەم لە تەواو بوونی دەرکەوتنی ئەندامە سێکسی‌یەکانی دەرەوە، وەك لە دەقە شەرعی‌یەکاندا هاتووە.**




**وێنەی (١٤٥/ هـ):** لەم هێڵکارییانەدا گەشە کردنی ئەندامەکانی زاووزێی نێرینە و مێینە دەبینین، لە وێنەی (A , B)دا دەبینین کە ئەندامەکانی زاووزێی نێرینە و مێینە هەمان شکڵ و گەشە کردنیان هەیە و بە تەواوەتی لەیەك دەچن لە هەفتەی چوارەمەوە تا هەفتەی حەوتەم، و لە هەفتەی نۆیەمەوە دەست دەکەن بە جیاواز بوون، وێنەکانی (D , F , H) گەشە کردنی ئەندامەکانی زاووزێی دەرەوەی مێینە لە هەفتەکانی (٩ ، ١١ ، ١٢)دا روون دەکاتەوە، و وێنەکانی (C , E , G) گەشە کردنی ئەندامەکانی زاووزێی نێرینە لە هەفتەکانی (٩ ، ١١ ، ١٢)دا دەردەخات.




ئەندامەکانی زاووزێی دەرەوەی مێینە لە هەفتەی نۆیەمدا.




ئەندامەکانی زاووزێی دەرەوەی نێرینە لە هەفتەی نۆیەمدا.

وێنەی (١٤٦/هـ): بڕوانە لێکچوونی گەورەی نێوان ئەندامەکانی زاووزێی دەرەوەی نێرینە و مێینە لە سەرەتادا.




وێنەی (١٤٧/ هـ): گەشە کردنی ئەندامەکانی زاووزێی ناوەوەی کۆرپەلە، کە لە سەرەتادا لەیەک دەچێت، و پاشان جیاواز دەبێت بۆ ئەندامی زاووزێی ناوەوەی نێرینە و ئەندامەکانی مێینە.

## چەند دیمەنێکی دەگمەن بۆ کۆرپەلە کە بە ئامێری هەناوبین گیراوە بۆ هەندێك لە جووڵەکانی لەناو منداڵدانداا



کۆرپەلە لە مانگی دووەمی سکپڕیدا.






کۆرپەلەیەك کە دەیەوێت پە نجەی بمژێت.



پەیدابوونی روخساری مرۆییانە لە مانگی دووەمی سکپڕیدا.



کۆرپەلەکە هەوڵی پە نجەمژین دەدات.



پەیدابوونی سەرەتا ئێسکی‌یەکان لە پەلی سەرەوەدا.



وێنەیەک کە بە ئامێری سۆنەر گیراوە بۆ کۆرپەلەیەکی (٥ مانگ).















لەسەرەتادا دەستی کۆرپەلە لە شێوەی سەوڵدایە، پاشان لەگەڵ پەیدابوونی ئێسك و ماسولکەدا پەنجەکان دەردەکەون و کۆرپەلەکە دەست بە جووڵاندنی دەستی دەکات.



إمكان تحريك الأصابع مع بداية الشهر الثالث



أطراف الأصابع وقد كساها اللحم مع نهاية الشهر الثاني





إمكان تحريك الأصابع مع بداية الشهر الثالث



الجنين في الشهر الثالث يتحرك في سهولة

دوای پەیدابوونی ئێسك و ماسولکە کۆرپەلەکە دەتوانێت بە شێوەیەکی سەربەست دەستی بجوولێنێت، کە ئەمەش یارمەتی دەدات هەموو لەشی لەناو شلەی ئەمنیۆنیدا بجوولێنێت و سەربەستانە مەلە بکات.




چەند وێنەیەکی ناووکە پەتکە، (الحبل السري) (Umbilical Cord) کە کۆرپەلەکە لەگەڵ دەست کردنی بە جووڵە لەناو منداڵداندا هەوڵ دەدات بیگرێت (ئەمە دیمەنێکی زۆر دەگمەنە!!).



کۆرپەلە لە دوای مانگی سێیەمەوە سیمای مرۆڤ وەردەگرێت، کە ئەم کردارە میهرەبانی پەروەردگاری بە ئاشکرا پێوە دیارە، بۆیە ئێمەش وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەبێت کڕنووش بۆ پەروەردگار ببەین و بڵێین:
﴿اللَّهُمَّ لَكَ سَجَدْتُ وَبِكَ آمَنْتُ وَلَكَ أَسْلَمْتُ، سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذِي خَلَقَهُ وَصَوَّرَهُ وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ تَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ﴾.





الجنين في الشهر الثالث وقد تكونت الجفون والتصقت لمدة ثلاثة شهور أخرى

لەگەڵ گەشە کردنی ئەندامەکانی و تەواو بوونی دروست بوونی ئێسك و ماسولکەکان کۆرپەلەکە چەند جووڵەیەك ئەنجام دەدات، وەك ئەوەی بڵێیت ئەوە ئاشکرا دەکات کە زیندەوەرێکی نوێ پەیدا بووە و پێویستە لە داهاتوودا حیسابی تایبەتی خۆی بۆ بکرێت!.



الحبل السري وقد أوشك الجنين على الامساك به



إمكان تحريك الأصابع مع بداية الشهر الثالث




**وێنەی (١٤٨/هـ)**: لەم هێڵکارییانەدا دەبینین کە چۆن کۆرپەلەی زۆرێك لە زیندەوەران لە قۆناغە سەرەتاییەکانیاندا لەیەك دەچن و لە دواییدا جیاواز دەبن، بەپێی ئایەتی پیرۆزی: ﴿ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ﴾ ((المؤمنون:١٢-١٤)).




**وێنەی (١٤٩/ هـ)**: چەند دیمەنێکی ڕاستەقینەی کۆرپەلە لە مانگی چوارەمیدا کە پەلەکانی و هێڵەکانی ڕوخساری بە ئاشکرا دەرکەوتوون.






بسم الله الرحمن الرحيم
﴿يا أيها الناس إن كنتم في ريب من البعث فإنا خلقناكم من


تراب ثم من نطفة ثم من علقة
ثم من مضغة مخلقة وغير
مخلقة لنبين لكم ونقر في
الأرحام ما نشاء إلى أجل مسمى
ثم نخرجكم طفلا ثم لتبلغوا أشدكم﴾


[سورة الحج: ٥]




الجنين في عمر أربعة أشهر،
بطول ٢٤ سنتميتراً، ورغم أن
الحركات تبدأ قبل هذا العمر
إلا أنها من الآن تكون إرادية
ومنتظمة نظراً لاستكمال
ألياف الجهاز العصبي وألياف
العضلات والعظام قال صلى
الله عليه وسلم: ( إن أحدكم

يجمع خلقه في بطن أمه أربعين يوما نطفة، ثم يكون علقة
مثل ذلك، ثم يكون مضغة مثل ذلك، ثم يرسل إليه الملك فينفخ
فيه الروح ).



وێنەی (١٥٠/هـ): چەند دیمەنێکی
ڕاستەقینەی کۆرپەلە لە قۆناغی
گەشە کردن (النشأة)دا، کە دەبینین
وێنەی مرۆڤی وەرگرتووە و دەتوانرێت
بە ئاسانی ڕەگەزەکەشی دیاری بکرێت
(وەك لە وێنەکەی لای چەپدا دیارە).







وێنەی (١٥١/هـ): پێگەیشتنی ئەندامەکانی بیستن و بینین (گوێکان و چاوەکان) لە قۆناغی گەشە کردندا دەبێت و بۆ یەکەم جار کۆرپەلە لە سکی دایکیدا دەبیستێت و وەڵامی بۆ کارتێکەرە دەرەکییەکان دەبێت.

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ ⑭﴾ [سورة المؤمنون: ١٤]

# القرآن يكشف أسرار الأرحام
# ثم أنشأناه خلقا آخر


وێنەی (١٥٢/ هـ)

يبدأ طور النشأة في الأسبوع التاسع إلى الثاني والعشرين، ويتميز بما يلي:

- البطء في أوله عقب طور اللحم ثم السرعة الهائلة في النمو ليكتمل الشكل الطبيعي للجنين.
- اكتمال الهيكل العظمي وتميز الجلد وظهور الشعر الزغبي.
- بداية ظهور الحركة نظرا لتطور نمو العضلات.
- تميز الأعضاء الجنسية وظهوره ذكراً أم أنثى بصورة نهائية (الأسبوع ١٢).
- في نهاية هذا الطور تكون أعضاء الجنين قد اكتملت وأصبحت مؤهلة للقيام بوظائفها.
- والخلاصة، إنه طور فاصل بين مرحلتين أساسيتين جزمت بهما جميع المصادر المتخصصة، مرحلة (الحميل) FEATUS، ومرحلة (الجنين) EMBRYO.

من كان يعلم ذلك في القرن السابع الميلادي ؟! ومن علم محمدا صلى الله عليه وسلم به في ذلك الزمن السحيق ؟!

يقول الله تعالى: ﴿وَلِيَعْلَمَ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ أَنَّهُ الْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَيُؤْمِنُوا بِهِ فَتُخْبِتَ لَهُ قُلُوبُهُمْ وَإِنَّ اللَّهَ لَهَادِ الَّذِينَ آمَنُوا إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ ⑤④﴾ [سورة الحج: ٥٤

الجنين فى الشهر
الخامس بستطيع
نحربك أصابعه

الأصوات الحبة
والأصوات الصاخبة
يسمعها الجنين مع
الشهر الخامس



الجنين فى الشهر السادس مع سهولة حركة الأطراف

**وێنەی (١٥٣/ھ): هەندێك دیمەنی ڕاستەقینەی تر بۆ کۆرپەلە و جووڵەکانی لە قۆناغی گەشەکردن ( النشأة )دا.**




**وێنەی (١٥٤): کۆرپەلە لە مانگە کۆتاییەکانی سکپڕیدا.**




وێنەی (١٥٥/هـ): کۆرپەلە لەنێو پەردەکانیدا بەدڵنیاییەوە گەشە دەکات.






**وێنەی (١٥٦/هـ):** لەگەڵ تەواو بوونی گەشە کردنیدا، لەشی کۆرپەلەکە خۆی و سیستمی لەشی دایکیشی کارێکی وا دەکەن کە ئەم دروستکراوە نوێیە بێتە ژیان و لە دونیایەکی تەسکەوە بێتە ناو دونیایەکی فراوانتر.




هذا هو القادم من عالم الغيب البعيد، العابر عبر الزمن السحيق، الإنسان الحامل لكل السر الأزلي في هذا الكون الشاسع، الناظر بما صوره الله تعالى فأحسن صورته ووهبه السمع والبصر والحياة.




## وێنەی ژمارە
## (١٥٨/هـ)

لەم وێنە راستەقینانەدا چەند منداڵێك دەبینین کە پێش کاتی خۆیان ( پێش ٩ مانگی ) لەدایك بوون ( ٧ مانگ ، ٨ مانگ )، و زۆر بە ئاسایی توانیویانە لە ژیاندا بەردەوام بن، کە سەلمێنەری ئەو راستی‌یەیە منداڵ پێش ٩ مانگی دەتوانێت بژی، هەروەك لە دەقە شەرعی‌یەکاندا هاتووە کە کەمترین ماوەی سکپڕی بریتی‌یە لە ٦ مانگ.




وێنەی (١٥٩/هـ): لە کۆتایی ٩ مانگ سکپڕیدا کۆرپەلەکە باری گونجاوی خۆی وەردەگرێت وەك خۆئامادە کردن بۆ لەدایك بوون، بەشێوەیەك کە سەری بۆ خوارەوە دەبێت وپەستان دەخاتە سەر ڕێڕەوی منداڵبوون کە فاکتەرێکی یاریدەدەرە بۆ ئەم پرۆسە ئاڵۆزە.






**وێنەی (١٦٠/هـ): زنجیرەیەك هێلكاری كە پرۆسەی لەدایك بوون روون دەكاتەوە، كە ئاشكرایە ئەگەر لەرێی ئەم كردارە بە ئازار و ئەشكە نجەیە نەبووایە ئەوا ئەم زیندەرەوە نایابە نەیدەتوانی بێتە بوون.**




**وێنەی ژمارە (١٦١/هـ):**

**ئەم هێلکاری‌یانە پرۆسەی لەدایك بوونی کۆرپەلە روون دەکاتەوە، کە میکانیزمێکی ئاڵۆز کۆنترۆڵی ئەم کردارە دەکات بۆ ئەوەی سەرەنجام بە سەرکەوتوویی کۆتایی بێت.**

ملی منالآن لەکاتی لەدایك بووندا فراوان دەبێت، هەروەها کۆرپەلەکەش بەهۆی زنجیرەیەك جووڵەی لەشیی و خول خواردن لە منالدانەوە دێتەدەرەوە، لەگەڵ ئەمانەشدا منالدان لە سەرەتادا بە پلەی (٩٠) خوار دەبێت بەنیسبەت ڕێڕەوی زاووزێوە، کە پاشان ئەم خواری‌یە کەمێك ڕێك دەبێتەوە، ئەمەش هەمووی بۆ ئەوەیە کە مانای ئایەتی پیرۆزی: ﴿ثُمَّ السَّبِيلَ يَسَّرَهُ﴾ بێتەدی.




لقد امتن الله تعالى على الإنسان بتيسير سبيله من داخل الرحم إلى خارجه وقد عد الكثيرون هذه النعمة لا مجال لذكرها، ولكن بتأمل حال الجنين عند نزوله على غير الهيئة المعتادة (في الصورة الجنين ينزل معكوساً بالقدمين بدلاً من الرأس) فإن الأطباء يواجهون متاعب هائلة للحفاظ على حياته، وربما لجأوا إلى الآلات الحديدية القاسية للمعاونة على تخليص الرأس المختنقة بين عظام حوض الأم وتحت مطارق الرحم العنيفة، فسبحان من يسره السبيل.



بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

﴿يَا أَيُّهَا الْإِنسَانُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ الْكَرِيمِ ۝ الَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّاكَ فَعَدَلَكَ ۝ فِي أَيِّ صُورَةٍ مَّا شَاءَ رَكَّبَكَ ۝﴾ (سورة الانفطار: ٦ - ٨)

قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: يقول الله عز وجل (ابن آدم أنى تعجزني وقد خلقتك من مثل هذه؟ حتى إذا سويتك وعدلتك مشيت بين برديك وللأرض منك وئيد، فجمعت ومنعت، حتى إذا بلغت التراقي قلت أتصدق، وأنى أوان الصدقة). رواه أحمد وابن ماجه.

وێنەی (١٦٢/هـ): ساتی یەکەمی هاتنە دونیای ئەم بەرهەمە نایابە!







**وێنەی (١٦٤/هـ): ساتی هاتنە دەنیای کۆرپەلەکە و بڕینی ناووکە پەتک.**

**ئەم وێنە ڕاستەقینانەی قۆناغەکان و هەفتەکانی گەشە کردنی کۆرپەلە دووبارە ئەم پرۆسە پڕ ووردەکاری و سەرسوڕهێنەرەمان دەخاتەوە بەرچاو:**



وێنەیەکی کۆرپەلە لە ڕۆژانی (٢٤-٢٥)دا، واتە لە قۆناغی خۆهەڵواسەر (عەلەقە)دا.






وێنەیەکی گەورە کراوی کۆرپەلە لە هەفتەی چوارەمدا، دەبینین لە گۆشتپارە دەچێت.



وێنەیەکی گەورەکراوی کۆرپەلەیە لە هەفتەی پێنجەمیدا : چاوەکانی دیارن، و دەستەکان و قاچەکان لە شێوەی سەوڵدان، و پێشکەوتنێکی گەورە لە دروستبوونی پەیکەری مرۆییدا هەیە.



کۆرپەلە لە تەمەنی ٥ هەفتە و نیوەدا درێژییەکەی (١ سم)ە.



جنين عمره من ٤٠-٤٢ يوما

دوو وێنەی کۆرپەلە لە هەفتەی شەشەمدا، بەئاشکرا ناووکە پەتک دەبینرێت کە بەستراوەتەوە بە وویلاشەوە کە وردە وردە دروست دەبێت، هەروەها دەتوانین گەشە کردنی سەرەتای چاوەکان و پەلەکان جیا بکەینەوە (گەشە کردنێکی بەرچاو دەبینین بە بەراورد بە هەفتەکانی پێشتر).



وێنەیەك لە دواوە بۆ کۆرپەلەیەك لە کۆتایی هەفتەی شەشەم و سەرەتای هەفتەی حەوتەمدا، لە وێنەکەدا لەلای چەپ توورەکەی زەردێنە و لەلای ڕاست ووێلاش دەبینین، بە درێژی کۆرپەلەکەش بڕبڕەی پشت دەبینین کە جیاواز بووە، بەشی سەرەوەش سەر نییە چونکە سەری کۆرپەلەکە چەماوەتەوە بۆ پێشەوە.



کۆرپەلە لە هەفتەی حەوتەمیدا.







ئەم وێنانە کۆرپەلەن لە هەفتەی هەشتەمیدا، ئەم هەفتەیەش بەشێکە لە قۆناغی سەرەکی دووەم بۆ گەشە کردنی کۆرپەلە، کە لەم قۆناغەدا کۆرپەلەکە پێی دەووترێت (Foetus)، ئەم وێنانە روونی دەکەنەوە کە هێڵە سەرەکی‌یەکان و ئەندامە گرنگەکان دروست بوون و ئیتر گەشە کردنەکە بەرەو زیادبوونی قەبارە دەبێت لەگەڵ تەواو کردنی هەندێک پێکهاتەدا.



چەند دیمەنێکی کۆرپەلە لە هەفتەی نۆیەم و دەیەمی گەشە کردنیدا، دەبینین پێلووەکان جیاوازبوون بەڵام هێشتا داخراون.




*By the sixth week of your pregnancy, the fetus, as it is now called, is 12mm (just over half an inch) long and is recognizably human. At eight and a half weeks (below) all the features of the fetus are recognizable.*

*The fetus at twelve weeks (left).*



کۆرپەلە لە هەفتەی چواردەیەمیدا ( واتە: هەفتەی دووەمی مانگی چوارەمی )، لەم کاتەدا جووڵەکانی بە بەهێزی جیادەکرێنەوە، و سیستمی سووڕانی خوێنی ووردە ووردە باشتر دەبێت.



کۆرپەلە لە هەفتەی شانزەیەمیدا



کۆرپەلە لە هەفتەی حەڤدەهەمیدا



کۆرپەلە لە هەفتەی هەژدەهەمیدا کە زوربەی ئەندامەکانی دروست بوون، ولەم دیمەنەدا دەبینین هەوڵ دەدات کە پەنجەی بمژێت.



کۆرپەلە
لە
هەفتەی
بیستەمیدا



کۆرپەلە
لە
هەفتەی
(٢٢)دا





کۆرپەلە لە مانگی شەشەمی گەشە کردنیدا، لە وێنەکاندا ناووکە پەتك و ووێلاش دەبینرێن کە ڕۆڵی سیەکان و گورچیلەکان و کۆئەندامی هەرسی بۆ دەبینێت.

کۆرپەلەکە لە جووڵەیەکی خۆویستانەدا دەبینین کە لە دوای مانگی چوارەمەوە ڕوودەدات و بریتییە لە پەنجەمژین، ئەم کردارە وەك مەشق کردنێك دەبێت بۆ هەستان بە کرداری شیرخواردن کە دوای لەدایکبوون پێویستێتی.



وێنەی کۆرپەلەیەك لە مانگی حەوتەمیدا، تێبینی پەردەی ئەمینیۆنی و شلەی ناوی بکە کە بواری پێدەدات هەستێت بە کردارە خۆویست و خۆنەویستەکانی، کە وەك ووتمان لە مانگی چوارەمەوە زیاد دەکات، کە تەنها ئەمە یەك کردارە لە ئەرکەکانی شلەی ئەمینیۆسی.



وێنەیەکی تری کۆرپەلەیەکی ٧ مانگ کە دەبینین بە هەمان شێوە بە پەردەی ئەمینیۆنی دا پۆشراوە کە دەیپارێزێت لە گۆڕانکارییەکانی ئاووهەوا و پلەی گەرما و هەروەها لە هێرشی میکرۆبەکانیش دەیپارێزێت.






کۆرپەلە
لە
مانگی
نۆیەمیدا

## زاراوە قورئانی یەکان لە تەرازووی زانستی کۆرپەلەزانی نوێ‌دا

# معجزة المصطلح العلمي في القرآن الكريم

## معجزة لغوية علمية في كتاب الله




• أعلى، (النطفة) حال إنقسامها بعد ثلاثة أيام.
• وسط، (العلقة) حيث (تتعلق) بجدار الرحم.
• أسفل ـ (المضغة) بعد ٢٤ يوماً. لاحظ آثار الأسنان (كأنها مضغت بالفم).







إن علماء العالم غرباً وشرقاً لم يلتفتوا الى أهمية اختيار المصطلح اللغوي المناسب للحقيقة العلمية فخرجت مصطلحاتهم العلمية إما مضللة، أو مخالفة، أو مضحكة تثير السخرية.

وبمراجعة الآيات الكونية والنفسية في كتاب الله تظهر الإهتمام التام باختيار المصطلح العلمي المعبر أتم تعبير عن الحقيقة، وهذا المثال في علم الأجنة يظهر ذلك جلياً .

- إنه يحتوي وصفاً دقيقاً لكل مرحلة جنينية من حيث الظاهر .
- إنه يحتوي وصفاً دقيقاً للتغيرات الجنينية الداخلية في كل مراحلها.
- إنه يستخدم اللفظ الأمثل بحيث تنطبق (الحقيقة العلمية) في كل جانب من جوانبها، (الحقيقة اللغوية) في كل جانب من استخداماتها المعجمية.
- إن ذكر (المصطلح العلمي القرآني) يؤدي فوراً إلى تصور كامل عن (الواقعة العلمية) التي انزل من أجلها.
- إن لفظة، نطفة ـ علقة ـ مضغة غير مخلقة، تشرح ببساطة ودقة تعريف ووصف كل مرحلة من مراحل الجنين.

**إنه المنهاج العلمي القرآني الذي على حضارة العلوم أن تنهج على أثره**




کۆرپەلە لە قۆناغە سەرەتاییەکانی گەشەکردنیدا




**Figure 9-1.** Development begins at fertilization, about 14 days after the onset of the last menstruation. On a daily basis, the nutfah stage, involving cleavage of the zygote in the uterine tube and implantation of the blastocyst, and the takhliq stage, involving early development of the embryo until the 8th week, are shown. Development in the fetal or nash'ah stage is shown in weeks 9 and 10. Finally, the growth in the nash'ah stage is shown for the remainder of the pregnancy. (Reproduced with permission from Moore, Keith L., *The Developing Human, Clinically Oriented Embryology*, 4th edition, W.B. Saunders Co., Philadelphia, 1988)



# قۆناغەکان و بەشەکانی قۆناغ و ڕووداوەکانی گەشە کردنی کۆرپەلە کە لە دەقە شەرعی یەکاندا هاتووە

## خشتەی ژمارە (٤): قۆناغەکانی دروستبوون و گەشەی کۆرپەلە لەژێر رۆشنایی چەند ئایەت و فەرموودەیەکدا:

| زنجیرەی قۆناغەکان | دەقی یەکەم: سوورەتی (المؤمنون) ئایەتەکانی (١٢-١٤) | دەقی دووەم: سوورەتی (القیامة) ئایەتەکانی (٣٦-٣٩) | دەقی سێیەم: سوورەتی (الحج) ئایەتی (٥) | دەقی چوارەم: سوورەتی (الإنفطار) ئایەتی (٧) | دەقی پێنجەم: ئەو فەرموودەیەی ئیمامی (موسلیم) گێڕاویەتەوە |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | وَلَقَدْ خَلَقْنَا الإِنْسَانَ مِنْ سُلالَةٍ مِّنْ طِينٍ، ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ | أَيَحْسَبُ الإِنْسَانُ أَنْ يُتْرَكَ سُدَى، أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ يُمْنَى | يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّنَ الْبَعْثِ فَإِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ | الَّذِي خَلَقَكَ | إِذَا مَرَّ بِالنُّطْفَةِ ثِنْتَانِ وَأَرْبَعُونَ لَيْلَةً |
| ٢ | ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً | ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً | ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ | | |
| ٣ | فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً | فَخَلَقَ | ثُمَّ مِن مُّضْغَةٍ مُّخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ لِّنُبَيِّنَ لَكُم | | |
| ٤ | فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا | فَسَوَّى | وَنُقِرُّ فِي الأَرْحَامِ مَا نَشَاءُ إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى ثُمَّ نُخْرِجُكُمْ طِفْلاً ...... | فَسَوَّاكَ | بَعَثَ اللَّهُ إِلَيْهَا مَلَكًا فَصَوَّرَهَا وَخَلَقَ سَمْعَهَا وَبَصَرَهَا وَلَحْمَهَا وَعِظَامَهَا |
| ٥ | فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا | | | | |
| ٦ | ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ | فَجَعَلَ مِنْهُ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالأُنثَى | | فَعَدَلَكَ | وَجِلْدَهَا<br>ثُمَّ قَالَ: يَا رَبِّ أَذَكَرٌ أَمْ أُنْثَى ..... |

لێرەدا وەکو پوختەیەك بۆ باتەکەمان ریزبەندی‌یەکی تەواو بۆ قۆناغەکانی گەشــە کردنــی کۆرپەلــە و بەشــەکانی ئــەم قۆناغانــە و رووداوەکــانی ناویــان دەکەین، بۆ ئەوەی ئەو راستی‌یە دووبارە بسەلمێنین کە ئەو ریزبەندی‌یەی لـە قورئـان و سـوننەتی پـیرۆزدا هـاتووە باشـترین ریزبەندی‌یـە بـۆ قۆناغـەکانی گەشــە کردنــی کۆرپەلــە و لــە رووی کۆرپەلــەزانی ئــەمڕۆوە زۆر زانسـتی و واقیعی و بێ‌وێنەیە.

ئەگەر ئێمە ئەو دەقانـەی قورئـان و سـوننەت پێکـەوە کۆبکەینـەوە دەبینین کە یـەکتری تـەواو دەکـەن، لەگـەڵ ئەوەشـدا کـە ئـەم دەقانـە بە پـەرت و بڵاوی دابەزیون و شوێنەکانیان جیاوازە لە قورئانی پیرۆزدا، حیکمـەت و دانـایی لـە بڵاوکردنەوەی ئـەو ئایەتانـەی کـە باسـی گەشـە کردنـی کۆرپەلـە دەکـەن لەناو قورئانی پیرۆزدا بـە تایبـەتی و هـەروەها ئایەتـە گەردوونی‌یـەکان بەگشـتی لـە چـەندین شـوێنێکی جیـاوازدا، و جیاکردنـەوەیان لـە یـەکتری، لـەم خاڵانـەدا خۆی دەبینێتەوە:

١- ئایەتـە گەردوونی‌یـەکان لـە چـەند شـوێنێکی دیـاری کـراو لـە قورئانـدا بـاس کــراون بــەهۆی بــوونی هۆکارێــك بــۆ بــاس کردنیــان، بــۆ نموونــە ئــەو ئایەتانەی باسـی بوومەلـەرزە دەکـەن لـەو شـوێنانەدا هـاتوون کـە باسـی رۆژی دوایی و زیندوو بوونەوەی تێدایە.

٢- بـاس کـردن و زانینـی تەفصـیل و درێـژەی دیـاردە گەردوونی‌یـەکان لـە ئامانجەکانی دابەزاندنی نیگا و وەحی خـودایی نی‌یـە، بـەڵام ئامـاژە پێـدانیان هۆکارێکـە بـۆ گەیشـتن بـە هیدایـەت و رێنومـایی، قورئـانی پیرۆزیـش کاتێـك باسی زیندەوەرەکان و نهێنی‌یەکانی دروست بوون بە کورتی دەکات مەبەست پێی ناسینی ناوە بەرزەکان و سیفاتەکانی خودایە، و مەبەست لێیـان بریتـی نی‌یە لە باس کردنی سیفاتی دروست کراوەکان بە دوور ودرێـژی، بـەڵکو ئـەم

بابەتــە بــەجێهێڵراوە بــۆ لێکۆڵینــەوەی مــرۆڤ و گــەڕانی بــە شــوێن ڕاستی‌یەکانی‌دا، کەواتە کاتێك ئایەتێکی گەردوونی باس دەکرێت مەبەست لێی دەرخستنی ووردەکاری‌یە لە دیاردەکانی دروست بووندا، و باس کردنی حیکمەت و داناییە لە پشت دروست کردنیان، ئەویش بۆ گەیشتن بە ڕاستی‌یە رەهاکان و زانینی ناوەکان و سیفاتە بەرزەکانی پەروەردگار.

٣- ئەگەر بهاتایە و هەموو ئایەتە گەردوونی‌یەکان لە یەك شوێنی قورئاندا کۆبکرانایەتەوە ئەوا تێگەیشتنیان زۆر قورس دەبوو پێش گەیشتن بە هۆکارە زانستی‌یەکانی ئەمڕۆ.

لەوانەشە ئەم جیاکردنەوەیە هۆکارێکی پێویست بووبێت بۆ دۆزینەوەی ڕاستی‌یەکانی دروست بوونی کۆرپەلە لە داهاتوودا، هەروەك خوای گەورە خۆی پێمان رادەگەیەنێت: ﴿خُلِقَ الْإِنسَانُ مِنْ عَجَلٍ سَأُرِيكُمْ آيَاتِي فَلَا تَسْتَعْجِلُونِ﴾ (الأنبياء:٣٧)، واتە: ئەوەندە ئینسان بە پەلە و تاڵوکەیە (هەر دەڵێیت) لە پەلە و تاڵوکە دروست کراوە، لە ئایندەدا من نیشانە و بەڵگەکانی خۆمتان نیشان دەدەم، جا پەلەم لێمەکەن، کەواتە پێویستە ئەو ئایەتە گەردوونی‌یانە بڵاوبکرێنەوە ئەویش بە مەبەستی پێدانی هەق بە هەموویان لە رووی لێکۆڵینەوە و توێژینەوەیان و پەلە نەکردن لە تێگەیشتنیاندا، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقُرْآناً فَرَقْنَاهُ لِتَقْرَأَهُ عَلَى النَّاسِ عَلَى مُكْثٍ وَنَزَّلْنَاهُ تَنْزِيلاً﴾ (الإسراء:١٠٦)، واتە: ئێمە قورئانیشمان بەش بەش کردووە تا بە شێنەیی و ئارامی بیخوێنیتەوە بەسەر خەڵکی‌دا، هەر ئێمەش بەو شێوەیە دامانبەزاندووە، پێویستیشە ماوەیەکی زەمەنی بڕوات کە لەگەڵ پێشکەوتنی زانستی‌دا وورده وورده ببنە هۆی کۆکردنەوەی ئایەت و فەرموودەکان لە زنجیرەیەکی یەکتری تەواوکەردا، هەروەك پەروەردگار خۆیشی ئاماژەی پێداوە و دەفەرموێت: ﴿لِّكُلِّ نَبَإٍ مُّسْتَقَرٌّ وَسَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾ (الأنعام:٦٧)، واتە: بۆ

هەموو هەواڵێك (کە لە قورئاندا هاتووە) کات و شوێنی بەدیهاتنی خۆی هەیە و لە ئایندەشدا دەیزانن.

قۆناغ (مرحلة) وەك لە فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبیدا هاتووە: بریتی‌یە لەو دووری‌یەی کە موسافیرێك لە ماوەی یەك رۆژدا دەیبڕێت، لە زاراوەی کۆرپەلەزانیشدا بریتی‌یە لەو ماوە زەمەنی‌یەی کە دوو خاڵی گۆڕان لە ژیانی کۆرپەلەکەدا لەیەك جیادەکاتەوە، ئەو گۆڕانکاری‌یانەش لە ناوەوە و دەرەوەی کۆرپەلەکەدا روودەدەن و وای لێدەکەن کە لە سروشتێکەوە بگۆڕێت بۆ سروشتێکی تر،وەك ووتمان لە قورئانی پیرۆزدا باسی سێ قۆناغی سەرەکی لە دروست بوونی کۆرپەلەدا هاتووە:

١- قۆناغی هێلکەی پیتێنراو (یان قۆناغی النطفة): کە لە کاتی پیتاندنی هێلکەی ئافرەتەوە لەلایەن سپێرمەکانەوە دەست پێدەکات و تا کاتی خۆچاندن و رۆچوونی زایگۆتەکە بۆ ناو دیواری مناڵدان دەخایەنێت، بۆیە ئەم ناوەشی لێنراوە (کە بە مانای تنۆکێك ئاو دێت) لەبەر ئەوەیە کە لەگەڵ هەموو ئەو گۆڕانکاری‌یانەی کە لەم کاتەدا روودەدەن، شکڵ و پێکهاتەی کۆرپەلەکە لە شێوەی تنۆکێك ئاو دەرناچێت.

٢- قۆناغی دروست بوون (مرحلة التخليق): ئەمیش لە سەرەتای خۆهەڵواسینی کۆرپەلەکە بە دیواری مناڵدانەوە دەست پێدەکات و تا کۆتایی داپۆشینی ئێسکەکان بە ماسولکە دەخایەنێت، بۆیە پێی دەووترێت قۆناغی دروست بوون لەبەرئەوەی تێیدا خانەکان زۆربوونێکی گەورە بەخۆیانەوە دەبینن و هەموو ئەندامەکانی لەشی تێدا دروست دەبێت (وەك دەستەکان و قاچەکان و دڵ و جگەر، و ....هتد)، هەروەها لەم قۆناغەشدا ئێسکەکان پەیدا دەبن و بە ماسولکەش دادەپۆشرێن، دەتوانین ناوێکی تر لەم قۆناغە بنێین ئەویش بریتی‌یە لە (قۆناغی دروست بوونی لەشی مرۆڤ).

٣- قۆناغی گەشە کردن (مرحلة النشأة): کە لە کاتی رێکبوونەوەی (التعدیل)ی لەشی کۆرپەلەکە دەست پێدەکات و تا کاتی لەدایك بوون دەخایەنێت، لەم قۆناغەدا دیاردەی گەشە کردن و زیاد بوونی قەبارەی کۆرپەلەکە زاڵە بەسەر هەموو شتێکی تریدا.

ئەمانەی باسمان کردن قۆناغە سەرەکییەکانی دروست بوونی کۆرپەلەن کە هەر یەکێکیان چەند قۆناغێك و چەند بەشێك و چەند رووداوێکی لاوەکی لەخۆ دەگرن.

**کاتەکانی رووداني کردارەکانی دروست بوون لە قورئان و سوننەتدا :**

وەسف کردنی قۆناغەکانی دروست بوونی کۆرپەلە بە دوورودرێژی لە قورئان و سوننەتی پیرۆزدا خۆی لەخۆیدا ئیعجازێکی گەورەیە، ئەویش بەهۆی ئەو وردەکارییە گەورانەی کە روودەدەن لە کاتی گەشە کردنی کۆرپەلەکەدا، لە هەمان کاتیشدا دیاری کردنی کاتەکانی رووداني ئەو قۆناغ و دروست بوونانە ئیعجازی زانستی ئایەت و فەرموودەکان تەواو بەهێز دەکات.

ئەگەر ئێمە سەیری ئەو دەقە قورئانی و فەرموودانە بکەین کە پەیوەندییان هەیە بە بابەتی قۆناغەکانی دروست بوونی کۆرپەلەوە (لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم بابەتە لە یەك سوورەت یان یەك فەرموودەدا کۆنەکراوەتەوە) دەبینین هەندێك لەم دەقانە کاتێکی بنەڕەتی بۆ قۆناغەکانی دروست بوونی کۆرپەلەکە دیاری دەکەن، هەروەك فەرموودەی: ﴿فَإذا كانَ يَومُ السَّابِع، جَمَعَهُ اللهُ تَعالى، ثُمَّ أَحْضَرَ لَه كلَّ عِرْقٍ بَينَه وَبَينَ آدَم ثُمَّ قَرَأَ: [فِي أَيِّ صُورَةٍ مَّا شَاء رَكَّبَكَ] (الإنفطار:٨)﴾ رواه الطبراني والبيهقي وابن منده، هەروەها فەرموودەی: ﴿إِنَّ أَحَدَكُم يُجْمَعُ خَلْقُهُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ أَرْبَعِينَ يَوْماً، ثُمَّ يَكُونُ فِي ذَلك عَلَقَةً مِثْلَ ذَلك، ثُمَّ يَكُونُ فِي ذَلك مُضْغَةً مِثْلَ ذَلك ....﴾ رواه مسلم، کە ئەگەر بێتو ئەم دەقانە کۆبکەینەوە لە

یەکەیەکی بابەتیدا دەبینین ئەم قۆناغانە بە شێوەیەکی وا رێك و پێك ریزدەبن کە زۆر سەرنج راکێشە.

لێرەدا بابچینە سەر درێژەی ئەو قۆناغ و بەش و رووداوانەی کە لە قورئان و سوننەتدا دەربارەی دروست بوونی کۆرپەلە هاتوون لەگەڵ کاتەکانیاندا، کە بەم شێوەیە دابەشیان دەکەین، و هەمووشیان بە قۆناغ ناودەبەین:

**بەشی (یان قۆناغی یەکەم):** بریتییە لە دروست بوونی پێکهاتەکانی ئاوی پیاو و ئافرەت، کە لەم دەقەدا هاتووە: ﴿خُلِقَ مِن مَّاء دَافِقٍ، يَخْرُجُ مِن بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ﴾ (الطارق: ٥-٧).

**قۆناغی دووەم:** دروست بوونی نوتفەکان لە کاتێکی پێشتردا و هەڵگرتنی سیفاتە زاڵ و بەزیوەکان و هەڵگرتن و عەمبار کردنیان بە کاتیی لە عەمبارێکی دیاری کراودا، لە ئایەتی: ﴿وَهُوَ الَّذِيَ أَنشَأَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ فَمُسْتَقَرٌّ وَمُسْتَوْدَعٌ قَدْ فَصَّلْنَا الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَفْقَهُونَ﴾ (الأنعام:٩٨)، و فەرموودەی: ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ أَعْرَابِيًّا أَتَى رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ امْرَأَتِي وَلَدَتْ غُلاَماً أَسْوَدَ وَإِنِّي أَنْكَرْتُهُ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: « هَلْ لَكَ مِنْ إِبِلٍ »، قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: «مَا أَلْوَانُهَا»، قَالَ: حُمْرٌ، قَالَ: « فَهَلْ فِيهَا مِنْ أَوْرَقَ »، قَالَ: نَعَمْ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): « فَأَنَّى هُوَ »، قَالَ: لَعَلَّهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ يَكُونُ نَزَعَهُ عِرْقٌ لَهُ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ (ﷺ): « وَهَذَا لَعَلَّهُ يَكُونُ نَزَعَهُ عِرْقٌ لَهُ»﴾ رواه مسلم.

**قۆناغی سێیەم:** دەرپەڕانی ئاوەکانی پیاو و ئافرەت، لە ئایەتی: ﴿خُلِقَ مِن مَّاء دَافِقٍ، يَخْرُجُ مِن بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ﴾ (الطارق: ٥-٧).

**قۆناغی چوارەم:** سەرکەوتن و زاڵ بوونی هەندێك لە نوتفەکانی پیاو و ئافرەت بەسەر یەکتریدا، لە فەرموودەی: ﴿مَاءُ الرَّجُلِ أَبْيَضُ وَمَاءُ الْمَرْأَةِ أَصْفَرُ فَإِذَا اجْتَمَعَا فَعَلاَ مَنِيُّ الرَّجُلِ مَنِيَّ الْمَرْأَةِ أَذْكَرَا بِإِذْنِ اللَّهِ وَإِذَا عَلاَ مَنِيُّ الْمَرْأَةِ مَنِيَّ الرَّجُلِ آنَثَا بِإِذْنِ اللَّهِ﴾ رواه مسلم.

**قۆناغی پێنجەم:** بەیەك گەشتنی دوو نوتفەکەی پیاو و ئافرەت و تێکەڵاو بوونیان، کە سەرەنجام دروست بوونی خانەی یەکەمی کۆرپەلەکە و دیاری کردنی ڕەگەزەکەی لێدەکەوێتەوە: ﴿إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعاً بَصِيراً﴾ (الدهر:٢).

**قۆناغی شەشەم:** کۆچ کردنی نوتفە تێکەڵاوەکە بۆ ناو مناڵدان، هەروەك لە دەقەکانی: ﴿خُلِقَ مِن مَّاء دَافِقٍ، يَخْرُجُ مِن بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ﴾، هەروەها فەرموودەی: ﴿إِذَا وَقَعَت النُّطْفة فِي الرَّحِم، بَعَثَ اللهُ مَلَكاً فَقال: يا ربّ مُخَلَّقة أو غير مُخَلَّقة؟ فإن قالَ: غَيْرُ مُخَلَّقة، مَجَّتْها الأَرْحامُ دَماً، وَإِن قال: مُخَلَّقة، قالَ: يا رَبِّ فَما صِفَة هَذه النُّطْفة؟﴾ رواه الطبري والطبراني بإسناد صحيح.

**قۆناغی حەوتەم:** توانەوەی ناوکی هێلکەکە و سپێرمەکە لە یەکتریدا، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ مِنَ الْمَاء بَشَرًا فَجَعَلَهُ نَسَبًا وَصِهْرًا وَكَانَ رَبُّكَ قَدِيرًا﴾ (الفرقان:٥٤).

**قۆناغی هەشتەم:** ئەندازە بۆدانانی نوتفەکە (التقدير)، لە ئایەتی: ﴿مِن نُّطْفَةٍ خَلَقَهُ فَقَدَّرَهُ﴾ (عبس:١٩).

**قۆناغی نۆیەم:** دوولەت بوونی نوتفەکە ﴿إِنَّ اللّهَ فَالِقُ الْحَبِّ وَالنَّوَى يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَمُخْرِجُ الْمَيِّتِ مِنَ الْحَيِّ ذَلِكُمُ اللّهُ فَأَنَّى تُؤْفَكُونَ﴾ (الأنعام: ٩٥).

**قۆناغی دەیەم:** نوتفەکە دەکەوێتە ناو مناڵدان لەگەڵ چانسی لەبارچوونی سەرەتایی: ﴿إِذَا وَقَعَت النُّطْفة فِي الرَّحِم، بَعَثَ اللهُ مَلَكاً فَقال: يا ربّ مُخَلَّقة أو غير مُخَلَّقة؟ فَإِن قال: غَيْرُ مُخَلَّقة، مَجَّتْها الأَرْحامُ دَماً، وَإِن قال: مُخَلَّقة، قالَ: يا رَبِّ فَما صِفَة هَذه النُّطْفة؟﴾ رواه الطبري والطبراني بإسناد صحيح.

**قۆناغی یانزەیەم:** چاندنی کۆرپەلەکە لەناو مناڵداندا ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ ...﴾ (البقرة: ٢٢٣).

ئەم یانزە بەشە (یانزە قۆناغە)ی سەرەوە هەموویان لە حەوت ڕۆژی یەکەمدا ڕوودەدەن چونکە لەدوای ئەم حەوت ڕۆژەوە کۆرپەلەکە دەچێتە

قۆناغێکی سەرەکی ترەوە کە بریتی‌یە لە قۆناغی دروست بوون (مرحلة التخليق)، کە بریتین لەم قۆناغانەی تر کە لە خوارەوە باسیان دەکەین بەو ریزبەندی‌یەی کە لە قورئان و فەرموودەکاندا هاتوون:

**قۆناغی دوانزەیەم:** کۆبوونەوەی خانەکانی کۆرپەلەکە و جێگیر بوونی لەناو منالدانداو رۆچوونی لەناو دیواری منالداندا، وەك لەم فەرموودانەدا هاتووە: ﴿فَإذا كانَ يَومُ السَّابعِ، جَمَعَهُ اللهُ تَعالى، ثُمَّ أَحْضَرَ لَه كلَّ عِرْقٍ بَينَه وَبَينَ آدَم ثُمَّ قَرَأ: [فِي أَيِّ صُورَةٍ مَّا شَاء رَكَّبَكَ] (الإنفطار:٨)﴾ رواه الطبراني والبيهقي وابن منده، هەروەها لە فەرموودەیەکی تریشدا هاتووە: ﴿النُّطْفَةُ إذَا اسْتَقَرَّتْ فِي الرَّحِم جَاءَها مَلَكٌ فَأَخَذَها بِكَفِّه فَقال: أَيْ ربّ مُخَلَّقة أو غَير مُخَلَّقة؟ فَإن قِيل: غَيْر مُخَلَّقة، لَمْ تَكُن نسْمَة، وَقَذَفَتْها الأَرْحامُ دَماً ....﴾ رواه ابن أبي حاتم والطبري وإسناده صحيح، واتە: کاتێك کە نوتفەکە لە منالداندا جێگیر بوو ئەو کاتە فریشتەیەکی بۆ دەنێردرێت کە بە دەستی دەیگرێت، و لە پەروەرگار دەپرسێت: ئەی خوایە دروست دەبێت یان دروست نابێت، ئەگەر بووترێت دروست نابێت ئەوا ئیتر رۆحی نابێت و لە منالدانەوە وەکو خوێن فرێ دەدرێتە دەرەوە.... هەروەها لە ئایەتێکیشدا هاتووە: ﴿اللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَحْمِلُ كُلُّ أُنثَى وَمَا تَغِيضُ الأَرْحَامُ وَمَا تَزْدَادُ وَكُلُّ شَيْءٍ عِندَهُ بِمِقْدَارٍ﴾ (الرعد:٨).

**قۆناغی سیانزەیەم:** سەرەتای زیادبوونی منالدانەکان بە دروست بوونی کۆرپەلەکە لەناوی‌دا، لە هەمان ئایەتی: ﴿اللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَحْمِلُ كُلُّ أُنثَى وَمَا تَغِيضُ الأَرْحَامُ وَمَا تَزْدَادُ وَكُلُّ شَيْءٍ عِندَهُ بِمِقْدَارٍ﴾ (الرعد:٨).

**قۆناغی چواردەیەم:** بوونی نوتفەکە بە خۆهەڵواسەر (علقة)، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً﴾ (المؤمنون:١٤).

**قۆناغی پانزەیەم:** پێکهاتنی کۆرپەلەکە لە شریتی سەرەتایی (عجب الذنب)، لە فەرموودەیەکدا هاتووە: ﴿كُلُّ ابْنِ آدَم يَأْكُلُه التُّراب إلاّ عَجْبَ الذَّنَب، مِنْهُ خُلِقَ وَمِنْهُ يُركب ...﴾ رواه مسلم.

**قۆناغی شانزەیەم:** دروست بوونەکانی گۆشتپارە (المضغة) ﴿فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً﴾ (المؤمنون:١٤)، ﴿ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ مِن مُّضْغَةٍ مُّخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ لِّنُبَيِّنَ لَكُمْ﴾ (الحج:٥)، هەروەها لە ئایەتێکی تردا هاتووە: ﴿ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّى﴾ (القيامة:٣٨).

**قۆناغی حەڤدەیەم:** ئەم قۆناغە لە ڕۆژی چلەمی گەشە کردنی کۆرپەلەکەوە دەست پێدەکات و بریتییە لە قۆناغی دروست بوونی ئێسك و ڕێکبوونەوە و وێنە پێدان و جێگیر کردن، لەم ئایەت و فەرموودانەدا هاتووە: ﴿فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا﴾ (المؤمنون:١٤)، ﴿إذا مَرَّ بِالنُّطْفَةِ ثِنْتان وَأَرْبَعون لَيْلَة، بَعَثَ اللهُ إلَيْها مَلَكاً فَصَوَّرَها وَخَلَقَ سَمْعَها وَبَصَرَها وَجِلْدَها وَلَحْمَها وَعِظامَها ثُمَّ قال: يارَبِّ أَذَكَرٌ أَم أُنْثى؟ ....﴾ اخرجه مسلم، ﴿ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّى﴾ (القيامة:٣٨)، ﴿ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ مِن مُّضْغَةٍ مُّخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ لِّنُبَيِّنَ لَكُم، وَنُقِرُّ فِي الأَرْحامِ مَا نَشَاءُ إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى ...﴾ (الحج:٥).

**قۆناغی هەژدەیەم:** داپۆشینی ئێسکەکان بە ماسولکە و ڕێکبوونەوە و وێنەپێدانی مرۆیی: ﴿فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا﴾ (المؤمنون:١٤)، ﴿ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّى﴾ (القيامة:٣٨)، ﴿الَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّاكَ فَعَدَلَكَ، فِي أَيِّ صُورَةٍ مَّا شَاءَ رَكَّبَكَ﴾ (الإنفطار:٧-٨)، ﴿إذا مَرَّ بِالنُّطْفَةِ ثِنْتان وَأَرْبَعونَ لَيْلَة، بَعَثَ اللهُ إلَيْها مَلَكاً فَصَوَّرَها وَخَلَقَ سَمْعَها وَبَصَرَها وَجِلْدَها وَلَحْمَها وَعِظامَها ثُمَّ قال: يارَبِّ أَذَكَرٌ أَم أُنْثى؟ ....﴾ اخرجه مسلم.

دوای ئەمانە قۆناغی سەرەکی سێیەم دەست پێدەکات کە بریتییە لە قۆناغی گەشە کردن (النشأة)، وەك لەم ئایەتە پیرۆزانەدا هاتووە: ﴿ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ﴾ (المؤمنون:١٤)، ﴿وَنُقِرُّ فِي الْأَرْحَامِ مَا نَشَاء إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى ثُمَّ نُخْرِجُكُمْ طِفْلًا ثُمَّ لِتَبْلُغُوا أَشُدَّكُمْ﴾ (الحج:٥)، کە ئەمیش لە چەند قۆناغێکی لاوەکی و چەند بەشێك پێکدێت کە بە ڕیزبەندی ئەمانەن:

**قۆناغی نۆزدەیەم: دروست بوونی پێست** (كە لە قۆناغی گەشە كردن و رێك بوونەوەدا روودەدات)، هەروەك لە ئایەتی: ﴿الَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّاكَ فَعَدَلَكَ، فِي أَيِّ صُورَةٍ مَّا شَاءَ رَكَّبَكَ﴾ (الإنفطار: ٧-٨)، هەروەها فەرموودەی: ﴿إذا مَرَّ بالنُّطْفَة ثنْتان وَأَرْبَعونَ لَيْلَة، بَعَث اللهُ إلَيْها مَلَكاً فَصَوَّرَها وَخَلَقَ سَمْعَها وَبَصَرَها وَجِلْدَها وَلَحْمَها وَعِظامَها ثُمَّ قال: يارَبِّ أَذَكَرٌ أَم أُنْثى؟ ....﴾ اخرجه مسلم.

**قۆناغی بیستەم: دیاری كردنی نێر و مێ**، لە ئایەتی: ﴿فَسَوَّى، فَجَعَلَ مِنْهُ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْأُنثَى﴾ (القيامة: ٣٨-٣٩)، ﴿إذا مَرَّ بالنُّطْفَة ثنْتان وَأَرْبَعونَ لَيْلَة، بَعَثَ اللهُ إلَيْها مَلَكاً فَصَوَّرَها وَخَلَقَ سَمْعَها وَبَصَرَها وَجِلْدَها وَلَحْمَها وَعِظامَها ثُمَّ قال: يارَبِّ أَذَكَرٌ أَم أُنْثى؟ ....﴾ اخرجه مسلم، ﴿وَكَّلَ اللَّهُ بالرَّحِمِ مَلَكاً فَيَقُولُ: أَيْ رَبِّ نُطْفَةٌ؟ أَيْ رَبِّ عَلَقَةٌ؟ أَيْ رَبِّ مُضْغَةٌ؟ فَإِذَا أَرَادَ اللَّهُ أَنْ يَقْضِيَ خَلْقَهَا قَالَ: أَيْ رَبِّ ذَكَرٌ أَمْ أُنْثَى؟ أَشَقِيٌّ أَمْ سَعِيدٌ؟ فَمَا الرِّزْقُ؟ فَمَا الأَجَلُ؟ فَيُكْتَبُ كَذَلِكَ فِي بَطْنِ أُمِّهِ »﴾ رواه البخاري.

**قۆناغی بیست و یەك: پێدانی وێنەی كەسێتی بە كۆرپەلەكە و كامڵ بوونی دروست بوونی**، هەروەك لە ئایەتی: ﴿الَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّاكَ فَعَدَلَكَ، فِي أَيِّ صُورَةٍ مَّا شَاءَ رَكَّبَكَ﴾ (الإنفطار: ٧-٨).

**قۆناغی بیست و دوو: ئەم قۆناغە لە تەمەنی چوار مانگ و دە رۆژی تەمەنی كۆرپەلەكەوە دەست پێدەكات و بریتییە لە سەرەتای دەست پێكردنی دایكەكە بە هەستكردن بەجووڵەی كۆرپەلەكەی**، هەروەك لە ئایەتی: ﴿وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا ....﴾ (البقرة: ٢٣٤).

**قۆناغی بیست و سێ: كەمترین ماوەی سكپڕی كە بریتییە لە شەش مانگ**، هەروەك لەم ئایەتانەوە وەردەگیرێت: ﴿وَحَمْلُهُ وَفِصَالُهُ ثَلَاثُونَ شَهْرًا .....﴾ (الأحقاف: ١٥)، هەروەها ووتەی پەروەردگار: [... وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ ...﴾ (لقمان: ١٤).

**قۆناغی بیست و چوار: ئاسان كردنی رێڕەوی لەدایك بوون** ﴿ثُمَّ السَّبِيلَ يَسَّرَهُ، ثُمَّ أَمَاتَهُ فَأَقْبَرَهُ﴾ (عبس: ٢٠-٢١).

## شێواز و ئوسلوبی قورئان لە بەکارهێنانی پیتەکانی (ثمّ) و (فاء) لە ئایەتەکانی کۆرپەلەزانیدا:

ئەوەی کە بەدوادا چوون بۆ ووشەکانی قورئان دەکات بۆی دەردەکەوێت کە داڕشتنیان بە ئەندازە و قەدەرێکی دیاری کراوە، و هەموو پیتێکی بەپێی پێویست دانراوە، کە هیچ جۆرە زیاد و کەمی‌یەك و خواری و جیاوازی‌یەکی تێدا نی‌یە، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لەلایەن پەروەردگاری زانا و داناوە دابەزیوە. چونکە ئەگەر بچووکترین هەڵەی تێدا بووایە ئەوا ئیعجازەکەی نەدەما و سیفەتە خوایی‌یەکەی لەدەست دەدا، هەروەك دەفەرموێت: ﴿أَفَلاَ يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ اللّهِ لَوَجَدُواْ فِيهِ اخْتِلاَفاً كَثِيراً﴾ (النساء:٨٢)، واتە: بۆچی لە قورئان ناکۆڵنەوە و تێی نافکرن؟! خۆ ئەگەر قورئان لەلایەن غەیری خوداوە بهاتایە ئەوا بە دڵنیایی‌یەوە جیاوازی و پێچەوانەی یەکتری زۆرتان تێدا دەدۆزی‌یەوە.

لەو نموونانەی کە بەڵگەن لەسەر ئەوەی قورئان بە هاوسەنگی‌یەکی پتەو و تەرازوویەکی دامەزراوەوە داڕێژراوە ئەوەیە کە هەندێك ماوەی زەمەنی (یان ژمارەی بیرکاری‌یانە) لە قورئاندا بە دیاری کراوی هاتوون، و بە شێوەیەك دیاری کراون ئاماژە بۆ ئەوە دەدەن کە ئەو کەسەی ئەم ژمارەیە یان ماوەیەی دیاری کردووە کەسێکە ئاگاداری هەموو نهێنی‌یەکە، و دەشزانێت کە هێنانی ئەو ژمارەیە نەك تەنها بە شێوەیەکی ووردی بیرکاری‌یانە تەعبیر لە ژمارە یان ماوە ڕاستەقینەکە دەکات بەڵکو لە دوو توێ‌ی‌دا چەندین مانا و تەفصیلی تر لەخۆ دەگرێت، کە ئیتر گومان لەوەدا ناهێڵێت هێنانی ئەم ژمارانە یان دیاری کردنی ئەو ماوانە هەگیز بە ڕێکەوت نی‌یە و لەخۆیانەوە دیاری نەکراون، چونکە هێنانی درێژە و تەفاصیلی شتێکی دیاری کراو پێچەوانەیە لەگەڵ هاتنی ئەو شتە بە ڕێکەوت، و دەیسەلمێنێت ئەو کەسەی کە دیاری کردووە پێویستە ئاگاداری هەموو لایەنە شاراوەکانی بێت.

هەندێك نموونە لەم دیاری کردنانە بریتین لە: ئایەتەکانی: ﴿وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا﴾ (البقرة:٢٣٤)، ﴿وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ إِحْسَاناً حَمَلَتْهُ أُمُّهُ كُرْهاً وَوَضَعَتْهُ كُرْهاً وَحَمْلُهُ وَفِصَالُهُ ثَلَاثُونَ شَهْراً﴾ (الأحقاف:١٥)، هەروەها فەرموودەکانی: ﴿قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): إِنَّهُ خُلِقَ كُلُّ إِنْسَانٍ مِنْ بَنِي آدَمَ عَلَى سِتِّينَ وَثَلاثِمَائَةِ مَفْصِلٍ ...﴾ رواه مسلم، ﴿إِنَّ أَحَدَكُم يُجْمَعُ خَلْقُهُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ أَرْبَعِينَ يَوْماً .....﴾ رواه مسلم، ﴿إِذا مَرَّ بِالنُّطْفَةِ ثِنْتَانِ وَأَرْبَعونَ لَيْلَةً، بَعَثَ اللهُ إِلَيْها مَلَكاً فَصَوَّرَها .....﴾ رواه مسلم.

یەکێك لە نموونە گەورەکانی ووردەکاری لە دیاری کردنی ماوەدا بریتییە لە بەکارهێنانی هەردوو پیتی (ثُمّ) و (فاء) لە ئایەتەکانی کۆرپەلەزانیدا، هەردووکیان بریتین لە پیتی (عطف) واتە پێکەوە بەستن، بەڵام زۆر جیاوازن لەو مانایەی دەیبەخشن کاتێك لە ڕستەدا بەکاردەهێنرێن، پیتی (ثُمّ) بۆ ڕێکخستن و خایاندنی ماوەیەك لە نێوان دوو شتدا بەکاردێت (للترتيب والتراخي)، بەڵام پیتی (فاء) بۆ ڕێکخستن و خێرایی لە بەدوای یەکدا هاتنی دوو ڕووداودا بەکاردێت (للترتيب والتعقيب)، با ئێستا هەندێك نموونە لەم بارەوە باس بکەین:

**نموونەی یەکەم:**

- ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن سُلَالَةٍ مِّن طِينٍ، ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ، ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ﴾ (المؤمنون:١٢-١٤).

ئەم دەقە قورئانییە ئاماژە بۆ سێ قۆناغی سەرەکی لە دروست بوونی کۆرپەلەدا دەدات: ١- قۆناغی نوتفە. ٢- قۆناغی دروست بوون. ٣- قۆناغی گەشە کردن. کە لە پێش هەمووشیاندا قۆناغێکی ئامادەکردن هەیە بە ناوی قۆناغی پوختە (مرحلة السلالة)، لەم ئایەتانەدا پیتی (ثُمّ) سێ جار بەکار هاتووە:

جارێك بۆ جیاكردنەوەی (سُلالة) لە قۆناغی (نوتفە): كە دەیسەلمێنێت گۆڕانی كۆرپەلەكە لە (سُلالة)وە بۆ (نوتفە)ی تێكەڵاو ماوەیەك دەخایەنێت، سەرەتای قۆناغی (سُلالة) لە دەرپەڕانی هێلكەكەوە دەست پێدەكات لە هێلكەدانەوە، كە پیتاندنیشی پێویستی بە ڕۆژێك دەبێت، و هەروەها كۆچ كردنی هێلكە پیتێنراوەكەش لە سەرەتای بۆری مناڵدانەوە تا گەیشتنی بۆ ناو مناڵدان و كەوتنە ناوی هەمووی شەش ڕۆژ دەخایەنێت، كەواتە هەمووی ٧ ڕۆژ دەخایەنێت كە بریتی‌یە لە ماوەیەكی درێژ بە پێوانە بەو ماوانەی كە كۆرپەلەكە دەیەوێت لە كاتی گۆڕانی لە بارێكەوە بۆ بارێكی تر، كەواتە بەكارهێنانی پیتی (ثُمَ) زۆر مانایەكی گونجاو دەگەیەنێت.

جاری دووەم بەكار هاتووە بۆ جیاكردنەوەی قۆناغی (نوتفە) لە قۆناغی (دروست بوون): كە بینراوە گۆڕانی نوتفە پیتێنراوەكە بۆ خۆهەڵواسەر (علقة) لەناو مناڵداندا بە هێواشی دەبێت، و دەبێت كۆرپەلەكە لەو نێوانەدا بە باری كۆبوەونەوەی خانەكانی‌دا (جمع خلایا الجنین) بڕوات، لەم كاتەدا تۆپەڵە خانەكەی كۆرپەلەكە خۆی هەڵدەواسێت بە دیواری مناڵدانەوە بەهۆی پێیەكەوە، كە ئەم كردارە هەفتەیەك بە لایەنی كەمەوە دەخایەنێت، و دوای ئەمەش دوو ڕۆژی تری دەوێت بۆ ئەوەی كردارە پشتی‌یەكان (العملیات الظهریة Notochordal Process) دەست پێبكەن و ببنە هۆی درێژ بوونەوەی كۆرپەلەكە و وەرگرتنی وێنەی (علقة)، كەواتە كۆی گشتی ئەو ماوەیەی كە دەیەوێت بۆ ئەوەی لە نوتفەوە ببێت بە (علقة) بریتی‌یە لە ١٠ ڕۆژ (لە ڕۆژی حەوتەمەوە بۆ ڕۆژی ١٦)، كە بریتی‌یە لە ماوەیەكی درێژ و حیساب بۆ كراو، هەربۆیە لەم نێوانەشدا پیتی (ثُمَ) بەكارهاتووە.

جاری سێیەمیش بۆ جیاكردنەوەی قۆناغی (دروست بوون) لە قۆناغی (گەشە كردن) بەكار هاتووە: كە مانای ئەوە دەگەیەنێت پاش داپۆشینی ئێسكەكان بە ماسولكە ماوەیەك پێویستە بۆ ئەوەی كۆرپەلەكە بچێتە قۆناغی

گەشەکردنەوە (النشأة)، و هەروەها ئەم قۆناغەی دوایش خۆی لەخۆیدا ماوەیەکی زۆر دەخایەنێت و بە هێواشی گۆڕانکارییەکان روودەدەن (نزیکەی ٢٨ هەفتە دەخایەنێت)، بینراوە کە دەرکەوتنی ئەندامەکان و گەشە کردنیان ماوەیەکی زۆری دەوێت وەك گەشە کردنی قژ و نینۆکەکان، هەروەها ریخۆڵەکان دەچنەوە ناو سك لە هەفتەی یانزەیەمدا، و جووڵە خۆویستەکان (وەك جووڵەی چاوەکان) لە هەفتەی چواردەیەمەوە دەست پێدەکات، کەواتە گەشە کردن و گۆڕان بۆ دروست کراوێکی تر بە هێواشی دەبێت و ماوەیەکی زۆر دەخایەنێت، ئەگەر بە شێوەیەکی رێژەیی وەریبگرین دەبینین قۆناغی داپۆشینی ئێسکەکان بە ماسولکە تەنها یەك هەفتە دەخایەنێت، بەلاّم گەشە کردن پێویستی بە ٢٨ هەفتە هەیە، کەواتە قۆناغی داپۆشین بە ماسولکە زۆر کورتترە بە بەراورد بە قۆناغی گەشە کردن هەربۆیە پیتی (ثُمَّ) لێرەشدا بەکارهاتووە.

بەلاّم لە قۆناغی دروست بوون (التخليق)دا ئامانج بریتییە لە تیشك خستنە سەر خێرایی بەدوای یەکدا هاتنی کردارەکان و گۆڕانکارییەکان، چونکە وەك بینراوە لەم کاتەدا زۆربوونێکی خێرای خانەکان روودەدات و کردارەکانی دروست بوون زۆر بەخێرایی روودەدەن (ئەم ماوەیە پێی دەووترێت ماوەی دروست بوونی ئەندامەکان **Organogenesis**)، لەبەر ئەم خێراییەی گۆڕانکارییەکانی کۆرپەلەکە هەربۆیە بۆ بەستنەوەی بەشەکانی ئەم قۆناغە پیتی (فاء) بەکار هاتووە:﴿... فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا﴾، بینراوە کە گۆڕانی کۆرپەلەکە لە خۆهەڵواسەر (علقة)وە بۆ گۆشتپارە (مضغة) دوو رۆژ دەخایەنێت (رۆژانی ٢٥ بۆ ٢٦)، و بەشێوەیەك خێرایە کە زۆر بە روونی ئەم دوو قۆناغە لەیەك جیانابەنەوە، هەروەها گۆڕانیش لە گۆشتپارەوە بۆ ئێسك زۆر بە خێرایی دەبێت و ئەم دوو قۆناغە تێکەلاّون، هەر لە هەفتەی پێنجەمەوە سەرەتای

ئێسك (کرکڕاگەکان) دروست دەبن و لە هەفتەی شەشەمدا بە ئێسك بوونیان دەست پێدەکات و لە سەرەتای هەفتەی حەوتەمدا پەیکەری ئێسکی کرکڕاگەیی کۆرپەلەکە بە ئاشکرا دیاردەبێت، کەواتە قۆناغی گۆشتپارە بە تەواوەتی کۆتایی نایەت کە ئێسکی سەرەتایی لە کۆرپەلەکەدا دروست دەبێت و شێوەی ئێسك وەردەگرێت، هەربۆیە لەم بەستنەوەیەشدا پیتی پێکەوە بەستنی (فَ) بەکار هاتووە.

هەروەها قۆناغی داپۆشین بە گۆشت یەکسەر پاش دروست بوونی ئێسکە سەرەتایی‌یەکان دەست پێدەکات و ئەم دووانەش تێکەڵاون لەبەر ئەوەی ئەو خانانەی کە جیاواز دەبن بۆ دروست کردنی ماسولکەکان لەگەڵ خانە کرکڕاگەیی‌یە سەرەتایی‌یەکاندا دروست دەبن لە سەرەتای هەفتەی شەشەمدا و لە بارستە لەشی‌یەکانەوە بەناو لەشدا بڵاودەبنەوە، لە کۆتایی هەفتەی حەوتەمدا بە ئاشکرا جیاواز بوونی ماسولکەکان دەبینرێت واتە پاش تەواو بوونی دروست بوونی پەیکەری ئێسکی کرکڕاگەیی یەکسەر شێوەی ئێسك و ماسولکە بەسەر کۆرپەلەکەدا زاڵ دەبێت، هەربۆیە لێرەشدا پیتی بەستنەوەی (فَ) بەکار هاتووە.

کەواتە لەمانەی سەرەوە تێدەگەین کە پیتی (ثُمَّ) بەکار هاتووە بۆ پێکەوە بەستنەوە و گەیاندنی مانای خایاندنی کاتێك و بوونی ماوەیەك لەنێوان ئەو قۆناغانەدا.

بەڵام بەکارهێنانی پیتی (فَ) بۆ پێکەوە گرێدانی قۆناغەکان پێکەوە و بەبێ بوونی جیاکەرەوە و خێرایی لە ڕووداوەکاندا بەکار هاتووە، بۆ سەلماندنی ئەم مانایانە دەقێکی کتێبی (فتح الباري شرح صحيح البخاري) دانراوی زانای موسوڵمان (إبن حجر العسقلاني) دێنینەوە کە دەڵێت: لە ئایەتەکەدا هەندێك لە قۆناغەکان بە پیتی (فَ) ڕێکخراون کە مەبەست پێی ئەوەیە لە نێوانیاندا ماوەیەك و قۆناغێکی تر نی‌یە، هەندێکی تر بە پیتی (ثُمَّ)

رێكخراون كە ئاماژەیە بۆ ئەو ماوە زۆرەی لەنێوان دوو قۆناغدایە بۆ ئەوەی هەر قۆناغێك بگاتە كامڵ بوون و تەواو بوون.

لە (ألفية)ی (إبن مالك)دا هاتووە:

وَالفـاءُ لِلتَّرتيبِ بِاتِّصـالِ وَثُـمَّ لِلتَّرتِيبِ بِانْفِصَـالِ

**نموونەی دووەم:**

- ﴿قُتِلَ الْإِنسَانُ مَا أَكْفَرَهُ، مِنْ أَيِّ شَيْءٍ خَلَقَهُ، مِن نُّطْفَةٍ خَلَقَهُ فَقَدَّرَهُ، ثُمَّ السَّبِيلَ يَسَّرَه، ثُمَّ أَمَاتَهُ فَأَقْبَرَه، ثُمَّ إِذَا شَاءَ أَنْشَرَه﴾ (عبس: ١٧-٢٢)، لێرەشدا بە هەمان شێوە دەبینین كە پیتی پێكەوە بەستنی (ثُمّ)ی بەكار هێناوە بۆ ماوەی نێوان ئەندازە بۆ دانان لە قۆناغی نوتفەدا و لەدایك بوون (كە ٩ مانگە)، هەروەها بە هەمان شێوەش لەنێوان لەدایك بوون و مردن و پاشان زیندوو بوونەوە كە ئاشكرایە ئەم ماوانە زۆر درێژن و نێوانیان زۆرە، بەڵام بەكارهێنانی پیتی (فَ)ی خێرایی لە دەقەكەدا بۆ بەستنەوەی دروست بوونی نوتفەكە و ئەندازە بۆدانانی بۆ ئەوە بەكارهاتووە كە كۆرپەلەزانی بۆمان باس دەكات ماوەی نێوان ئەم دوو كردارە تەنها بریتی‌یە لە كەمتر (٣٠ سەعات).

**نموونەی سێیەم:**

- ﴿يَا أَيُّهَا الْإِنسَانُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ الْكَرِيمِ {٦} الَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّاكَ فَعَدَلَكَ {٧} فِي أَيِّ صُورَةٍ مَّا شَاءَ رَكَّبَكَ {٨}﴾ (الإنفطار)، ئەم ئایەتە سێ قۆناغی باس كردووە: قۆناغی دروست بوون، قۆناغی رێك كردن و وەرگرتنی وێنەی مرۆیی (تەسویە)، قۆناغی رێكبوونەوە (تەعدیل)، پیتی (فَ) لێرەدا بەكار هاتووە كە مانای بەدوای یەكدا هاتنی خێرا دەگەیەنێت، چونكە ئەم كردارانە بەخێرایی بەدوای یەكدا دێن، و هەندێكیان تێكەڵاوی یەكتری دەبن لە كۆتایی و سەرەتایاندا، بۆ نموونە: كۆرپەلەكە رێكدەبێتەوە لە كۆتایی قۆناغی دروست بووندا (واتە لە رۆژانی ٤٣-٤٧) بۆ ئەوەی مانای رێك كردن (تەسویە) ببەخشێت، و پێوانەكانی ئەندامەكانی كۆرپەلەكە (هەردوو دەست

و هەردوو قاچ و دەم وچاو) دەست دەکەن بە رێکبوونەوە (تەعدیل) لە کۆتایی هەفتەی نۆیەمدا، واتە یەکسەر دوای قۆناغی (تەسویە)، هەروەها وێنەپێدانی مرۆیی کە لە قۆناغی (تەسویە)دا دەستی پێکردووە (وەك پەیدابوونی پێڵووەکان و تیشکدانی پەنجەکان) بەردەوام دەبێت تا هاتنەدی مانای رێکبوونەوەی مرۆیی (تەعدیل).

**نموونەی چوارەم:**

– ﴿أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ يُمْنَى {٣٧} ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّى {٣٨} فَجَعَلَ مِنْهُ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْأُنثَى {٣٩}﴾ (القيامة)، ئەم دەقە پیرۆزە باسی ٥ قۆناغ دەکات: (نوتفەی نەپیتێنراو) کە پێش ئەوەیە ئاوی پیاو و ئافرەت بگەن بە یەکتری و پاشان پیتاندنی و دوو لەت بوونی و رۆیشتنی بە قۆناغی کۆبوونەوەی خانەکانی‌دا کە ئەمانە ماوەیەکی زۆر دەخایەنێت هەربۆیە پیتی (ثُمَّ) بەکارهاتووە بۆ بەستنەوەی بە قۆناغی دوای خۆی کە، قۆناغی خۆهەڵواسەرە (علقة)، بەڵام بۆ بەستنەوەی ئە قۆناغە لەگەڵ ئەوەی دوای خۆی کە بریتی‌یە لە قۆناغی دروست بوون (کە قۆناغی گۆشتپارەیە چونکە ئەندامەکانی تێ‌دا دروست دەبێت)، لەم نێوانەدا پیتی (فَ) بەکارهاتووە چونکە وەك ووتمان گۆڕانکاری نێوانیان زۆر خێرایە.

قۆناغی چوارەم کە ئایەتە باسی کردووە قۆناغی رێکبوون (تەسویە)یە، لەگەڵ ئەوەی پێش خۆی بە پیتی (فَ) پێکەوەی گرێداون ئەویش لەبەر خێرایی گۆڕانەکە وەك پێشتر باسمان کرد، پاشان ئەم قۆناغەی بە قۆناغی پێنجەمەوە کە قۆناغی جیاکردنەوەی رەگەزەکانە بەهۆی پیتی بەستنەوەی (فَ) پێکەوە گرێدراون، ئەویش بەهۆی تێکەڵاوی رووداوەکانی ئەم دوو قۆناغە، چونکە قۆناغی جیاکردنەوەی رەگەزەکان هەر لە قۆناغی رێکبوونەوەوە دەست پێ‌دەکات بەڵام لەسەر ئاستی ناوەوەی لەشی کۆرپەلەکە، کە بە بوونی کرۆمۆسۆمی نێرینە (Y) هێڵە سێکسی‌یە

سـەرەتاییەکان (Primary Sex Cords) جیـاواز دەبـن بـۆ بۆریچـکە سپێرمییەکان (Seminiferous Tubules) لـە هەفتـەی حەوتەمـدا (واتـە لە قۆناغی ئێسکدا)، بەڵام ئەندامەکانی زاووزێی دەرەوە بە تـەواوەتی لەیـەك دەچن تا هەفتەی نۆیەم (واتـە تـا کۆتـایی قۆنـاغی رێکبـوون و تەسویە)، ئیتر دوای ئەمە جیابوونەوەی دەرەکی بە هێواشی دەست پێدەکات تاوەکو تـەواو ئاشکرا دەبێت لە هەفتەی دوانزەیەمدا.

لەبەر ئەوەی کە کردارەکانی دەرکەوتنی نێرینـەیی و مێینـەیی کۆرپەلەکە بەردەوامە، و لەبـەر تێکەڵاوی کردارەکـانی رێکبـوون و قۆنـاغی جیـاوازبوونی رەگەزی کۆرپەلەکە، دەبینین لە ئایەتە پیرۆزەکەدا پیتی پێکـەوە بەسـتنی (فـَ) بەکار هاتووە، کەواتە کۆرپەلەکە لە نـاوەوە رەگـەزی جیابووەتـەوە لـە کۆتـایی قۆناغی رێکبووندا بەڵام نیشانەکانی جیاواز بوونی دەرەکی لەم کاتەدا پەیـدا نەبووە، ئەوەی جـێی سەرنجیشـە ئەوەیـە کـە جیـاوازبوونی سێکسـی دەرەوە بە شێوەیەکی رێژەیی هێواشە، ئەگەر بێتو بەراوردی بکەین بە ماوەکانی تری گۆڕانکاری وەك: گۆڕان لە قۆناغی (علقة)وە بۆ قۆناغی گۆشتپارە، یان گـۆڕان لە گۆشتپارەوە بۆ ئێسك و .....هتد.

**تێبینی:**

ئەگەر بڕوانینە ئایەتێکی پیرۆزی تر کە باسی قۆناغەکانی دروست بـوونی کۆرپەلە دەکات کە بریتییە لە ئایەتی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّنَ الْبَعْثِ فَإِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ مِن مُّضْغَةٍ مُّخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ لِّنُبَيِّنَ لَكُمْ وَنُقِرُّ فِي الْأَرْحَامِ مَا نَشَاءُ إِلَىٰ أَجَلٍ مُّسَمًّى ثُمَّ نُخْرِجُكُمْ طِفْلًا ثُمَّ لِتَبْلُغُوا أَشُدَّكُمْ﴾ (الحج:٥)، لێرەدا دەپرسین بۆچـی لـەنێوان هـەموو قۆناغەکانـدا پیتـی پێکـەوە بەستنی (ثُمَّ) بەکار هاتووە.

ئەوەی تێبینی دەکـەین ئـەم ئایەتـە پیرۆزەش سـێ قۆنـاغە سـەرەکییەکەی گەشە کردنی کۆرپەلەی باس کـردووە: قۆنـاغی نوتفە، پاشـان دروست بوون

(خۆهەڵواسەر و گۆشتپارە)، پاشان جێگیربوون لە مناڵدانـدا و گەشـە كـردن و لەدایك بوون، هەموو ئەم قۆناغانە وەك باسمان كرد ماوەیەكی پێ‌دەچێت كە كۆرپەلەكـە لـە قۆناغێكـەوە دەچـێتە قۆنـاغێكی تـرەوە، هەربۆیـە لـە بەستنەوەیاندا پیتی (ثُمّ) بەكار هاتووە، بەڵام لێرەدا ئەوەی زیاتر سەرنجمان رادەكێشێت بریتی‌یە لە بەستنەوەی قۆناغی (علقة) بە قۆناغی گۆشتپارەوە بەهۆی پیتی پێكەوە بەستنی (ثُمّ).

ئەگـەر سـەرنجی رێـڕەوی گشـتی ئایەتەكـە بـدەین دەبیـنین باسـی زینـدوو بوونەوە دەكات. كە پێویست دەكات كەسی خوێنـەر بوەستێنرێت بۆ ئـەوەی بە ووردی بیر لـە بابەتەكە بكاتـەوە، هەربۆیـە دەبیـنین بۆ بەستنەوەی هـەموو رووداوەكانی ئایەتەكە پیتی (ثُمّ) بەكار هـاتووە، كـە ئاگـادار كردنەوەیەكە بـۆ خوێنـەر كـە دەبێـت لەسـەر هـەموو رووداوەكـان بوەسـتێت و تێبڕوانێـت و دەرسـێك وەرگرێـت بـۆ ئـەوەی بابـەتی زینـدوو بوونـەوە لـە دەروونـی‌دا بچەسـپێت، هەربۆیـە لـە ئایەتەكـەدا داوامـان لێكـراوە كـە بڕوانینـە شـێوەی گۆشتپارە و ئەو گۆڕانكاری‌یانەی بەسەری‌دا دێن كە هەندێكی دروست بووە و هەنـدێكی تـری دروسـت نـەبووە، و هـەروەها تێـڕوانین لـە یەكگرتنـەوەی دەربڕینـە قورئانی‌یـەكان لەگـەڵ زانیاری‌یـەكانی كۆرپەلـەزانی‌دا، وەك ئایەتـە پیرۆزەكە دەفەرموێت: (لِّنُبَيِّنَ لَكُـمْ) واتـە: بـۆ ئـەوەی بۆتـان روون بكەینـەوە و بۆتان دەركەوێت، كە لەمانەوە بۆمان دەردەكەوێت قورئـان حـەق وراستی‌یە و دەسـت كـەوتنی ئـەم دەرئەنجامـە پێویسـتی بـە كـات وبـە لێكۆڵینـەوە هەیـە، هەربۆیە لێرەدا پیتی (ثُمّ) بەكار هاتووە.

لەلایـەكی تـرەوە وەك زانایـانی زمانـەوانی دەڵـێن پیتـی (ثُـمّ) یـەكێك لـە ئامانجـەكانی بـەكار هێنـانی بریتی‌یـە لـە راكێشـانی سـەرنج بـۆ دەرئـەنجام و كۆتـایی ئـەو قۆنـاغـە، بـە پێچـەوانەی پیتـی (فَـ) كـە ئامـاژەیـە بـۆ سـەرەتای قۆناغەكە، هەربۆیە بەكارهێنانی پیتی (ثُمّ) لە ئایەتەكەی سوورەتی (الحج)دا

بۆ راکێشانی سەرنجی خوێنەرە بۆ تێبینی کردنی قۆناغی گۆشتپارە لە سەرەتاوە بۆ کۆتایی تاوەکو بە تەواوەتی ماناکەیمان بۆ روون ببێتەوە، ئەگەر کەمێك باسی قۆناغی گۆشتپارە بکەین دەبینین کە بارستە لەشیەکان بە هێواشی لە کۆتایی قۆناغی (علقة)دا پەیدا دەبن (لە رۆژی بیست و چوارەمدا)، کە ژمارەیان تەنها لە نێوان ٤-١٢ دانەدایە، و پاشان بە خێرایی ژمارەیان زیاد دەکات لە رۆژانی ٢٥-٣٠ و ژمارەیان دەگاتە ٣٠-٣٥دانە و پاشان زیاد بوونیان خاو دەبێتەوە و لە رۆژی ٣٥دا دەگاتە زۆرترین ژمارە کە ٤٢ دانەیە، لێرەوە لەوە تێدەگەین کە بۆچی لە سوورەتی (المؤمنون)دا قۆناغی گۆشتپارە (مُضْغَة) بە پیتی (فَ) بەستراوەتەوە بە قۆناغی پێش خۆی کە (علقة)یە، ئەویش لەبەر ئەوەیە کە ئەو بارستە لەشیانەی کە شێوەی گۆشتپارە دەدەن بە کۆرپەلەکە پەیدا بوونیان بە چڕی لە سەرەتای ئەم قۆناغەدا دەبێت.

بەڵام لە سوورەتی (الحج)دا باسی گۆشتپارە هاتووە لەگەڵ وەسف کردنی بەوەی (مُخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ) کە ئەمە ئەوە دەگەیەنێت هەردوو سیفەتی (دروست بوون و دروست نەبوون) بەستراونەتەوە بە گۆشتپارەکەوە، کە مانای ئەمە ئەوەیە سەرەتای هەموو ئەندامەکانی کۆرپەلە لێرەدا دروست دەبن بەڵام دروست بوونیان کامڵ نەبووە، ئەگەر بە ووردتر سەیری ئەم قۆناغە بکەین دەبینین کە ئەندامەکانی ئەم گۆشتپارەیە وەك دەستەکان و قاچەکان و چاوەکان و گوێکان دروست بوونیان ئاشکرا و بینراو نابێت تەنها لە ٥ رۆژی کۆتایی گۆشتپارەدا نەبێت، کە کوویی توورەکەیی چاو دەردەکەوێت و پەیکەری دەرەوەی گوێ دروست دەبێت، و باریکایی قاچەکان و دەستەکان دەردەکەون، بەڵام ئەگەر بڕوانینە سەرەتای قۆناغی گۆشتپارە ئەمە ئاشکراو بینراو نییە بۆ ئەو کەسەی تێبینی دەکات (بڕوانە وێنەی ئەودیو).




لە وێنەی ( A )دا دەبینین کە ئەندامەکانی کۆرپەلەکە لە سەرەتای قۆناغی گۆشتپارەدا ( ٢٦ رۆژ ) ئاشکرا نین، هەربۆیە ناتوانین بڵێین کە ئەم کۆرپەلەیە ئەندامەکانی دروست بوون، لەبەرئەوەی دەستەکان و قاچەکان بە ئەستەم دەرکەوتوون، بەڵام لە وێنەی ( B )دا بە ئاشکرا دەبینین کە گوێکان و چاوەکان و دەستەکان و قاچەکان دروست بوون لەگەڵ ئەوەشدا کە دروست بوونیان کامڵ نەبووە لە کۆتایی قۆناغی گۆشتپارەدا ( ٤٢ رۆژ )، هەربۆیە دەتوانین وەسفی گۆشتپارەکە بەوە بکەین کە هەندێکی دروست بووە و هەندێکی دروست نەبووە ( مُخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ )، لە وێنەی ( C )دا دەبینین کە چۆن ئەندامەکانی کۆرپەلەکە لە کۆتایی قۆناغی رێکبووندا ( تەسویە ) ( ٥٦ رۆژ ) کە بەدوای قۆناغی گۆشتپارەدا دێت وێنەبوون و مرۆیی بوون، کە ئەمە بۆمان دەسەلمێنێت کە مەبەست لە ووشەی ( غَيْرِ مُخَلَّقَةٍ ) بریتی‌یە لە تەواو نەبوونی وێنە پێدانی گۆشتپارەکە، ئەویش لەبەر ئەوەیە کە ئەندامەکانی کۆرپەلەکە وێنەی مرۆیی تەواویان وەرناگرن لە قۆناغی گۆشتپارەدا.

بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە ئایەتەکە دەیەوێت سەرنجمان بۆ کۆتایی قۆناغی گۆشتپارە رابکێشێت ئەوەیە کە تەواو بوونی دروست بوون و وەرگرتنی وێنەی مرۆیی (وەك شتێکی بەڵگە نەوویست) دەبێت بەدوای دروست بوونێکی ناتەواودا بێت، لەبەر ئەوەش کە وێنە کردنی کۆرپەلەکە تەنها لەدوای ٤٢ رۆژ دەبێت واتە دوای قۆناغی گۆشتپارە وەك لە فەرموودەکەی: ﴿إذا مَرَّ بالنُّطْفَة ثنْتان وَأَرْبَعونَ لَيْلَة، بَعَثَ اللهُ إِلَيْها مَلَكاً فَصَوَّرَها وَخَلَقَ سَمْعَها وَبَصَرَها وَجِلْدَها وَلَحْمَها وَعِظامَها ثُمَّ قال: يارَبِّ أَذَكَرٌ أَم أُنْثى؟ ....﴾دا

هاتووە، ئەوا تێدەگەین کە دروست بوونی کۆرپەلەکە لە کۆتایی قۆناغی گۆشتپارەدا دەبێت گەیشتبێتە لوتکەی دروست بوونی پێش کرداری وێنە پێدان، هەربۆیە لە ئایەتەکەی سوورەتی (الحج)دا زۆر دروستە کە پیتی (ثُمّ) بەکار بهێنرێت بۆ بەستنەوەی ئەم دوو قۆناغە.

لێرەوە دەبینین کە مانای فەرموودەکەی پێشوو لەگەڵ دەقی ئایەتەکەی سوورەتی (الحج) و کار و مانای پیتی پێکەوە بەستنی (ثُمّ) هەمووی لەگەڵ زانستی گەردوونی و لۆژیکدا یەکدەگرنەوە و دەیسەلمێنن کە ئایەتەکەی سوورەتی (الحج) زۆر بە ووردی‌یەوە چەندین نهێنی شارراوەی گەردوونی ئاشکرا کردووە، کە مەحاڵە مرۆڤێك لە دەوروبەرێکی نەخوێندەواری‌دا بیزانێت تەنها لەرێی چەندین توێژینەوە و بە بەکارهێنانی ووردترین ئامێرەوە نەبێت؛ یان دان بەوەدا بنێین و بڵێین ئەمە وەحی و نیگای ئەو پەروەردگارەیە کە ئەو جەستەیەی دروست کردووە وەك ئایەتەکە وەسفی دەکات.

لێرەوە تێدەگەین کە زۆر پێویستە لەو شوێنەی سوورەتی (الحج)دا پیتی پێکەوە بەستنی (ثُمّ) بهێنرێت، و خۆی لەخۆی‌دا ئیعجازێکی زانستی گەورەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) بەهۆی وەحی خودایی‌یەوە کاتی دەرکەوتنی ئەندامەکانی کۆرپەلەکە دیاری بکات، لە قۆناغێکدا کە زۆر تەسکە لەرووی کاتەوە (دوو هەفتە و نیو دەخایەنێت)، و هەروەها وەسفەکەی بە شێوەیەکی وورد دیاری بکات (کە هەندێکی دروست بووە و هەندێکی دروست نەبووە)، لێرەوە ئیعجازەکە چەند جارە دەبێتەوە و نوورەکە رۆشنتر و پرشنگدارتر دەبێت.



# گەشتی دروست بوونی کۆرپەلەی مرۆڤ لە بۆچوونی ئەدیبێکدا

خوێنەری بەڕێز ......

لێرەدا پێم خۆشە بە کورتی و بە شێوەی داڕێژراوێکی ئەدەبی قۆناغەکانی دروست بوون و گەشە کردنی کۆرپەلەی مرۆڤت بۆ روون بکەمەوە، بۆ ئەوەی لە کۆتاییدا و دوای ئەم گەشتە بە پێز و سەرسوڕهێنەرە بەناو ئایەت و فەرمووده پیرۆزەکان و ئیعجازەکەیاندا، لەبیرت نەچێت کە تێبڕوانیت و تێبفکریت لەو موعجیزە گەورەیەی لە دروست بوونی کۆرپەلەی مرۆڤدایە، کە ئێمە رۆژانە لەبەر چاومانە بەڵام دیققەتی نادەین، بۆیە پێم خۆش بوو وەك کەسێکی خاوەن زانیاری و ئەزموون لەم بوارەدا (بەهۆی جۆری خوێندنەکەم و کارەکەم وەك پزیشکێك) کەمێك سەرنجتان بۆ ئەم موعجیزە گەورەیە رابکێشم، بۆ ئەوەی بە تەواوەتی دەسەڵاتی ئەو دروستکەرەمان بۆ دەرکەوێت کە راگری ئەو ووردەکاری و هاوسەنگییەیە، و ئەمەش ببێتە مایەی ملکەچ بوونی زیاترمان بۆ دەسەڵاتە بێسنوورەکەی و بەرنامە نێردراوەکەی بۆ مرۆڤایەتی کە ئیسلامە.

مرۆڤی یەکەم بریتی بووە لە ئاو+خۆڵ کە پوختەکەی (سلالةکەی) بەپێی ئەم هاوکێشەیە دروست بووە، پاشان بەهۆی دەسەڵاتی بەرزی پەروەردگار و بە وویستی باڵای ئەو، رۆحی بۆ نێردرا بۆ ئەوەی ژیان بەم دروستکراوە نوێیە ببەخشێت کە پێشتر تەنها گڵ بووە (وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن سُلَالَةٍ مِّن طِينٍ)، بەڵام پاش ئەمە نەوەکانی ئەم دروستکراوە نوێیە بەهۆی گەشتێکی ئەفسوناوی سەرسوڕهێنەرەوە لە تنۆکێك ئاوی بێنرخەوە دروست دەبن (ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُ مِن سُلَالَةٍ مِّن مَّاءٍ مَّهِينٍ).

**کارگەکانی شادی دروستکەر:**

گونەکان لە پیاودا بریتین لەو کارگەیەی سپێرمەکان دروست دەکەن، کە خۆی لە خۆیدا هەر گونێك خاوەنی پێکهاتەیەکی وورده و لە کۆمەڵێکی

ئێجگار زۆر لە بۆری پێچاوپێچ پێکهاتوون، ئەم بۆرییانە لە کۆتاییەکانیاندا بەیەك دەگەن هەروەك لق و پۆی رووبارێکی مەزن، و پێکەوە ١٠ بۆ ١٢ بۆری سەرەکی دروست دەکەن و دەرژێنە ناو بەشێکە تری گونەوە کە پێی دەووترێت بەربەخ (Epididymis)، درێژی ئەم بەشە پێچاوپێچەش ٦مەتر زیاترە کە توانایەکی وای دەداتێ بتوانێت ژمارەیەکی ئێجگار زۆر لە سپێرم لەخۆ بگرێت، سپێرمەکان لێرەدا گەشەیان تەواو دەبێت و هێز وتوانایان پێدەبەخشرێت و سەردەکەون بۆ شوێنێك (توورەکەکانی سپێرم) کە هەڵدەگیرێن بۆ کاتی پێویست، با لەگەڵ یەکێك لەم سپێرمانەدا سەرکەوین بەم بۆرییە درێژو پێچاوپێچانەدا، ئەگەر بۆشمان بکرێت یەکێکیان بگرین بۆ ئەوەی پێکهاتە سەرسوڕهێنەرەکەی شیبکەینەوە، کە لە نزیکەوە سەیری دەکەین دەبینین لە فیشەکێك دەچێت کە لەسەر پەتێکی درێژ دانرابێت (وێنەی ٩-٢)،ئەمە یارمەتی دەدات هەستێت بەو گەشت و ئەرکە ناوازەیەی: کلکەکەی ١٠ ئەوەندەی خۆی درێژترە، دەبێت سوودی ئەم کلکە درێژە چی بێت؟




وێنەی (٩-٢) پێکهاتەی سپێرمێك

وێنەی (٩-١): بڕگەیەکی بۆریچکەیەکی سپێرم لەناو گوندا (کە کارگەی ناوازەی دروست کردنی سپێرمەکانە).

+ ئەمە بۆ یارمەتی دانێتی لە مەلە کردنێکی خێرادا، کە وەك مەکینەیەك وایە بۆ جوولاندنی ئەو کەشتی‌یە بچووکەی پێوەی بەستراوە و بە خێرایی‌یەکی ئێجگار زۆر دەیجوولێنێت، بینراوە خێرایی‌یەکەی دەگاتە ٤ میللیمەتر لە چرکەیەکدا (واتە زیاتر لە ٤٠٠ ئەوەندەی درێژی خۆی لە هەر چرکەیەکدا، کە وابزانم خێراترین فیشەکی ناگاتێ؟!).

پاشان با سەیری سەری ئەم سپێرمە بکەین، شێوەکەی هەرمێیی‌یە و لە پێشەوە درێژ دەبێتەوە و نووکێکی تیژ دروست دەکات، هەروەها لە پێشەوەی زرێپۆش کراوە بۆ ئەوەی کە بتوانێت بەهۆیەوە بەخێرایی بچێتە ناو هێلکەکەوە، کەواتە فیشەکێکی زرێپۆشکراوە.

دە ئێستا با سەیری ناو ئەم فیشەکە بکەین، دەبینین نهێنی‌یەکی گەورە و قووڵی لەخۆ گرتووە کە بووەتە مایەی ئەم چالاکی و زیندەگی‌یەی تێ‌ی‌دایە، ئەویش ئەوەیە لە کاتی گەشە کردن و دابەش بوونی‌دا جۆرێکی تایبەت لە دابەش بوونی بەسەردا هاتووە کە پێ‌ی دەووترێت کەمە دابەش بوون، ئەم کردارە وای لێ‌کردووە کە نیوەی ژمارەی کرۆمۆسۆمەکانی لەدەست بدات، کەواتە ئەو ماددە بۆماوەیی‌یەی کە لە باوکەوە دێت کامڵ نی‌یە و نوقسانە و تەنها نیوەیەتی، ئەمەیە وا لە سپێرمەکان دەکات چالاك و لە جووڵەی بەردەوامدا بن چونکە بە شەوقن بۆ ئەو ساتەی کە لەگەڵ هێلکەکەدا یەکدەگرن (کە ئەمیش نیوەی ژمارەی کرۆمۆسۆمەکان و سیفاتەکانی دایکەکەی هەڵگرتووە)، لەگەڵ بەیەکگەشتنی ئەم دوو دڵدارەدا ئیتر مرۆڤێکی کامڵ دروست دەبێتەوە!!

لێرەدا پرسیارێك دێت بە مێشکماندا: ئایا بۆ گونەکان هەمیشە لە دەرەوەی لەشدان لەناو توورەکەی گوندا، ئەی باشە خۆ ئەمانە دوو ئەندامی هەرە گرنگ نین و چارەنووسی رەگەزی مرۆڤایەتی‌یان پێوە بەند نی‌یە؟!، ئەی بۆچی ئاوا لە لەش دوور خراونەتەوە؟!

زانستی پزیشکی وەڵاممان دەداتەوە و دەڵێت: لە بنچینەدا گونەکان لە نزیك گورچیلەکان بوون و لەوێدا دروست دەبن لە کۆرپەلەدا، بەڵام لەگەڵ لەدایك بوونی مرۆڤدا دەچنە ناو شوێنی ئاسایی خۆیان لەناو توورەکەی گون لە دەرەوەی لەشدا کە شوێنی نیشتەجێی کۆتاییانە، هۆی دانانیشیان لەم شوێنەدا ئەوەیە کە سپێرمەکان ناتوانن لە پلەی گەرمی ناو لەشدا دروست ببن و بژین، بەڵکو پێویستە لە پلەیەکی گەرمی کەمتر لە پلەی ناو لەش بە (٣-٤ پلە) بژین (پلەی گەرمی ناو لەش بە ناوەندی ٣٧,٥ پلەی سەدییە بەڵام پلەی گەرمی ناو تورەکەی گون نزیکەی ٣٣-٣٤ پلەی سەدییە)، هەربۆیە گونجاوترین شوێن بۆیان لەناو توورەکەی گوندایە، لێرەدا ووتەی پەروەردگارمان بیر دەکەوێتەوە کە دەفەرموێت ﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِن بَنِي آدَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنفُسِهِمْ أَلَسْتَ بِرَبِّكُمْ قَالُواْ بَلَى شَهِدْنَا أَن تَقُولُواْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَذَا غَافِلِينَ﴾، بەڕاستی موعجیزەیەکی گەورەیە؟!



سپێرمەکان کە بەهۆی کلکە درێژەکانیانەوە مەلە دەکەن.

با بەردەوام بین لەم گەشتەدا بۆ ئەوەی بزانین ئەو فاکتەرانە چین کە ڕێ خۆش دەکەن بۆ هاتنە بوون و هاتنە دەرەوەی ئەم سپێرمانە، ڕۆڵی سەرەکی لەم کردارەدا بۆ کوێرە ڕژێنێکی زۆر گرنگ و سەرسوڕهێنەرە، کە شای ڕژێنەکانە و پێی دەووترێت (کوێرە ڕژێنی ژێرمێشك یان ژێرمێشکە ڕژێن Pituitary Gland)، کە هۆرمۆنێك دەڕژێت و بە خوێندا دەینێرێت بۆ گونەکان، ئەم هۆرمۆنە ڕۆڵی پەیامبەرێکی

هەژێنــەر دەبینێــت بــۆ جووڵانــدنی هەســتی پیــاوەتی نــاو ســپێرمەکان و هاندانیان بۆ رۆیشتن بە قۆناغەکانی گەشە کردن و پێگەیشتن لە گوندا، تا سەرەنجام ئامادە دەبن بۆ دەرپەڕان و پاشان پیتاندن، لەلایەکی ترەوە ئەم شای رژێنانە نێردراوێکی تر دەنێرێت کە هانی هەندێك خانەی ناو گونەکان (خانـەکانی سێرتۆلی و لایـدیگ) دەدات بـۆ رژانـدنی هۆرمـۆنی نێرینـە، ئـەم هۆرمۆنە هەڵدەستێت بە پێدانی خاسیەتەکانی نێرینە وەك: گڕیی دەنگ و دەرکەوتنی قوڕگ و رەقی ماسولکەکان و توندی میزاج و تەسکی حەوز و پانیی نێوان شانەکان و دابەش بوونی تایبەتی تووك لە لەشدا بە تایبەتی لە بن باڵ و ناوچەی زاووزێدا، لەگەڵ پەیدا بوونی ئارەزووی سێکسی، کەواتە بۆ بەردەوام بوونی رەگەزی مرۆڤایەتی نێرینەی مرۆڤ لەسەر سێ ئاست دروست دەبێت: یەکەم دروست بوونی سپێرمەکان کە نهێنی دروست بوونی تێدایە، دووەم پەیدابوونی ئارەزووی سێکسی، سێیەم نیشانەکان و خاسیەتە نێرینەیییەکانی دەرەوە کە نێرینە لە مێینە جیادەکاتەوە.

ئەو کەسەی کە دەڕوانێتە ئەم وردەکارییانە بە تێڕامانەوە دەوەستێت لە بەرامبەر ئەم دیاردە و رووداوانەدا، باشە چی وا لەم هۆرمۆنی نێرینەیە دەکات کە قەناعەت بە سەلکەکانی مووی سەرپێست بکات بۆ ئەوەی ئاوا سەر دەربێنن و بەو شێوە تایبەتییە لەناو لەشدا بڵاوببنەوە؟! کە لە نێرینەدا لە هەموو لەشدا بە چڕیی پەیدا دەبن بەڵام لە مێینەدا وانییە و بە دەگمەن دەردەکەون، چۆن توانی ئەم فرۆفێڵە ئەنجام بدات؟! ئەی باشە چۆن ئەم هۆرمۆنە (کە خاوەنی توانایەکی قەناعەت پێکردن و رازی کردنێکی بێوێنەیە) توانی دەنگەژێکان تێبگەیەنێت کە بەو شێوە تایبەتەبن و ئەو دەنگە گڕە تایبەتییەی نێرینە دروست بکەن؟! ئەی چۆن توانی یارمەتی ماسولکەکان بدات کە دەست بکات بە کۆکردنەوەی پرۆتینەکان بۆ ئەوەی رەق و بەهێزبن؟! ئەی نهێنی کرانەوەی ئێسکەکانی سنگ و شان و تەسك



وێنەی (٩-٤): نوتفەی پیاو کە سپێرمەکانە.

بوونەوەی حەوز دەبێت چ نهێنی‌یەك لە پشتیانەوە بێت؟ باشە چۆن ئەم هۆرمۆنە دەتوانێت بە چەندین زمان گوفتار بکات و بتوانێت کار بکات لە ماسولکەکان و ئێسکەکان و جومگەکان و دەنگە ژێکان و کڕکڕاگەکانی قوڕگ و سەلکەکانی موو ... و چەندین ئەندامی تر، و لە کۆتاییشدا چۆن ئەو میزاج و نەفسی‌یەتە تایبەتی‌یە دروست دەکات، کە ئەمەی دوایی‌یان وەك نهێنی و مەتەڵێکی سەرسوڕهێنەر دەمێنێتەوە؟! باشە کێ ئەم هەموو توانا بێ‌سنوورەی دەداتێ؟!

کاتێك ئێمە سەرگەرمی ئەم قسە و باسانەین سپێرمەکان بەردەوام دەبن لە گەشتەکەیان و ڕۆشتنیان بەناو ئەو تونێلە سیحراوی‌یە تاریکانەدا وەك ژێردەریایەك کە ناوەندی ئەو دەردراو و ئاوە لێڵە دەبڕن بەبێ ئەوەی خۆیان بدەن بە دیوارەکاندا، تەنانەت ئەگەر بەریشی بکەوێت ئەوا ئەو زرێپۆشەی لەبەری‌دایە و کڵاوە بەهێزەکەی نایەڵن کەمترین زیانی پێ‌بگات و کاری تێناکرێت، لە پاڵ ئەم سپێرمەی کە ئێمە لەگەڵی‌دا گەشت دەکەین دەبینین نەتەوە و میللەتێکی تەواو لە سپێرم بە هەمان ئاراستەدا دەڕۆن و هەمان

گەشت دەکەن لەم کۆڕەو و خۆپیشاندانە مەزنەدا کە بریتی‌یە لە سروودی هێنانە ژیانی مرۆڤێکی ناوازە.

بەیناوبەین ئەم تونێلە تەسک دەبێتەوە و فراوان دەبێت تا دەگاتە عەمباری تایبەتی هەڵگرتنیان کە بریتی‌یە لە توورەکەکانی سپێرم، لێرەدا کۆدەبنەوە و ڕێکدەخرێن و چاوەڕێی کاتی گونجاو دەکەن بۆ دەرپەڕان، و بۆ گەیشتن بەو ساتەی چاوەڕێی دەکەن، و پاشان ئەنجامدانی کارەکەی خۆیان، ئەم عەمبار کردنە میکانیزمێکی زۆر زیرەکانە و ئابووری‌یانەیە چونکە ئەگەر ئەمە نەبووایە ئەوا بەردەوام ئەم سپێرمانە لە ئەندامی زاووزێوە دەهاتنە دەرەوە و بەم شێوەیە بەردەوام بەفیڕۆ دەچوون، و کارگەکە کاڵاکەی خۆی بۆ شوێنی نەگونجاو دەنارد، بەڵام ئەو بەفیڕۆدانە خووی ئەم دروستکراوە وورد و ناوازانە نی‌یە بەڵکو هەڵدەستن بە عەمبار کردنیان لە چەند شوێنێکی گونجاودا تا کاتی پێویست دێت، ئیتر بە وەجبە ئەم کاڵا بەنرخە دەنێردرێتە بازاڕەوە بە مەبەستی دەست کەوتنی سوود و قازانج، خوای گەورە زۆر جوانە کە دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ الَّذِيَ أَنشَأَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ فَمُسْتَقَرٌّ وَمُسْتَوْدَعٌ قَدْ فَصَّلْنَا الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَفْقَهُونَ﴾.

ئێستا بابزانین چۆن ئەم سپێرمانە بە سەلامەتی دەگەنە ناو مناڵدان کە لە بەردەمی‌دا چەندین کۆسپ و مەترسی گەورە هەیە کە هەڕەشەی لێدەکەن بە لەناوچوون، هەر لە بۆری سپێرم و پاشان ڕێڕەوی میز کە دوور و درێژە و ناوەندێکی ترشە بەهۆی ڕۆیشتنی بەردەوامی میز بەناوی‌دا، هەروەها درێژی ڕێگا و ترشیی زۆری زێ و ڕێڕەوی زاووزێی مێینە، و لە هەمان کاتیشدا دەردراوەکانی توورەکەکانی سپێرم زۆر کەمن و بەو شێوەیە ناتوانن بیانپارێزن، دەبێت چار چی‌بێت بەرامبەر ئەم هەموو مەترسی‌یانە؟!

بەڕاستی چیرۆکی پەیدابوونی ژیان سەرسوڕهێنەرە!! ئەو کەسەی کە دایهێناوە هەموو شتێکی بە ئەندازە و بە قەدەری خۆی دیاری کردووە ﴿إِنَّا

كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرْ﴾، بۆ ئەوەی ئەم شلەمەنی‌یە گرنگە (کە دەتوانین بڵێین ئاوی ژیانە) بگەیەنرێتە شوێنی خۆی (کە منداڵدانە)، سەرەتا پێویستی بە چەند پێشەکی‌یەك هەیە، پێویستە توورەکەکانی سپێرم کە سپێرمیان لە گونەکانەوە بۆدێت پڕبن و تێبخزێنرێن بۆ ئەوەی هەستن بە دەرپەراندن و هەڵدانی ئەم سپێرمانە بۆ دەرەوە، کە ئەم کردارە بەهۆی ئاماژە و کارلێکە دەماری‌یەکانەوە دەبێت لە سەنتەرە دەماری‌یە کۆنترۆڵ کەرەکانی ناو مێشکەوە، بابزانین چۆن مێشك فەرمان و ئاماژەکانی خۆی دەنێرێت؟!

ئەمە لە ئەنجامی ئەو بۆچوونەوە دروست دەبێت کە مێشك دەربارەی دەرەوە وەریدەگرێت، کە ئەمەش بەهۆی هەستەکانەوە دروست دەبێت بەتایبەتی بینین، هەربۆیە دەبینین بیرە غەریزی‌یەکان دەجوولێنێت، کە لێرەوە پاش دروست بوونی ئارەزووی سێکسی فەرمان لە مێشکەوە دەردەچێت بۆ دڕکەپەتك، ئەمیش بە پەلە لەرێی دەمارەکانی‌یەوە ئاماژە و فەرمان دەنێرێت بۆ توورەکەکانی سپێرم و رژێنەکانی تری یارمەتیدەر، ئەم رێڕەوە دووورودرێژە تەنها چەند ساتێك و چەند چرکەیەك دەخایەنێت و فەرمانەکان دەگەن، سەرەتا پەستان دەخەنە سەر رژێنەکانی سەر رێگای بۆری سپێرم بۆ ئەوەی کە دەردراوێکی تفت دەرکەن و رێڕەوی میز کە ترشە هاوسەنگ بکەن، ئەمەش بە مەبەستی زیان نەگەیشتن بە سپێرمەکان لە کاتی دەرپەڕانیان لەم رێڕەوەوە، بەڵام دەپرسین ئایا ئەمە بەسە؟ نەخێر پێویستە گەرەنتی تر هەبێت، هەربۆیە رژێنی (پرۆستات)یش دەردراوەکانی خۆی دەردەدات، و بەم شێوەیە رێگا خۆش دەبێت بۆ سپێرمەکان بەناو بۆری میزدا.

وەك ووتمان تەگەرەی یەکەم بریتی‌یە لە دەوروبەرە ترشەکەی بۆری میز، کە هەموو ئەو فاکتەرانەی باسمان کرد هاوسەنگی دەکەنەوە، بەڵام لەلایەکی ترەوە بینراوە کە سپێرمەکان خۆیان کارلێکێکی تفتیان هەیە هەربۆیە ئەمەش جارێکی تر وادەکات کە زیانیان پێ نەگات لە رۆیشتن بەو شوێنەدا،

پاش ئەم ئامادە کردنی ڕێگایە و ئامادەباشی‌یەی هەموو لایەك بۆ ئەو کردارە گرنگە (کە بە هۆی فەرمانە دەماری‌یەکانەوە دەبێت)، ئیتر فەرمانی تر دێت لەڕێی دەمارەکانەوە کە دەبێتە هۆی گرژ بوونی توندی توورەکەکانی سپێرم و ڕوودانی دەرپەڕانی تۆوەکان بە خێرایی بۆ ئەوەی زۆر لە بۆری میزدا نەمێننەوە، ئیتر بەم شێوەیە ڕێگا خۆش کرا و هەموو ئیحتیاتێك وەرگیرا بە مەبەستی پاراستنی ژیانی ئەم نوتفە بەسەزمانە کە ئەمانەتێکی زۆر گەورەی هەڵگرتووە کە بریتی‌یە لە بنچینەی ئادەمیزاد، ڕوودانی لەرزینی جنسیی لەش لە کاتی ئەم دەرپەڕینەدا وەك نهێنی‌یەکی نەفسی دەمێنێتەوە، و بە تەواوەتی نەتوانراوە کە لێکدانەوەی پێویستی بۆ بکرێت و شتێکی ئاسان نی‌یە.

دەبێت ژمارەی قوربانیان لەم ڕێگەیەدا چەند بێت؟ بێگومان ژمارەکە گەورەیە ئەویش لەبەر سروشتی ژیان کە بەردەوام پێویستی بە تێکۆشان و قوربانی‌دان و مردن هەیە لە پێناوی ئامانجەکاندا، بەڵام ووردەکاری نەخشە بۆدانان و ناوازەیی لە دروست کردندا ئەم بابەتە ناخۆشانەی داپۆشیوە، هەر دەرپەڕینێکی تۆواو لە پیاوەوە نزیکەی ٥٠٠ ملیۆن سپێرمی تێدایە، کە بریتی‌یە لە نەتەوە و گەلێکی تەواو لە سپێرم کە هەر یەکێکیان بەشداری لەو پێشبڕکێ مەزنەدا بۆ ئەوەی کە پلەی یەکەم بەدەست بهێنێت، و زووتر بگاتە هێلکەکە و لەگەڵیدا یەکبگرێت و پێکەوە مرۆڤێکی نوێ دروست بکەن، ئێمەش لەگەڵ سپێرمی هاوڕێماندا چاودێری ئەم پێشبڕکێ ترسناکە دەکەین کە نەك لە نێوان دەیان یان سەدان سپێرمدا بەڵکو لەنێوان ملیۆنەها سپێرمدایە، کە بەرەوە سەرەوە بەگوڕ دەردەچن، و بەهۆی قامچی‌یەکانی دوایان زرم و ناڵەیەکی بەهێز دروست دەکەن و بێ گوێپێدان خۆیان دەکێشن بەو شلەمەنی‌یە لینجانەی دەوروبەریان گرتوون، و بەناویاندا بەخێرایی‌یەکی زۆر بەرز دەردەچن، هەروەك بڵێیت ئەم کلکانە بزوێنەری مەزنی ئەم فیشەکانەن کە نهێنی مرۆڤیان لەخۆ گرتووە.

لە کۆی ئەو ٥٠٠ ملیۆن سپێرمەی لە هەر کارێکی جنسی‌دا دەبێت تەنها یەك ملیۆنیان سەرکەوتوو دەبن لە گەیشتنیان بۆ منالّدان بە زیندوویی و بڕینی ئەو دەردراو و دەوروبەرە لینجەی کە دێتە ڕێیان.

لەلایەکی ترەوە ئێمە کە خەریکی چاودێری کردنی ئەم پێشبڕکێ گەورەیەین لەولاوە هێلکەکە کە لە هێلکەدانەوە دەرپەڕیوە و چۆتە سەرەتای بۆری منالّدان (کە زوڕناشی پێ‌دەووترێت)، بەو پەڕی ناز و بە لەنجەولارەوە دەڕوات وەك بلّێیت شاژنێکە و چاوەڕوانی سوارچاکی خەونەکانی دەکات، لە هەموو لایەکەوە بە خانەی پارێزەر بە شێوەیەك دەورەدراوە وەك دەست و پێوەند و خزمەتکار لە دەوری شاژندا، و لە هەمان کاتدا تاجی شایەتی (چەپکی تیشکدەر Corona Radiata)ی لەسەرنراوە!! و لە ئامادەباشی‌دایە بۆ پێشوازی لە براوەی یەکەم.

لێرەدا دەپرسین ئەی ئەم هێلکەیە لە کوێوە هات و چۆن دروست بوو؟ لێرەدا با گوێبیستی زانستی پزیشکی ببین کە ئەم چیرۆکە عەجیب و سەرسوڕهێنەرەمان بۆ دەگێڕێتەوە!

**کارگەی هێلکۆکەکان لە ئافرەتدا:**

هێلکەدانەکان بریتین لەو دوو کارگەیەی کە هێلکۆکە دروست دەکەن لە ئافرەتدا، ئەوەی سەرنج ڕاکێشە لەم کارگەیەدا ئەوەیە کە هەلّدەستێت بە دروست کردن و هەلّگرتنی مادده خاوە سەرەتایی‌یەکان (کە بریتین لەو خانانەی کە هێلکەکان دروست دەکەن)، بەلاّم ئەم کارگەیە دەرگاکانی ناکاتەوە و بەرهەمەکەی ناخاتە بازاڕەوە تا ئافرەتەکە بالّغ نەبێت و نەگاتە تەمەنی پێگەیشتن لە رووی لەشی و دەروونی‌یەوە، کاتێکیش دەچێتە تەمەنی پێگەیشتنەوە هێلکەدانە سڕبووەکان دەست دەکەن بە کارکردن و یەکەم هێلکەی لێوە دەردەپەڕێت.

بینراوە کە لە هەر هێلکەدانێکدا نزیکەی ٤٠٠,٠٠٠ هێلکۆکەی تێدایە کە بە ناوەندی تەنها ٤٠٠ دانەیان دەبنە هێلکەیەکی پێگەیشتوو (یان پێیان دەووترێت توورەکەی گراف کە بریتییە لە کیسێکی بچووك و پڕە لە خانەی بچکۆلە کە دەوری هێلکۆکەکەیان داوە) لە ماوەی ژیانی مێینەدا، کە دەکاتە هێلکەیەك لە هەموو مانگێکدا، ئەم دروست بوون دەرپەڕانی هێلکەیە سووڕی مانگانەی ئافرەت دروست دەکات کە هەموو ٢٨ ڕۆژ جارێك (یان مانگێکی کۆچی) دەخایەنێت. یەکێك لە خاڵە گرنگەکان کە لێرەدا ئاماژەی پێبدەین ئەوەیە کە لەلای ئاژەڵان کاتێکی دیاری کراو هەیە پێی دەووترێت وەرزی جنسی یان مەوسمی سێکسی*، بینراوە لە ئاژەڵاندا ئەمە چەند کاتێکی دیاری کراوە لە هەموو ساڵێکدا کە ئەگەری زاووزێ و پیتاندن و وەچە خستنەوەی تێدایە، و لەم کاتەدا هەر ڕەگەزێك ئارەزوو لە ڕەگەزەکەی تر دەکات و جووت بوون ڕوودەدات، ئەم ماوەیە لە نێوان چەند مانگێکدایە (وەك لە پشیلە و سەگدا) بۆ چەند ڕۆژێك (وەك لە بۆقدا).

بەڵام لە مرۆڤدا: لە ئافرەتدا نزیکەی ٤٠ساڵ دەخایەنێت (کە بە ناوەندی لەنێوان تەمەنی ١٢-٥٠ ساڵیدایە)، بەڵام لە پیاودا بەدرێژایی ژیانی دەخایەنێت، هەروەها توانای سێکسی و ئەگەری پیتاندن و ئارەزووی سێکسی لە مرۆڤدا بە درێژایی ساڵ هەیە، کە ئەمە کردارەکەی زۆر خەتەرناك کردووە، ئەویش لەبەر ئەوەیە کە ئاژەڵان خووە خۆڕسکەکان و غەریزەکانیان کۆنترۆڵ کراوە وەك سیستەمەکانی خۆراك و هەناسەدان و دەردان کە

* دەتوانین بڵێین لە هەموو زیندەوەرەکاندا کاتژمێرێکی بایۆلۆجی (یان چاوێکی سێیەم) هەیە، کە هەموویان ئاگادار دەکاتەوە بۆ تەوقیتی ووردی هەموو سووڕێك لە سووڕەکانی ژیانیان، هەربۆیە دەبینین ئاژەڵەکان و باڵندەکان و ماسییەکان و زیندەوەرەکانی تر دەنوون و هەڵدەستن، و خانوو هێلانە دروست دەکەن و کۆچ دەکەن، و زاووزێ دەکەن، ئەمانە هەمووی لە چەند سووڕێکی ڕێك وپێکی ووردا ئەنجام دەدەن، کە تا ئێستا ئەم دیاردەیە زۆری نهێنییە و زۆر توێژینەوە سەرگەرمی لێکۆڵینەوەین.

هەموویان ملکەچن بۆ یاسا و سوننەتێکی دیاری کراو، بەشێوەیەك کە لە ڕۆژانی غەیری وەرزی سێکسیدا ئیتر ئارەزووی جنسییان دەکوژێتەوە و ئاژەڵەکە دەچێت بەلای کارەکانی تری و سەرقاڵییەکانی تری ژیانیدا، بەڵام لە مرۆڤدا ئەم سیستمە بەستراوەتەوە بە وویست و ئیرادە و توانای هەڵبژاردنی خۆیەوە، و خۆیەتی کە دەبێت ئەمە ڕێکبخات لە رووی زۆری یان کەمی و خۆگرتنەوە و جڵەوگیریی یان بەرەڵاییدا، بەپێی ئەوەی کە وویستە سەربەخۆکەی بۆی دیاری دەکات، هەربۆیە مرۆڤ بریتییە لە تەنها دروستکراوێك کە تەکلیف و ئەرك لێپرسینەوەی لەسەرە دەربارەی ئەم سیستمانەی کە پێی درابوو ﴿إِنَّا عَرَضْنَا الْأَمَانَةَ عَلَى السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا الْإِنسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا﴾.

تێبینییەکی تر کە باسی بکەین بریتییە لە بوونی سەرە لە کاتی فڕێدانی هێلکەدا لە هەردوو هێلکەدانەکەوە کە ئەمە یاسایەکی جێگیرە لە هەموو ڕژێنەکانی لەشدا، بینراوە کە ڕژاندنی هۆرمۆنەکان بە پچڕپچڕییە و بەردەوام نییە، و کاری لوولەکان و پلەکانی گورچیلە بە سەرەیە کە هەر کاتێك کۆمەڵێك کاردەکەن بەشێکی تر دەحەوێنەوە و هەروەها هەموو سیکڵدانۆچکەکانی سییەکان لەیەك کاتدا ناکشێن لە کاتی هەناسە وەرگرتندا، هەروەها هەموو موولوولەکانی خوێن لەیەك کاتدا فراوان نابن (تەنها لە چەند حاڵەتێکی دەگمەندا نەبێت، وەك: زیادبوونی هیلاکی یان لە کاتی ڕووداوەکاندا)، بابڕوانینە هێلکۆکەکانیش کە بینراوە بە تەنها نین لە هێلکەدانەکاندا، بەڵکو دەورە دراون وەك شاژن بە دەست وپێوەندێکی زۆر لە خانە و لەسەر سەری تاجێکی پرشنگدار و تیشکدەری داناوە لە خانەی یارمەتیدەر، کە هەموویان لەناو توورەکەیەکی بچووکدان پێی دەووترێت توورەکەی گراف، بێجگە لەم خانانە لەناویشیدا چەند شلەیەکی هۆرمۆنی تێدایە کە دەبنە هۆی ئامادە کردنی مناڵدان بۆ پێشوازی کردنی هێلکەی

پیتێنراو، کاتێکیش کە مانگەکە تێپەڕی بەبێ ئەوەی پیتاندن رووبدات ئیتر ناوپۆشی منالدان دادەڕمێت و خوێنی بەخوڕ دێتە خوارەوە کە پێی دەووترێت خووی یان سووڕی مانگانە یان حەیز لە ئافرەتدا.

لێرەدا پرسیارێکی تر دەکەین: ئایا چۆن ئەم هێلکەیە لە هێلکەدانەوە دەردەپەڕێت کە وەك زیندانێك یان توندتر وایە بۆی؟! زانستی پزیشکی بۆمان باس دەکات کە پەیوەندی‌یەکی ئالۆز هەیە لە نێوان رژێنەکانی ناو لەشدا، بینراوە کوێرەرژێنی ژێرمێشك بریتی‌یە لە شاژنی رژێنەکانی ناو لەش و کلیلی هەموویانە بەبێ بەرامبەر، کە ئەمیش لەسەر تەختی خۆی دانیشتووە لەناو ئێسکی کەللەی سەردا و لە شوێنێکی زۆر پارێزراودا،




وێنەی (٩-٥): دەرپەڕانی هێلکە لە هێلکەدانەوە.

لەم شوێنە بەرزەی لەشەوە و لەم تەختەوە فەرمانەکانی دەردەکات، یەکێك لەم فەرمانانەی بریتی‌یە لە ناردنی نامەیەکی بەپەلە بۆ ئەو توورەکانەی گراف کە لەناو هێلکەدانەکاندان، بە تایبەتی یەکێکیان زیاتر هاندەدات بۆ جوولان و زیاد کردنی دەردراوەکانی، و هەروەها بانگ کردنی سەربازە ئیحتیاتەکانی لە خانە یارمەتیدەرەکان، ئیتر بەم شێوەیە خانە ئیحتیاتەکان کۆدەبنەوە و سوپایەکی خانەیی دروست دەکەن و چواردەوری هێلکۆکەکە

دەدەن و لەگەڵیدا دەڕۆن بۆ پاراستنی لە هەموو ئەو شتانەی کە دێنە ڕێی تاوەکو دەیگەیەننە سنووری وڵات!!

سنووری ئەم وڵاتەش بریتییە لە رووپۆشی هێلکەدان (یان توێکڵی هێلکەدان کە پەردە داپۆشەرەکەیەتی لە دەرەوە) و کە دەگاتە ئێرە توورەکەکە ئەوەندە گەورە بووە کە وەك دەنکە گێلاسێکی لێهاتووە و پەستان دەخاتە سەر توێکڵی تەنکی هێلکەدان، لێرەدا هۆرمۆنێکی تر دەگات کە بە پەلە لەلایەن شاژنی کوێرە رژێنەکانەوە نێردراوە و فەرمان بە پاسەوانانی سنوور دەکات کە بوار بکەنەوە بۆ هێلکەکە بە خێرایی بۆ ئەوەی کە دەرچێت، و توورەکەکەی بتەقێت، هەروەکو چۆن مینێك کە لەسەر سنوور دانرابێت دەتەقێتەوە کاتێك کە ڕێبوارێکی نەزان بە سروشتی ئەو سنوورە بەسەریدا دەڕوات!! ﴿فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ مِمَّ خُلِقَ ، خُلِقَ مِن مَّاءٍ دَافِقٍ﴾.

بەڵام ئەم تەقینە بە مەبەستێك و ئامانجێکی دیاری کراو روودەدات چونکە پاڵ بە هێلکەکەوە دەنێت و دەریدەپەڕێنێت بۆ ناو سەرەتای بۆری مناڵدان کە وەك زوڕنا وایە و کراوەتەوە بەسەر هێلکەداندا، وەك بڵێیت تێگەیشتنێك هەیە لەنێوان پاسەوانانی سنوور و ئەم زوڕنایەدا، کاتێکیش کە زوڕناکە ئەم ئەمانەتە ئازیزە (کە هێلکەکەیە) وەردەگرێت ئەو توورەکەی گرافەی کە تەقیوە شلەمەنییەکانی ناوی دەڕژێنێتە ناو بۆشایی سکەوە، کە ئەم شلەمەنییانە بریتین لە هۆرمۆنی جۆراوجۆر کە هانی ئارەزووی سێکسی دەدەن لەلای ئافرەتەکە، هەروەك بڵێیت هانی ئافرەتەکە دەدەن بۆ ئەوەی ئەم رەنجە زۆرەی دراوە بەفیڕۆ نەڕوات؟!!

ئیتر بەهۆی ئەمەوە پیتاندن روودەدات و هێلکەکە لەناوناچێت (چونکە دەتوانێت بە تەنها ٢٤ کاژێر بژی)، دوای ئەم رووداوەش پاشماوەی توورەکەکەی گراف لەناو هێلکەداندا وەردەگەڕێت بۆ ئەنجامدانی ئەرکێکی تر کە بریتییە لە یارمەتی دانی ئەو هێلکەیەی کە بە ڕێڕەوی خۆیدا و بۆ

کاری خۆی رۆیوە، چونکە ئەم ئەو هاوەڵی‌یە درێژەی بیرناچێتەوە و بە وەفایە بۆ هاورێ کۆنەکەی، پاشماوەی تورەکەکەی گراف پێی دەووترێت تەنی زەرد (ئەویش لەبەر ئەوەیە کە پڕدەبێت لە ماددەیەکی زەرد)، و بریتی‌یە لە دەردەری هۆرمۆنێکی تایبەتی کە پێی دەووترێت پرۆجیستیرۆن کە رێگە خۆشدەکات لەبەردەم هێلکەکەدا ئەگەر پیتێنرا، کارەکەی بریتی‌یە لە ئاگادار کردنەوەی مناڵدان و تێگەیاندنی بۆ ئەوەی ئامادەباشی تەواو بکات بۆ پێشوازی کردنی هێلکە پیتێنراوەکە کە لە رێدایە بۆ ئەوێ.




وێنەی (٩-٦) هێلکاری‌یەك پێگەیشتنی توورەکەی (گراف) روون دەکاتەوە، کە لە ناویدا هێلکۆکەیەکی پێگەیشتووی تێدایە.




وێنەی (٩-٧): دوای دەرپەڕینی هێلکۆکەکە پاشماوەکەی لەناو هێلکەداندا دەبێت بە (تەنی زەرد).

کاتێك منداڵدان ئەم هەواڵە گرنگە دەبیستێت دەست دەکات بە خۆئامادە کردن بۆ پێشوازی کردنی ئەم میوانە ئازیز و خۆشەویستە لەرێی راخستنی فەرش و راخەری ئەستوور و نەرم و نیان و ئیسراحەت بەخش و ئامادە کردنی سەرینی پڕ نەرمی و خۆراکی بە لەزەت و ئامادە کراو، ئەمانە هەمووی لەرێی ئەستوور کردنی ناوپۆشی منداڵدان، کە چەند چینێك خانەکانی و رژێنەکانی زیاد دەکەن و پڕدەبن لە گلایکۆجین، کاتێك کە منداڵدان لەم چاوەڕوانی‌یەدا دەبێت هەواڵە ناخۆشەکان بۆی دێن کە ئەم میوانە ئازیزە لە رێگەدا مردووە و لەناو چووە، ئیتر زۆر کاری تێ‌دەکرێت و لەبری فرمێسك خوێن دەرێژێت بۆ ئەم میوانە خۆشەویستەی کە بە دیداری شاد نەبوو!! ئەم کردارەیە کە پێی دەوترێت خوێنی خووی مانگانەی ئافرەت.

با ئێستە بگەڕێینەوە بۆ ئەو هێلکەیەی کە بۆ گەشتە تۆمار کراوەکەی دەرچووە، لێرەدا رووداوێکی گرنگ و خەتەرناك روودەدات کە ناسراوە بە کەمە دابەش بوون، کە وا لە هێلکەکە دەکات نیوەی ژمارەی کرۆمۆسۆمەکان هەڵبگرێت تا دەگاتە سپێرمەکە کە ئەمیش هەر نیوەی ژمارەی کرۆمۆسۆمەکانی هەڵگرتووە لە باوکەوە، دوای بەیەك گەشتنی ئەم دووانە ژمارەی تەواوی کرۆمۆسۆمەکان دروست دەبێتەوە و لەم دوو نیوەیەوە

مرۆڤێکی کامڵ پێکدێتەوە، ئێستا سەعاتی سفرە چونکە ئەو سپێرمەی بە کاتی بەجێمان هیلا بە خێرایی مووشەك بەناو مناڵداندا دەردەچێت و دەگاتە بۆری مناڵدان و پاشان بۆ سەرەتاکەی دەڕوات کە بەهۆی کلکە درێژەکەیەوە تاریکیی دەردراوە خەستەکان شەق دەکات بەخێرایییەکی زۆر و بە جووڵەیەکی بەخول، کە پێشەکییەکەی بە کڵاوێکی بەهێز زرێپۆش کراوە، ئێستا بازانین چۆن ئەم بەیەك گەشتنە مێژوویییە روودەدات؟!!

**بەیەك گەشتنی سپێرم بە هێلکۆکەکە:**

وەك ووتمان چانسی ئەم بەیەك گەشتنە وەك ئەوە وایە کە کەسێك لە ئەمریکاوە لە رۆژئاوای گۆی زەوی و یەکێکی تریش لە یابانەوە لە رۆژهەڵاتی زەوییەوە بنێردرێن بەپێ بڕۆن و بەچاو بەستراوی بۆ ئەوەی لە ناوەڕاستی زەویدا لە شاری مەککە بەیەك بگەن؟؟!! کە لە ڕاستیدا ئەمە هەرگیز روونادات و بەهیچ شێوەیەك ئەو دووانە بەیەك ناگەن.

بە تەواوەتی ئەمە ئەوەیە کە لەگەڵ تۆو و هێلکەدا روودەدات چونکە تیرەی هێلکە ٢٠٠مایکرۆن دەبێت (١مایکرۆمەتر= ١ لە ١٠٠٠ بەشی میللیمەترێك) و تیرەی تۆو لە ٥٥ مایکرۆن تێناپەڕێت، بەڵام تیرەی بۆری هێلکەدان ١سانتیمەتر و درێژییەکەی ١٥سم دەبێت، واتە لەچاو تۆو و هێلکەدا درێژییەکەی ٢٤٠هەزار جار گەورەترە کە پێویستە هێلکەکە ١/٣ی بڕێت، و تۆوەکان ٢/٣ی ئەم درێژییە بڕن لە ماوەی چەند سەعاتێکدا، پاشان با خەستیی ئەم فیشەکە پێشبڕکێکەرانە بزانین کە بە ملیۆنەهان و ئەوەی براوەی یەکەم بێت لەگەڵ هێلکەکە یەکدەگرێت، کە نزیك دەبێتەوە لە دیوارەکەی و نێرراوێکی تایبەتی دەنێرێت (کە بریتییە لە ئینزیمێك)، بە مەبەستی ئاگادار کردنەوەی هێلکەکە کەوا من نزیك بوومەتەوە لێت تۆش دەرگام بۆ بکەرەوە، ئیتر هێلکەکەش نێردراوێکی لە دیوارەکەیەوە بۆ دەنێرێت کەوا ئەم شوێنێکی بۆ ئامادە دەکات (کە بەرزایییەکی بچووکە لە

دیوارەکەدا و زانایان پـێی دەڵـێن پێکهاتـەی راکێشـان) بـۆ ئـەوەی لـەوێوە بچـێتە ژوورەوە، سـپێرمەکەش لـەم شـوێنە نزیـك دەبێتـەوە و دیـوارەکـە لـەم شوێنەدا شەق دەبێت (بە یارمەتی هەردوولا، چونکە سپێرمەکەش ئەنزیمێك دەڕژێـت (پـێی دەووترێـت هایلورۆنیـدەیز Hyaluronidase) کـە ئـەو شوێنەی دیوارەکە دەتوێنێتەوە).



وێنەی (٩-٨): هێلکۆکەیەك کە لەناو لۆچەکانی بۆری منالّدانّدا چاوەڕێی سپێرم دەکات.

کـە دەرگاکـە کرایـەوە سـەری ئـەم سـپێرمە دەچـێتە ژوورەوە و لـــەدوای خـــۆی کلکەکـــەی جێدەهێڵێـــت (کـــە یارمـــەتی دەرێکـــی زۆر باشـــی بـــوو لـــە گەشـتەکەیدا)، تـەنها نـاواخنی سـپێرمەکە دەچـێتە ژوورەوە کـە نیوەکـــەی تـــری مرۆڤەکەیـــە و پاشـان هـەردوو ناوکەکـە لـە یـەك نزیك دەبنەوە و یەکدەگرن، بەم شێوەیە کرۆمۆسۆمەکانی هەردولا کۆدەبنەوە و ژمارەکـە جارێکی تـر تـەواو دەبێتـەوە و مرۆڤێکـی نـوێ لەمانـەوە دروسـت دەبێت کە هەڵگری سیفاتی هەردوو دایك و باوکەکەیە.

ئـەوەی شـایەنی باسـە تـەنها یـەك سـپێرم دەچێە ژوورەوە و دوای خـۆی دەرگاکە دادەخات و دیـواری هێلکەکـە جـۆرە گۆڕانکاری‌یەکی بەسـەردا دێـت کە رێدەگرێت لە سپێرمی تر بنووسێن بـە هێلکەکـەوە و دیوارەکـەی ناتوانن بڕن، ئەمیش لەبەر ئەوەیە کە هێلکە وەك دروستکراوێکی داوێنپاك تـەنها بـە یەك هاوەڵی ژیان رازی دەبێت و کە بە ئاواتی خۆی گەیشـت ئیتر داوێنپاکی خـۆی رادەگرێـت، دیـارە ئـەم کـردارەش بـۆ پاراسـتنی ووردەکـاری دروسـت بوونی مرۆڤە و رێگەنەدانە بە شێواندن و تێکدانی ئەم هاوسەنگی‌یە.

کەواتە هێلکەی پیتێنراو لە یەکگرتنی ئەم دووانەوە دروست دەبێت، تیرەی ئەمیش لە چەند مایکرۆنێک تێناپەڕێت و پێویستە ئەم ماوە دووروودرێژە لەچاو خۆیدا ببڕێت (کە بریتییە لە ٣\١٢ی بۆری منداڵدان) بۆ ئەوەی بگاتە ناو منداڵدان، کە شوێنی جێگیر بوونێتی و شانۆی سەرەکی ڕووداوەکانی دروست بوونی کۆرپەلەیە، باشە کێ ڕێنوومایی ئەمانە دەکات و ئاگای لێیانە بۆ ئەوەی هەریەکەیان بگەنە شوێنی مەبەستی خۆیان و ڕێیان لێ وون نەبێت؟! بێگومان دەبێت ئەو کەسە بێت کە هیچ شتێکی لێ وون نابێت و ڕێنومایکەری هەموو دروست کراوەکانە، کە خودای پەروەردگاری هەموو زیندەوەرەکانە، دەبینین ئەم ڕاستییە لە ئایەتێکی قورئاندا ئاماژەی بۆ کراوە کە دەفەرموێت: ﴿مِن نُّطْفَةٍ خَلَقَهُ فَقَدَّرَهُ، ثُمَّ السَّبِيلَ يَسَّرَهُ﴾، واتە: پەروەردگار کە مرۆڤ لە نطفەیەکی ئەندازە بۆ دانراوەوە دروست دەکات، پاشان ڕێ بۆ ئەم کۆرپەلەیە ئاسان دەکات کە بگاتە مەبەستی خۆی.

دەبێت سیفاتەکانی ئەم دروستکراوە نوێیە لە کوێدابن؟! وەك ووتمان لە پێکهێنەری کرۆمۆسۆمەکاندایە کە بریتییە لە ترشی ناووکی کەم ئۆکسجین (DNA)، درێژییەکەی بریتییە لە تەنها ٣٠ ئەنگستڕۆم، ئەم هێلکە پیتێنراوەی لە کۆبوونەوەی هێلکۆکە و سپێرم دروست بووە بارستاییەکەی تەنها یەك بەشە لە ملیۆنێك بەشی گرامێك!! ئا لەم بەشە کەمەوەیە کە مرۆڤێکی تەواو دروست دەبێت، پاك و بێگەردی بۆ ئەو پەروەردگارەی کە دەفەرموێت: ﴿إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعاً بَصِيراً﴾.

بینراوە ئەم خانە پیتێنراوە کات و شوێنی دیاری کراوی خۆی هەیە کە ئەگەر پێش و دوا بخرێت ئەوا پیتاندن و دروست بوونی مرۆڤەکە روونادات، کاتەکەی ئەوەیە کە هێلکەکە لە ڕۆژی چواردەیەمی سووڕی مانگانەی

ئافرەتەکەدا دەردەپەڕێت و تەنها بۆ چەند سەعاتێك یان زۆرترینی بۆ ڕۆژێك دەژی ئەگەر نەگات بە سپێرمەکە، هەروەها سپێرمەکانیش دەچنە بۆری منالدانەوە و ئەمانیش تەنها بۆ ٣-٤ ڕۆژ دەمێننەوە کە ئەگەر پیتاندن روونەدات دەمرن.

شوێنەکەش بریتی‌یە لە سەرەتای بۆری منالدان (کە پێی دەووترێت سێ‌یەکی دوور ئەگەر بۆری منالدان بکەین بە ٣ بەشەوە: بەشێکی نزیك لە منالدانەوە و بەشێکی ناوەڕاست و بەشێکی دوور لە منالدانەوە).

لێرەدا دەپرسین بۆ دەبێت تەنها لەم شوێنەدابێت، چونکە ئەگەر پیتاندنی سروشتی لە هەر شوێنێکی تردا روویدات ئەوا نایەتە بەرهەم و ناتوانێت ڕێڕەوەکەی تەواو بکات، زانایان زۆر لێکدانەوەیان بۆ ئەم بابەتە کردووە کە تا ئێستا لێکدانەوەیەکی روون و ئاشکرای نی‌یە تەنها ئەوە نەبێت کە بلێین ئەمە ئەندازە دانانی خودایەکی زانا و دانایە ﴿أَفَرَأَيْتُم مَّا تُمْنُونَ {٥٨} أَأَنتُمْ تَخْلُقُونَهُ أَمْ نَحْنُ الْخَالِقُونَ {٥٩} نَحْنُ قَدَّرْنَا بَيْنَكُمُ الْمَوْتَ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ {٦٠} عَلَى أَن نُّبَدِّلَ أَمْثَالَكُمْ وَنُنشِئَكُمْ فِي مَا لَا تَعْلَمُونَ {٦١} وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ النَّشْأَةَ الْأُولَى فَلَوْلَا تَذَكَّرُونَ﴾ (الواقعة)، واتە: جا پێم بلێن ئەو مەنی‌یەی کە لە جێی خۆیدا دایدەنێین چی‌یە و چۆنە؟ (واتە بۆ ناڕواننە ئەو دروستکراوە و نهێنی‌یەکانی)، ئایا ئێوە دروستی دەکەن یان ئێمە بەدیهێنەرین؟! ئێمە نەخشەی مردنمان لە نێوانتاندا بڕیارداوە، کەس دەسەڵاتی پێش ئێمە نەکەوتووە و بێ‌تواناش نین، کە لە شوێنی ئێوە نەوەی تر بهێنین و بیخەینە شوێنتان، یاخود سەر لە نوێ لە ڕێگەیەکەوە کە ئێوە نایزانن دروستتان بکەینەوە، سوێند بەخوا خۆ ئەوەتا بوونی سەرەتا و یەکەم جارتان زانیوە و بە چاوی خۆتان بینیوتانە چۆن پەیدا دەبن!!! کەواتە بۆچی یاداوەری وەرناگرن و بیرناکەنەوە؟!.

پاشان لەتبوون و شەقبوونی ئەم خانە نوێیە دەست پێدەکات (کە پێی دەووترێت هێلکەی پیتێنراو یان زایگۆت) کە توانایەکی ئێجگار گەورەی پێدراوە بۆ دابەش بوون و زیادبوون، بە شێوەیەك کە زانایان ئەم خانە نوێیە و سیفاتەکانی بە تەواوەتی دەزانن، گەورە بوونی منداڵدان و سکی ئافرەت بە پلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ بوونی سکپڕی و کۆرپەلە، کە بە تەواوەتی دەناسرێتەوە چونکە گەشەکردن و زیادکردنەکەی زۆر زیاترە لە هۆکارەکانی تری وەك شێرپەنجە، بەڵام بیرمان نەچێت کە هۆکاری تر هەیە بۆ گەورە بوونی منداڵدان و سکی ئافرەت، وەك: شێرپەنجە یان زیادە گۆشت و وەرەمی بێزیان، بەڵام ئەم دووانە نێوان زەوی و ئاسمانیان بەینە چونکە گەورەبوونی سك بەهۆی کۆرپەلەوە سەرەنجام ژیانێکی نوێی لێدەکەوێتەوە، بەڵام گەورە بوونی سك بەهۆی وەرەم و شێرپەنجەوە دەبێتە هۆی ئازار و ئەشکەنجە و سەرەنجام مردن و لەناوچوون، کەواتە لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت توانای ژیان بۆ پەیدا بوون و زیادبوون زیاتر و بەهێزترە لە مردن، پاك و بێگەردی بۆ ئەو پەروەردگارەی ئاماژەی بەم ڕاستییە داوە کە ناوسکی ئافرەت مەرج نییە تەنها منداڵی تێدابێت، و تەنها پەروەردگاریش پێش هەموو کەسێك ئەمە دەزانێت، ئەوەتا دەفەرموێت: ﴿اللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَحْمِلُ كُلُّ أُنثَى وَمَا تَغِيضُ الأَرْحَامُ وَمَا تَزْدَادُ وَكُلُّ شَيْءٍ عِندَهُ بِمِقْدَارٍ﴾ (الرعد:٨)، واتە: تەنیا پەروەردگار خۆی دەزانێت کە ئافرەت چی لە سکیدایە و لەکاتی سکپڕیدا چی هەڵگرتووە، و ئەوانەش کە لە منداڵدانەکاندا ڕۆدەچن، وون دەبن و تیا دەچن چین، یان زیاد بوونی منداڵدانەکان چییە؟ و هەموو شتێك لای ئەو بە ئەندازەیە و قەدەری بۆ دانراوە.

ئەم خانە نوێیەی کە بارستەی تەنها یەك بەشە لە ملیارێك بەشی گرامێك، لە کاتی لەدایك بووندا دەبێتە دروستکراوێکی تەواو کە کێشەکەی ٣٥٠٠ گرام دەبێت، و ژمارەی خانەکانی لەشی لە هەزار ملیۆن ملیۆن خانە زیاترە

کە ژمارەیەکی ئێجگار گەورەیە!! کە لە ئەنجامی دابەش بوونە بەردەوامەکاندا پەیدا دەبن، بارستەکەیشی زیاتر لە ٣٠٠٠ ملیار جار گەورەتر دەبێت لەچاو ئەو کاتەی کە تەنها یەك خانە بووە.

دوای پیتانـدنی هێلکەکـە دیوارەکـەی زۆر ئەسـتور و بـەهێز دەبێـت بەشێوەیەك کـە هـەر سپێرمێکی تـر خـۆی پـێدا بکێشێت ناتوانێت بچێتە ناوی‌یەوە و بەم شێوەیە ئەوانەی تـر دەمرن، پاشان با گەشتی ئەم زایگۆتـە تێبینـی بکـەین، دەبینـین دەسـت دەکـات بـە دابـەش بـوون بـە شـێوەیەکی زنجیرەیی و ئەندازەیی:

٢ ، ٤ ، ٨ ، ١٦ ، ٣٢ ، ٦٤ ، ١٢٨ ، ٢٥٦ ، ٥١٢ و ..... هتـد، کـە ئەمـە دەبێتـە هـۆی دروسـت بـوونی ژمارەیـەکی زۆر زۆری خانـە بـەڵام قـەبارەی هـەموویان لەچاو قەبارەی هێلکە بنچینەیی‌یەکەدا زیاد ناکات، لەکاتی ئەم دابەش بوونانەدا زایگۆتەکە بەهۆی چەندین فاکتەرەوە پاڵی پێوە دەنرێت بە رێگەی مناڵداندا و ئەم گەشتە نزیکەی هەفتەیەك دەخایەنێت، کە لـە کۆتـایی گەشتەکەدا دابەش بوونـەکان گەیشتووەتە لوتکە (هەندێك لـە زانایـان دەڵێن نزیکەی ٥٠ دابەش بوون روودەدات).

کاتێك کە دەگاتە نـاو مناڵدان و دەکەوێتـە نـاوی، دیوارەکەی بەشێوەیەك ئامادە کراوە کە پێشوازی لەم دروستکراوە نوێیە بکات و لێرەدا کردارێکـی عـەجیب و سەرسـوڕهێنەر روودەدات، کـە وەك باسمـان کـرد بریتی‌یـە لـە کرداری چوونە ناوەوەی کۆرپەلەکە بۆ ناو دیواری مناڵدان کە ئەم دیـوارە لـە بەرامبـەری‌دا داخـراوە؟! دەبینین ئـەم هێلکـە پیتێنـراوە کە ئێستا لـە شـکڵی توویەکدایـە (بـەهۆی قـەرەباڵغی لـە بـوونی خانـەدا) چـەند گەندەپێیـەك لەملاولایـەوە پەیـدادەبێت هـەروەك پێکـانی ئەختـەبووت، کـە بەشـێوەیەکی بێ‌رەحمانـە هەڵدەستن بـە کرانـدن و هـەڵکۆڵینی دیـواری مناڵـدان بـۆ دروسـت کردنی دەرگایەك بۆ چوونە ناوەوە، کاتێکیش ئەم کـردارە ئـەنجام دەدەن ئـەم

زایگۆتە توویی‌یە لەناو دیوارەکەدا نوقم دەبێت و ئەو دەرگایەی کە لێوەی هاتووەتە ناوەوە لە دواوەی دادەخرێت، پاشان بابزانین چی روودەدات؟!




وێنەی (٩-٩): کۆرپەلەکە لە تۆپەڵێك خانە پێکهاتووە کە دەکەوێتە ناو مناڵدانەوە، خۆی هەڵدەواسێت بە دیوارەکەیە و پاشان هەڵیدەکۆڵێت، و لە کۆتاییدا ئەو شوێنەی کە لێوەی هاتووەتە ژوورەوە لە پاش خۆی دادەخرێت.

ئەم گەندەپێ ئەختەبووتی‌یانە بەچواردەوری تووەکەدا هەڵدەستن بە هەرس کردنی پێکهاتەکانی دیوارەکە لەگەڵ لوولەکانی خوێندا، بەم شێوەیە خوێنێکی زۆری گەش بە چواردەوری کۆرپەلەکەدا وەك حەوزێك دەورەی دەدات!! ئیتر لێرەدا کۆرپەلەکە پێی دەووترێت خۆهەڵواسەر یان (علقة)

چــونکە خــۆی هەڵواســیوە لــەناو منداڵدانــدا و بــەخوێن دەورە دراوە!! گەندەپێکانی کۆرپەلەکەش لەناو خوێنەکەدا خۆیان نوقم دەکەن و لێیەوە خۆراك و ئۆکسجین بۆ کۆرپەلەکە دەمژن!

لێرەدا نهێنییەکی گەورەی تر دێتە ڕێمان کە ئەوەیە: باشە بۆچی ئەم خانە نوێیە لەگەڵ ئەوەدا کە پێکهاتە بۆماوەیییەکەی جیاوازە لە پێکهاتەی دایکەکەی، و بە تەنێکی بێگانە دادەنرێت! بۆچی لە منداڵدان و لە لەشی ئافرەتەکە ناکرێتە دەرەوە و دژایەتی ناکرێت و هەوڵی لەناوبردنی نادرێت لەلایەن کۆئەندامی بەرگری لەشەوە؟ کە وەك دەزانین هەر تەنێکی بێگانە کە دەچێتە لەشەوە مەترسییەکە بۆ سەر پێکهاتە و دروست کراوەکانی ناو لەش، هەربۆیە زیرەکانە لەلایەن دەسەڵاتی باڵای لەشەوە چەند شانەیەك و کۆئەندامێك دیاری کراون وەك سوپایەکی پارێزەر کە بە بەردەوامی سەربازەکانی (خانەکانی) بۆ هەموو شوێنێکی لەش دەنێرێت بۆ بەرەنگار بوونەوە و لەناو بردنی ئەو دوژمنە دەرەکییانە!!

بەڵام بەهۆی میکانیزمێکەوە کە تا ئێستا ووردەکارییەکانی بە تەواوەتی نەزانراوە لە زوربەی حاڵەتەکانی سکپڕیدا لەشی دایکەکە ئەم کۆرپەلە بێگانەیە وەك تەنێکی دوژمن ناناسێتەوە، بەڵکو لەخۆی دەگرێت و بەخێو و گەورەشی دەکات و لە هەموو مەترسییەکیش دەیپارێزێت، کە وابزانم بەس تەنیا پەروەردگاری دانەری ئەم ووردەکارییە ئاگاداری هۆکاری ئەم نهێنییەیە!!!

هەروەها منداڵدان بەشێوەیەکی وا پتەو لەناو لەشی ئافرەتەکەدا جێگیر کراوە کە بە هیچ هۆکارێکی دەرەکی کاری تێناکرێت، و گرنگترین خاڵ کە باسی بکەین بریتییە لەوەی منداڵدان لە کاتی گەشە کردنی کۆرپەلەکە لەناو سکدا هەڵواسراوە بەهۆی بەستەرە شانەکانەوە، و بە هیچ شێوەیەك ڕاستەوخۆ بە ئێسکەوە یان بە ئۆرگانی ترەوە نەنووساوە، ئەم هەڵواسراوی

و بەرەڵڵاییی‌یەی بریتی‌یە لە گرنگترین هۆکار کە دەیپارێزێت لە کارتێکەرەکانی دەرەوە و بەرکەوتنە راستەوخۆکانی دەرەوە، هەروەها خوای گەورە کردارێك فێری کۆرپەلەکە دەکات لەگەڵ گەیشتنی بۆ ناو منداڵدان کە ئەویش بریتی‌یە لە خۆهەڵواسین و خۆچاندنە ناو دیواری منداڵدانەوە، بەم شێوەیە خۆی بە پتەوی لەناو منداڵداندا جێگیر دەکات، دیارە ئەگەر بەم پتەوی‌یە دانەمەزرایە ئەوا لەگەڵ هەر جووڵەیەکی بەهێزی دایکەکەدا (وەك ڕاکردن، یان خۆهیلاك کردن و وەستان بەپێوەی زۆر، و ئەرکە هیلاککەرە



وێنەی (٩-١٠): کۆرپەلە لە قۆناغی نوتفەدا (هەر لە پیتاندنەوە تاوەکو خۆچاندنە ناو دیواری منداڵدان).

ماسولکەیی‌یەکان، چونکە دایکی ئەمڕۆ: پزیشکە، ئەندازیارە، مافناسە، وەرزشکارە و فەرمانبەرە و ....) کۆرپەلەکە دەکەوتە خوارەوە، ئەمە بریتی‌یە لە سۆز و میهرەبانی خودایی بۆ ئەو کۆرپەلە گەشە کردووەکە.

**خۆهەڵواسەرە و پلێتی کۆرپەلەیی:**

دەبینین کە ئەم خۆهەڵواسەرە مرۆیی‌یە لە هەموو لایەکەوە بە گەندەپێی کۆریۆنی دەورەدراوە، کە لە خوێنی دایکەکەوە ئەوەی پێویست بێت بۆ دروست بوونی کۆرپەلەکە دەیمژێت لە ئاو و خوێ و ڤیتامینەکان و شەکرەمەنی‌یەکان و پرۆتینەکان و چەوری‌یەکان، ئایا لەوە سەرسوڕهێنەتر هەیە کە یەکێك لە ژوورێکدا بێت و ماددە خۆراکی‌یەکان لە میوە و سەوزە و خۆراکی بەلەزەت و چەور لە هەموو شوێنێکەوە وەك لە

سەقف و دیوارەکان و پەنجەرەکان و لە دەرگاکانەوە بۆی بباریێنرێت!! ئەمە بە تەواوی ئەوەیە کە بۆ کۆرپەلەکە دەکرێت کاتێك خۆراکی پێدەدرێت!!

ئەگەر بچینە ناو پێکهێنەرەکانی لەشی ئەم خۆهەڵواسەرەوە دەبینین کە پارچەکانی لەیەکتر جیاوازن و بەشێکی تەنکی هەیە کە لە شێوەی خەپلەیەکدایە، ئەم شوێنە دوورترین شوێنە کە بیر بۆی بچێت کۆرپەلەکەی لێوە دروست دەبێت، کەواتە دەبینین ئەو کۆمەڵە خانەیەی کۆرپەلەکەی لێوە دروست دەبێت (و لە شێوەی توویەکدایە) زۆریان جیاواز دەبن بۆ پێکهێنانی چەند پێکهاتەیەکی دەرەکی کە پێیان دەووترێت ووێڵاش و پەردەکانی دەوری کۆرپەلەکە، و تەنها بەشێکی بچووکی تایبەت دەبێت بە پێکهێنانی نەخشەی سەرەتایی دروست بوونی مرۆڤ، کە جیاواز دەبێت بۆ سێ چین خانەی سەرەکی: دەرەوە و ناوەند و ناوەوە، لەشی کۆرپەلەکە لە چەندین تۆپەڵ یان بارستە خانە پێکهاتووە کە لەمانەوە زوربەی پێکهێنەرەکان پەیدا دەبن وەك ئێسکەکان و ماسولکەکان، پاشان ئەو پرۆسە ناوازە و مەزنە دەست پێدەکات کە بریتییە لە پێکهێنانی ئەندامەکان، کە هەندێك خانە تایبەت دەبن بۆ پێکهێنانی هەستەکان، هەندێکی تر بۆ ئێسکەکان و هەندێکی تر بۆ ماسولکەکان و بەم شێوەیە.

وێنەی (٩-١١): کۆرپەلە لە قۆناغی خۆهەڵواسەرە (عەلەقە)دا.

بەم شێوەیە لە هەر سێ چینەکەوە ئەندامەکانی کۆرپەلەکە پەیدا دەبن، لە چینی ناوەوە ئەمانە پەیدا دەبێت: قوڕقوڕاگە، بۆری هەناسە و بۆریچکەکانی هەناسە، سی‌یەکان، و سورێنچك و بۆری هەرس، جگەر و پەنکریاس، لە چینی ناوەڕاستەوە: کەللەی سەر، شانەی بەستەر و ماسولکەی سەر، ماسولکەکانی لەش و پەیکەری ئێسکی، کۆئەندامی میز و زاووزێ، پەردەی داپۆشەری دڵ و سی‌یەکان و ریخۆڵەکان، هەروەها دڵ و لوولەکانی خوێن، لە چینی دەرەوەش: پێست و پێکهێنەر و هاوپێچەکانی لە رژێن و موو و نینۆك، ئەندامەکانی هەست و کۆئەندامی دەماری مرۆڤ پەیدا دەبن، باشە چۆن هەموو ئەم ئەندامانە نەخشەیان بۆ دەکێشرێت و چۆن ئەم بیناکردنە بەیەك رێڕەودا دەڕوات، بەشێوەیەك کە هەموو کۆمەڵە خانەیەك هەڵدەستن بە دروست کردنی ئەندامێك و شانەیەکی تایبەت، کە هیچیان بە تەنیا کارناکەن بەڵکو پێکەوە ئەم سیمفۆنیا هاوسەنگ و هاوئاهەنگە دەژەنن، کە سەرەنجام هەموو ئەندام و سیستمێك شوێنی ئاسایی خۆی وەردەگرێت، چونکە بچووکترین خەلەل و تێکچوون دەبێتە هۆی شێواوی‌یەکی خەتەرناك لە داهاتوودا، و ژیانی کۆرپەلەکە دەخاتە مەترسی‌یەوە.

بۆیە دەبینین بە هیچ شێوەیەك چاو لە سکدا پەیدا نابێت یان دەست لە سەرەوە دەرنایت یان گوێ لە قاچەکاندا دروست نابێت، یان کۆم لە پشتدا دروست ببێت، بە ڕاستی هاوسەنگی‌یەکی گەورەیە کە لەلایەن پەروەردگارەوە راگیراوە ﴿يَا أَيُّهَا الْإِنسَانُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ الْكَرِيمِ ، الَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّاكَ فَعَدَلَكَ ، فِي أَيِّ صُورَةٍ مَّا شَاءَ رَكَّبَكَ ، كَلَّا بَلْ تُكَذِّبُونَ بِالدِّينِ﴾، کاتێکیش کە کۆرپەلەکە گەشە دەکات (یان راستتر بڵێین کە گۆشتپارەکە گەشە دەکات) بینراوە لە هەفتەکانی یەکەمی‌دا زۆر لە گۆشتپارەی باڵندەکان و خشۆکەکان و شیردەرەکان و تەنانەت لە بەرازیش دەچێت!! بەڵام لەگەڵ تەواو بوونی مانگی دووەمدا دروستکراوێکی جیاواز گەشە دەکات و مرۆڤێکی نوێی لێوە

دروست دەبێت، پەروەردگار زۆر راستی فەرمووە: ﴿ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ﴾.

**دروست بوونی نێر و مێ:**

بینراوە کە گۆشتپارەی مرۆڤ لە رۆژی ٣٥دا درێژییەکەی ٥ میللیمەترە، پاشان بە رێژەی ١ملم لە رۆژێکدا زیاد دەکات تا کۆتایی مانگی دووەم (واتە دەبێت بە ٣٠ملم یان ٣ سانتیمەتر کاتێك تەمەنی کۆرپەلەکە ٢ مانگ دەبێت)، لە کۆتایی مانگی سێیەمیدا دروست بوونی ئەندامەکانی زاووزێی دەرەوە دەست پێدەکات، لێرەدا دەپرسین: چۆن رەگەزی کۆرپەلەکە دیاری دەکرێت؟ ئەمە دەگەرێتەوە بۆ رۆژەکانی یەکەمی تەمەنی، کە وەك باسمان کرد یەکگرتنی تۆوێك کە هەڵگری کرۆمۆسۆمی نێرینەیە (Y) لەگەڵ هێلکەدا (X) دەبێتە هۆی دروست بوونی کۆرپەلەیەکی نێرینە (XY)، هەروەها یەکگرتنی تۆوێك کە هەڵگری کرۆمۆسۆمی مێینەیە (X) لەگەڵ هێلکەدا (X) دەبێتە هۆی دروست بوونی کۆرپەلەیەکی مێینە (XX)، کەواتە سپێرمە کە نێر و مێی کۆرپەلەکە دیاری دەکات: ﴿أَيَحْسَبُ الْإِنسَانُ أَن يُتْرَكَ سُدًى، أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ يُمْنَى، ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّى، فَجَعَلَ مِنْهُ (واتە لە سپێرمەکانەوە) الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْأُنثَى﴾ ﴿وَأَنَّهُ خَلَقَ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْأُنثَى، مِن نُّطْفَةٍ إِذَا تُمْنَى﴾، کە ئەم ئایەتانە ئاماژە بە نهێنی دیاری کردنی رەگەزی کۆرپەلەکە دەدەن لەلایەن سپێرمەکانەوە کە زۆر تازە زانستی نوێ ئەم راستییەی دۆزیوەتەوە.

هەربۆیە لەژێر رۆشنایی تێگەیشتن لەم ئایەتانە ئافرەتێکی ئەدیبی عەرەب گلەیی لە مێردەکەی دەکات کە لێی توورە بووە چونکە ئەم هەر منداڵی مێینەی دەبێت، و بە سەلیقەی خۆی پێی دەڵێت کە هۆکاری رەگەزی کۆرپەلەکە پیاوەکە خۆیەتی و مناڵدانی ئافرەت وەك زەوییەکی بەپیت وایە کە چی تێدا بروێنیت هەر ئەوەت بۆ دێتە بەرهەم، ئەوەتا دەڵێت:

ما لأبي حَمزة لا يَأْتينا　　يَظَل في البَيتِ الّذي يَلينا
غَضْبانَ ألاّ نَلِدَ البَنيـنا　　تَاللهِ مـا ذلك في أيْدينـا
وَنَحْنُ كَالأَرْضِ لِزارِعينا　　نُنْبِتُ ما قَد بَذَروه فِينـا

بۆ ئەوەی کە گرنگی ئەم بابەتە و مەترسییەکەی لەسەر بوونی مرۆڤ بزانین (واتە زیاد بوون یان کەمبوونی کرۆمۆسۆمێکی جنسی)، بابڕوانینە دوو حاڵەتی پزیشکی کە پێیان دەووترێت کۆنیشانەی کلاین فیلتەر (Klinefelter's Syndrome) و هەروەها کۆنیشانەی تورنەر (Turner's Syndrome)، یەکەمیان بریتییە لە تێکچوونێك لە ژمارەی کرۆمۆسۆمە سێکسییەکاندا، بە شێوەیەك کە کرۆمۆسۆمێکی (X) لە پێکهاتەی بۆماوەیی کۆرپەلەکەدا زیاد دەبێت لەگەڵ هەمان ژمارەی کرۆمۆسۆمە لەشییەکان (واتە ٤٤)، کەواتە کۆرپەلەکە لە بری ژمارەی ئاسایی کە ٤٦ کرۆمۆسۆمە ٤٧ کرۆمۆسۆمی دەبێت (44+XXY)، لەم حاڵەتەدا تێکچوونی خەتەرناك لە لەشی کۆرپەلەکەدا روودەدات وەك: دواکەوتوویی ژیریی پێشکەوتوو (التخلف العقلي الشديد)، نەزۆکی و نەبوونی سپێرمەکان، پەیدابوونی مەمك تێیدا وەك ئافرەت (کە خۆی نێرینەیە)، و هەروەها نەخۆشی خەتەرناکی وەك: شەکرە، و هەڵاوسانی سییەکانی لەگەڵدایە، ناخۆشترین دیاردەی ئەم نەخۆشییە بریتییە لە دواکەوتووییەکی ژیریی پێشکەوتوو و زۆر کە بە تایبەت بۆ کەس و کاری زۆر ناخۆشە چونکە هیچ سوودێکی لێنابینن تەنها تێکدان و ناڕەحەت کردن نەبێت، ئەمەش هەمووی تەنها بەهۆی زیاد بوونی یەك کرۆمۆسۆم لە پێکهاتەی کرۆمۆسۆمییدا!! کە بە داڕێژەر و پێکهێنەری مرۆڤ دادەنرێت.

حاڵەتی دووەمیان (کۆنیشانەی تورنەر) بریتییە لە نوقسانی و کەمکردنی کرۆمۆسۆمێکی جنسی، کە کۆرپەلەکە یەك کرۆمۆسۆمی جنسی هەیە (لە جۆری X)، واتە کۆی گشتی ٤٥ کرۆمۆسۆمی هەیە (44+X0)، کۆرپەلەکە

**لەم حاڵەتەدا بە دڵنیایی مێینەیە و شکڵی دەرەوەشی بەم شێوەیەیە، بەڵام لە نیشانە جیاکەرەوەکانی ئەم حاڵەتە بریتی‌یە لە نەزۆکی و نەبوونی هێلکەدانەکان** ** **، خواریی و یەکپارچەیی مل، هەڵئاوسانی لیمفیی پەلەکان، شێواوی لە پەیکەری جووڵەدا، و لە هەمووشی ناخۆشتر بریتی‌یە لە دواکەوتوویی لە ژیریدا (Mental Retardation)، ئەمەش هەمووی بەهۆی نەبوونی کرۆمۆسۆمێکی جنسی‌یەوەیە.**

**ئەم دوو حاڵەتە وەك باسمان کرد هۆکارەکەی بریتی‌یە لە کەمبوونی یان زیاد بوونی کرۆمۆسۆمێکی جنسی (لە جۆرە جیاوازەکان) لە کۆرپەلەکەدا کە لە قۆناغی کەمە دابەش بوونی هێلکە و سپێرمەکەدا روودەدەن، و ئەمانە ئەو ووردەکاری‌یە گەورەیەمان بۆ روون دەکەنەوە کە لە دروست بوونی مرۆڤدایە بە شێوەیەك بچووکترین خەلەل و تێکچوون ئەو هەموو کاریگەری‌یە گەورەیەی دەبێت لە دوارۆژی کۆرپەلەکەدا.**

**لەلایەکی ترەوە ئەگەر لەسەر باس کردنی تێکچوونەکان لە ژمارەی کرۆمۆسۆمە جنسی‌یەکاندا بەردەوام بین، دەبینین زانایان چەندین حاڵەتی تریان بۆ روون کردووینەتەوە، لەوانە زیاد بوونی کرۆمۆسۆمێکی (Y) لە کۆرپەلەی نێرینەدا (واتە بەم شێوەیەی لێدێت: XYY)، بینراوە ئەم کەسانە زۆر توند و رەق و بێبەزەیی دەبن و توانایەکی لەشیی لەرادەدە بەدەر و توانای کۆنترۆڵ کردنی خەڵکی تریان دەبێت (ئەمانە پێیان دەووترێت**

---

** لە فەرموودەیەکی پیرۆزی پێغەمبەردا (ﷺ) ئاماژەیەکی ئیعجازی بۆ ئەو راستی‌یە هاتووە کە ئەو منداڵەی بە شێواوی‌یەکی بۆماوەیی زۆر لەدایك دەبێت خوای گەورە توانای وەچە خستنەوەی ناداتێ و نەزۆك دەردەچێت، ئەوەتا دەفەرموێت: ﴿إِنَّ اللهَ لَم يَمْسَخْ شَيْئاً فَيَدَعَ لَه نَسْلاً أَو عاقِبَة ......﴾ **رواه مسلم**، واتە: خوای گەورە هیچ دروستکراوێك بە شێواوی دروست ناکات کە دوایی نەوە یان وەچەی بداتێ و وەچەی نابێت، ئەم راستی‌یە وەك لە سەرەوە چەند نموونەیەکی دەبینین زانستی نوێ سەلماندوویەتی کە زوربەی ئەو منداڵانەی نەخۆشی بۆمایی خەتەرناکیان هەیە نەزۆکن.

مرۆڤی خاریق و لەرادده بەدەر)، تەنانەت بینراوە نهێنی لە پشت تاوان و بێبەزەیی هەندێك كەسدا بریتی‌یە لەم زیاد بوونە، ئەویش بە پشکنینی تاوانباران لە زیندانەکاندا دەرکەوتووە.

لەلایەکی ترەوە بینراوە زیاد بوونی کرۆمۆسۆمێکی (X) لە کۆرپەلەیەکی مێینەدا (واتە بەم شێوەیەی لێدێت: XXX) هاوشانە لەگەڵ کەمبوونەوەی توانا عەقڵی‌یەکاندا، بەشێوەیەك چواریەکی ئەم کەسانە دواکەوتوون لەبواری ژیریی‌دا؛ و هەتا ژمارەی کرۆمۆسۆمەکانی (X) زیاد بکات توانا عەقڵی‌یەکان دادەبەزێت (بینراوە کە ئەگەر دوو کرۆمۆسۆمی Xی زیادەی هەبێت (واتە: XXXX) ئەوا نیوەی ئەمانە ژیریی‌یان دواکەوتووە، هەروەها ئەگەر سێ کرۆمۆسۆمی Xی زیادەی هەبێت (واتە: XXXXX) ئەوا هەموو ئەمانە ژیریی‌یان دواکەوتووە).

بەم شێوەیە دەبینین لەگەڵ زیاد بوونی کرۆمۆسۆمی (Y)دا توانا عەقڵی‌یەکان و بەهێزی کەسێتی و توند و تیژی زیاد دەکات (بەهۆی زیاد بوونی کاریگەریی هۆرمۆنی نێرینە تێستۆستیرۆن)، هەروەها لەگەڵ زیاد بوونی کرۆمۆسۆمی مێینە (X)دا راددەی ژیری دادەبەزێت بەڵام لە هەمان کاتدا سۆز و بەزەیی و نەرم ونیانی زیاد دەکات (بەهۆی زیاد بوونی کاریگەریی هۆرمۆنەکانی مێینە).

دیارە بوونی ئەم جیاوازی‌یە لە نێوان پیاو و ئافرەتدا بە شێوەیەکی گشتی نوقسانی نی‌یە و زۆر گرنگ و سەرەکی‌یە بۆ بەردەوام بوونی ژیان، چونکە پیاو پێویستی بەو ژیری و توانایەی هەیە بۆ ئەنجامدانی کارە قورسەکانی و دابین کردنی بژێوی خێزانەکەی، لەهەمان کاتیشدا بوونی ئەو بەزەیی و سۆزە زۆرەی ئافرەتیش زۆر سەرەکی‌یە بۆ بەخێو کردن و پەروەردە کردنی منداڵەکان و راگرتنی شیرازەی خێزان، ئەمەش بەزەیی پەروەردگارە کە ئەم جیاوازی‌یەی دروست کردووە و هەموو دروستکراوێکی

وا هیدایەت داوە و ئەو توانایەی پێداوە کە بتوانێت بەهۆیەوە ئەرکەکەی لە ژیاندا بە ڕێك وپێکی جێبەجێ بکات.

**ڕێڕەوی دروست بوونی مرۆڤ:**

ئێستاش پاش تەواو بوونی دروست بوونی پێهاتەکانی مرۆڤ و کێشانی نەخشەکەی بە شێوەیەکی کۆکراوە لە دوو مانگی یەکەمدا، کۆرپەلەی مرۆڤ دەچێتە قۆناغی کۆرپەلەی تەواوەوە، کە ئەندامەکانی کامڵ و جیاواز دەبن و شێوەی کۆتایی خۆیان وەردەگرن، لێرەوە و لە مانگی سێیەمەوە دەست دەکات بە گەشە کردنێکی جیاواز، بینراوە ئەو گەندەپێیانەی کە دەوروبەری کۆرپەلەکە دەدەن لە سەرەتادا و دیواری مناڵدان دەخۆن لە یەك شوێندا نابێت (ئەو شوێنە لە داهاتوودا وویڵاشی کۆرپەلەکە دروست دەکات)، هەروەها بینراوە کە شلەی ئەمینیۆنی لەم مانگەدا دروست دەبێت و دەوروبەری کۆرپەلەکە دەدات، سوودی ئەم شلەیە ئەوەیە کە کۆرپەلەکە لەناوی‌دا مەلە دەکات و لەناوی‌دا هەڵواسراوە کە ئەمە دەیپارێزێت لە تووش بوونی زیان لە ئەنجامی پیاکێشاندا، هەروەها جووڵەی کۆرپەلەکەش ئاسان دەکات، ئەمەش گرنگە چونکە لە کاتی لەدایك بووندا کۆرپەلەکە دەبێت سەر بەرەو خوار بێت و ئەگەر بێتو شوێنی تری لەشی لە خوارەوە بێت ئەوا لەدایك بوونەکە زۆر ئاڵۆز و قورس دەبێت، و لەوانەیە ژیانی دایکەکە و کۆرپەکەی بخاتە مەترسی‌یەوە.




**وێنەی (٩-١١): کۆرپەلە لە هەفتەی چوارەمی گەشە کردنی‌دا.**

ئەوەی کە ئەم مەترسی‌یە کەم دەکاتەوە بریتی‌یە لەم شلەی ئەمینیۆنی‌یە، چونکە رێگە دەدات بە جووڵەی کۆرپەلەکە بۆ ئەوەی کە باری ئاسایی خۆی وەرگرێت پێش لەدایك بوون، هەروەها بینراوە ئەم شلەمەنی‌یە ملی مناڵدان لە کاتی لەدایك بووندا فراوان دەکات: ئەویش بەهۆی دروست کردنی گیرفانێکی ئاویی لە ناوچەی ملی منالداندا و کاتێك ئەم گیرفانە دەتەقێت رێڕەوێکی ئاویی نەرم و نیان بۆ کۆرپەلەکە دروست دەکات بۆ ئەوەی بەسەریدا بخلیسکێت، دەبێت چ نهێنی‌یەکی سەرسوڕهێنەر لەم شلەمەنی‌یەدا بێت کە لە شێوەی ئاودایە و بەم هەموو کارە هەڵدەستێت.

ئەگەر دەربارەی ووێلاش بدوێین، تۆ نازانی ئەم ووێلاشە چی‌یە؟! بریتی‌یە لەو پاڵاوگە ئەمین و خۆراك بەخشە زیرەك و بەڕێوەبەرە دانایەی کە بۆ هەموو کارێکی ژیانی کۆرپەلەکە پێویستە، چونکە ئەمە کە لە خوێنی دایکەکەوە خۆراك دەمژێت و هەرسی دەکات (بە تایبەتی پرۆتین) و دەینێرێت بۆ کۆئەندامی سووڕانی خوێنی کۆرپەلەکە، بە تایبەتی کە جگەری کۆرپەلەکە هێشتا نەکەوتۆتە کار ئەم رۆڵی جگەر دەبینێت، هەر ئەمیشە کە گازەکان و خوێکان و شیرینی‌یەکان دەنێرێت بۆ کۆرپەلەکە، و بەبێ ئەم نەیدەتوانی ساتێك بژی، کاتێکیش کە چەوری‌یە قورسەکان دێن بۆ کۆرپەلەکە ئەم بەهۆی ئەنزیمەکانی‌یەوە شی‌یان دەکاتەوە و دەینێرێت بۆ کۆرپەلەکە بۆ ئەوەی سوودی لێوەرگرێت، هەر کاتێکیش شەکرەمەنی لە پێویستی کۆرپەلەکە زیادبوون ئەم دەگۆڕێت بۆ عەمبارێکی دەستپاك و بۆ

وێنەی (٩-١٢): ئەو لوولە خوێنانەی لەناو ووێلاشدان.

كاتی پێویست بۆی هەڵدەگرێت، خانەكانی پێشەوەی ووێلاشیش چەندین هۆرمۆن دەردەدەن كە زەمانەتی بەردەوام بوونی ژیانی كۆرپەلەكە و جێگیریی و هێمنی و هاوسەنگیی لە پێكهاتەكانی لەشیدا بۆ دەكەن، كێیە كە ئەم هەموو وانانەی فێركردووە و ئەم هەموو پرۆگرامانەی بۆ داڕێژاوە؟!!

با ئێستاش بڕوانینە ئەو پارێزگاریەیە سەرسوڕهێنەرەی لەم كۆرپەلەیە كراوە كە لەناو قوولاییدا نێژراوە بە زیندوویی! لەگەڵ ئەوەدا كە پێستی سك و ماسولكەكانی و لەگەڵ ریخۆڵەكانی و هەروەها ئەستووریی دیواری منداڵدان دەیپارێزن، لەگەڵ ئەمانەشدا كۆرپەلەكە بە ٣ پەردەی ئەستوور دەورە دراوە، لێرەدا مرۆڤ سەرسوڕمان دەیگرێت كاتێك دەبینێت قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: ﴿يَخْلُقُكُمْ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ خَلْقًا مِن بَعْدِ خَلْقٍ فِي ظُلُمَاتٍ ثَلَاثٍ ...﴾، چونكە ئەگەر مەبەست پێی تاریكایی سك و تاریكایی دیواری منداڵدان و تاریكایی پەردەكانی دەوری بێت ئەوا زۆر سەرسوڕهێنەر و عەجیبە! بەڵام بابزانین كە پەردەكانی دەوری كۆرپەلەكەش هەر ٣دانەن!!

با بەردەوام بین لە بەدواداچوونی گەشەی كۆرپەلەكە و دروست بوونی لە مانگەكانی سكپڕیدا، لە مانگی سێیەمدا درێژییەكەی ٣سم دەبێت و كێشی ١١گرام دەبێت، سەری كۆرپەلەكە بە شێوەیەكی ترسناك گەورەیە و سێیەكی قەبارەی كۆرپەلەكە پێكدێنێت، ناوسكیشی هەمووی لە دەرەوەیە لەگەڵ جگەریدا و لە حاڵەتێكی (فتق)دایە و لە ناوكییەوە هاتوونەتە دەرەوە، ئەم دیمەنە نابەجۆرە چییە؟ و چ نەشتەركارێك دەتوانێت ئەم فتقەی بۆ چاك بكاتەوە؟ با پەلە نەكەین چونكە خاوەن ویستی دانا كاری خۆی دەكات لەدواییدا، هەروەها لەم كاتەدا تێبینی پەیدابوونی چەكەرەی چاوەكان و گوێكان و پەلەكان دەكرێت.

لە كۆتایی مانگی سێیەمدا درێژی كۆرپەلەكە ١٠سم و كێشەكەی ٥٥گرام دەبێت، واتە درێژییەكەی سێجارە بۆتەوە لە مانگێكدا و كێشیشی پێنج

قات زیادی کردووە، ئیتر لێرەدا وورده وورده فتقەکەی نامێنێت و ناوسکی لەگەڵ جگەری‌دا دەچنەوە ناوەوە، هەروەها شوێنی ناووك دروست دەبێت بۆ ئەوەی وەك شوێنەوارێك بێت بە درێژایی رۆژگار کە مرۆڤ یاد دەخاتەوە بەو شوێنەی کە لێوەی هاتبووە دەرەوە!!..

لە کۆتایی مانگی چوارەمدا درێژی‌یەکەی دەگاتە ٢٠سم و کێشی دەبێتە ١٧٠ گرام، کەواتە درێژی‌یەکەی لە ماوەی ٢مانگدا ٧ ئەوەندە دەبێت، و کێشەکەی ١٧بەرامبەر دەبێتەوە!! هەروەها کۆئەندامی هەرس دروست دەبێت و جگەر دەست دەکات بە کار کردن، بەڵام لەگەڵ ئەمانەدا کۆرپەلەکە رەنگی سوور و سەر کەچەڵە و روخسارێکی ناشرینی هەیە و پێستی چرچ و لۆچە! با پەلە نەکەین چونکە هەموو شتێك رێکدەبێتەوە! لە کۆتایی مانگی پێنجەمدا درێژی‌یەکەی دەبێت بە ٣٠سم و کێشی دەبێتە ٦٥٠گرام، لێرەدا قژی سەر پەیدا دەبێت و رژێنەکانی پێست دەست بە کارکردن دەکەن، کەواتە دیاردەکانی جوانی دەستیان کردووە بە پەیدا بوون، زۆر باشە بەڵام ئایا لێرەدا تەواو دەبێت؟ یان پێویستی بە شتی نوێ هەیە؟!



وێنەی (٩-١٣)

بەڵێ زۆر شتی تر پێویستیان بە کامڵ بوون هەیە: پێڵووەکان پێکەوە نووساون و داخراون، و نینۆك دەرنەکەوتووە، و رەنگی پێستیش هێشتا هەر سوورە، چرچی و لۆچی‌یەکانی پێستیش بوونیان ماوە، و گونەکان لە نێرینەدا هێشتا لە

پشتدان! بەڵام هەر کە دەگاتە مانگی هەشتەم درێژی‌یەکەی دەگاتە ٤٥سم و کێشـەکەی دەبێتـە ٢٥٠٠ گـرام، پێڵووەکـان کراونەتـەوە و چـەوری لـەژێر پێستدا کۆدەبێتـەوە و دەبێتـە هـۆی نـەمانی چرچ ولۆچی‌یەکان، هـەروەها رەنگی پێست دەبێتە سپی‌یەکی پەمەیی باوی جوان وگونەکان دێنە خوارەوە بۆ ناو توورەکەی گون.




لـە کۆتـایی مـانگی نۆیەمـدا درێژی‌یەکـەی ٥٠سـم و کێشـەکەی دەگاتـە ٣٥٠٠ گـرام، واتـە درێژی‌یەکـەی نزیکەی ١٧جار زیادی کـردووە و کێشیشـی ٣٥٠ ئەوەنـدەی یەکـەم جـاری لێهـاتووە، هـەروەها سیسـتمەکان کامڵ بوون و کۆرپەلەکە دروست بوونی تەواو و کـامڵ دەبێـت و هـیچ نوقسـانی‌یەکی نامێنێت، باشە چۆن کردارەکان ئاوا بەم رێڕەوە بە ئـەنجام گەیشتن قۆناغ بە قۆناغ، کە هیچ قۆناغێك پێش ئەوی تر یان دوای ئەوی تر ناکەوێت، و هـەموویان کۆرپەلەکە دەگەیەننـە قۆناغەکەی دوای خۆیـان بـەم سیسـتمە دارێـژراوە، ئەمـە چـۆن دروسـت کردنێـك و ووردەکاری‌یـەك و داهێنانێکە؟!! گەورەیی هەر بۆ تۆیە ئەی پەروەردگاری باڵادەست!!...

**لەدایك بوون:**

با سەرنجێکی کۆئەندامەکانی ئەم کۆرپەلەیە بدەین کاتێك وەختی هاتنە دەرەوەی دێت بۆ دونیای پڕ لە هەوڵ و هیلاکی، بارستایی دڵ ۲۰گرام دەبێت، و بارستایی سی‌یەکان ۳۰ گرامە، بارستایی گورچیلە ۱۲گرام و بارستایی مێشك ۳۵۰ گرامە، بارستایی هەریەك لە غوددەی دەرەقی و پەنکریاس ۳ گرامن، جگەریش بارستایی‌یەکەی دەگاتە ۱۲۵ گرام، بارستایی ژێرمێشکە رژێنیش کە شاژنی کوێرە رژێنەکانە تەنها نیو گرام زیاتر نابێت!! لەگەڵ ئەمانەدا بارستایی ووێڵاش ۵۰۰ گرام دەبێت چونکە لە راستی‌دا ئەم لەجیاتی هەموو ئەندامەکان و سیستمەکانی لەشێتی، هەر ئەمە کە خۆراکی دەداتێ و دەیپارێزێت و هەموو ئەوانەی کە پێویستی‌یەتی بۆ گەشە کردن و جێگیربوون و هاوسەنگ بوونی بۆی ئامادە دەکات، ببینە چەند ژیر و وورده ئەم دایکە بچکۆلەیە؟!.

لەلایەکی ترەوە بابڕوانینە ئەو پەتە (یان گوریسەی) کە کۆرپەلەکە بەهۆیەوە خۆی هەڵواسیوە لەناو مناڵدانەدا، کە بە (ناوکە پەتك) ناودەبرێت، بریتی‌یە لە جۆلانەیەکی خۆشی بەخش (درێژی ناوکەپەتك ۵۰سم دەبێت)، کە کۆرپەلەکە بەهۆیەوە یاری دەکات و دەجووڵێت بە وویستی خۆی و قاچەکانی و دەستەکانی دەکێشێت بە دیواری مناڵداندا، بۆ ئەوەی رایبگەیەنێت کە بوون و ژیانی هەیە و هەروەها خۆشحاڵی خۆی دەردەبڕێت لەم حاڵەتەی کە تێ‌دایە، هەروەها ناوکە پەتك چەندین لوولەی خوێنی تێ‌دایە کە خوێن لە ووێڵاشەوە بۆ کۆرپەلەکە سووڕ پێ‌دەدەن، دەبینین لەناو ئەم پەتەدا خوێنهێنەرێکی گەورە و دوو خوێنبەری تێ‌دایە کە بە کاری گەیاندن و گەڕاندنەوەی خوێن هەڵدەستن کە کارێکی پیرۆزە، هەربۆیە ئەم ناووکەپەتکە چەندین خاسی‌یەتی گرنگی هەیە، چونکە کورتی ئەم پەتە لەوانەیە ببێتە هۆی دروست بوونی فشار لەسەر ووێلاش و لەشوێنی خۆی

هەڵکەندنی، و دروست بوونی مەترسی لەسەر ژیانی کۆرپەلەکە بەهۆی کەم ڕۆیشتنی خوێن بۆی لە وویلاشەوە، هەروەها درێژی زۆریشی لەوانەیە ببێتە هۆی هاتنە دەرەوەی لە منالدانەوە و فشار کەوتنە سەری، یان لەوانەیە لە ملی کۆرپەلەکە بئالێت و ببێتە هۆی خنکاندنی وەك کردارێکی لەسێدارەدان؟! کە ئەگەر ئەمە رووبدات دەبێتە هۆی برینی چوونی خوێن بۆ مێشك و سەرەنجام مردنی کۆرپەلەکە و لەناوچوونی، بڕوانە ئەمە چۆن ئەندازە دانان و داهێنانێکی پڕ لە حیکمەت و نهێنی‌یە؟! و چۆن یاسایەکی وورد و هاوسەنگە لە هەموو پارچەکانی لەشی ئەم دروستکراوەدا؟! بەڵکو لە هەموو گەردوونیشدا بە هەمان شێوەیە: ﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ﴾ ، ﴿الَّذِي أَحْسَنَ كُلَّ شَيْءٍ خَلَقَهُ﴾ ، ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ﴾.

زۆر باسی ئەو گەورەیی‌یەمان کرد کە کۆرپەلەکە دەیگاتێ، کە لەلایەنی درێژی‌یەوە ١٧جار زیادی کردووە، و لە لایەنی بارستایی‌یەوە ٣٥٠ ئەوەندەی گۆشتپارەی لێهاتووە لە کۆتایی مانگی دووەمدا، با بزانین منالدان چی بەسەردێت؟ و ئایا ئەم هەر لە سەرەتاوە هەر بەو قەبارە گەورەیەیە یان ئەمیش دەکشێت؟ و کە کشا ئایا دەگاتە ئەم قەبارە هەرە گەورەیە؟

زانستی پزیشکی وەڵاممان دەداتەوە و دەڵێت: قەبارەی منالدان لە ئافرەتی شوونەکردوودا دەگاتە تەنها ٢-٣ سانتیمەتر سێجا، بەڵام لە کۆتایی سکپڕی‌دا دەگاتە نزیکەی ٥ لیتر یان ٥٠٠٠ سانتیمەتر سێجا، واتە قەبارەکەی بە بڕی ٢٥٠٠ جار زیادی کردووە و گەورە بووە؟! و بینراوە لە هەندێك حاڵەتی نەخۆشی‌دا لەوانەیە بگاتە ١٠ لیتر یان تەنانەت ١٥ لیتریش (هەروەك لە حاڵەتی زۆر کۆبوونەوەی ئاوی ئەمینیۆنی‌دا یان سکپڕی‌یەکە دووانە بێت)!! باشە چۆن ماسولکەکانی منالدان توانی‌یان ئەوەندە بکشێن و گەورە بن کە بگەنە ٢٥٠٠ ئەوەندەی قەبارەی ئاسایی خۆیان؟! کە لەدوای سکپڕیش دەگەڕێنەوە دۆخی جارانیان، ئەمە چ نهێنی‌یەکی گەورەیە کە

لەناویاندایە؟! هەروەها بارستایی‌یەکەشی ٢٠ ئەوەندەی لێدێت کە پێش سکپڕی بارستایی‌یەکەی تەنها ٥٠ گرامە و لە کاتی منالبووندا بریتی‌یە لە ١ کیلۆگرام، دەبێت ئەو ماددانە چی بن کە چوونەتە ناوی و هەڵی‌مژیون کە ئاوا بەم شێوەیە زیاد دەکات!؟

ئەمانە و چەندینی تر هێشتا زۆریان وەك نهێنی و مەتەڵ ماونەتەوە و زانستی پزیشکیش بۆ لێکدانەوەیان زۆر جار سەرسام دەبێت (کە خۆی ئەمە کاری خۆیەتی)!! هەروەها دەپرسین دەربارەی ئەم گەورەیی‌یە لە رادەبەدەرە چۆن سك دەتوانێت لەخۆی بگرێت؟! بە شێوەیەك کە بنی منالدان دەگاتە کۆتایی ئێسکەکانی بڕبڕەی پشت لە کلێنچکەدا، بەڕاستی سکپڕی و منالّ هەڵگرتن خۆی لەخۆی‌دا موعجیزەیە و لەبەر ئەوەی ئێمە رۆژانە لەبەر چاومانە و دەیبینین زۆر هەست بەم مەزنی‌یە ناکەین.

بابڕوانینە چەند ئاستێکی تر لەم گۆڕانکاری و وەرچەرخانە گەورەیەی لە لەشی ئافرەتەکەدا روودەدات، کە لە هەموو لایەکی لەشی‌دا بە روونی دەردەکەوێت، سەرەتا لەسەر ئاستی حەوز کە ئامادە دەبێت بۆ گۆشگرتنی منالّەکە و پاشان چوونە دەرەوەی بە زیندوویی، هەروەها هێلکەدانەکانیش لەغاوگیر کراون و ئیتر هیچ دەردراوێك ناڕژن، هەروەك بڵێی گوێگرێکی بێدەنگە و سەیری ئەم شانۆگەری‌یە عەجیبە دەکات کە بەخشی دروست بوونی مرۆڤ دەکات، هەروەها خوێنیش ئامادە باشی و کەوتنە خۆی راگەیاندووە بۆ ئەم مەسەلەیە، بەلاّم بابزانین چۆن دەتوانێت خزمەتی ئەم مەسەلە خەتەرناکە بکات؟! بەڵێ لێرەدا پرس و را دەگۆڕدرێتەوە لە ئاستێکی بەرزدا و سەرەنجامەکەی بەم شێوەیە دەبێت:

خوێن دەڵێت: من دەتوانم چی پێشکەش بکەم، بەرپرسەکان وەلاّمی دەدەنەوە: تۆ کارت لەسەر نی‌یە، بەلاّم کوێرە رژێنی ژێرمێشك هەڵدەستێت بە ناردنی فەرمانەکانی بۆ کوێرە رژێنی سەرگورچلە بۆ ئەوەی کە هۆرمۆنی

گلدەرەوەی ئاو و کانزاکان (کە پێی دەووترێت ئەڵدۆستیرۆن) زیاتر بڕژێت، کە ئەم هۆرمۆنە هەڵدەستێت بە زیاد کردنی بارستە و قەبارەی خوێن، ئەویش وەك ئیحتیاتێك بۆ حاڵەتە کوتوپڕەکان کە ئەگەر خوێن بەربوونێکی زۆر رووبدات ئەوا بڕی خوێن زۆرتر دەبێت، بەڵام ئایا ئەمە بەسە؟ نەخێر بەس نییە بەڵکو پەیوەندی بکەن بە جگەرەوە بۆ ئەوەی کە بڕی ماددەی فایبرینۆجین (کە ماددەیەکی مەیێنەری خوێنە) زیاتر بڕژێت، و بینێرێت بۆ خوێن بۆ ئەوەی کە زوو بمەیێت ئەگەر بێتو خوێن بەربوونێکی زۆر رووبدات، بە تایبەتی کە وویلاش لە شوێنی خۆی هەڵدەکەنرێت و چانس و مەترسی رووداني خوێن بەربوون زۆر زیاد دەکات.

لەلایەکی ترەوە بە خوێن دەووترێت کە هەستێت بە گرتنەخۆی هەموو ئەوانەی کە بۆی دەنێردرێت چونکە ئەم بە بەردەوامی دڵسۆزی خۆی دەربڕییوە بۆ مەسەلەکە، وەڵامی خوێنیش ئەوە دەبێت کە من هەمیشە خزمەتکارێکی بەئەمەك بووم بۆ ئەم مرۆڤە مەزنەی کە یارمەتی هاتنە بوونی دەدەم، ئیتر پاش ئەمە فەرمانی توند بۆ جگەر دەردەچێت بۆ بەهێزتر کردنی خوێن و پشت قایم کردنی لە ناڕەحەتییەکاندا بە دەردانی زیاتری ئاسن و هیمۆگلۆبین، بەم شێوەیە دەبینین کە هاوکاری روودەدات لەنێوان ژێرمێشکە رژێن و رژێنی سەر گورچیلە و جگەر و خوێندا، با لێرەدا شتێکی ترمان لەیاد نەچێت کە چانسی رووداني هەوکردنەکانە بەهۆی میکرۆبە هەلپەرستەکانەوە کە چاوەڕێی فورسەتێکی ئاوا دەکەن، هەربۆیە فەرمان دەردەچێت بۆ مۆخی ئێسقان کە هەستێت بە دروست کردنی ژمارەیەکی زیاتر لە سەربازە پارێزەرەکان (کە خڕۆکە سپییەکانی خوێنن)، و بیانخاتە ئامادەباشییەوە بۆ بەرەنگاربوونەوەی هەوکردن و نەخۆشی، بەم شێوەیە ژمارەی خڕۆکە سپییەکان چەند هەزارێك لە هەر میللیمەتر سێجای خوێندا زیاد دەکات، لەگەڵ ئەمانەشدا مۆخی ئێسقان ژمارەیەکی زیاتر لە

خەپلـەکانی خـوێن دەنێرێـت بـۆ ئـەوەی کـە هاوکـاری بکـەن لـە وەسـتاندنی خوێنبەربوونـــدا ئەگـــەر رووی‌دا، کەواتـــە گۆڕانکـــاری و وەرچـــەرخان و کودەتایەکی گـەورە روودەدات لـە هـەموو سیسـتمەکانی لەشـدا: دەمارەکـان و رژێنەکان و دەردراوەکان و ماسولکەکان و جومگەکان و ئێسکەکان و ...هتد، و هەموویان ئامادە دەبن بۆ ئەو ئەرکە خەتەرناکەی لە پێشەوەیە.

فەرمانە هۆرمۆنی‌یەکان دەنێردرێن بـۆ جومگـەکانی حـەوز بـە تایبـەتی بـۆ ئـەوەی کـە خاوببنـەوە و رێ‌خـۆش بکـەن، و هاتووچـۆ تەسـك و ناڕەحـەت نەکەن، ئەمیش لە رێی هۆرمـۆنی (ریلاکسین)ەوە کە بـەم کـارە هەڵدەسـتێت، ئـەی چـی دەڵێیـت دەربـارەی ئـەو هۆرمۆنـە سـیحری و ئەفسـوناوی و عەجیبانەی کە بە خەستی‌یەکی زۆر زۆر کەمەوە (کە چەند بەشێکە لە ملیۆن) هەڵدەستن بە کارکردن لەسەر چەندین ئاستی جۆراوجۆر و زۆر جوان؟!

تەنی زەرد کە بۆ ماوەی ٥ مانگ لەسەر چالاکی و کارەکەی بـەردەوام بـوو، ووێڵاش پێی دەڵێت خوا پاداشتت بداتەوە بۆ ئەو هـەموو هیلاکـی و مانـدوو بوونەی چەشتت و من پێم وایە لەمـەودوا ئیسـراحەت بکـەیت بـۆ ئـەوەی ئیتر من بەو کارەی تۆ هەڵسم!! ئیتر خانـەکانی پێشـەوەی ووێڵاش هەڵدەستن بـە کارێکی تـر (بێجگـە لـە کـارە مژەرەکـەی) ئـەویش بریتـی‌یـە لـە دەردانـی چـەند هۆرمۆنێك کـە یارمـەتی جێگیر بـوونی کۆرپەلەکـە دەدەن، ئـەم هۆرمۆنانـە لـە تێگەیشتنێکی بەردەوامـدان لەگـەڵ کوێرەرژێنی ژێرمێشـکدا و سـات لـەدوای سات هەواڵی پێ‌دەدەن دەربارەی حاڵـەتی کۆرپەلەکـە و تەندروسـتی‌یەکەی و بـەرەوپێش چـوونی گەشـە کردنـی لەسـەر ئاسـتی خانـەکان و شـانەکان و ئەندامەکانی، کاتێکیش کە سـەعاتی سفر دێـت پلانەکـە بـەو جۆرەیـە کـە ئـەم هۆرمۆنانـە بوەسـتێنرێن لـە دەردان بـە یـەکجارەکی و بـە کوتـوپڕی، کـە ئەمـە رووداوێکـی لـە ناکـاوی سـەیرە! ئـەو هۆرمۆنانـەی کـە کۆرپەلەکـەیان جـێگیر کردبوو نامێنن!!

ئەم مەسەلەیە زۆر بە ووردی و بە هاوکاری هەموو لایەك (رژێنەکان و ئەندامەکان) نەخشەی بۆ کێشراوە، بەم شێوەیە مانەوەی کۆرپەلەکە دەکەوێتە لەقی‌یەوە و منداڵبوونی بەئازار و سەخت دەست پێ‌دەکات، کە سەرەنجام دەبێتە هۆی رۆیشتنی کۆرپەلەکە بەناو ئەندامەکانی زاووزێ‌دا بۆ دەرەوە، کونی ملی مناڵدان بە تەواوەتی بە داخەرێکی ئەستوور داخراوە و لە خوارەوە ئەوپەڕی تیرەی ئێسکەکە ١٢ سم و لەمە زیاتر دەرکەی مناڵدان ناتوانێت بکشێت، ئەی چۆن کۆرپەلەکە بەناو ئەم کونەدا دەڕوات؟!

شاژنی چالاکی رژێنەکان لە بەشی پشتی‌یەوە بە شێوەیەکی رێك وپێك فەرمان دەنێرێت بەهۆی هۆرمۆنێکەوە بۆ ماسولکەکانی مناڵدان، کە ئەم هۆرمۆنە لە چەند خانەیەکی تایبەتەوە دەڕێژرێن، کە هەر لەم بەشەدا خانەی تری تێ‌دایە بۆ رژاندنی هۆرمۆنی تر وەك هۆرمۆنی دژەدەردان، باشە چی رووی دەدا ئەگەر خەلەلێکی بچووك رووی بدایە و فەرمانەکان بۆ خانەکانی دووەم بچوونایە لەجیاتی خانەکانی یەکەم، ئەوا منداڵبوون رووی نەدەدا، بەڵام ئەمە بە هیچ شێوەیەك و هیچ کاتێك رووی نەداوە لە یەك ئافرەتیشدا! کێ‌یە کەوا ئەم یاسا و هاوسەنگی‌یە ناوازەیە رادەگرێت؟!!

ئەم هۆرمۆنەی بەشی پشتەوە دەست دەکات بە رژاندن بە شێوەیەکی رێك و پێك کە دەبێتە هۆی گرژ کردنی ماسولکەکانی مناڵدان، بەم شێوەیە گرژبوونەکان بەدوای یەکدا دێن و پاڵ بە کۆرپەلەکەوە دەنێن بۆ خوارەوە، ئیتر ئازارەکانی منداڵبوون دەست پێ‌دەکەن و لەگەڵ بەردەوام بوونی ئەم کارەدا ملی مناڵدان دەکرێتەوە، کە خاسی‌یەتێکی سەرسوڕهێنەری تێ‌دایە ئەویش ئەوەیە کە بە پلەیەکی تەواو دەکرێتەوە بەشێوەیەك کە یەکسان بێت لەگەڵ تیرەی مناڵداندا، دوای ئەمە ئەو گیرفانە ئاوی‌یەی پێشتر باسمان کرد دەتەقێت و سەری مناڵەکە دەردەکەوێت، کە هەوڵ دەدات قەبارەکەی یەکسان بێت لەگەڵ کونە فراوان بووەکەی ملی مناڵدان ئەویش بە نوساندنی

چەناگەی بە ملیەوە و چوونە پێش بە بەکارهێنانی بەشی پشتەوەی کەللەی سەر و لە هەمان کاتدا ئەو ئێسکە تەختانەی کەللەی سەر بەسەر یەکدا دەخلیسکێن و بەمەش قەبارەی سەر بچووکتر دەبێتەوە.

بەم شێوەیە منالّەکە بەرەو خوارەوە دەڕوات لە کاتێکدا کە دایکەکە لەو ئازار و حالّەتە ناڕەحەتەدا دەبێت!! بەلاّم یەکسەر کە منالّەکە دێتە دەرەوە و لە تەنیشت خۆی دەیبینێت ئیتر هەموو ئەو ئازارانەی کە چەشتی لەپێناو دەست کەوتنی ئەم بەرە بەنرخ و ئازیزەدا (کە بەرهەمی خۆشەویستییە) هەمووی لەبیر دەچێتەوە، کاتێکیش کە کۆرپەلەکە دێتە ژیانەوە بابەتێکی تر روودەدات کە خۆی لەخۆیدا ئەمیش هەر موعجیزەیە، کە بریتییە لە قەبارەی گەورەی منالّدان و ئەو بۆشاییە گەورەیەی کۆرپەلەکە دوای خۆی جێی دێلّێت، ئەمە زۆر گرنگ نییە لەچاو رووداوێکی تردا کە بریتییە لە لێبوونەوە و بەربوونەوەی وویلاّش لە دیواری منالّدانەوە، و کرانەوەی ئەو گۆمە خوێنانەی کە پێشتر خۆراك بەخش بوون بۆ کۆرپەلەکە.

ئەگەر وویستی عەجیبی خودایی نەبێت کە ئەم زیندەوەرەی پاراست لە هەموو قۆناغەکانیدا ئەوا قۆناغی لەدایك بوون دەبووە مردنی راستەقینەی دایك چونکە خوێن لێوەی وەکو فوارە دەردەچوو لەو گۆمە خوێنانەی ناو منالّدانەوە، بەلاّم نەخێر چونکە هەر کاتێك وویلاّشەکە دابەزی و ناو منالّدان هیچ پاشماوەیەکی کۆرپەلەکەی تێدا نەما ئیتر دیواری ماسولکەیی منالّدان بە شێوەیەکی عەجیب و سەرسوڕهێنەر دەچێتەوەیەك و گرژ دەبێت و وەك بەرد رەق دەبێت، بەشێوەیەك هەر کەسێك دەست بخاتە سەر بەشی خوارەوەی سکی دایکەکە هەست بەو بارستە رەقە دەکات، کە ئەمە نیشانەیەکی زۆر باشە لەسەر گرژ بوونی منالّدان و پێی دەووترێت تۆپی دلّنیایی و ئەمان، بەڕاستیش وایە چونکە تۆپێکە پزیشکەکان دلّنیا دەکاتەوە کە حالّەتەکە زۆر باش و ئاساییە، و هیچ جۆرە مەترسییەك

لەسەر دایکەکە نەماوە کە کۆرپەلەکەی بووە، پاك و بێگەردی بۆ ئەو پەروەردگارەی باشترین و ووردەکارترین دروستکەرە.

خوێنەری ئازیز .....

ئەمەی پێشەوە بە کورتی گەشتی دروست بوون و لەدایك بوونی کۆرپەلەی مرۆڤ بوو بە کۆکراوەیی، کە هیوادارم بووبێتە مایەی ئاوڕدانەوەمان لەم ووردەکاری و هاوسەنگی و ناوازەیی‌یە لە دروست کردندا، بێگومان هەموو دروستکراوەکانی تری پەروەردگاریش ئەگەر وەك ئەم پرۆسەیە نەبن ئەوا هیچ لەمە کەمتر نین، و بە هەموو دروستکراوەکان شایەتی بۆ گەورەیی دەسەڵاتی بەدیهێنەرەکەیان دەکەن و داوا لە مرۆڤیش دەکەن کە ملکەچ و پابەندی فەرمانەکانی بن و شوێن بەرنامە ناوازەکەی بکەون، ئەمە ئەوەیە کە پەروەردگار دروستی کردووە، دەی خەڵکینە بڕواننە ئەوانەی خەڵکی تر دروستی دەکەن و لە لاوازی‌یان بکۆڵنەوە ﴿هَذا خَلْقُ الله فَأَرُونِي مَاذَا خَلَقَ الَّذِينَ مِنْ دُوْنِه .....﴾ صدق الله العظيم.



قورئـان و سـوننەتی پـیرۆز چـەند نـاوو(مصـطلح)ێکـی جۆراوجۆریـان بەکارهێناوە بۆ وەسف کردنی گەشەی کۆرپەلە:

قۆنـاغی یەکـەم لـە بۆچـوونی قورئـانیدا تنۆکێـك ئـاوە(نطفـة)یەکـە سەرچاوەکەی لە دایك و باووکەوەیـە، و دوای یەکگرتنیشیان هـەر لـە شـکڵی تنۆکێك ئاودا دەبێت.

پـێش یـەکگرتنیان سـپێرمی پیـاو و هێلکـەی ئـافرەت دەردەپـەڕن لـە ئەندامـەکانی زاووزێـوە، کـە ئـەم ئەندامانـە سـەرەتا لـەنێوان بڕبـڕەی پشـت و پەراسووەکاندا دروسـت دەبـن، و زۆرێـك لـەم خانانـەی زاووزێ تووشـی لـەناو چوون و وون بوون دەبن، بە شێوەیەك تەنها یـەك سـپێرمی پیـاو ڕۆدەچێت و لەگەڵ هێلکەکەدا یەکدەگرێت، ئـەم سـپێرمە پـێش پیتانـدن لـە رووپۆشـەکەی دەردەهێنرێت بەهێمنی، و خۆیشی لە شکڵی دەرەوەیدا لە ماسییەکی درێـژ دەچـێت، وەك ووتمـان تـەنها یـەك سـپێرم چانسـی ئـەوەی هەیـە کـە لەگـەڵ هێلکەکەدا یەکبگرێت و هێلکەی پیتێنراو دروست بکـات، کـە تێکەڵاوێکـە لـە خانەکانی زاووزێی دایك و باوك، ئەمە مانـای (نطفة أمشـاج) دەردەخـات کـە بە مانای تێکەڵاوێك دێت لە هەردوو ئاوی پیاو و ئافرەت و سیفاتەکانی دایك و باووك، هەروەها قورئان بۆمان باس دەکات کە ئافرەت شـوێنی چاندنمانـە، پێشتر بینیمان کە چۆن کۆرپەلـە خـۆی دەچێنێتە نـاو دیـواری منـداڵان و ئـەم ووتەیـــەمان بـــۆ ســـەلما، هـــەروەها ئـــەم منالْدانـــە خـــۆی گونجـــاوترین و دامەزراوترین شوێنە بۆ گەشەکردنی کۆرپەلەکە.

پاشان چووینە سەر باس کردنـی دوو قۆنـاغی تـری گەشـەکردنی کۆرپەلـە کە ئەوانیش قۆناغەکانی خۆهەڵواسەر (العلقة)، و گۆشتپارە (المضغة) بوون، لە چەندین رووی جیاوازەوە ئـەوەمان بـە شـێوەیەك سـەلماند کـە بـواری هـیچ جـۆرە گومـانێکی تێـدا نـەما کـە وەسـف کردنـی قورئـان بـۆ ئـەم دوو قۆنـاغـە هەمەلایـــەنترین وەســـفە، و بـــەکارهێنانی ئـــەم دوو زاراوەیـــە تـــەواوترین و

گونجاوترین زاراوەن کە هەردوو لایەنی شکڵی دەرەوە و کردارەکانی ناو لەشی کۆرپەلە دەگرنەخۆ.

پاشان بەکارهێنانی هەردوو زاراوەی ئێسك (العظام) وگۆشت (العضلات) زۆر بەئاشکرا سیمای سەرەکی کۆرپەلە دەردەخات لە هەردوو هەفتەی حەوتەم وهەشتەم بەدوای یەکدا، ئەم دوو هەفتەیە بەوە جیادەکرێنەوە کە ئێسك وماسولکەکانی تێدا دروست دەبن، و ناولێنانی ئەم دوو هەفتەیە بەم دووناوە زۆر گونجاوە و وەسفی کۆرپەلەی پێدەکرێت بەشێوەیەکی زۆر سادە وئاشکرا و زانستییانە.

لە کۆتاییدا هاتینە سەر باس کردنی دواین قۆناغی گەشەکردنی کۆرپەلە کە ئەویش قۆناغی گەشە کردن (النشأة)یە، ووشەی (أَنشَأْنَاهُ) بەو شێوەیەی کە لە قورئاندا بەکار هاتووە باشترین و جوانترین روون کردنەوەی تێدایە بۆ باس کردنی گەشەکردن و گۆڕانکارییەکانی ناو لەش و دەرەوەش کە لە شێوەی کۆرپەلەکەدا روودەدات لە کاتی ئەم قۆناغەی دروست بوونی کۆرپەلەکە لەسکی دایکیدا.

لە بەشەکانی پێشترەوە بۆمان دەرکەوت کە هەر سێ مانای ووشەی (نشأة) بە تەواوەتی و ئاشکرا لەم قۆناغەی گەشە کردنی کۆرپەلەدا دێنەدی:

–ئەوەی کە بە مانای (بدأ) یان دەست پێکردن هاتبوو، وەسفی سەرەتای دەست پێکردنی کاری ئەندامە جیاوازەکانی کۆرپەلە دەکات، دەبینین لێرەدا گورچیلەکان دەستیان کردووە بە ئیش و دروست کردنی میز، مۆخی ئێسقان دەستی کردووە بە دروست کردنی خڕۆکەکانی خوێن، هەروەها مووەکان دەست دەکەن بە سەردەرهێنان لە هەفتەی دەیەمەوە و ... هتد.

–بە مانای (نما) یان گەشەی کرد، ئەم مانایە گەشەی خێرا و گەشەی تەواو و گشتگیرمان بۆ باس دەکات کە روودەدات لە هەموو ئەندامەکانی لەشی کۆرپەلەکە لەم قۆناغەدا.

-مانای (إرتفع و ربا) وەسفی ئەو زیاد بوونە ئاشكرا و خێرایە دەكات كە لـە كـێش و درێـژی كۆرپەلەكـەدا روودەدات و لـە هەفتــەی دوانزەیەمــەوە دەردەكەوێت.

كەواتە بۆمـان دەردەكـەوت كـە زاراوەی (نشأة) بـە شـێوەیەكی زۆر وورد و گونجاو دەتوانین بەكاری بهێنین بۆ وەسف كردنی ئـەم قۆناغـەی گەشـەكردنی كۆرپەلە (Fetal Period).

لەگـەڵ ئەوەشـدا كـە (أرسـطو) و هەنـدێك لـە پێشـینان باسـی بۆچـوونی زنجیرەیی‌یان كردووە لە دروسـت بـوونی كۆرپەلـەدا بـەڵام ئـەو تێبینـی‌یانـەیان پشـتی بەسـتبوو بەوەسـف كردنـی كۆرپەلـەی باڵنـدەكان كـە یـەك ناگرێتـەوە لەگـەڵ قۆناغـە سـەرەتایی‌یەكانی دروسـت بـوونی كۆرپەلـەی مرۆڤـدا، تـەنیا لەكۆتایی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتاكانی سەدەی بیستەمدا مرۆڤایەتی ئـەو راستـی‌یەی بۆ ئاشـكرا بـوو كـە دروسـت بـوونی منـداڵ لـە سـكی دایكـی‌دا بـە چـەندین قۆنـاغی جیـاوازدا دەڕوات، لێـرەوە مـرۆڤ گـەورەیی ومـوعجیزەی قورئانی پیرۆزی بۆ دەردەكەوێت كە دەبینێت یەكەم وەسفێكی تێـر وتـەواوی كۆرپەلــەی تێدایــە بــەپێی قۆناغــەكانی دروســت بــوون و زنجیرەكــانی گەشـەكردنی، وچـەندین سـەدە پـێش ئـەو زانیاری‌یانـە كـەوتووە كـە زانسـتی نـوێ لـەڕێی زۆرێـك لـە زانایـان ولێكۆڵەرەوانـەوە و بـەهۆی بـەكارهێنانی پێشـكەوتووترین و ووردتـرین ئـامێری زانسـتی‌یەوە دەسـتی كـەوتووە لـە رۆژگاری ئەمڕۆماندا.

ئەوەی كە زیاتر پلـەی ئـەم موعجیزەیە بـەرز دەكاتـەوە حاڵـەتی زانیـاری و خوێندەواری نەتەوەكەی پێغەمبەر (ﷺ) بوو كە زوربەی زۆریان نەخوێندەوار بـوون و هـیچ جـۆرە بیركردنەوەیـەكی زانستی‌یانەشـیان نـەبوو، ئـەوەی ئـەم راستـی‌یە دەسەلمێنێت بریتـی‌یـە لـە ئایـەتی: ﴿هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الْأُمِّيِّينَ رَسُـولًا

مِّنْهُمْ ...﴾ (الجمعة:٢)، واتە: هەر پەروەردگارە کە لەناو نەخوێندەوار و نەزانەکاندا پێغەمبەرێکی نارد کە وەك خۆیانە (واتە ئەویش نەخوێندەوارە)، لەگەڵ ئەمەشدا زانیاری‌یەکی کەمیان هەبوو بە تایبەتی دەربارەی ئەو شتانەی کە لە ژیانی رۆژانەیاندا پێویستی‌یان پێ‌ی هەبوو، بەڵام زوربەی ئەو زانیاری‌یە کەمانەش پێکهاتبوو لە شتی خورافیات و نازانستی‌یانە، لێرەوە تێدەگەین کە تاریکایی زانستی هەموو نیوە دورگەی عەرەبی داگیر کردبوو پێش ئیسلام.

لەلایەکی ترەوە پێغەمبەر (ﷺ) خۆی نەخوێندەوار بووە و نووسین و خوێندنەوەی نەزانیوە ﴿وَمَا كُنتَ تَتْلُو مِن قَبْلِهِ مِن كِتَابٍ وَلَا تَخُطُّهُ بِيَمِينِكَ إِذًا لَّارْتَابَ الْمُبْطِلُونَ﴾ (العنکبوت:٤٨)، واتە: تۆ ئەی پێغەمبەر (ﷺ) پێش ناردنی ئەم قورئانە هیچ کتێبێکت نەدەخوێندەوە، و بەدەستی خۆشت هیچ شتێکت نەنووسیوە (چونکە نەخوێندەوار بوویت)، خۆ ئەگەر شتێکی وات ئەنجام بدایە لەو کاتەدا نەفام و دەم بەتاڵەکان دونیایان پڕدەکرد لە شك و گومان (کە گوایە قورئان لە دانان و داڕشتنی تۆیە).

هەروەها لە رووداوی دابەزینی وەحی‌دا هاتووە: کاتێك جوبرائیلی فریشتە هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و توند گوشی بەخۆیەوە و پێ‌ی ووت (إِقْرَأ) واتە: بخوێنە، سێ جار ئەمەی لێ‌دووبارە کردەوە و پێغەمبەر (ﷺ) هەر دەیفەرموو: (مَا أَنَا بِقَارِيْءْ) واتە: من خوێندەوار نیم، هەتا جاری سێ‌یەم ئەم ئایەتانەی پێ راگەیاند: ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ {١} خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ {٢} اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ {٣} الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ {٤} عَلَّمَ الْإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ {٥}﴾ (العلق)، واتە: بخوێنە ئەی محمد (ﷺ) بە ناوی ئەو خودایەی کە دروست کەرە، مرۆڤی دروست کردووە لە (علق)..... دوو شتی گرنگ لەم ئایەتانەوە تێ‌دەگەین: ١- پێغەمبەر (ﷺ) نەك تەنها فێری خوێندەواری نەکراوە بەڵکو

تەواو نەخوێندەوار بووە و نووسین و خوێندنەوەی نەزانیوە. ٢- خوای گەورە لە دووەم ئایەتی قورئاندا کە دابەزی‌یە سەر زەوی (واتە لە سەرەتای وەحی‌دا) ئاماژەی بە دروست بوونی مرۆڤ داوە لە خۆهەڵواسەرە (عَلَــقْ)، ئەمەش بۆ دەبڕینی گەورەیی ئەم بابەتە و دەرخستنی موعجیزەی دروست بوونی مرۆڤە، پاشان خوای گەورەش داوای لە پێغەمبەر کرد کە هەموو مرۆڤەکان فێری ئەم بابەتە بکات.

لێرەوە بۆمان ئاشکرابوو کە گەلی عەرەب لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) هەموو نەخێندەوار و نەزان بوون، گەلانی تریش لەو سەردەمەدا لەگەڵ ئەوەشدا زانیاری‌یان باشتر بوو و توانیان زانست ببەستنەوە بە مەنتیقەوە بەڵام ئەمەش سوودی نەبوو بۆیان چونکە چووبوون بە هەڵەدا لەو بیردۆزانەی کە دایان نابوو، و نەبوونی هۆکارە تەکنەلۆجی‌یەکان ڕێگربوو لەبەردەمیان بۆ لێکۆڵینەوەی کۆرپەلە لە منداڵداندا، کەواتە مێژوو شایەتە بۆ ئەوەی کە هیچ جۆرە تۆمارکردنێکی هەمەلایەنە و زانستی‌یان و ڕێکخستن و زاراوە دانان نەبووە بۆ کۆرپەلەزانی لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ)، هەروەها شایەتیشە بۆ ئەوەی کە هیچ جۆرە هۆکارێك نەبووە بۆ لێکۆڵینەوەی گەشە کردنی کۆرپەلە لە سکی دایکی‌دا لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ).

کەواتە دەچێت بە عەقڵدا و ژیریی ئەوە قبوڵ دەکات کە پێغەمبەر (ﷺ) لەو کاتەدا نهێنی‌یەکانی کۆرپەلەزانی دەربخات و ئاشکرا بکات بەبێ پشتگیری وەحی و نیگای خودایی؟!

بینیمان کە چۆن نەخوێندەواریی و نەزانیی تەنها چەند خەیاڵاتێکی بێ‌بنەما نەبێت هیچی تریان لێ‌ناکەوێتەوە، وەك حاڵی یۆنانی‌یەکان (کە لە چاو عەرەبەکاندا پێشکەوتووتر بوون لە بواری زانستی‌دا)، ئەی باشە چۆن پێغەمبەر (ﷺ) توانای هەبوو چەند ڕاستی‌یەکی زانستی ئاشکرا بکات کە لە

بەرزترین پلەی ووردەکاریدایە بە شێوازێکی ئیعجازیی سەرسوڕهێنەر، ئەگەر ئەمە وەحی و نیگای پەروەردگاری بە دەسەڵات نەبێت؟! تەنانەت زۆرێك لە زانایان دوای دۆزینەوەی مایکرۆسکۆبیش نەیانتوانی کە کەمێکی لێئاشکرا بکەن!.

لەگەڵ ئەمانەشدا پێشکەشکردنی وەسفێکی زانستییانە بۆ قۆناغەکانی دروست بوونی مرۆڤ پێویستی بە دەستکەوتنی ژمارەیەکی زۆر لە کۆرپەلەی مرۆڤ هەیە لە چەند تەمەنێکی دیاری کراودا بۆ لێکۆڵینەوەیان، کە تەنانەت لە رۆژگاری ئەمڕۆشماندا زۆر گرانە ئەم زنجیرەیە کۆبکرێتەوە؟! هەروەها پێویستی بە چەندین ئامێری زانستی زۆر پێشکەوتوو هەیە کە لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) لە هیچ شوێنێکی دونیادا دەست نەدەکەوت (وەك: ووردبینی ئەلیکترۆنی، و ئامێرەکانی وێنەگرتنی پێشکەوتوو، و ئامێری پێوانی هێزی رێژەیی شەپۆلەکانی رووناکی، و کۆمپیوتەر، و ئامێرەکانی دۆزینەوەی پرۆتینەکان و ترشە ناووکییەکان و کاربۆهیدراتە ئاڵۆزەکان و ... هتد)، کە ئەگەر ئەم توێژینەوانە نەبووایە کۆرپەلەزانی نەدەگەیشتە ئاستە پێشکەوتووەکەی ئەمڕۆ.

ئەوەی کە بابەتەکە ئاڵۆزتر دەکات ئەوەیە ئەو کۆرپەلانەی کە دەکەونە خوارەوە لە حاڵەتی لەبارچوون لە قۆناغە سەرەتاییەکانی کۆرپەلەدا بە شێوەی لەبارچوونی زوو، ئەمانە لەگەڵ رێژەیەکی زۆر لە خوێن دێنە دەرەوە و پارچە پارچە دەبن بۆ بەشی وورد وورد و شێوەیەك نادەن بە دەستەوە کە بتوانرێت توێژینەوەی لەسەر بکرێت، لەسەروو هەموویشییەوە ئەو نەوەیەی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) بە هیچ شێوەیەك نەیاندەزانی کە ئەم خوێنە کۆرپەلەی لەبارچووی لەگەڵدایە، چونکە زانینی سکپڕی لە هەفتە سەرەتاکانیدا تا سەردەمێکی زۆر نزیك نەدەزانرا.

ئەگەر وای دابنێین کە پێغەمبەر (ﷺ) هەموو ئەمانەی لەبەردەستدا بووە، بەڵام کۆرپەلە لە سەرەتای دروست بوونیدا (بە تایبەتی لە کاتی دروست بوونی شریتی سەرەتاییدا) قەبارەکەی لە ٠,٠٥ میللیمەتر تێناپەڕێت، و کۆرپەلە نەك تەنها لەناو تاریکایی ناوسکدایە بەڵکو لەناو تاریکایی دیواری مناڵدانیشدایە، کە گەیشتن بەو شوێنە زۆر زەحمەتە چونکە ملی منداڵدان لە حاڵەتی ئاساییدا تەنها رێ بە پەنجەی بچکۆلە دەدات کە پێیدا بڕوات و لە ناوەوەش بە توێیەڵێك ماددەی لینج گیراوە، و کۆرپەلەکەش کە دەچێتە ناو دیواری منالدانەوە دوای خۆی شوێنی چوونە ناوەوەکە دادەخرێت!.

کەواتە نەك تەنها سەرسوڕهێنەرە بەڵکو مەحاڵە کە پێغەمبەر (ﷺ) وەسفی شێوە و باری کۆرپەلە بکات لە منالداندا بە تایبەتی لە هەفتەکانی یەکەمیدا، کە بە بەردەوامیش لە گۆڕاندایە لە ماوەی زۆر کورتدا، هەروەها زۆر سەرسوڕهێنەرە کە بەرنامەیەکی زەمەنی وورد دابنێت بۆ گەشە کردنی، کە هیچ عەقڵێکی دروست ئەمە قبوڵ ناکات چونکە زۆر لە ئاسایی بەدەرە، ئەی باشە ئەمانە هەمووی بەڵگەنین لەسەر ئەوەی کە محمد (ﷺ) پێغەمبەرێك و نێردراوێکی خودایە و لە لایەن ئەوەوە نیگای بۆدێت!! کێ بە خەیاڵیدا دێت کە لە ٤٠ رۆژی یەکەمیدا سەرەتای هەموو ئەندامەکانی کۆرپەلە دروست دەبێت (کە ٩ مانگ لە سکی دایکدا دەمێنێتەوە!)؟! و کێ بە خەیاڵیدا دێت کە کۆرپەلە لە ماددەیەکی جووراو و پارووی‌ەك دەچێت؟!

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) هەندێك بنەمای بۆماوەزانی (بە وویستی پەروەردگار) پێ راگەیاندووین پێش ١٤٠٠ ساڵ لە دۆزینەوەی لەلایەن زانایانی ئەمڕۆوە، کە بۆی روون کردووینەتەوە پێکهاتەی مرۆڤ کاتێك دیاری دەکرێت کە سپێرم هێلکۆکەکە دەپیتێنێت، و کرداری ئەندازە بۆدانان پێویست بە توانەوەی ناووکی هەردووکیان دەکات، و گەشە کردنی کۆرپەلەکەش پێویستی بەو شیفرە بۆماوەییە هەیە کە لە هێلکەی

پێتێنراودا دروست دەبێت، باس کردنی ئەم کردارە غەیبی و نادیارانە زۆر بەهێزترە لە باس کردنی ئەو گۆڕانکاری‌یانەی کە بەسەر کۆرپەلەکەدا دێت، چونکە بابەتەکە زۆر ووردترە و بریتی‌یە لەو بنەمایەی کە کۆنترۆڵی داهاتوو و سەرەنجامی نادیاری کۆرپەلەکە دەکات.

بەڕاستی دەرخستنێکی زۆر سەرسوڕهێنەرە، کە ئەگەر لەلایەن خوداوە نەبووایە ئەوا پێویستی دەبوو بە کاتێکی زۆر و چەندین پسپۆڕی شارەزا بۆ ئەوەی لەو رووداوانە تێبگەن، و هەروەها پێویستی بە تەکنەلۆجیایەکی زۆر پێشکەوتووش دەبوو، کە ئەم کاتە و ئەو تەکنەلۆجیایە لەبەر دەستی پێغەمبەردا (ﷺ) نەبووە، چونکە ئەم سەرگەرمی بانگەواز و رێکخستنی کاروباری ئوممەتی ئیسلامی بووە، لەگەڵ ئەمەشدا لە هەموو ژیانیدا چالاکی‌یەکی زانستی تاقیکاریی ئەنجام نەداوە لەم بوارەدا (وەك مێژوو بۆی تۆمار کردووین) و لەسەرروو هەموویشی‌یەوە نەخوێندەوار بووە، کە هەموو ئەمانە ئاستی ئیعجازە خودایی‌یەکە بەرزتر دەکەنەوە، و دڵنیا دەبین کە قورئانی پیرۆز وەحی و نیگای خودایی‌یە.

هەرکەسێك کە مێژووی بانگەوازی پێغەمبەرانی خوێندبێتەوە و لێی ڕاما بێت، دەبینێت کە بانگەوازەکەیان پڕبووە لە تەحەددا و بەربەرەکانی کردن، چونکە زوربەی خەڵکی باوەڕناهێنن بە پێغەمبەران تاوەکو بەڵگە و نیشانە و موعجیزاتێك نەبینن کە راستی بانگەوازەکەیان بسەلمێنێت، بۆ نموونە: جادووگەرەکان باوەڕیان نەهێنا بە پەیامەکەی (موسی) پێغەمبەر (علیه السلام) تاوەکو دارەکەیان نەبینی کە بووە مارێکی راستەقینە و دەستیان نەبینی کە بە رووناکی وەك مانگ دەدرەوشایەوە؟! هەروەها گەلی (صالح) پێغەمبەر (علیه السلام) باوەڕیان نەهێنا تاوەکو ووشترە زەبەلاحەکەیان نەبینی کە لە بەردەکەوە هاتە دەرەوە، هەروەها گەلی (عیسی) پێغەمبەر (علیه السلام) کاتێك کە بینی‌یان مردوو زیندوو دەکاتەوە (بە فەرمانی خودا) و

نەخۆشی گول و کوێر چاکدەکاتەوە، و زۆرێکی تر لەو چیرۆکانەی کە لە قورئانی پیرۆز و کتێبە مێژوویی‌یەکاندا باسی هاتووە.

کاتێکیش محمد (ﷺ) نێردرا نەتەوەکەی (وەك عادەت وایە) بەربەرەکانی‌یان لەگەڵ کرد و داوایان لێکرد کە نیشانە و بەڵگە بهێنێت لەسەر ئەوەی کە لەلایەن خوداوە هەڵبژێردراوە، و ئەوەبوو پێغەمبەر (ﷺ) (بە ویستی پەروەردگار) ئەم تەحەددایەی قبوڵ کرد، ئیتر چەندین موعجیزەی پرشنگدار لەسەر دەستی هاتنەدی، لەوانە: موعجیزەی هەواڵدان کە وەسفی (بیت المقدس)ی کرد بۆ بێباوەڕان لە مەککە لە موعجیزەی (ئیسرا و میعراج)دا، هەروەها موعجیزە هەست پێکراوەکانی وەك: هەڵقوڵینی ئاو لە نێوان پەنجەکانی‌یەوە، و گێڕاندنەوەی چاوێکی دەرهاتووی هاوەڵێك لە جەنگدا بۆ شوێنی خۆی و چاکبوونەوەی، و بەرەکەت کەوتنە ناو خۆراکەوە (وەك ئەو خواردنەی کە (جابر)ی هاوەڵ هێنای و بەشی ٢ کەسی دەکرد بە فەرمانی خودا و بە بەرەکەتی پێغەمبەر (ﷺ) زیاتر لە ١٠٠٠ هاوەڵ تێریان لێخوارد).

لەبەر ئەوەش کە پێغەمبەرانی پێشوو تەنیا بۆ کەسانی سەردەمی خۆیان دەنێردران و پێغەمبەرمان (ﷺ) بۆ هەموو مرۆڤایەتی نێردراوە لە سەردەمەکانی داهاتووشدا تا ڕۆژی دوایی، هەربۆیە جۆرە موعجیزەیەکی هەرە گەورەی پێدراوە (کە قورئانی پیرۆزە) کە بە تێپەڕ بوونی ڕۆژگار بەڵگەی تازەی لێدەدۆزرێتەوە، بۆ ئەوەی کە نەتەوە دواکەوتووەکان لە ڕۆژگاردا باوەڕی پێبهێنن، و بەم شێوەیە بەڵگە گەورەکە بە زیندوویی دەمێنێتەوە تا بەرپابوونی ڕۆژی دوایی.

دەرخستنی هەندێك زانیاری لەلایەن پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە لە ڕۆژگاری هاتنە خوارەوەی قورئاندا نەزانرابوو و تەنها لە زانیاری خوادایە، ئەو ووتەیە دەمکوت دەکات کە سوودی لە گەلانی سەردەمی خۆی وەرگرتبێت ، و هیچ

کەسێك ناتوانێت نوکوڵی لەو راستی‌یە بکات کە زانیاری‌یەکانی لەلایەن دروستکەری مرۆڤەوە وەرگرتووە.

لە زۆر شوێنی قورئاندا چەندین ئایەت هاتووە کە ئەوە دووپات دەکەنەوە کە خودا دەزانێت و ئاگادارە بەوەی لەناو منالدانەکاندایە و ئەوەی تێ‌ی‌دا روودەدات، وەك:

- ﴿وَمَا تَحْمِلُ مِنْ أُنثَى وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلْمِهِ ...﴾ (فاطر:١١)، واتە: هیچ مێینەیەك نازێت و سکپڕنابێت و سکەکەی دانانێت تەنها بە ئاگاداری ئەو زاتە نەبێت.

- ﴿وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ ...﴾ (لقمان:٣٤)، واتە: تەنها خودا دەزانێت کە چی لە منالدانەکان و سکی دایکاندایە.

- ﴿هُوَ الَّذِي يُصَوِّرُكُمْ فِي الأَرْحَامِ كَيْفَ يَشَاء ...﴾ (آل عمران:٦)، واتە: ئەو خودایە زاتێکە کە نەخشەی روخسارتان لە منالدانەکاندا دەکێشێت چۆنی بیەوێت.

- ﴿اللّهُ يَعْلَمُ مَا تَحْمِلُ كُلُّ أُنثَى ...﴾ (الرعد:٨)، واتە: خوا چاك دەزانێت بەوەی هەموو مێینەیەك چی لە سکی‌دا هەڵگرتووە.

- ﴿هُوَ أَعْلَمُ بِكُمْ إِذْ أَنشَأَكُم مِّنَ الْأَرْضِ وَإِذْ أَنتُمْ أَجِنَّةٌ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ ...﴾ (النجم:٣٢)، واتە: بە ڕاستی پەروەردگار چاك دەتانناسێت، لە کاتێکدا ئێوەی لە زەوی‌دا بەرپاکردووە، لەو کاتەشدا کە ئێوە کۆرپەلەی بچووك بوون لە سك و منالدانەکانی دایکانتاندا.

دووبارە بوونەوەی ئەم ئایەت و مانایانە بەڵگەیە لەسەر گرانی دۆزینەوەی ئەو رووداوانەی پەیوەستن بە دروست بوونی مرۆڤەوە لە سکی دایکی‌دا، و بەڵگەیە لەسەر گەورەیی ئیعجازەکەی، ئایەتەکان بەوەوە نەوەستاون کە تەشدید بخەنە سەر ئەم بابەتە بەڵکو لەوەش تێپەڕیون بۆ ئەوەی ئەوە ئاشکرا بکەن کە پەروەردگار زیاتر لە خەڵکی خۆیان شارەزاتر و ئاگادارترە بە دروست بوونیان، باشە بۆ ئەمە دووپات کراوەتەوە؟

تەنها زانایانی کۆرپەلەزانی دەتوانن وەڵامی ئەم بابەتە بدەنەوە، ئەویش لەبەر ئەوەی کە منداڵدان ئاشکرا و دیار نی‌یە، بەڵکو لە ناوەڕاستی لەشی ئافرەتدایە، و زۆر گرانە ئەوەی تێ‌یدا ڕوودەدات لە قۆناغە سەرەتایی‌یەکانی دروست بوونی کۆرپەلەدا بزانرێت تەنها بەهۆی میکرۆسکۆبی ئەلیکترۆنی‌یەوە نەبێت، کە لە سەردەمی پێغەمبەردا بوونیان نەبووە.

ئەو کۆرپەلەیەی کە جێ‌ی باسکردنمانە درێژی‌یەکەی لە (١ ملم) تێناپەڕێت لە قۆناغە سەرەتایی‌یەکانی‌دا، و تەنها (١٣ ملم) دەبێت پاش دروست بوونی ئەندامەکانی، و هیچ بوارێك نی‌یە بۆ بینینی وردەکاری‌یەکانی لەناو منداڵداندا تەنها بەهۆی وردبینە ئەلیکترۆنی‌یەکانەوە نەبێت.

لێرەدا ئەو ڕاستی‌یەمان بۆ دەچەسپێت کە موعجیزەکانی هەواڵدان (وەك باس کردنی دروست بوونی کۆرپەلە کە لە قورئاندا هاتووە) زۆر بەهێزترن لە موعجیزە هەست پێ‌کراوەکان بۆ سەردەمی ئێمە، ئەویش لەبەر ئەوەیە مرۆڤ کۆنترۆڵی نی‌یە بەسەر شتە نەبینراوەکاندا و بواریشی نی‌یە بۆ لێکۆڵینەوەیان، هەربۆیە پێویستە لەسەر ئادەمیزاد کە باوەڕیان پێ‌بهێنێت ئەگەر بێتو پێ‌ی ڕابگەیەنرێت و بۆی ڕوون بکرێتەوە.

ئەو ئایەتە پیرۆزانەی کە ئاماژەی گەردوونی‌یان تێ‌دایە بە گشتی و ئەو ئایەتە پیرۆزانەی باسی کۆرپەلەزانی دەکەن بە تایبەتی بوونەتە مایەی سەرسوڕمانی زۆرێك لە زانایان و پسپۆڕانی سەردەم و وای لێ‌کردوون کە باوەڕی تەواو بهێنن بەوەی کە قورئان لەلایەن پەروەردگارەوە نێردراوە، یەکێك لەو زانایانەی پێشتریش باسمان کرد پرۆفیسۆری کۆرپەلەزانی (کیث مور Keith Moore)ە کە مامۆستای زانستی کۆرپەلەزانی‌یە لەزانکۆکانی ئەمریکا وکەنەدا وخاوەنی بەناوبانگترین کتێبی کۆرپەلەزانی‌یە لە جیهاندا، کاتێك ئەم ئایەتانەی کۆرپەلەزانی بیست لە زانایەکی موسوڵمان،

بەپرسیارەوە ووتی: پێغەمبەری ئێوە مرۆڤێکی سادە ونەخوێندەوار بووە، لە سەدەی حەوتەمی زایینیدا ژیاوە و مردووە، واتە لە کاتێکدا کە زانستی کۆرپەلەزانی هیچ بنەمایەك و تەنانەت ناویشی نەبووە، هەروەها هیچ جۆرە ووردبین (مایکرۆسکۆب)ێك نەبووە لەو کاتەدا، تەنانەت زانستی رووناکیزانی (علم البصريات) هێشتا نەدۆزرابووەوە، باشە دەبێت محمد لە کوێوە ئەم زانیارییە سەرسوڕهێنەرانە فێربووبێت؟ دەبێت لە کوێوە یەکگرتنی تۆ و هێلکەی بینیبێت؟ و بە چ هۆکارێك قۆناغەکانی گەشەکردنی کۆرپەلەی لەیەك جیاکردبێتەوە؟

یەکێك لەزانا موسوڵمانە تێگەیشتووەکان (کە پرۆفیسۆر عبدالمجيد زيندانی بوو) وەڵامی ئەم پرسیارەی پرۆفیسۆر (مور)ی دایەوە بە پرسیارێکی تر کە لێی پرسی: باشە بەڕای تۆ کێ مرۆڤی دروست کردووە؟

+ پرۆفسیۆر (مور) وەڵامی دایەوە: بێگومان خودایە ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّـهُ﴾ (الزمر:٣٨)، پاشان زانای موسوڵمان وەڵامی دایەوە: باشە ئەو خودایەی مرۆڤی دروست کردووە و ڕێك وپێکی کردووە هەر ئەو شارەزا نییە بە نهێنییەکانی ئەم دروست کردنە؟! و هەر ئەویش نییە کە ئەم نهێنییانەی باس کردووە لە کتێبەکەیدا کە قورئانە، پرۆفیسۆر (مور)یش بەشێوەیەك کە ڕاستی لە ووتەکانیدا دیاربوو وەڵامی دایەوە: بەڵێ، پاشان ووتی: سوێندبێ بەخودا هیچ گومانێکم نییە کە ئەم ووتانە و ئەم زانیارییانە لەلایەن خوداوە هاتووە، هەروەها هیچ گومانێکم نییە کە (محمد)یش نێردراو و پێغەمبەری خودایە، لە ڕاستیدا ئەمە سەلمێنەری ئەو فەرموودەیەی خودایە:﴿ وَيَرَى الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ الَّذِي أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ الْحَقَّ وَيَهْدِي إِلَى صِرَاطِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ﴾، زۆر ڕاستە کە پێشینان ووتوویانە (الحَقُّ مَا شَهِدَت بِه العُلَمَاءُ) واتە: ڕاستی ئەوەیە کە زانایان شایەتی بۆ دەدەن.

قورئان و سوننەتی پیرۆز پێش ١٤٠٠ساڵ لەمەوبەر بەشێوەیەك باس و وەسفی قۆناغەکانی کۆرپەلەیان کردووە و چەند ناو و(مصطلح)ێکیان بەکارهێناوە کە زۆر گونجاو و لەبارە، و بە تەواوەتی وەسفی شکڵی دەرەوە و کردارەکانی ناوەوەی کۆرپەلەش دەکات، و هەموو مەرجێکی ناولێنانی زانستی تێدایە، و دووبارە دەمەوێت ئەوە بڵێم لەگەڵ بەرەوپێش چوونی لێکۆڵینەوەکان لەم بوارەدا و ئاشنابوونی زانایان بە قورئان و سوننەت دەگونجێ ئەم زانایانە هەستن بە بەکارهێنانی ئەم زاراوە (مصطلح)ە قورئانی‌یانە لەجیاتی ئەو ناوانەی ئێستا لە زانستی کۆرپەلەزانی‌دا بەکاردێن، بە تایبەتی کە ئەم زاراوانەی قورئان ئەوپەڕی سادەییشیان تێدایە و هەموو کەسێك لێی تێدەگات.



## دەرەنجامەکانی لێکۆڵینەوەکە :

قورئانی پیرۆز کتێبێکی هیدایەتدەرە بۆ مرۆڤەکان بۆ پێکهێنانی کۆمەڵگەیەکی نموونەیی و سەرفرازی‌یان لە پاشەرۆژدا، هەربۆیە کتێبێکی زانستی رووت نی‌یە، بەڵام ئەو ئاماژە زانستی‌یانەی کە تێ‌یدا هاتووە، بە تایبەتی ئاماژەکانی کۆرپەلەزانی چەند مەبەستێکی تێدایە، کە من باوەڕم وایە خۆیان لەم خاڵانەدا دەبیننەوە (کە ئەم خاڵانە مەبەستی نووسینی ئەم کتێبەی بەردەستیشتە):

**١- دەرخستنی گەورەیی توانا و دەسەڵاتی پەروەردگار و ووردەکاری لە دروستکراوەکانی‌دا:** و بیرخستنەوە و خستنە بەرچاوی گەورەیی سۆز و بەزەیی‌یەکەشی، وەك لەم ئایەتانەدا هاتووە:

- ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ إِذَا أَنتُم بَشَرٌ تَنتَشِرُونَ﴾ (الروم:٢٠).
- ﴿وَلِنَجْعَلَكَ آيَةً لِّلنَّاسِ وَانظُرْ إِلَى العِظَامِ كَيْفَ نُنشِزُهَا ثُمَّ نَكْسُوهَا لَحْمًا فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ قَالَ أَعْلَمُ أَنَّ اللّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ (البقرة:٢٥٩).
- ﴿وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ مِنَ الْمَاء بَشَرًا فَجَعَلَهُ نَسَبًا وَصِهْرًا وَكَانَ رَبُّكَ قَدِيرًا﴾(الفرقان:٥٤).
- ﴿هُوَ الَّذِي يُصَوِّرُكُمْ فِي الأَرْحَامِ كَيْفَ يَشَاء لاَ إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾(آل‌عمران:٦).
- ﴿وَهُوَ الَّذِيَ أَنشَأَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ فَمُسْتَقَرٌّ وَمُسْتَوْدَعٌ قَدْ فَصَّلْنَا الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَفْقَهُونَ﴾ (الأنعام:٩٨).
- ﴿أَلَمْ نَخْلُقكُّم مِّن مَّاء مَّهِينٍ.{٢٠} فَجَعَلْنَاهُ فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ {٢١} إِلَى قَدَرٍ مَّعْلُومٍ {٢٢} فَقَدَرْنَا فَنِعْمَ الْقَادِرُونَ {٢٣}﴾ (المرسلات).

**٢- دەرخستنی نیعمەت و بەخششە زۆرەکان و بەخشندەیی خودا بەسەر بەندەکانی‌یەوە:** ئەمە مەبەستێکە لە باس کردنی دیاردە گەردوونی‌یەکان بەگشتی و دیاردەکانی کۆرپەلەزانی و دروست بوونی مرۆڤ بە تایبەتی کە لە قورئاندا هاتوون:

- ﴿أَفَمَن يَخْلُقُ كَمَن لاَّ يَخْلُقُ أَفَلا تَذَكَّرُونَ {١٧} وَإِن تَعُدُّواْ نِعْمَةَ اللّهِ لاَ تُحْصُوهَا إِنَّ اللّهَ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ {١٨}﴾ (النحل).

**٣- ئاگادارکردنەوەی ژیرییەکان بۆ بیرکردنەوە و تێڕامان، و سەیرکردن و دۆزینەوە و دەرهێنان (لێکۆڵینەوە و پێشبڕکێی زانستی):** دەبینین ئەو ئایەتانەی کە ئامارەی زانستی تێدایە دەگاتە زیاتر لە (١٠٠٠) ئایەت لە کۆی ئایەتەکانی قورئان (کە ژمارەیان ٦٢٣٦ ئایەتە)، بەڵام ئەو ئایەتانەی کە باسی ئەحکام و یاسای شەرعی دەکەن ژمارەیان دەگاتە (٥٠٠) ئایەت (واتە نیوەی ئایەتە زانستییەکان)، وەك ئەوەی کە زانایانی فیقهی بڕیاریان داوە، زۆر رەوا و راستە کە لە سەردەمی دۆزینەوە زانستییەکاندا هەوڵ بدەین بۆ گەڕان و دۆزینەوەی نهێنییەکان، چونکە لەگەڵ ئەو هەموو پێشکەوتنە زانستی و پزیشکییەدا زۆرێك لە دیاردەکان هێشتا بە نهێنی و راڤە نەکراوی ماونەتەوە، کە ئەگەر ئێمە لەژێر رۆشنایی پرۆگرامی قورئانیدا لێکۆڵینەوەی زانستی بکەین لەوانەیە بگەینە لێکدانەوەی زۆرێك لەو نهێنییانە، و بەم شێوەیە لە بواری زانستیدا پێش خەڵکانی تریش دەدەینەوە: ﴿وَلاَ يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ سَبَقُواْ إِنَّهُمْ لاَ يُعْجِزُونَ﴾ (الأنفال:٥٩)، واتە: با خەڵکانی بێباوەڕ وانەزانن کە پێش دەسەڵاتی خودا دەدەنەوە، ئەوان ناتوانن لە دەسەڵاتی ئێمە دەربچن (کەواتە ئەگەر موسوڵمانیش شوێنکەوتەی راستەقینەی پەیامەکەی خودا بێت، پێش بێباوەڕان دەداتەوە لە هەموو بوارێکدا)، جووڵاندنی ژیریی بە تێڕامان لە دروست بوونی مرۆڤ لەم ئایەتانەدا دەبینین:

- ﴿فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ مِمَّ خُلِقَ {٥} خُلِقَ مِن مَّاء دَافِقٍ {٦} يَخْرُجُ مِن بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ {٧} إِنَّهُ عَلَى رَجْعِهِ لَقَادِرٌ {٨}﴾ (الطارق).

- ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ {١} خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ {٢}﴾ (العلق).

- ﴿نَحْنُ خَلَقْنَاكُمْ فَلَوْلَا تُصَدِّقُونَ {٥٧} أَفَرَأَيْتُم مَّا تُمْنُونَ {٥٨} أَأَنتُمْ تَخْلُقُونَهُ أَمْ نَحْنُ الْخَالِقُونَ {٥٩} نَحْنُ قَدَّرْنَا بَيْنَكُمُ الْمَوْتَ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ {٦٠} ....... وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ النَّشْأَةَ الْأُولَى فَلَوْلَا تَذَكَّرُونَ {٦٢}﴾ (الواقعة).

**٤- دەرخستنی ئیعجازی زانستی قورئان:** بە روونکردنەوە و هێنانەوەی بەڵگەی زانستی بۆ سەلماندنی راستیی هاتنی قورئان لەلایەن پەروەردگارەوە، و دەرخستنی گەورەیی ئەم موعجیزەیە و مانەوەی بە زیندویێتی وەك بەڵگەیەك بۆ پەیامبەرێتی محمد (ﷺ):

- ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ (فصلت:٥٣).

- ﴿اللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَحْمِلُ كُلُّ أُنثَى وَمَا تَغِيضُ الأَرْحَامُ وَمَا تَزْدَادُ وَكُلُّ شَيْءٍ عِندَهُ بِمِقْدَارٍ﴾ (الرعد:٨).

- ﴿يَخْلُقُكُمْ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ خَلْقًا مِن بَعْدِ خَلْقٍ فِي ظُلُمَاتٍ ثَلَاثٍ ذَلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ الْمُلْكُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ فَأَنَّى تُصْرَفُونَ﴾ (الزمر:٦).

- ﴿هَلْ أَتَى عَلَى الْإِنسَانِ حِينٌ مِّنَ الدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْئًا مَّذْكُورًا {١} إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعًا بَصِيرًا{٢}﴾ (الإنسان).

**٥- بەستنەوەی زۆرێك لە حوكمە شەرعییەكان و یاسا زانستییەكان لە بواری پزیشكیدا:** لەبەر ئەوەی كە باكگراوندێكی زانستی هەیە بۆ زۆرێك لە حوكمە شەرعییەكان بە تایبەتی لە بواری كۆرپەلەزانیدا، وەك: حوكمەكانی حەیز و ماوەی مانەوەی ئافرەتی بێوەژن و تەڵاقدراو و ... هتد.

- ﴿وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلاَثَةَ قُرُوَءٍ ...﴾ (البقرة: ٢٢٨)، واتە: با ئەوانەی كە تەڵاق دراون سێ حەیز و سێ پاكبوونەوە بووەستن پێش ئەوەی كە شوو بكەنەوە، كە مەبەست لێی دڵنیا بوونە لە خاڵیێتی منداڵدانی پێش ئەوەی شوو بكاتەوە، وەك پێشتر ووتمان حەیزی یەكەم و دووەم لەوانەیە ئافرەتەكە بە

حەیزی تێبگات بەڵام هۆکارەکەی لە راستیدا بریتی بێت لە کاریگەریی کۆرپەلەکە لەسەر منداڵدان، بەڵام کە حەیزی سێیەم رووی‌دا ئیتر گومان نامێنێت لەوەدا کە ئافرەتەکە سکپڕ نی‌یە.

- ﴿وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا ...﴾ (البقرة:٢٣٤)، واتە: ئەو پیاوانەتان کە دەمرن و هاوسەران بەجێ دەهێڵن، پێویستە ئەو هاوسەرانە چوار مانگ و دە رۆژ خۆیان بگرن و چاوەڕێ بکەن (شوو نەکەنەوە)، لێرەدا ماوەکە زیادکراوە بۆ دڵنیا بوونی تەواو لە خاڵیتی منداڵدان و زیندوویتی کۆرپەلەکە، حیکمەتیش لەم زیادکردنە بۆ ئافرەتی بێوەژن ئەوەیە کە ئافرەتی سکپڕ لە کۆتایی هەفتەی نۆزدەیەمدا دەست دەکات بە هەست کردن بە جووڵە خۆویستەکانی منداڵەکە، بەڵام پێش ئەمە جووڵەکان زۆر دیاری کراون و وا لە دایکەکە ناکەن کە هەست بکات کۆرپەلەکەی زیندووە.

**٦- بەهێز کردن و چەسپاندنی ماناکان و پایەکانی ئیمان (وەك باوەڕبوون بە خودا و بە رۆژی دوایی):** ئەویش بۆ چەسپاندنی عەقیدە و بیروباوەڕ لە دەروونەکاندا، چونکە وەك چۆن زانستی نوێ پشتگیری ووتەکانی پەروەردگار دەکات لە بواری دروست بوونی مرۆڤدا و دەیسەلمێنێت، کەواتە ئەو ووتانەی تری پەروەردگاریش کە باسی باوەڕهێنان بە خودا و رۆژی دوایی و زیندووبوونەوە دەکات، ئەمانەش هەر راستی رەهان و هاتنەدی‌یان گومانی تێدا نی‌یە:

- ﴿يَا أَيُّهَا الْإِنسَانُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ الْكَرِيمِ {٦} الَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّاكَ فَعَدَلَكَ {٧} فِي أَيِّ صُورَةٍ مَّا شَاء رَكَّبَكَ {٨} كَلَّا بَلْ تُكَذِّبُونَ بِالدِّينِ {٩}﴾ (الإنفطار).

- ﴿قَالَ لَهُ صَاحِبُهُ وَهُوَ يُحَاوِرُهُ أَكَفَرْتَ بِالَّذِي خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ سَوَّاكَ رَجُلًا﴾ (الكهف:٣٧).

- ﴿خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ جَعَلَكُمْ أَزْوَاجًا وَمَا تَحْمِلُ مِنْ أُنثَى وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلْمِهِ وَمَا يُعَمَّرُ مِن مُّعَمَّرٍ وَلَا يُنقَصُ مِنْ عُمُرِهِ إِلَّا فِي كِتَابٍ إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ {١٢}........ ذَلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ الْمُلْكُ وَالَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِهِ مَا يَمْلِكُونَ مِن قِطْمِيرٍ {١٣}﴾ (فاطر).

- ﴿أَيَحْسَبُ الْإِنسَانُ أَن يُتْرَكَ سُدًى {٣٦} أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ يُمْنَى {٣٧} ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّى {٣٨} فَجَعَلَ مِنْهُ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْأُنثَى {٣٩} أَلَيْسَ ذَلِكَ بِقَادِرٍ عَلَى أَن يُحْيِيَ الْمَوْتَى {٤٠}﴾ (القيامة).

- ﴿قُتِلَ الْإِنسَانُ مَا أَكْفَرَهُ {١٧} مِنْ أَيِّ شَيْءٍ خَلَقَهُ {١٨} مِن نُّطْفَةٍ خَلَقَهُ فَقَدَّرَهُ {١٩} ثُمَّ السَّبِيلَ يَسَّرَهُ {٢٠} ثُمَّ أَمَاتَهُ فَأَقْبَرَهُ {٢١} ثُمَّ إِذَا شَاء أَنشَرَهُ {٢٢} كَلَّا لَمَّا يَقْضِ مَا أَمَرَهُ {٢٣}﴾ (عبس).

- ﴿أَوَلَمْ يَرَ الْإِنسَانُ أَنَّا خَلَقْنَاهُ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ {٧٧} وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِيَ خَلْقَهُ قَالَ مَنْ يُحْيِي الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ {٧٨} قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ {٧٩}﴾ (يس).

- ﴿وَأَنَّهُ خَلَقَ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْأُنثَى {٤٥} مِن نُّطْفَةٍ إِذَا تُمْنَى {٤٦} وَأَنَّ عَلَيْهِ النَّشْأَةَ الْأُخْرَى {٤٧}﴾ (النجم).

- ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن سُلَالَةٍ مِّن طِينٍ {١٢} ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ {١٣} ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ {١٤} ثُمَّ إِنَّكُمْ بَعْدَ ذَلِكَ لَمَيِّتُونَ {١٥} ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ تُبْعَثُونَ {١٦}﴾ (المؤمنون).

- ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّنَ الْبَعْثِ فَإِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ مِن مُّضْغَةٍ مُّخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ لِّنُبَيِّنَ لَكُمْ وَنُقِرُّ فِي الْأَرْحَامِ مَا نَشَاء إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى ثُمَّ نُخْرِجُكُمْ طِفْلًا ثُمَّ لِتَبْلُغُوا أَشُدَّكُمْ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّى وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَى أَرْذَلِ الْعُمُرِ لِكَيْلَا يَعْلَمَ مِن بَعْدِ عِلْمٍ شَيْئًا وَتَرَى الْأَرْضَ هَامِدَةً فَإِذَا أَنزَلْنَا عَلَيْهَا الْمَاء اهْتَزَّتْ

وَرَبَتْ وَأَنبَتَتْ مِن كُلِّ زَوْجٍ بَهِيجٍ {٥} ذَلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَقُّ وَأَنَّهُ يُحْيِي الْمَوْتَى وَأَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ {٦}﴾ (الحج).

- ﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِن بَنِي آدَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنفُسِهِمْ أَلَسْتَ بِرَبِّكُمْ قَالُواْ بَلَى شَهِدْنَا أَن تَقُولُواْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَذَا غَافِلِينَ﴾ (الأعراف:١٧٢).

لە کۆتاییدا هیوادارم جارێکی تر ئەی مرۆڤ لەخۆت بپرسیت کە ئایا لە کوێوە هاتوویت؟ چۆن دروست بوویت؟ لەچی‌یەوە دروست بوویت؟

تۆ شتێکی زۆر بچووك و کەم بوویت پەروەردگار ئاوا پێی گەیاندیت، کێ ئەو ئەندازەیە و وردەکاری‌یەی بەڕێوە برد تاوەکو تۆ چاوت بەدونیا هەڵهێنا، ئەی مرۆڤ بزانە کە تۆ هەرچەندێك خۆت بە گەورە بزانیت و پلە و پایەت بەرزبێتەوە تۆ سەرەتا تنۆکێك ئاو بوویت پەروەردگار کردیتی بەو مرۆڤە، و بیستن و بینین و هەموو هەستەکان و ئەندامەکانی تریشی پێبەخشیت، دەی بیرێك بکەرەوە و پابەندیی و ملکەچی خۆت بۆ خوای گەورە رابگەیەنە، با لەوکەسانە نەبیت کە خوای گەورە لە بارەیانەوە دەفەرموێت: ﴿قُتِلَ الْإِنسَانُ مَا أَكْفَرَهُ، مِنْ أَيِّ شَيْءٍ خَلَقَهُ، مِن نُّطْفَةٍ خَلَقَهُ فَقَدَّرَهُ، ثُمَّ السَّبِيلَ يَسَّرَهُ، ثُمَّ أَمَاتَهُ فَأَقْبَرَهُ، ثُمَّ إِذَا شَاء أَنشَرَهُ، كَلَّا لَمَّا يَقْضِ مَا أَمَرَهُ﴾ (عبس:١٧-٢٣)، ﴿أَوَلَمْ يَرَ الْإِنسَانُ أَنَّا خَلَقْنَاهُ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ، وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِيَ خَلْقَهُ قَالَ مَنْ يُحْيِي الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ، قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ﴾ (يس:٧٧-٧٩).

دووبارە داواکارم لە خوای گەورە کە ئەم نووسراوە سوومەند بێت بۆ موسوڵمانان و مایەی بەهێزکردنی بیرو باوەڕیان بێت، و بەم هەوڵە توانیبێتم زانیاری‌یەکی پێویست بۆ موسوڵمانان پێشکەش بکەم، و هیچ پڕوپاگەندەی بێخەوشی و کاملی ناکەم لە کارەکەمدا، چونکە هەموو مرۆڤێك راست دەڕوات و هەڵەش دەکات و کاملی و بێنوقسانی تەنها بۆ پەروەردگار و

کتێبە پیرۆزەکەیەتی، من بەم کارە هەوڵم داوە کە بیری خوێنەر بجووڵێنم بۆ ئەوەی زیاتر بەدوای حەق و راستیدا بگەڕێت و دڵی بکاتەوە بۆ ئەوەی کە رووناکیی و نووری پەروەردگاریی تێبچێت.

لەم کتێبەدا هەوڵی ئەوەم داوە ئەو راستییە روون بکەمەوە کە ئیسلام هەمووی نیگایەکە لەلایەن خوداوە و دەستی مرۆڤ کاری تێدا نییە، و محمد (ﷺ) رەوانەکراو و پێغەمبەری خودایە و ووتەکانی هەمووی وەحی خودایی بوون، و هەندێك لە موعجیزەکانی پێغەمبەرم (ﷺ) لە قورئانی پیرۆزدا لەژێر رۆشنایی راستییە زانستییەکاندا خستووەتە روو، ئەمە هەمووی بۆ ئەوەیە کە ئەوانەی باوەڕدارن ئیمانیان پێی زیاد ببێت و ئەوانەشی سەرگەردانن ببێتە مایەی رێنموییکەرێك بۆیان، چونکە خەڵکانی سەردەمی ئێمە بۆ هیچ شتێك بەقەدەر زانست ملکەچ نابن بە جیاوازی نەتەوە و ئاینەکانیانەوە.

هیوادارم سوودمەند بێت و بۆ منیش سوودبەخش و یاریدەدەرێك بێت لەناو گۆڕ، و لە دوارۆژ لەبەردەم پەروەردگاردا تکایەکم بۆ بکات ﴿يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ {٨٨} إِلَّا مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ {٨٩}﴾ (الشعراء)، و ببێتە مایەی رزگاربوونم.

داواکارم لەخوای گەورە ئەم کارەم لێوەرگرێت و تەنها بۆ رەزامەندی ئەو بێت، و لە تاوانەکانم ببوورێت و بە چاکە دوایی بەکردەوەکانم بهێنێت.

اللّهُم آمين.

وصلى الله وسلم على سيد المرسلين

والحمد لله رب العالمين.

**هاوپێچی ژماره (١):**

# قۆناغەکانی گەشەکردنی کۆرپەلە لە ٤٠ رۆژی یەکەمیدا لەژێر ڕۆشنایی فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ)، هەروەها گەشەی دوای (٤٢) رۆژ

ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بۆمان باس دەکەن کە کۆرپەلە لەسکی دایکیدا بە قۆناغ دروست دەبێت: ﴿وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا﴾ (نوح:١٤)، ﴿يَخْلُقُكُمْ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ خَلْقًا مِن بَعْدِ خَلْقٍ فِي ظُلُمَاتٍ ثَلَاثٍ﴾ (الزمر:٦)، ئەوەبوو بە درێژایی ئەم کتێبە هەوڵماندا ئەو راستییە بۆ خوێنەری بەرێز بچەسپێنین، و بۆمان روون کردەوە بەشێوەیەك کە گومانی تێدا نییە ئەوەی قورئانی پیرۆز باسی کردووە دەربارەی ووردەکارییەکانی دروست بوونی کۆرپەلەی مرۆڤ لە سکی دایکیدا هەمان ئەو راستییانەیە کە زانستی کۆرپەلەزانی و توێکاری نوێ لەمرۆماندا پەردەیان لەسەر هەڵماڵیوە، بەڵکو ئەوەشمان سەلماند کە قورئانی پیرۆز چەندین سەدە پێش زانستی نوێی داوەتەوە لە باس کردنی ووردەکارییەکانی ئەم بابەتەدا.

هەروەها بابزانین فەرموودەکانی پێغەمبەریش (ﷺ) چەندین ئاماژەیان لەم بوارەدا لەخۆ گرتووە، و لایەنی ئیعجازەکەی قورئانیان بەهێزتر کردووە، فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) باسی ئەوە دەکەن کە هەفتەی حەوتەم بریتییە لە قۆناغێکی گوێزەرەوەی گرنگ لە ژیانی کۆرپەلەکەدا و وەسفی شێوەی کۆرپەلەکەیان لە (٤٠) رۆژی یەکەمدا بەووردی کردووە و پاشان حاڵەتی کۆرپەلە لە دوای (٤٠) رۆژی یەکەمیش دەخەنە روو.

پێغەمبەر (ﷺ) هێڵە سەرەکییەکان و ووردەکارییەکانی هەر قۆناغێکی خستووەتەروو، لەم هاوپێچەدا فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) دەخەینەروو کە وەسفی کۆرپەلە دەکەن پێش و پاش ٤٠ رۆژی، و هەروەها رای هەندێك زانای موسوڵمان باس دەکەین دەربارەیان بەپێی یاساکانی رێزمانی عەرەبی، و پاشان ئەو راستییە زانستییانەش کە پشتگیرییان دەکەن باس دەکەین، و رووەکانی ئیعجاز لەم فەرموودە پیرۆزانەدا ئاشکرا دەکەین:

## PERIODS OF SUSCEPTIBILITY TO TERATOGENESIS



# چل رۆژی یەکەم

**پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەسفی حاڵەتی کۆرپەلەی کردووە لە (٤٠) رۆژی یەکەمدا لەو فەرموودەیەی کە ئیمامی (مسلم) بۆمان دەگێڕێتەوە: عن عبدالله بن مسعود (رضي الله عنه) قال: حدثنا رسول الله (ﷺ) وهو الصادق المصدوق قال:** ﴿إن أحدكم يجمع خلقه في بطن أمه أربعين يوماً، ثم يكون في ذلك علقة مثل ذلــك، ثم يكون في ذلك مضغة مثل ذلك، ثم يرسل الملك فينفخ فيه الروح و يؤمر بأربع كلمات: بكتب رزقه و أجله و عمله و شقي أو سعيد﴾*. **واتە: هەر یەکێك لە ئێوە دروست بوونی لە سکی دایکیدا لە چل رۆژدا تەواو دەبێت، هەر لەو چل رۆژەدا (علقـة) دەبێـت، پاشـان هـەر لـەو چـل رۆژەدا (مضـغة) دەبێـت، پاشـان پەروەردگار فریشتەیەك دەنێرێت کە ئەمانەی بۆ دەنووسێت: رۆزیيەکەی لە دونیادا، کاتی مردنی(ئەجەلی)، کاری لە دونیادا و ئایا بەختەوەر دەبێت یان بەهیلاك دەچێت.**

**ئەم فەرموودەیە دوو راستی سەرەکیمان بۆ ئاشکرا دەکات:**

**یەکەم: دروست بوونی مرۆۆ لە (٤٠) رۆژی یەکەمدا تەواو دەبێت.**

**دووەم: قۆناغە سەرەتاییيەکانی دروست بوونی کۆرپەلە: کە بریتین لە (نطفة، علقة و مضغة)، لە (٤٠) رۆژی یەکەمی دروست بوونیدا تەواو دەبێت و کامڵ دەبێت.**

---

* صحيح مسلم ج٤ ص٢٠٣٦-٢٦٤٣، و أصل الحديث رواه البخاري وأبو داود والترمذي وابن ماجة وأحمد في مسنده وعبدالرزاق في مصنفه، وأبو نعيم في الحلية، و روى أبو عوانة بسند ضعيف حديث عبدالله بن مسعود بإدراج لفظ (نطفة) بعد قوله (أربعين يوماً) فكانت الرواية هكذا: (إن أحدكم يجمع خلقه في بطن أمه أربعين يوماً نطفة)، وهذا اللفظ ليس له أصل في جميع روايات البخاري ومسلم، ولا غيرهما من الروايات في كتب الأصول وهو لفظ مدرج على الحديث، أنظر: (فتح الباري ٤٧٩/١١)، وقال ابن حجر: وأما ما أخرجه أحمد من طريق أبي عبيدة قال: قال عبدالله رفعه: (إن النطفة تكون في الرحم أربعين يوماً على حالها لا تتغير) ففي سنده ضعف وانقطاع، انظر (فتح الباري ٤٨١/١١).

## كۆ كردنەوە و تەواو بوونی دروست بوون (قۆناغە سەرەتاییەكانی دروست بوونی كۆرپەلە):

پێغەمبەر(ﷺ) وەسفی كۆرپەلەی لە چل رۆژی یەكەمیدا(شەش هەفتەی یەكەم) بەو فەرموودەیەی سەرەوە كردووە: ﴿إن أحدكم يجمع خلقه في بطن أمه أربعين يوماً، ثم يكون في ذلك علقة مثل ذلك، ثم يكون في ذلك مضغة مثل ذلك﴾ صحيح مسلم -كتاب القدر-.

زانستی كۆرپەلەزانی بۆمان باس دەكات كە كۆرپەلە لە هەفتەی پێنجەمدا لەشی چەماوە و نیمچە بازنەییە و درێژییەكەی نزیكەی (١سم)ە، درێژی بەشی سەرەوەی لەشی نزیكەی ٣\٢ی درێژی لەشێتی، چەكەرەی پەلەكان لەم كاتەدا دروست دەبن، هەر لەم كاتەدا نیمچە كلكێكی دەبێت، دڵی لە قۆناغێكی زۆر سەرەتاییدایە و بە رێك وپێكی لێدەدات، پەلەكانی سەرەوە لە هەفتەی چوارەمدا پەیدا دەبن، شكڵیان لەسەرەتای هەفتەی پێنجەمدا لە سەوڵی بەلەم دەچێت، پاشان ووردە ووردە كۆتاییەكەی پان دەبێتەوە وتەختانی دەست وتیشكی پەنجەكان پەیدا دەبێت (بڕوانە وێنەی هـ/١).



وێنەی (هـ/١): كۆرپەلە لە كۆتایی هەفتەی پێنجەم و سەرەتای هەفتەی شەشەمدا.

لە كۆتایی هەفتەی شەشەمدا پێش رۆژی ٤٢ وێنە و روخساری دەم وچاوی كۆرپەلەكە لە روخساری مرۆڤ ناچێت، چاو و پێكهاتووەكانی، گوێ و پێكهاتووەكانی لەگەڵ ئەندامەكانی دەرەوەی زاووزێ بە شێوەیەكی سەرەتایی پەیدا بوون پێش رۆژی ٤٢ بەڵام كار ناكەن و لە ئەندامی ئاسایی مرۆڤ ناچن (وێنەی هـ/ ٢).


وێنەی (هـ/٢): کۆرپەلە لە هەفتەی (٦ و ٧)دا ناتوانرێت ڕوخساری مرۆڤانەی جیابکرێتەوە.

ئەمانەی باس کرا لە گەشە کردنی کۆرپەلـەدا یەکدەگرێتـەوە لەگـەڵ ووشـەی (يجمـع خلقـه) کـە لـە فەرموودەکەی ابن مسعود دا هاتووە، چـونکە باسـی کـۆکراوەیی و چەماوەیی شکڵی دەرەوەی کۆرپەلەکە و توێکـاری نـاو لەشـی دەکـات کـە هـەموو ئەنـدام و کۆئەندامـەکانی کۆکراونەتـەوە لـە بارسـتەیەکی بچووکدا و لەسـەرەتای تـەواو بـوونی دروست بووندان. کەواتە لێرەوە بۆمـان دەرکـەوت کە وەسـفی ئـەم قۆناغـە بـە ووشـەی (يجمـع خلقـه) زۆر بـە ووردی لایـەنی توێکـاری کۆرپەلـەمان بـۆ دەخاتەڕوو.

## کۆرپەلە لە (٤٠) رۆژی یەکەمدا:

### قۆناغی (النطفة):

ئەم قۆناغە لە بەیەکگەیشتنی ئاوی پیاو وئافرەتەوە دەست پێدەکات، بە تێکـەڵ بـوونی ئـەم دوو شـلەمەنییە، مـاددەی بۆماوەییشـیان لەگـەڵ یەکـدا یەکدەگرن، کەواتە سەرەتای ئەم قۆناغە بە تنۆکێك ئاوی تێکەڵاوە کە خۆشی لە دەوروبەرێکی ئاویدایە، ئەم کرداره ماوەی ٦ رۆژ دەخایەنێت کە تێیدا ئەم دوو ئاوە یەك دەگرن و هێلکەی پیتێنراو (زایگۆت Zygote) لەناو ئاوەکەدا دروسـت دەکـەن، هـەروەها ئـەم زایگۆتـە هـەروەك ئـاو سـیفەتی جووڵـەی گلبوونـەوەی هەیـە، هـەروەها چـەند پێکهێنـەرێکی تـری ئـەم ئاوە هەیـە کـە ئەوانیش هەر شلەمەنین، ئەم کرداری یەکگرتنـە لـە بۆری هێلکەدان (جۆگـەی فالووپ Fallupian Tube)دا روو دەدات کە ئەمیش پڕە لـە شـلەمەنی، لـە

Meiosis | Fertilization | Meiosis

دروست بوونی هێلکۆکە | پیتاندن | دروست بوونی سپێرم

44 XX → 22 X → 22 X → 44 XY ← 22Y ← 22 Y ← 44 XY

22X (First polar body) | 22X (Second polar body)

44 XX → 22 X → 22 X → 44 XX ← 22X ← 22 X

Immature ova | Mature ova | Mature sperms | Primary spermatocyt

وێنەی (هـ/٢): پێکهاتەی کرۆمۆسۆمیی هێلکۆکە و سپێرم و زایگۆت.

رۆژی شەشـەمدا ئـەم تنۆکە ئاوە (نطفـةیـە) خـۆی دەگەیەنێتـە دیـواری منـدالان، و ووردە ووردە هـەڵی دەکۆڵێت و خۆی تێدا دەچەسپێنێت، لێرەدا پاش ئەم خۆ رواندنە لە دیواری منالّداندا قۆناغی (النطفة) تـەواو دەبێـت لـە رۆژی چـواردەیەمدا پـاش پیتانـدنی هێلکەکـە لەلایـەن تـۆوی پیـاوەوە، ئەمـە ئـەو ماوەیـە کـە قۆناغی(نطفة) بۆ خۆی دەبات لە ٤٠رۆژەکە (واتە:١٤رۆژ).

## قۆناغی (العلقة)* :

لـە دوای قۆنـاغی (النطفـة) خانـەکانی کۆرپەلـە دەسـت دەکـەن بـە دابـەش بوون و کەڵەکە بوون، لەگەڵ کەڵەکە بوونی خانەکانـدا کۆرپەلەکـەش بـەرەو رەق بـوون و ئەسـتوور بـوون دەچـێت، پـاش ٢ هەفتـە کۆرپەلەکـە خـۆی دەنووسـێنێت بـەدیواری منداڵانـەوە و پێـوەی هەڵدەواسرێت، لە رۆژی ٢١دا کۆرپەلەکـە شـێوەی کرمـی (العلقة) وەردەگرێت و خوێنـە وەسـتاوەکانی نـاو لوولـە



وێنەی (هـ/٤): بڕوانە لێکچوونی تەواوی نێوان کۆرپەلە و کرمی زەروو (هەڵەق).

* دووبارە بزانە کە زاراوەی (العلقة) ئەم مانایانەی هەیە بەپێی فەرهەنگەکانی زمانی عـەرەبی: ١-کرمێکـە کـە لـە زۆنگاوەکاندا دەژی (دودة العلق). ٢-بە مانای شتێکی هەڵواسراو. ٣-پارچەیەك خوێنی رەقبوو (دم جامد). بڕوانـە: المفردات للراغب الأصفهاني ص٣٤٢، المعجم الوسيط ٢:٦٢٢.

خوێنەکانی لەشی شێوەی پارچەیەك خوێنی مەییوی وەستاوی دەدەنێ، لێرەوە ماناکانی (علقة) بەتەواوەتی ئاشکرا دەبن، ئەمەش ئەو ماوەیەیە کە قۆناغی(علقة) لە ٤٠رۆژەکە دەیبات (**بڕوانە وێنەکانی: هـ/٥ ، هـ/٦**).



**وێنەی (هـ/٥): کۆرپەلەکە لوولەکانی خوێنی دروست بوون بەڵام سووڕی خوێن هێشتا دستی پێنەکردووە، و لەبەر ئەوەی لەناو دیواری منداڵدانا جەلواسراوە کەواتە پارچەیەك خوێنەی وستاوی گەشی هەلواسراوە.**

## قۆناغی گۆشت پارە (المضغة):

ئەم قۆناغە لەگەڵ دروست بوونی تۆپەڵە یان بارستە لەشییەکان (الکتل البدنیة) دەست پێدەکات لە رۆژی ٢٤ یان ٢٥دا کە لە بەشی سەرەوەی کۆرپەلەوە پەیدا دەبن پاشان بەشی دواوەش دەگرێتەوە، لە رۆژی ٢٨ دوای پیتاندن کۆرپەلەکە لە چەند بارستەیەکی لەشی پێك دێت کە بەرزی ونزمی لە نێوانیاندایە، بە پەیدا بوونی ئەم بارستانە شێوەی دەرەوەی کۆرپەلەکە لە بنێشتێکی جووراو دەچێت، کۆرپەلەکە شێوەی گۆشتپارە (پاروویەکی جووراو) وەردەگرێت لە رووی قەبارەوە (درێژییەکەی ١سم دەبێت کە بچووکترین شتێکە بتوانرێت بجوورێت)، بەمەش ئەم قۆناغە تەواو دەبێت لە پاشماوەی ئەو (٤٠) رۆژەی یەکەمی ژیانی کۆرپەلەکەدا.

ئەم ریزبەندییەی قۆناغەکان کە تێیدا قۆناغی گۆشتپارە (مضغة) دوای قۆناغی (العلقة) دێت یەك دەگرێتەوە لەگەڵ ئەوەی کە لە قورئاندا هاتووە: ﴿فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً﴾ (المؤمنون:١٤)، ئەم قۆناغە بە کۆتایی هاتنی هەفتەی شەشەم تەواو دەبێت، لە هەفتەی حەوتەمەوە شێوەی مرۆڤانەی کۆرپەلەکە دەردەکەوێت لەبەر بڵاوبوونەوەی چوارچێوەی ئێسکیی بەناو لەشیدا.

**قۆناغی جیاكەرەوە:**

دوای ئەوانەی باس كران دەبینین كە قۆناغەكانی: (النطفة، العلقة والمضغة) لە ٤٠رۆژی یەكەمدا تەواو دەبن، كۆرپەلەكە لە كۆتایی ئەم قۆناغانەدا لە شێوەی گۆشتپارەیەكدایە كە سیمای مرۆڤی پێوە دیار نییە، لەرۆژی (٤٥)وە ئەندامەكان و چوارچێوەی ئێسكیی بۆ كۆرپەلەكە بە شێوەیەكی ئاشكرا دروست دەبێت، دابەش بوون و جیابوونەوەی ووردی خانەكان دوای ئەمەش هەر بەردەوام دەبێت، بەڵام هەنگاوە سەرەكییەكانی نەمانی شێوەی گۆشتپارە و دەركەوتنی شێوەی ئاسایی مرۆڤانە لە نێوان (٤٠ بۆ ٤٥) رۆژ دەبێت (وێنەكانی: هـ/٦ و هـ/٧).




وێنەی (هـ/٦): كۆرپەلەیەك لە هەفتەی شەشەمیدا (پێش ٤٢ رۆژ)، دەبینیت كە روخسار و پێكهاتەی لەشی مۆركی ئادەمیزادی پێوە دیار نییە.

وێنەی (هـ/٧): كۆرپەلەیەك لە هەفتەی حەوتەمیدا، دەبینین كەوا شكڵ و روخساری مرۆڤانەی پێوە دیارە و زۆربەی ئەندامەكانی لەشی دروست بوون و كامڵ بوون.

**جیاوازی لە تێگەیشتنی زانایاندا بۆ فەرموودەکە:**

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ تێگەیشتنی جیاوازی زانایان بۆ ئەو فەرموودەیەی لەسەرەوە باس کرا، دەبینین کە جیاوازی زۆر روویداوە لە تێگەیشتنی زانایانی پێشین بۆ دیاری کردنی ماوەی هەر یەك لە قۆناغەکانی: (النطفة، العلقة والمضغة)، کە ئایا هەر یەکەیان (٤٠) رۆژ دەخایەنن یان بە هەموویان (٤٠) رۆژی پێدەچێت، ئەمەش بە پشت بەستن بە تەفسیری جیاواز بۆ فەرموودەکەی (عبدالله ی کوڕی مسعود)، هەندێك لەو زانایانە بەو شێوەیە راڤەی ئەم فەرموودەیەیان کردووە کە هەر یەك لەم سێ قۆناغە بەدوای یەکدا دێن و هەریەکەیان ماوەی (٤٠) رۆژ دەخایەنێت، لە دەستەواژەی (مثلَ ذلك) ئەوە تێگەیشتن کە ئاماژەیە بۆ ماوەکەی پێشتر واتە (أربعون يوماً)، لەمەوە گەیشتنە ئەوەی کە قۆناغی (مضغة) پاش (١٢٠) رۆژ تەواو دەبێت، و بۆیە هەندێکیان فەتوای ئەوەیاندا کە ئاساییە لە ٤ مانگی یەکەمی گەشە کردنیدا کۆرپەلە لەباربرێت تەنانەت بەبێ بوونی زەروورەتێکی گەورەش، چونکە بە بۆچوونی ئەوان ژیانی کۆرپەلەکە لەم ماوەیەدا ژیانێکی رووەکییە و هێشتا رۆحی ئادەمیزادی بە بەردا نەکراوە.

**چارەسەر کردنی ئەم جیاوازییە:**

دوای کۆکردنەوەی ئەو دەقانەی کە لەم بارەیەوە هاتوون لە کتێبەکانی فەرموودەدا و بەدوادا چوونیان و لێکۆڵینەوەیان دەگەینە ئەو راستییەی کە ئەو ووتەیەی کە دەڵێت: قۆناغی گۆشتپارە پاش (١٢٠) رۆژ تەواو دەبێت، ووتەیەکی راست نییە لەرووی شەرعییەوە، ئەویش لەبەر ئەم خاڵانەی خوارەوە:

١- فەرموودەکەی پێشووی (عبدالله ی کوڕی مسعود) هەریەك لە پێشەوایان (بوخاری و موسلیم) گێڕاویانەتەوە، بەڵام گێڕانەوەکەی ئیمامی

موسلیم دەستەواژەی (في ذلك)ی لەگەڵدایە لە دوو شوێندا پێش هەردوو ووشەی (علقة) و (مظغة)، کە ئەمە زیادەیەکی راستە و بە بەشێك لە فەرموودەکە دادەنرێت وەك کۆرکردنەوەیەك لەنێوان گێڕانەوەکاندا (جمعاً بين الروايات)، لێرەوە دەگەینە ئەوەی کە گێڕانەوەی تەواوی دەستەواژەکانی فەرموودەکە بەو شێوەیە جێگیر دەبێت کە پێشەوا موسلیم گێڕاوێتی‌یەوە: ﴿إن أحدكم يجمع خلقه في بطن أمه أربعين يوماً، ثم يكون في ذلك علقة مثل ذلك، ثم يكون في ذلك مضغة مثل ذلك ... الحديث﴾.

٢- قورئانی پیرۆز باسی ئەوەمان بۆ دەکات کە دروست بوونی ئێسك پاش قۆناغی گۆشتپارە دەبێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا﴾، پێغەمبەریش (ﷺ) لە فەرموودەکەی (حذيفة)دا ئەوەی بۆ دیاری کردووین کە سەرەتای دروست بوونی ئێسك لە لەشی کۆرپەلەدا پاش رۆژی (٤٢) دەبێت لە دروست بوونی (نطفة)وە.

**فەرموودەکە**: عن حذيفة (رضي الله عنه) أن رسول الله (ﷺ) قال: ﴿إذا مرَّ بالنطفة ثنتان وأربعون ليلة بعث الله إليها ملكاً فصوَّرَها، وخلق سمعها، وبصرها، وجلدها، ولحمها، وعظامها ... الحديث﴾*، ئەو ووتەیەی کە دەڵێت تەواو بوونی قۆناغی گۆشتپارە و سەرەتای دروست بوونی ئێسك لە لەشی کۆرپەلەدا دوای (١٢٠) رۆژ دەبێت، بە ئاشکرا پێچەوانەی مانای دیاری ئەم فەرموودەیەیە.

٣- توێژینەوە نوێکانی زانستی کۆرپەلەزانی بۆی سەلماندووین کە دروست بوونی ئێسك لە لەشی کۆرپەلەدا یەکسەر پاش هەفتەی شەشەمی دەبێت نەك پاش هەفتەی (١٧)، کە ئەمە بە ئاشکرا پشتیوانی مانا

* أخرج الحديث مسلم في صحيحه ٢٠٣٧/٤ ح:٢٦٤٥، و له طريق آخر عند مسلم في الموطن السابق ح:٢٦٤٤، وأخرجه الطبراني في المعجم الكبير ١٧٨/٣ ح٣٠٤٤، وأبو داود في كتاب القدر، وجعفر الفريابي، أنظر فتح الباري ٤٨٤/١١.

ئاشکراکەی فەرموودەکەی (حذيفة) دەکات، لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە مانای دەستەواژەی (مثل ذلك) لە فەرموودەکەدا ئەوە ناگەیەنێت کە هەر قۆناغێك (٤٠) رۆژ دەخایەنێت**.

بەمەبەستی یەکخستنی مانای فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لەم بارەیەوە، دەڵێین:

لەبەر ئەوەی ووشەی ئاماژەدان (إسم الإشارة) لە دەستەواژەی (مثل ذلك) لە فەرموودەکەدا: ﴿إن أحدكم يجمع خلقه في بطن أمه أربعين يوماً، ثم يكون في ذلك علقة مثل ذلك، ثم يكون في ذلك مضغة مثل ذلك﴾ دەگەڕێتەوە بۆ یەکێك لە ٣شت کە لە پێشیدا باس کراون، کە بریتین لە: کۆکردنەوەی دروست بوون (جمع الخلق)، سکی دایك (بطن الأم)، (٤٠) رۆژ (أربعين يوماً).

لێرەدا دەبێت بزانین کە ئەو ووشەی إشارەیە لە فەرموودەکەدا هاتووە رەها وگشتییە (لفظ مطلق)، و لەوانەیە هەر سێ شتەکە بگرێتەوە.

سەبارەت بەوەی کە بگەڕێتەوە بۆ (٤٠) رۆژەکە (أربعون يوماً) ئەوەی رێدەگرێت لەمە فەرموودەکەی (حذيفة)یە، چونکە بەپێی فەرموودەکە لە دوای (٤٠) رۆژ قۆناغەکان تەواو دەبێت و ئێسك دروست دەبێت، کەواتە ئەگەر ووشەی إشارەکە بگەڕێنینەوە بۆ (٤٠) رۆژەکە ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە هەر قۆناغێك (٤٠) رۆژ دەخایەنێت، کە وەك ووتمان فەرموودەکەی (حذيفة) ئەمە رەتدەکاتەوە، لەبەر ئەوەی فەرموودەکەی (حذيفة) بە تایبەتی باسی بابەتەکەی کردووە و روونی کردووەتەوە (نص مُبَيِّن)، و فەرموودەکەی پێشتر بە گشتی باسی بابەتەکەی کردووە (نص مُجْمَل)، ئەوا بەپێی یاساکانی لێکدانەوەی دەقە شەرعییەکان دەبێت مانای ئەو گشتییە بە

---

** أنظر حاشية الجمل على الجلالين ج٣ ص١٨٥، حيث قال: (... فسقط ما قيل أن الوارد في الحديث أن مدة كل استحالة أربعون يوما ...).

تایبەتی‌یەکە بکرێت و لێك بدرێتەوە (النص المُجْمَل يُحْمَلُ على النص المُبَيّن)، کەواتە ووشەی إشارەکە ناگەڕێتەوە بۆ (٤٠) رۆژەکە.

هەروەها نابێت ئەو (إسم إشارة)یە بگەڕێنرێتەوە بۆ دەستەواژەی سکی دایك (بطن الأم) چونکە بەم شێوەیە دەبێتە دووبارە کردنەوەیەك کە پێویست ناکات و مانایەکی نوێ نادات بە دەستەوە، واتە فەرموودەکە بەم شێوەیەی لێدێت: (إن أحدكم يجمع خلقه في بطن أمه أربعين يوماً، ثم يكون في ذلك البطن علقة مثل ذلك، ثم يكون في ذلك البطن مضغة مثل ذلك)، ئەم دووبارە کردنەوەیەی ووشەی (البطن) دەبێتە تێئاخنین و کۆکردنەوەی ووشەی زیادە، کە ئەمە لەگەڵ رەوانبێژی پێغەمبەردا (ﷺ) ناگونجێت، چونکە ئەو هەمیشە بە چەند ووشەیەکی کەم و پوخت و پڕ لە مانا و دوور لە دووبارە کردنەوە مەبەستەکانی گەیاندووەتە بەرامبەر.

کەواتە ئەگەر ئەو ووشەی ئاماژەکردنە (إسم الإشارة)یە بۆ هیچ کام لە دەستەواژەکانی (اربعين يوماً، بطن الأم) نەگەڕێتەوە ئەوا دەبێت بۆ دەستەواژەی کۆکردنەوەی دروست بوون (جمع الخلق) بگەڕێتەوە نەك بۆ (٤٠) رۆژ، کە بەمە فەرموودەکە مانای راستی خۆی وەردەگرێت و لێکدانەوەی دروستی بۆ دەکرێت.

بابزانین ئەم بۆچوونە شتێکی داهێنراو و تازە نی‌یە، چونکە ئەمە هەمان ئەو راستی‌یەیە کە زانایەکی بەناوبانگی موسوڵمانان پێی گەیشت لە سەدەی حەوتەمی کۆچی‌دا کە ئەویش زانا (إبن الزملكاني)یە.*

ئەم زانایە لەم فەرموودانەوە گەیشتە ئەوەی کە هەر سێ قۆناغی (النطفة، العلقة، المضغة) لە (٤٠) رۆژی یەکەمدا دەبێت، إبن الزملكاني دەڵێت:

---

* ناوی ئەم زانایە بەتەواوی بریتی‌یە لە: كمال الدين عبد الواحد کوڕی عبدالكريم الزملكاني‌یە، لەساڵی ٦٥١ی کۆچی‌دا کۆچی دوایی کردووە، خاوەنی کتێبی (البرهان الكاشف عن إعجاز القرآن)ە.

{سەبارەت بە فەرموودەکەی ئیمامی بوخاری (مەبەستی فەرموودەکەی عبدالله ی کوڕی مەسعودە کە بوخاری گێڕاوی‌یەتەوە)، مانای (یجمع خلقه) واتە دروست بوونی تەواو و رێك وپێك دەکرێت، هەروەکو چۆن دەڵێن پیاوێکی تەواو (رجل جمیع، أي: مجتمع الخلق)، کەواتە هەردوو ئەم دەستەواژەیە یەکسانن لە مانایاندا کە رێك وپێکی و کاملی دەگەیەنن لە دروست بووندا (الإحکام والإتقان في الخلق)، هەروەها کۆرپەلەکە گۆشتپارە(مضغة) دەبێت لە بەشی خۆی هەر لەو (٤٠) رۆژەدا کە دروست بوونی رێك وپێك و تەواو دەبێت، لەدوای (٤٠) رۆژەکەش شێوەی رێك وپێکی مرۆڤ وەردەگرێت، دەستەواژەی (مثل ذلك)ەش دەگەرێتەوە بۆ ئەم کۆکردنەوە و رێك وپێك کردنە.

نموونەی ئەم شێوازی قسەکردنە لە فەرموودەکەدا وەك ئەوە وایە بڵێیت: مرۆڤ لە دونیادا بە درێژایی تەمەنی لە گۆڕاندایە، پاشان بێیت ئەم گۆڕانکاری‌یانە باس بکەیت و بڵێیت: ئەو یەکەم جار ساوایەك و شیرە خۆرەیەکە، دوایی دەبێت بە منداڵ، پاشان لاوێکە، دوایی گەنجە، پاشان کامڵ دەبێت، دوایی پیر دەبێت، و پاشان پەکی دەکەوێت، و لە کۆتایی‌دا دەمرێت، ئەمە بریتی‌یە لەشێوازێکی رێکخستن بۆ ئەو گۆڕانکاری و بارانەی کە بەسەری‌دا دێت لەماوەی مانەوەی لە دونیادا}**.

لە یاساکانی رێزمانی زمانی عەرەبی‌دا زانراوە کە ئامرازی (ثم) کە بەکاربێت مانای رێکخستن و خایاندنی ماوەیەك دەگەیەنێت (تفید الترتیب والتراخي) لەنێوان ئەو دوو هەواڵەی کە بە یەکیانەوە دەبەستێتەوە، تەنها لە حاڵەتێکدا نەبێت کە ئەگەر بەڵگەیەکی تر هەبێت کە ئەو مانایە ناگەیەنێت، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ذَلِكُمْ وَصَّاكُم بِهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ، ثُمَّ آتَيْنَا مُوسَى

** بڕوانە کتێبی: البرهان الكاشف عن إعجاز القرآن لإبن الزملكاني ص٢٧٥.

الْكِتَابَ ...﴾، ئاشکرایە کە ئامۆژگاری خوای گەورە بۆ ئێمە لە قورئاندا لە پاش کاتی ناردنی موسا پێغەمبەرەوەیە.

کەواتە ئەو ئامرازی (ثم)یەی لەم ئایەتەدا بەکار هاتووە مانای رێکخستن و ماوە گەیاندن (ترتيب و تراخي) ناگەیەنێت، بەڵام لە فەرموودەکەدا ئاشکرایە کە مانای رێکخستن و کات خایاندن دەگەیەنێت لە نێوان قۆناغەکانی گەشە کردنی کۆرپەلەدا.

سەرەنجامی گشتی ئەم کۆکردنەوەیە، و ئەوانەی لە سەرەوە باسمان کرد مانای تەواوی ئایەتەکە بەم شێوەیەی لێدێت: ﴿إن أحدكم يجمع خلقه في بطن أمه أربعين يوماً، ثم يكون في ذلك (أي في ذلك العدد من الأيام) علقة (مجتمعة في خلقها) مثل ذلك (أي مثلما اجتمع خَلْقُكُم في الأربعين يوماً)، ثم يكون في ذلك (أي في نفس الأربعين يوماً) مضغة (مجتمعة مكتملة الخلق المقدر لها) مثل ذلك (أي مثلما اجتمع خلقكم في الأربعين يوماً)﴾ واتە: هەر یەکێك لە ئێوە دروست بوونی لەسکی دایکیدا لە چل رۆژدا تەواو دەبێت، هەر لەو چل رۆژەدا (علقة) دەبێت (کە دروست بوونی تەواو بووە)، پاشان هەر لەو چل رۆژەدا (مضغة) دەبێت (کە دروست بوونی کۆ بووەتەوە و تەواو بووە).

کەواتە لێرەوە دەگەینە ئەوەی کە مانای فەرموودەکان یەکتری تەواو دەکەن و ئەگەر لەگەڵ یەکدا لێکیان بدەینەوە هیچ جۆرە بەیەکدا کێشانێك لە نێوانیاندا روو نادات، دەستەواژەی: ﴿ثم يكون علقة مثل ذلك، أي: ثم إنه يكون في الأربعين المذكورة علقة تامة الخلق، متقنة محكمة الإحكام الممكن لها، الذي يليق بنعمه سبحانه وتعالى﴾ مانای ئەوەیە کە لە (٤٠) رۆژەکەدا کۆرپەلەکە (علقة) دەبێت کە دروست بوونی زۆر تەواوە و رێك وپێکە بۆ ئەو قۆناغەی کە تێیدایە، بە شێوەیەك کە لەگەڵ دەسەڵاتی بێپایان و بێسنووری پەروەردگاردا دەگونجێت.

**کەی رۆح دەکرێت بە بەری کۆرپەلەکەدا :**

**ئایا لەدوای (٤٠) رۆژ دەبێت یان لەدوای سێ (٤٠) رۆژی؟**

ئەم بابەتە بە دڵنیاییەوە لە فەرمودەکان و دەقە شەرعیەکانەوە تێدەگەین، زانایانی موسوڵمان هەموو کۆکن لەسەر ئەوەی کە کردنی رۆح بە بەری کۆرپەلەکەدا دوای قۆناغی گۆشتپارە (المضغة) دەبێت، ئەویش بە پشت بەستن بەو دەقە ئاشکرایەی سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ)، بەڵام ئایا لە کەیدا بە ووردی ئەم کردارە روودەدات، دوای دوو مانگ یان سێ یان چوار مانگ؟ هیچ کەسێك ناتوانێت بە دەقیقی رۆژی ئەم کردارە دیاری بکات چونکە هیچ دەقێك نییە کە رۆژەکەی دیاری کردبێت، بەڵام دەتوانین لە دەقەکانی تری قورئانەوە کاتە نزیکەکەی دیاری بکەین.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ سَوَّاهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِن رُّوحِهِ ...﴾ (السجدة:٩)، واتە: پاشان خوای گەورە لەشی (ئادەمی) رێك کردەوە و لە رۆحی خۆی کرد بە بەردا، کە لەمەوە ئەوە تێدەگەین کە رۆح دەکرێت بە بەری کۆرپەلەکەدا دوای رێکبوونەوە (تەسویە)، ئەمیش یەکسەر دوای دروست بوون (الخلق) دێت: ﴿الَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّاكَ فَعَدَلَكَ﴾ (الإنفطار:٧).

واتە: پەروەردگارە کە دروستی کردوویت و لەشی رێك کردوویتەوە و رێك و پێکی کردوویت، کەواتە دەتوانین بڵێین رۆح و گیان دەکرێت بە بەری کۆرپەلەکەدا دوای قۆناغی دروست بوون (واتە: دوای هەفتەی هەشتەم) و لە قۆناغی گەشە کردندا، کە ئەمە بۆچوونێکە زۆرێك لە موفەسیران لەگەڵیدان و ووتوویانە قۆناغی (النشأة خلقاً لآخر) ئەو قۆناغەی کۆرپەلەیە کە تێیدا گیان دەکرێت بە بەریدا، کە دوای قۆناغەکانی ئێسك و داپۆشینی ئێسك بە ماسولکەکان وەك لە ئایەتەکەدا هاتووە، ئەوەی ئەم رایە بەهێز دەکات هاتنی پیتی (ثم)یە لە فەرموودەکەدا پێش کرداری رۆح کردن بە بەری کۆرپەلەکەدا

(...ثم يرسل الملــك فيــنفخ فيــه الــروح...) کە ئەم پیتە مانای رێکخستن و ماوەخایاندن دەگەیەنێت.

کۆرپەلەزانی بۆمان باس دەکات کە دوای تێپەڕبوونی هەفتەی هەشتەم هەموو ئەندامە سەرەکییەکانی کۆرپەلەکە دروست بوون و شێوەی ئادەمیزادی وەرگرتووە و ئەندامەکانی زاووزێی دەرەوەش تا ڕاددەیەك جیاوازبوون، و لەوانەیە دەست کردنی کۆرپەلەکە بە جووڵە لە سکی دایکیدا (وەك جووڵەکانی هەناسەدان و جووڵەی پەلەکانی سەرەوە و لێدانەکانی دڵ و جووڵەی هاوێنەکانی چاو و کرداری قووتدان و بردنی دەستی بۆ ناو دەمی و مژینی کە ئەمانە هەمووی دەبینرێن) لە دوای ئەم بەروارەوە نیشانەیەکی تر بێت لەسەر بوونی گیان تێیدا.

**ڕووەکانی ئیعجازی فەرمووەدەکە (لە٤٠ڕۆژی یەکەمدا):**

**١- کۆکردنەوەی دروست بوون (جمع خلق الإنسان):**

پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿إن أحدكم يجمع خلقه في بطن أمه أربعين يوماً﴾، مانای ئاشکرای فەرموودەکە ئەوەیە کە دروست بوون و کۆکردنەوەی سەرەتاکانی ئەندامەکانی مرۆڤ لە (٤٠) ڕۆژدا تەواو دەبێت.

زانایان و پزیشکان لەمڕۆدا پاش توێژینەوە و توێکاری دوور ودرێژی لەشی کۆرپەلە لە (٤٠) ڕۆژی یەکەمدا بۆیان دەرکەوتووە کە لەم کاتەدا هەموو ئەندامە سەرەکییەکانی لەشی مرۆڤ یەك لەدوای یەك دروست دەبن، کە (٤٠) ڕۆژی یەکەم تێناپەڕێت تاوەکو هەموو ئەم ئەندامانە دروست نەبن و کۆنەبنەوە، بەلام لە شێوەی چەکەرەیەکدان کە لە قەبارەی (١سم)ی لەشی کۆرپەلەکەدا کۆبوونەتەوە، هەروەها کۆرپەلەکە بە دەوری خۆیدا چەماوەتەوە و لە شێوەی پیتی (C)ی ئینگلیزیدایە کە شێوەیەکی کۆکراوەی دەداتێ، کەواتە بە هەموو شێوەیەك کۆرپەلەکە دوای تەواو بوونی

ئەم (٤٠) رۆژە شێوەیەکی کۆکراوەی هەیە لە هەردوو رووی دروست بوون و شکڵی دەرەوەشیدا (وێنەکانی: هـ/٨ و هـ/٩).




وێنەی (هـ/٨ و هـ/٩): ئەم وێنانە چەمانەوە و کۆبوونەوەی لەشی کۆرپەلەمان بۆ روون دەکەنەوە لە قۆناغی گۆشتپارەدا، هەروەك لە فەرموودەکەی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە.

٢- (ثم یکون، في ذلك علقة مثل ذلك):

واتە کۆرپەلەکە دەبێت بە (علقة)یەکی تەواو دروستبوو بەو شێوەیەی کە بۆی دیاری کراوە و هەموو ماناکانی (علقة)ی تێدا کۆبووەتەوە، هەروەك چۆن لە دوای (٤٠) رۆژەکە دروست بوونی مرۆڤ هەمووی تەواو دەبێت وەك باسکرا، زانستی نوێ بۆمان باس دەکات کە کۆرپەلە لە نێوان رۆژانی (١٥ تا ٢٤)ی دروست بوونیدا شێوەی کرمی زەروو (علق) وەردەگرێت (ئەو کرمەی لە زۆنگاوەکاندایە و دەنووسێت بە قورگی مەڕومالاتدا و لەسەر خوێنیان دەژی)، ئەگەر بڕوانینە (وێنەی ژمارە: هـ/٤).

دەبینین کە شێوەی کۆرپەلەکە و کرمەکە لە ١٠٠٪ لەیەك دەچێت، لە لاپەڕەکانی پێشتردا بابەتی (دروست بوونی کۆرپەلەی مرۆڤ لە قۆناغی (العلقة)دا) بخوێنەرەوە بۆ روون کردنەوەی زیاتر.

٣- (ثم یکون في ذلك مضغة مثل ذلك):

ئەمەش موعجیزەیەکی ترە کە ووردی ئەو زاراوانە دەردەخات کە قورئان و سوننەتی پیرۆز بەکاریان هێناوە، بە تایبەتی بۆ ئەو قۆناغەی کە دوای

قۆناغی (العلقة) دێت، کە ئەویش قۆناغی گۆشتپارە (المضغة)یە، ئیعجازەکە لەوەدا دەردەکەوێت کە ئەم قۆناغە وردە وردە گەشە دەکات تاوەکو کۆرپەلەکە شێوەی پارووی‌یەکی پێچ خواردوو وەردەگرێت کە نیشانەی ددانی پێوەیە و رووەکەی ناڕێك وپێکە، بڕوانە (وێنەکانی ژمارە: هـ/٨ و هـ/٩ ) کە کۆرپەلەی لە قۆناغی (المضغة)دا تێدا دەردەکەوێت و بە روونی لێکچوونی کۆرپەلە و پاروو روون دەبێتەوە، پێشتر باسی ئەوەمان کرد کە ئەندامە سەرەکی‌یەکانی ناوەوە دەستیان کردووە بە جیابوونەوە و بۆشایی‌یەکانی نێوان توێەڵە لەشی‌یەکان شێوەیەك دروست دەکەن کە لە ماددەیەکی جووراو دەچێت، و وردە وردە هەموو کۆرپەلەکە دەچێتە سەر شێوەی گۆشتپارە (مضغة)یەکی تەواو.

٤- فەرموودەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە قۆناغەکانی (نطفة، علقة و مضغة) لە (٤٠) رۆژی یەکەمدا روودەدەن، لەگەڵ ئەوەشدا کە کۆرپەلەکە لەم کاتەدا یەکجار بچووکە و ماوەی نێوان ئەم قۆناغانەش زۆر کورتە. دیاری کردنی تەمەنی کۆرپەلەش پێش دۆزینەوەی هێلکە و پەیوەندی دیاردەی مانگانەی ئافرەت پێیەوە کارێکی زۆر گرانە، و ئەم دیاری کردنە دووچاری زیاد و کەم دەبێت لە تەمەنی کۆرپەلەکەدا کە دەگاتە (٢١) رۆژ، چونکە ئەوەی ئەم تەمەنە دیاری دەکات نازانێت ئایا کەی سکپڕی دەستی پێکردووە؟ لە سەرەتای پاکبوونەوەی دایکەکە یان لە کۆتایی‌یەکەی‌دا، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە قۆناغەکانی (نطفة، علقة و مضغة) کە قورئان باسی کردووە پێشتر و لەسەردەمی پێغەمبەردا بەهیچ شێوەیەك نەزانراوە، بەڵام دەبینین قورئان و سوونەتی پیرۆز بە ئاشکرا ئەم راستی‌یانەمان دەخەنە بەردەست و تەحەددای ی هەموو مرۆڤەکانی پێ‌دەکەن، کە سەلمێنەری خوایەتی سەرچاوەی هەردووکیانە.

کۆتـایی ئـەم سـەرنجانە بـە شـاهیدی دوو زانـای رۆژئـاوا دەهێـنم لـەم بارەیـەوە، یەکـەمیان پرۆفیسـۆر دکتـۆر (جـۆلی سیمسـۆن)ە کـە مامۆسـتای کۆرپەلەزانی و پسپۆڕی نەخۆشییەکانی ژنان و منداڵبوونە لەزانکۆی (نۆرث وێست) لە (شیکاگۆ)ی وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، کاتێك ئەو دەقانەی قورئانی بینی کە باس لە دیاری کردنی سیفاتە بۆماوەییەکانی کۆرپەلە دەکات کە لە قۆناغە سەرەتاییەکانەوە (واتە لە قۆناغی نطفةوە) دەست پێدەکـات و تـێیدا بـەهۆی یـەکگرتنی مـاددە بۆماوەییـەکانی (کرۆمۆسۆمەکانی) تۆو وهێلکەوە سیفاتە داهاتووەکانی کۆرپەلەکە دیاری دەکرێن و ئەندازەیان بۆ دادەنرێت، هەر لە رەنگی چاو و پێست و قژ، هەروەها ووردەکارییەکانی تری لەشی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مِـن أَيِّ شَيْءٍ خَلَقَهُ، مِن نُّطْفَةٍ خَلَقَهُ فَقَدَّرَهُ﴾ (عبس:١٧-١٩)، واتە خوای گەورە لە تنۆکێك ئاوی ئەندازە بۆ دانراوەوە مرۆڤی دروست کردووە، کۆرپەلە لە کاتی (٤٠) رۆژی یەکەمیدا هەموو ئەندامەکانی کۆ دەکرێنەوە و پەیدا دەبن بەدوای یەکـدا و کۆرپەلەکـە بـە دەوری خۆیـدا چـەماوەتەوە، پێغەمبـەر(ﷺ) دەفەرموێت: ﴿إن أحدكم يجمع خلقه في بطـن أمـه أربعـين يومـاً﴾، پرۆفیسۆر سیمسۆن کاتێك ئەم فەرموودەیە و فەرموودەکەی تری بینی: ﴿إذا مرَّ بالنطفة ثنتان وأربعون ليلة بعث الله إليها ملكاً فصوَّرَها، وخلق سمعها، وبصـرها، وجلـدها، ولحمها، وعظامها﴾ دەستی کرد بە لێکۆڵینەوە و بەراورد کردنیان، و کاتێك ووردەکاری و ماناکانیانی بینی لە یەکێك لە کۆنگرە زانستییەکاندا ووتی: لەم دوو فەرموودەیەوە دەتوانین خشتەیەکی ووردی دیاری کراو دابنێین سەبارەت بە قۆناغەکانی گەشەکردنی کۆرپەلە لە (٤٠) رۆژی یەکەمدا، ئەم فەرموودە پیرۆزانە دەیانتوانی پێشەنگ بن بۆ هەموو ئەو زانیارییە زانستییانەی کـە لـەو کاتـەدا درکـی پـێکرابوو و ئـەمانیش دەبوونـە سەلمێنەری ئەم سرووشە خواییانە (لێرەدا پرۆفیسۆر ئاماژە بەوە دەدات

کە ئیسلام دەتوانێت پێشەنگ و رابەری زانستی ئەمڕۆ بێت)، پاشان ووتی: لێرەوە من گەیشتوومەتە ئەو بڕوایەی کە هیچ جۆرە جیاوازی و دژایەتی‌یەك نی‌یە لەنێوان راستی‌یە زانستی‌یەکان و سرووشەوە (قورئان و سوننەت) بەڵکو ئەم سرووشە پشتگیری لە هۆکارە پێشکەوتووەکانی دۆزینەوەی زانستی دەکات، ئەم یەککگرتنەوەیەی فەرموودەکانی قورئان و سوننەت و تازەترین زانیاری‌یە دۆزراوەکانی کۆرپەلەزانی بەڵگەی ئەوەیە کە قورئان لەلایەن خوداوە نێردراوە. بەڵێ موسوڵمانان دەبێت پێشەنگی زانست بن چونکە ئەوان دەتوانن ئەم زانستە لە شوێنی شیاوی خۆیدا دابنێن کە بەڵگەیە لەسەر دەسەڵاتی خوای گەورە و سەلمێنەری راستیی پەیامبەریتی محمدە (ﷺ).

دووەم لەو زانایانە پرۆفیسۆر دکتۆر (ت. ف. برسود)ە کە سەرۆکی بەشی توێکاری‌یە لە کۆلیژی پزیشکی زانکۆی (مینوتوبا) لە وولاتی کەنەدا و خاوەنی چەندین کتێبە لەسەر نەخۆشی‌یەکانی ژنان و منداڵبوون، ئەم زیاتر بەو فەرموودەیەی پێغەمبەر(ﷺ): ﴿إذا مرَّ بالنطفة ثنتان وأربعون ليلة بعث الله إليها ملكاً فصوَّرَها، وخلق سمعها، وبصرها، وجلدها، ولحمها، وعظامها، ثم قال: يا رب أذَكَرٌ أم أُنثى، فيقضي ربك ما شاء ويكتب الملك﴾ سەرسامبوو بوو و چەندین لێکۆڵینەوەی لەسەر ئەم فەرموودە پیرۆزە پێش کەش کرد، لە یەکێك لە کۆنگرە زانستی‌یەکاندا دوو وێنەی راستەقینەی کۆرپەلەی پیشانی ئامادەبووان دا یەکێکیان کۆرپەلەیەك بوو لە تەمەنی (٣٥) رۆژیدا و ئەوی تریان لە تەمەنی (٤٤) رۆژیدا بوو (بڕوانە وێنەی هـ/١٠)، پاشان ووتی: ئەگەر سەیری وێنەی کۆرپەلەی (٣٥) رۆژ بکەین دەبینین ناتوانین شێوەی مرۆڤی تێدا ببینین، بەلام کۆرپەلەکەی تر کە پاش ٤٢رۆژە دەبینین بە تەواوەتی شکڵ و وێنەی مرۆڤی وەرگرتووە و بە ئاسانی دەزانین کە ئەمە کۆرپەلەیەکی مرۆڤە، لە کۆتایی ووتەکانیدا پرۆفیسۆر برسود ووتی: من بەو شێوازەی کە

بۆیان باس کردم وا تێگەیشتم کە محمد (ﷺ) مرۆڤێکی ئاسایی بووە، تەنانەت نەیتوانیوە بنووسێت و بخوێنێتەوە (واتە نەخوێندەوار بووە)، ئێمەش باسی ئەوە دەکەین کە پیاوێکی نەخوێندەوار لە پێش ١٤٠٠ساڵ لەمەوبەر ئاوا چەند راستییەکی وورد و قووڵی بەشێوازێکی سەرسوڕهێنەر راگەیاندووە کە سروشتێکی زانستییانەی هەیە، من وەکو کەسی خۆم باوەڕناکەم و ناتوانم بڵێم ئەمانەی وەك رێکەوت ووتوە چونکە راستی زانستی زۆر ووردی تێدایە، بۆیە منیش وەك پرۆفیسۆر (کیث مور) هیچ قورسییەك لەوەدا نابینم کە بە باوەڕی تەواوەوە بڵێم ئەم ووتانە سرووش (وەحی)ێکە لەلایەن خوداوە و هەر ئەوە ئەم راستییانەی بۆ روون کردووەتەوە.




وێنەی (هـ/١٠): بڕوانە کۆرپەلە لە رۆژی (٤٢)دا زۆر لە مرۆڤ ناچێت، بەڵام یەکسەر لە رۆژی (٤٤) بەدواوە سیمای تەواوی مرۆڤ وەردەگرێت.

ئەمە شایەتی دووان بوو لەو زانا سەر ڕاستانەی کە کاتێك راستییان بۆ روون دەبێتەوە دانی تەواوی پێدا دەنێن ﴿وَيَرَى الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ الَّذِي أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ الْحَقَّ وَيَهْدِي إِلَى صِرَاطِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ﴾ (سورةسبأ:٦).

# وەسفی دروست بوونی مرۆڤ دوای رۆژی (٤٢)

**ئەو گۆڕانکاری‌یانەی کە لە هەفتەی حەوتەم و دواتردا روودەدەن:**

لە سەرەتای هەفتەی حەوتەمی گەشە کردندا (واتە لە رۆژی ٤٢دا بە نزیکەیی) پەیکەری کرکراگەیی ئێسکی دروست دەبێت، کە شێوەی تایبەتی مرۆیی دەدات بە کۆرپەلەکە و قەدی رێك دەبێتەوە، و سەرێکی گەورەی خڕی بۆ دروست دەبێت و چاوەکان دەجوولێن بۆ پێشەوەی روخسار و بەم شێوەیە شکڵی مرۆیی کۆرپەلەکە دەردەکەوێت، هەروەها گوێکانی ناوەوە و دەرەوە دوای رۆژی (٤٢) دروست دەبن و شکڵی مرۆیی وەردەگرن.

هەمان شت سەبارەت بە لووتیش رووەدات کە شکڵی مرۆیی وەردەگرێت، باڵەکانیش کە لە شێوەی چەکەرەیەکدا دەرکەوتبوون لە هەفتەی چوارەمدا لە دوای رۆژی (٤٢) درێژتر دەبن، چەند پەنجەیەکی ئاشکرا دەردەکەون کە پێشتر بوویان نەبووە، کۆتایی بڕبڕەی پشتیش (کە لە شێوەی کلکدایە) کورت دەبێتەوە و رێکدەبێتەوە و شوێنەوارێك دروست دەکات کە تێبینی ناکرێت و دیار نی‌یە.

سەرەتای ئەندامەکانی زاووزێی دەرەوەی نێر و مێ یەکەم جار لەیەك دەچن، و دەست دەکەن بە گەشە کردن پێش رۆژی (٤٢) لە هەفتەی چوارەمدا، و سیفاتە سێکسی‌یە جیاکەرەوەکان لە هەفتەی نۆیەمدا دەردەکەون و ناتوانرێت ئەندامەکانی زاووزێی دەرەوە (نێرینە و مێینە) لەیەك جیابکرێنەوە تەنها لە دوای هەفتەی (١٢) نەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا کە چاوەکان و گوێکان بەردەوام دەبن لە گەشەی تایبەتی خۆیان لە دوای رۆژی (٤٢) بەڵام قەبارەی چاو لە هەفتەی (١١)دا لە قەبارەی دەنکە نۆکێك زیاتر نی‌یە، سیفاتە تایبەتی‌یەکانی وەك تۆڕی چاو و رەشێنە و هەستیاری‌یان بۆ رووناکی لە مانگی حەوتەمدا دەردەکەون.

بەلام بینین و ناسینی شێوە و رەنگەکان تەنها دوای لەدایك بوون بە ماوەیەك دەبێت، گوێکانیش لە هەفتەی حەوتەمدا کامڵ دەبن و لۆچەکانی گوێی ناوەوە وەك هی کەسێکی پێگەیشتووی لێدێت و ئێسکەکانی گوێی ناوەڕاست لەم کاتەدا رەق دەبێت و کڕکڕاگەی گوێی دەرەوەش لە سێ چەماوە پێکدێت، گوێی کۆرپەلە ناتوانێت دەنگەکان ببیستێت تەنها لە دوای هەفتەی (٢٤) نەبێت.

هەروەها سیستمەکانی ئێسك و ماسولە و پێست شێوەی مرۆیی دیاری کراوی خۆیان دوای رۆژی (٤٢) وەردەگرن، هەروەها لایەنی غەریزی و هەستیی و سۆزی لە کۆرپەلەکەدا گەشە دەکات و بەڵگە لەسەر بوونی چالاکی‌یەکی مێشك هەیە دوای رۆژی (٤٢)، کە ئەویش بەهۆی ئامێری هێڵکاری کارەبایی مێشکەوە تۆمار کراوە، لەوانەیە کۆرپەلە لە نێوان هەفتەی (٦ و ٧)دا وەلامی هەبێت لە هەموو لەشی‌دا ئەگەر بە هێواشی دەست لە گۆشەی لێوەکانی بدەیت، لەوانەشە هەندێك جوولەی خۆویست وەك جوولەی چاو و قووتدان لە نێوان هەفتەی (٩ و ١٠)دا روودەن.

پزیشکی ئینگلیزی (سێر ویلیەم لیلی) وەسفی کۆرپەلە دوای رۆژی (٤٢) بەم شێوەیە دەکات: (کۆرپەلە وەلامی دەبێت بۆ ئازار و بەرکەوتن و ساردیی و دەنگ و رووناکی، شلەی ئەمینیۆنی دەخواتەوە بە تایبەتی ئەگەر بە شێوەیەکی دەستکرد شیرینی‌یەکەی زیاد بکرێت، و ئەگەر تامی ناخۆش بێت کەم دەیخواتەوە! بێزار دەبێت لە ئاماژە دووبارە بووەکان، و دەتوانرێت فێربکرێت کە بەئاگا بێت بۆ کارتێکەرەکان بۆ جاری یەکەم و بۆ ماوەیەکی کورت)، هەروەها هەندێك لێکۆڵینەوەی کۆرپەلەی مرۆڤ دەریخستووە کە هەندێك سیفاتی هەڵس و کەوت و سلوکی تایبەت بە کۆرپەلە کە لە هی دایك و باوکی دەچێت دەردەکەوێت، کەواتە لێرەوە کۆرپەلەکە کەسایەتی‌یەکی تایبەتی جیاکراوەی خۆی دەبێت.




**وێنەی (هـ/١١): هێلكاری كۆرپەلەیەك لە هەفتەی (٧-٨)دا، دەبینین كە چۆن بە ئاشكرا وێنەی مرۆڤی وەرگرتووە.**

پێغەمبەری خودا (ﷺ) هەموو ئەم رووداوانەی کە ئاماژەمان پێدان باس کردووە لە فەرموودەکەی سەرەوەدا: ﴿إذا مرَّ بالنطفة ثنتان وأربعون ليلة بعث الله إليها ملكاً فصوَّرَها، وخلق سمعها، وبصرها، وجلدها، ولحمها، وعظامها، ثم قال: يَارَبِّ أَذَكَرٌ أَم أُنْثَى؟ فَيَقضي ربُّك ما يَشاء وَيَكتب المَلَك﴾ (رواه مسلم)، ئەم فەرموودە پیرۆزە گرنگیی رۆژی (٤٢) لە ژیانی کۆرپەلەکەدا روون دەکاتەوە و هەروەها ئاماژە بە گۆڕانکاریيە وردەکانیشی دەدات.

لێکۆڵینەوە نوێکانی کۆرپەلەزانی دەریخستووە کە کۆرپەلە شێوەی مرۆیی لەم ماوەیەدا وەردەگرێت، و هەموو ئەوانەی کە لەو فەرموودەیەی پێش ١٤ سەدەدا باس کراون بەسەر کۆرپەلەکەدا دێت، سەبارەت بە رەگەزی کۆرپەلەکەش فەرموودەکە باسی گەشە کردنی ئەندامەکانی زاووزێی دەرەوە دەکات، نەك ئەندازەدانان کە لەگەڵ پیتاندندا لە قۆناغی نوتفەدا دیاری دەکرێت، کە خوای گەورە لەم ئایەتەدا ئاماژەی پێداوە: ﴿وَأَنَّهُ خَلَقَ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالأُنْثَى، مِنْ نُطْفَةٍ إِذا تُمْنَى﴾ (النجم: ٤٥-٤٦).

ئەگەر تێبینی فەرموودەکە بکەین دەبینین پرسیاری فریشتەکە دەربارەی ئەندامەکانی زاووزێی دەرەوەیە کە خەڵکی بەهۆیەوە نێرینە لە مێینە جیادەکەنەوە، کە ئەمانە بە شێوە مرۆییيەکەیان تەنها لەدوای هەفتەی (١٢)وە دەردەکەون.

**هاوپێچی ژمارە (٢):**

# زاراوەکانی قورئان بۆ وەسف کردنی قۆناغەکانی گەشە کردنی کۆرپەلە

هەوڵە سەرەتایی‌یەکان بۆ ڕێکخستنی گەشە کردنی کۆرپەلە لە چەند قۆناغێکدا لە کۆتایی سەدەی نۆزدەدا دەستی پێکرد و هەوڵەکان تا سەرەتای سەدەی بیستەمیش بەردەوام بوو، گەورەترین ئاستەنگ لەبەردەم زانایاندا بریتی بوو لە ڕۆیشتنی کۆرپەلەکە بە زنجیرەیەك گۆڕانکاری چوو بەناویەك و بەردەوامدا لە کاتی گەشە کردنی‌دا.

ساڵی (١٩١٤ز) زانا مول (Mool) ٢٢٦ کۆرپەلەی مرۆڤی لە زنجیرەیەك قۆناغدا ڕێکخست، دوای ٢٨ ساڵ (١٩٤٢ز) زانا ستریتەر (Streeter) کۆرپەلەی مرۆڤی لە ٢٣ قۆناغدا ڕێکخست کە ناوی نان (ئاسۆکانی گەشە کردن)، کە ئەم ڕێکخستنەی ستریتەر لەسەر ئاستی جیهان کاری پێدەکرا، تا ساڵی (١٩٧٣ز) کاتێك ئۆرایلی (Oreilly) سیستمێکی درێژتری پێشکەش کرد بۆ پۆلێن کردنی کۆرپەلەی مرۆڤ بە تایبەتی لە ٣ هەفتەی یەکەمی دروست بوونی‌دا.

ئەم سیستمە نوێیەی دانرا مایەی ڕەزامەندی بوو لە هەموو جیهاندا، کە پشتی بەستووە بە ڕووداوە جۆراوجۆرەکانی گەشە کردن، و بە پێوانەکانی شکڵی دەرەوە، ئەم سیستمە زانیاری تەفصیلی پێشکەش دەکات بۆ زانایانی کۆرپەلەزانی (بڕوانەی وێنەی هـ/١٢).

لە سەرەتای هەوڵەکانیاندا زانایانی کۆرپەلەزانی چەند پیتێکیان دانا بۆ وەسف کردنی هەر قۆناغێك، پاشان ئەم پیتانە گۆڕدران بۆ ژمارە، بەڵام هیچ کامێك لە پیتەکان و ژمارەکان بۆچوونێکی وەسفیی دیاری کراوی لەخۆ نەگرتووە بۆ جیاکردنەوەی قۆناغەکان لە یەکتری، تا کاتێکی زۆر نزیکیش نەزانرابوو کە قورئان و سوننەتی پیرۆز چەند زاراوەیەکی ووردی لەخۆ گرتووە کە پەیوەندی هەیە بە قۆناغەکانی گەشە کردنی کۆرپەلەی مرۆڤەوە تەنها لای موسوڵمانان نەبێت.

# وێنەی (هـ/١٢)

## خشتەی زەمەنی دروست بوونی کۆرپەلەی مرۆڤ لە هەفتەی (١ بۆ ٢)




## خشتەی زەمەنی دروست بوونی کۆرپەلەی مرۆڤ لە هەفتەی (٣-٦)



# خشتەی زەمەنی دروست بوونی کۆرپەلەی مرۆڤ لە هەفتەی (٧-١٠)

**TIMETABLE OF HUMAN PRENATAL DEVELOPMENT**
**7 to 38 weeks**

| AGE (weeks) | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 7 | 43 CR: 16.0 mm | 44 Stage 18 begins. Eyelids beginning | 45 Tip of nose distinct. Toe rays appear. Ossification may begin. CR 17.0 mm | 46 Loss of villi. Smooth chorion forms | 47 genital tubercle, urogenital membrane, anal membrane, ♀ or ♂ | 48 Stage 19 begins. Trunk elongating and straightening | 48 CR: 18 mm |
| 8 | 50 Upper limbs longer & bent at elbows. Fingers distinct | 51 Anal membrane perforated. Urogenital membrane degenerating. Testes and ovaries distinguishable | 52 Stage 21 begins | 53 Stage 21. External genitalia still in sexless state but have begun to differentiate | 54 Stage 22 begins. genital tubercle, urethral groove, anus, ♀ or ♂ | 55 Beginnings of all essential external & and internal structures are present | 56 Stage 23. CR: 30 mm |
| 9 | 57 beginning of fetal period | 58 | 59 Genitalia show some ♀ characteristics but still easily confused with ♂ | 60 phallus, urogenital fold, labioscrotal fold, perineum, ♀ | 61 Genitalia show fusion of urethral folds. Urethral groove extends into phallus | 62 phallus, urogenital fold, labioscrotal fold, perineum, ♂ | 63 CR: 50 mm |
| 10 | 64 Face has human profile. Note growth of chin compared to day 44 | 65 | 66 Face has human appearance | 67 clitoris, labium minus, urogenital groove, labium majus, ♀ | 68 Genitalia have ♀ or ♂ characteristics but still not fully formed | 69 glans penis, urethral groove, scrotum, ♂ | 70 CR: 61 mm |

## گەشە کردنی کۆرپەلەی مرۆڤ لە هەفتەی (٩) تا کۆتایی سکپڕیی



ئەم زاراوانە تا کاتێکی زۆر نزیکیش خەڵکی لێیان تێنەگەیشتبوو، چونکە ئاماژە دەدەن بە چەند ووردەکاری‌یەکی دروست بوون کە پێشتر نەزانرابوو، بەڕاستی پرۆگرامی قورئانی بۆ دابەش کردنی قۆناغەکانی دروست بوونی کۆرپەلە مایەی سەرسوڕمان و بەرز ڕاگرتنە، کە وەك ئاشکرایە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی حەوتەمی زایینی، لەگەڵ ئەوەشدا کە (ئەرستۆ تالیس) کە بە (دامەزرێنەری کۆرپەلەزانی) دادەنرێت لە سەدەی چوارەمی پێش زاییندا لە لێکۆڵینەوەکانی لەسەر هێلکەی مریشك گەیشتە ئەوەی کە جووجکەکان بە قۆناغ دروست دەبن، بەڵام هیچ جۆرە ووردەکاری‌یەکی نەدا لەسەر ئەم قۆناغانە، بە پشت بەستن بەوەی دەیزانین دەربارەی مێژووی کۆرپەلەزانی تەنها چەند شتێکی کەم دەزانرا دەربارەی دابەش کردنی قۆناغەکانی دروست بوونیان پێش سەد ساڵ لە ئێستا.

## یاسا تایبەتەکانی زاراوە زانستی‌یەکان:

زانایان لە کاتی هەڵبژاردن و دانانی زاراوەیەك لە کۆرپەلەزانی‌دا لەوە دڵنیا دەبن کە ئەو زاراوەیە بە تەواوەتی وەسفی شکڵی دەرەوەی کۆرپەلەکە دەکات، و دەبێت ئەم ناوە بگونجێت لەگەڵ سروشتی گەشە کردن و ئەو ڕووداوانەی کە کۆرپەلەکە لەو قۆناغەدا پیێ‌دا تێدەپەڕێت، بۆ ئەوەی کە خۆشمان بەدوور بگرین لە تێکەڵاوبوونی قۆناغەکان دەبێت هەر زاراوەیەك وەسفی قۆناغێك بکات کە سەرەتایەك و کۆتایی‌یەکی دیاری کراوی هەبێت، و تا بتوانرێت دەبێت بەدوور بین لە تێکەڵاو بوونی قۆناغەکان.

لەبەر ئەوەی قۆناغەکانی دروست بوونی کۆرپەلە زۆر ئاڵۆزن و بەردەوام دەگۆڕێت، ئەوا پێویستە سیستمێکی نوێ پێشکەش بکەین بۆ وەسفی قۆناغەکانی کۆرپەلە بە بەکار هێنانی ئەو زاراوانەی لە قورئان و سوننەتدا هاتوون، ئەویش لەبەر ئەوەیە کە ئەم سیستمە پێشنیار کراوە پشتی

بەستووە بە وەسف کردنی گۆڕانکاری‌یەکانی روخسار و شێوە و هەروەها گۆڕانکاری‌یەکانی ناو لەشی و لە هەمان کاتیشدا ئاشکرا و هەمەلایەنن و لەگەڵ پێشکەوتنەکانی کۆرپەلەزانی‌دا دەگونجێت، ئەوەی جێی ئاماژە پێکردنە ئەوەیە کە قورئان یەکەم سەرچاوەیە باسی قۆناغە جیاوازەکانی کۆرپەلەی کردبێت: ﴿يَخْلُقُكُمْ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ خَلْقًا مِن بَعْدِ خَلْقٍ فِي ظُلُمَاتٍ ثَلَاثٍ﴾ (الزمر:٦)، هەروەها قورئانی پیرۆز چەند ناوێکی تایبەتی ناوە بۆ هەموو قۆناغێکی دروست بوونی کۆرپەلە: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن سُلَالَةٍ مِّن طِينٍ، ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ، ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ﴾ (المؤمنون:١٢-١٤).

لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەی ئەم زاراوانەوە بۆمان ئاشکرا دەبێت کە هەموو مەرجێکی پێویستیان تێدایە بۆ ناولێنانێکی نموونەیی، چونکە بە ئاشکرا یەکدەگرێتەوە لەگەڵ هەموو قۆناغێکی گەشە کردنی کۆرپەلەدا و بە تەواوەتی روونی دەکاتەوە، هەربۆیە ناتوانین بڵێین ئەم وەسفەی کۆرپەلە کە لە قورئاندا هاتووە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو زانیاری‌یانەی کە لە سەدەی حەوتەمدا باوبووە، و تەنها دەرەنجام ئەوەیە کە خوای پەروەردگار بەهۆی نیگاوە بۆ پێغەمبەرە نەخوێندەوارەکەی ناردووە، کە لە هەموو ژیانی‌دا چالاکی‌یەکی زانستی لەم بوارەدا ئەنجام نەداوە!!

## زاراوە قورئانی‌یەکان بۆ قۆناغەکانی کۆرپەلە:

### یەکەم: قۆناغە سەرەکی‌یەکان:

قورئانی پیرۆز ئەوەی بڕیارداوە کە کۆرپەلە لەسکی دایکی‌دا بە ٣ قۆناغی سەرەکی و جیاوازدا دەڕوات، کە لە نێوانیاندا ماوەیەکی زەمەنی هەیە و بە بەستنەوەیان بە پیتی (ثُمَّ) دەربڕیوە (وەك لە ئایەتەکانی سوورەتی

(المؤمنون)دا)، قۆناغی یەکەم بریتی‌یە لە: نوتفە کە لە زمانی عەرەبی‌دا بە واتای تنۆکێك ئاو دێت، قۆناغی دووەم بریتی‌یە لە: قۆناغی دروست بوون (التخليق) کە تێ‌ی‌دا شێوەکانی دروست بوونی کۆرپەلە: (علقة، مضغة، عظام، كساء العظام باللحم) یەکسەر بەدوای یەکدادێن و بە پیتی (فاء) پێکەوە بەستراون، قۆناغی سێ‌یەمیش کە دوای (ثُمَّ)ی کۆتایی دێت بریتی‌یە لە قۆناغی گەشە کردن (النشأة).

**دووەم: قۆناغە ناسەرەکی‌یەکان (بەشەکان و بارەکان):**

**١- بەشەکانی نوتفە:** کە باسی ئەم بەشانە هاتووە:

**أ- باری ئاوی دەرپەڕیو:** وەسفی شلەمەنی‌یەکانی زاووزێ دەکات کە دەردەپەڕن و لەناویاندا سپێرم لە پیاودا و هێلکۆکە لە ئافرەتدا هەڵدەگرن.

**ب- باری سولالە (السلالة):** کە لە زمانی عەرەبی‌دا بە مانای پوختەیەکی دەرهێنراو یان ماسی‌یەکی درێژ دێت، کە وەك باسمان کرد سپێرمێك لەنێوان ملیۆنەها دانەدا دەردەهێنرێت و خۆیشی لەسەر شێوەی ماسی‌یەکی درێژە.

**ج- باری نوتفەی تێکەڵاو (النطفة الأمشاج):** واتە ئاوێکی تێکەڵاو کە وەسفی بەیەك گەشتنی دەردراوەکانی پیاو و ئافرەت دەکات لە بۆری پیتاندندا بۆ دروست کردنی زایگۆت، کە لە شێوەی تنۆکێك شلەمەنی‌دا دەبێت و پێکهاتووە لە تێکەڵاوێکی ئاوی پیاو و ئافرەت، کە ئەمە وەسفێکی زۆر روونکەرەوەیە سەبارەت بە شێوە و پێکهاتەکەی، دەتوانرێت ئەم باری نوتفەی تێکەڵاوە دابەش بکرێت بۆ:

١- باری دروست بوون (الخلق): چونکە پێش چوونە ناوەوەی سپێرم بۆ ناو هێلکۆکەکە خانەیەکی کامڵی مرۆڤ نابینین! پاش یەکگرتنیان بڕیاری دروست بوونی مرۆڤێکی نوێ دەدرێت بە دروست بوونی خانەیەکی مرۆیی کامڵ کە (٤٦) کرۆمۆسۆمی تێ‌دایە و دەتوانێت زیاد بکات بە دابەش بوون بۆ دروست

کردنی مرۆڤ، کەواتە قۆناغی بوونی مرۆیی بە تێکەڵاو بوونی سپێرم و هێلکۆکە دەست پێدەکات، و ئەم بارەش جیاوازە لە پێش خۆی چونکە مرۆڤ پێشتر دوو بەشی لەیەك جیاواز و لەیەکدوور بووە (وێنەی: هـ/١٣).

٢- باری ئەندازە بۆدانان (التقدیر): دروست بوونی مرۆڤ بە یەکگرتنی سپێرم و هێلکۆکە دەست پێدەکات، بەڵام ئایا سیفاتەکانی کۆرپەلە دروست بووەکە چی‌یە؟ و چی بۆ دەمێنێتەوە لە دایك و باوکی‌یەوە؟ ئەمە لە قۆناغێکی دوای باری دروست بووندا بە چەند سەعاتێك روودەدات کە بریتی‌یە لە باری ئەندازە بۆدانان (التقدیر) وەك لە قورئاندا هاتووە، یان باری داڕشتنی پرۆگرامی جینی (البرمجة الجینیة) وەك کۆرپەلەزانانی ئەمڕۆ باسی لێوە دەکەن، کە تێیدا ئەو سیفاتانەی کە زاڵ دەبن و دەردەکەون بڕیاردەدرێن و ئەوانەشی کە بەزیون لادەچن و لەوانەیە لە نەوەکانیدا پەیدابن، وەك قورئان دەفەرموێت: ﴿قُتِلَ الْإِنسَانُ مَا أَكْفَرَهُ، مِنْ أَيِّ شَيْءٍ خَلَقَهُ، مِن نُّطْفَةٍ خَلَقَهُ فَقَدَّرَهُ﴾ (عبس:١٧-١٩)، کەواتە سەرەتا دروست بوون و دووەم ئەندازە بۆدانانە کە کەمتر لە (٣٠ سەعات)یان بەینە.




(وێنەی: هـ/١٣)

ئەم هێلکارییانە پیتاندن یان نوتفە دەردەخات، زنجیرەی رووداوەکان کاتێك دەست پێدەکات کە سپێرم دەگاتە دیواری هێلکۆکەکە، و بە تێکەڵاوبوونی کرۆمۆسۆمەکانی دایك و باوك و دروست بوونی هێلکەی پیتێنراو (زایگۆت) کۆتایی دێت، لە خوارەوەش دوو وێنەی راستەقینەی دروست بوونی (زایگۆت) کە یەکەم خانەی مرۆڤە لەگەڵ دابەش بوونی دەبینین.

د- باری خۆچاندن (الحرث): دوای تەواو بوونی بارەکانی دروست بوون و ئەندازە بۆدانان نوتفەکە لە (بۆری فالووپ)ەوە دەجوولێت بۆ ناو منداڵدان و دەکەوێتە ناوی و خۆی لەدیوارەکەی‌دا دەچێنێت (هەروەك تۆو لە زەوی‌دا)، ئەم بارە جیاوازە لە بارەکانی پێش خۆی و کۆتایین بارەکانی قۆناغی نوتفەیە، چونکە لێرەوە کۆرپەلە خۆی دەنووسێنێت بە دیواری منداڵدانەوە و لەوەوە خۆراك وەردەگرێت و ئیتر لە شێوەی تنۆکێك ئاو (نوتفە) دەردەچێت.

٢- **بەشەکانی قۆناغی دروستبوون:** لەم قۆناغەدا خانەکان تایبەتمەند دەبن بۆ دروست کردنی ئەندامەکان و سیستەمەکان کە پێشتر بوونیان نەبووە، ئەم قۆناغە لە سەرەتای هەفتەی سێیەمەوە دەست پێدەکات، و کۆرپەلەکە بە چەند بارێکی ناسەرەکی تایبەتدا دەڕوات کە ئەمانەن:

أ- باری خۆهەڵواسەرە (العلقة): لە رۆژی (١٥)وە دەست پێ‌دەکات و لە رۆژی (٢٣) یان (٢٤)دا تەواو دەبێت و کامڵ دەبێت بە هێواشی لەسەر شکڵی خۆهەڵواسەرەیەك، (عەلەقە) لە زمانی عەرەبی‌دا بەم مانایانە دێت: ١- کرمی زەروو کە کرمێکی بچووکە و لە زۆنگاوەکاندا دەژی و خوێنی زیندەوەرانی تر دەمژێت. ٢- خۆهەڵواسین بە شتێکەوە. ئەم دوو مانایە دێنەدی لە شێوەی کۆرپەلەکەدا کە لە کرمی زەروو دەچێت و هەروەها خۆی هەڵواسیوە بە دیواری منداڵدانەوە، کەواتە ئەم دوو مانایە وەسفی شێوەی دەرەوەی کۆرپەلەکە زۆر بە ووردی دەکەن. ٣- هەروەها بە مانای خوێنی مەییو یان خوێنی گەش و وەستاو دێت: کە ئەم مانایەی عەلەقە دیارترین پێکهاتەی ناوەوە دەردەخات کە کاردەکاتە سەر پێکهاتەی دەرەوە، چونکە لێرەدا خوێن لەناو لوولە خوێنەکاندا دروست دەبێت وەك چەند دوورگەیەکی داخراو، کە وا لە خوێنەکە دەکات وەستاو و نەجوولاو بێت لە لوولە خوێنەکاندا و شکڵی خوێنێکی مەییو یان بەستووی دەداتێ (بڕوانە **شکڵەکانی وێنەی: هـ/١٤**).



**وێنەی (هـ/١٤):**

**1: وێنەی کۆرپەلەیەکی مرۆڤە {کە درێژیەکەی (٣,١ ملم) و ١٢ بارستەی لەشی هەیە} لە قۆناغی (١١)ی دروست بووندا (ڕۆژانی ٢٤-٢٥)، کە دەبینین بە هۆی قاچێکەوە خۆی هەڵواسیوە.**

**2: بەراوردێکی نێوان کۆرپەلەی مرۆڤ و کرمی زەروو، کە لێکچوونی نێوانیان روون دەکاتەوە.**

**3: هێلکارییەکی سیستمی دڵ و سوورانی خوێنی سەرەتایی کۆرپەلە لە قۆناغی عەلەقەدا (ڕۆژی ٢٠) لێرەدا کۆرپەلەکە بۆ خۆراک پشت بە خوێنی دایکی دەبەستێت، و هۆی وەسف کردنیشی بە عەلەقە بۆمان روون دەکاتەوە (بەهۆی بوونی برێکی زۆر لە خوێنی وەستاو لە کۆرپەلەکە و وێڵاشەکەیدا).**

**4: کۆرپەلە لە قۆناغی عەلەقەدا کە هەڵواسراوە و بە شلەیەکی لینج و توورەکەی زەردێنەدەورە دراوە.**

ب- باری گۆشتپارە (المضغة): کۆرپەلە لە شێوەی عەلەقەوە دەگۆڕێت بۆ گۆشتپارە لە ڕۆژی (٢٤-٢٦)، کە ماوەیەکی کەمە ئەگەر بەراورد بکرێت بە ماوەی گۆڕانی نوتفە بۆ عەلەقە، ووشەی (مضغة) ئەم مانایانەی هەیە: ١- ئەو ماددەیەی کە دانەکان جویبێتی. ٢- بە ئەندازەی شتێك کە بجوورێت. ٣- شتێکی بچووك.

لەم بارەدا کۆرپەلەکە شێوەی ماددەیەکی جووراو وەردەگرێت کە بە بەردەوامی شکڵی لە گۆڕاندایە، کە لەگەڵ گۆڕانەکاندا شوێنەواری ددانەکانی هەر لەسەر دەمێنێت، بەم شێوەیە شێوەکانی کۆرپەلەکە دەگۆڕێت لەم بارەدا، بەڵام لەگەڵ مانەوەی بارستە لەشی‌یەکاندا کە شێوەی شوێنەواری ددانەکان دەدات بە هەموو شێوەکان، کۆرپەلەکە دەخولێتەوە و ئەملاولا دەکات هەروەك چۆن ماددەیەکی جووراو لەناو دەمدا دەخولێتەوە، ئەگەر بڕوانینە مانای دووەم و سێ‌یەمی ووشەی (مضغة) دەبینین بەسەر کۆرپەلەکەدا دەچەسپێت چونکە لە قەبارەی بچووکترین شتێکدا دەبێت کە ددانەکان بتوانێت بیجوێت (درێژی‌یەکەی نزیکەی ١سم دەبێت) (**بڕوانە شکڵەکانی وێنەی: هـ/١٥**).

ئەم ناوە بەڵگەیە لەسەر ڕوودانی چەند شتێك لە گەشە کردنی‌دا کە هۆکاری ڕوودانی گۆڕانکارین لە شێوەی دەرەوەی‌دا، قورئانی پیرۆزیش ئاماژەی بەوەداوە کە هۆکاری ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ دەستکردن بە دروست بوونی سیستەمەکانی لەش، وەك دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ مِن مُّضْغَةٍ مُّخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ لِّنُبَيِّنَ لَكُمْ﴾ (الحج:٥).

ئەمە بووەتە شتێکی زانراو بۆمان لە توێژینەوە نوێکانماندا دەربارەی کۆرپەلەزانی، کە زاراوەی قورئانی (مضغة) بارێکی نوێی تایبەتمان پێشکەش دەکات کە وەسفی شکڵی دەرەوە و گرنگترین کردارەکانی ناو لەشی کۆرپەلەکە دەکات (**بڕوانە شکڵەکانی وێنەی: هـ/١٥**).




**وێنەی** (**هـ/١٥**): ئەم وێنە راستەقینانە هۆکاری ناونانی کۆرپەلەکە بە گۆشتپارە روون دەکاتەوە، بڕوانە (لە وێنەکانی لای راستدا) لێکچوونی نێوان کۆرپەلە و قۆرێك کە شوێنەواری ددانەکانی پێوەیە، هەروەها چەماوەیی لەشیشی (وەك پیتی Cی ئینگلیزی) روون دەکاتەوە، لەلای چە پیشدا درێژی راستەقینەی کۆرپەلەکە و قەبارە بچووکەکەی دەبینین.

ج- باری ئێسك (العظام): کۆرپەلە پارێزگاری لە شکڵی گۆشتپارە دەکات و شێوەی مرۆڤی تێدا نابینرێت تا کۆتایی هەفتەی شەشەم، لەگەڵ سەرەتای هەفتەی حەوتەمدا پەیکەری ئێسکی کرکراگەیی دەست دەکات بە بڵاوبوونەوە بەناو هەموو لەشدا و کۆرپەلەکە شێوەی پەیکەری ئێسك وەردەگرێت، دروست بوونی ئێسك بریتی‌یە لە ئاشکراترین دروست بوون لەم قۆناغەدا، و گۆڕان لە شێوەی گۆشتپارەوە بۆ سەرەتای شێوەی پەیکەری ئێسك لە ماوەیەکی کەمدا روودەدات، ئەم قۆناغە بە پەیدابوونی پەیکەری ئێسکی جیادەکرێتەوە کە شێوەی مرۆیی‌یانە دەدات بە کۆرپەلەکە.

زاراوەی ئێسك کە قورئانی پیرۆز بۆ ئەم بارەی کۆرپەلەکە بەکاری هێناوە بریتی‌یە لەو زاراوەیەی کە تەعبیر لەم قۆناغەی ژیانی کۆرپەلەکە دەکات زۆر بە ووردی، روخساری دەرەوەی دەردەخات لەگەڵ ئاشکرا کردنی گرنگترین

گۆڕانکاری لە پێکهاتەی ناوەوەیدا، کە سەرەنجام دەبێتە هۆی ڕێک کردنەوەی دیمەنی لەشی کۆرپەلەکە، و جیاواز دەبێت لە قۆناغەکەی پێش خۆی کە گۆشتپارە بوو.

د- باری داپۆشین بە گۆشت (ماسولکە): ئەم قۆناغە بە بڵاوبوونەوەی ماسولکەکان بە دەوری ئێسکەکان و داپۆشینیان وەك پۆشاك جیادەکرێتەوە، بە تەواوبوونی ئەم داپۆشینە شێوە مرۆیی‌یەکەی ڕێك دەبێتەوە، و کۆرپەلەکە دەست دەکات بە جووڵە.

بەمەش شوێنەواری داپۆشینی ئێسکەکان بە ماسولکە لەسەر شێوەی دەرەوەی کۆرپەلەکە دەردەکەوێت و لە هەمان کاتدا تەعبیر دەکات لە گرنگترین کرداری دروست بوونی کۆرپەلەکە لەم قۆناغەدا، کە بارێکی جیاوازە لەوەی پێش خۆی (باری دروست بوونی ئێسك) لە شێوە و پێکهاتەی ناوەوەیدا.

قۆناغی داپۆشین بە گۆشت لە کۆتایی هەفتەی حەوتەمدا دەست پێ‌دەکات و بە درێژایی هەفتەی هەشتەم بەردەوام دەبێت، کە دوای قۆناغی ئێسك دێت وەك قورئانی پیرۆز تەعبیری لێ‌کردووە: ﴿... فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا ....﴾ (المؤمنون:١٤).

قۆناغی داپۆشین بە ماسولکە کە لەگەڵ کۆتایی هەفتەی هەشتەمدا تەواو دەبێت بە باری کۆتایی قۆناغی دروست بوون (التخليق) دادەنرێت، کە زانایانی کۆرپەلەزانی کۆتایی هەفتەی هەشتەم بە کۆتایی قۆناغی سەرەتایی (حوممەیل Embryo) دادەنێن و دوای ئەم دەڵێن قۆناغی (کۆرپەلە Fetus) دەست پێ‌دەکات، کە یەکدەگرێتەوە لەگەڵ قۆناغی گەشە کردندا وەك لە زاراوەی قورئانی‌دا هاتووە: ﴿فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ﴾ (المؤمنون:١٤).




وێنەی (هـ/١٦)
لەم وێنانەدا دەبینین کە چۆن لە هەفتەی شەشەمدا پێش تەواو بوونی دروست بوونی ئێسك و ماسولکە کۆرپەلەکە سیمای مرۆڤی پێوە دیارنی‌یە، بەلاّم لە هەفتەکانی دواتردا ئەم سیمایە بە ئاشکرا دەردەکەوێت لەگەڵ تەواو بوونی دروست بونیاندا.

**٣- بەشەکانی قۆناغی گەشە کردن بۆ دروستکراوێکی تر (النشأة خلقاً آخر):**

(نشأة) چاووگە و وەرگیراوە لە کرداری (نشأ)، ئەم کردارەش بەم دوو مانایە دێت: أ- بەرزبوونەوەی شتێك. ب- پێگەیشت و گەورە بوو و سەرکەوت، ئەم هەنگاوانەی خوارەوەش دەگرێتەوە:

ئەم قۆناغە لە ژیانی کۆرپەلەکە دوای داپۆشین بە گۆشت دەست پێدەکات، واتە لە هەفتەی نۆیەمەوە کە ماوەیەك دەخایەنێت (بەکار هێنانی پیتی (ثُمَّ) ئەمە دەسەلمێنێت)، لە کاتی ئەم قۆناغەدا چەندین کرداری گرنگ

لە گەشە کردنی کۆرپەلەکەدا ڕوودەدات، کە بە ئاشکرا لەژێر ئەو دوو وەسفەی دەقە قورئانییەکەدا جێیان دەبێتەوە، کە بەم شێوەیە دەتوانین کورتیان بکەینەوە:

أ- گەشە کردن (النشأة): ئەم وەسفە بە ئاشکرا لەم قۆناغەدا دەردەکەوێت، چونکە ڕاددەی گەشە کردنی کۆرپەلەکە لە هەفتەی نۆیەمەوە خێرا دەبێت ئەگەر بەراورد بکرێت بە قۆناغەکانی پێش خۆی.

ب- بۆ دروستکراوێکی تر (خلقاً آخر): ئەم وەسفە شانبەشانی وەسفی یەکەم دەڕوات، و بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هەمان کۆرپەلە لە قۆناغی گەشە کردندا گۆڕاوە بۆ دروستکراوێکی تر.




وێنەی (هـ/١٧): ڕێکبوونەوەی ڕوخساری کۆرپەلەکە لە قۆناغی گەشە کردندا.

لەم وێنە ڕاستەقینەیەی کۆرپەلەیەک لە هەفتەی (٢٥)دا دەبینین هەموو ئەندامەکانی کۆرپەلەکە دروست بوون، بەڵام پێست هێشتا چرچە بەهۆی تەواو نەبوونی کۆبوونەوەی چەوری پێویست لەژێریدا.

* لە ماوەی نێوان هەفتەی (٩ بۆ ١٢)دا قەبارەکانی هەریەك لە سەر و لەش و پەلەکان دەست دەکەن بە ڕێکبوونەوە و هاوسەنگی وەرگرتن.

* لە هەفتەی (١٢)دا ڕەگەزی کۆرپەلەکە دیاری دەبێت بە شێوەیەکی کۆتایی، ئەویش بە دەرکەوتنی ئەندامەکانی زاووزێی دەرەوە.

* لە هەمان هەفتەی (١٢)دا پێکهاتەی پەیکەری ئێسکی گەشە دەکات لە ئێسکە کرکڕاگەییەیە نەرمەکانەوە بۆ ئێسکە نیشتووە ڕەقەکان، هەروەها پەلەکان جیاواز دەبن و دەتوانرێت نینۆك لەسەر کۆتایی پەنجەکان ببنرێت.

* موو لەسەر پێست لەم قۆناغەدا پەیدا دەبێت.

* کێشی کۆرپەلەکە بە شێوەیەکی بەرچاو زیاد دەکات.

* ماسولکە خۆویست و خۆنەویستەکان گەشە دەکەن.

* جووڵە خۆویستەکان لەم قۆناغەدا دەست پێدەکەن.

* هەموو ئەندامەکان و سیستەمەکانی لەش ئامادە دەکرێن بۆ هەستان بە کارەکانیان لە داهاتوودا.

* لەم قۆناغەدا ڕۆح (گیان) دەکرێت بە بەری کۆرپەلەکەدا، بەپێی بەڵگەی دەقەکانی قورئان و سوننەت، دەتوانرێت ئەم گیان بە بەردا کردنە بناسرێتەوە، ئەویش بە تێبینی کردنی دیاردەی نوستن و بەخەبەر هاتنەوە لە کۆرپەلەکەدا، کە زۆرێك لە دەقەکانی قورئان و سوننەت باسی پێکەوە بەسترانی لەگەڵ ڕۆحدا دەکەن.

لێرەوە ووردیی دەقە قورئانییەکە ﴿ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ﴾ دەبینین لە تەعبیر کردن لە دیمەنی دەرەوەی کۆرپەلەکە، و گرنگترین کردارە ناوەکییەکانی کە لەم قۆناغەدا ڕوودەدەن، و لە هەفتەی نۆیەمەوە دەست پێدەکەن، کە بەردەوام دەبێت تا ئەو کاتەی کە کۆرپەلەکە دەچێتە قۆناغی توانای ژیان لە دەرەوەی مناڵدان.

**باری توانای ژیان لە دەرەوەی منداڵدان (طور القابلية للحياة):**

ئامادەکردنی کۆرپەلەکە بۆ ژیانی دەرەوەی منداڵدان لە هەفتەی (٢٢)وەوە دەست پێدەکات، و لە هەفتەی (٢٦)دا تەواو دەبێت کاتێك کە سیستمی هەناسەدان ئامادە دەبێت بۆ هەستان بە کارەکانی، و هەروەها سیستمی دەمار (دوای تەواو بوونی پێکهاتەکەی) ئامادە دەبێت بۆ رێکخستن و کۆنترۆڵ کردنی پلەی گەرمی لەشی کۆرپەلەکە.

(٢٦) هەفتە بە نزیکی یەکسانە بە (٦) مانگی هەیڤی (کۆچی)، قورئانی پیرۆزیش ئەوەی بڕیارداوە کە قۆناغەکانی سکپڕی و شیردان هەردووکیان (٣٠) مانگ دەخایەنێت، خوای گەورە دەفەرمەوێت: ﴿وَحَمْلُهُ وَفِصَالُهُ ثَلَاثُونَ شَهْرًا ...﴾ (الأحقاف:١٥)، هەروەها ئەوەشی روون کردووەتەوە کە ماوەی شیردانی تەواو دەبێت دوو ساڵی کامڵ بێت، کە دەفەرموێت: ﴿...وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ ...﴾ (لقمان:١٤)، کەواتە لەمەوە تێدەگەین ئەو ماوەیەی کە کۆرپەلە پێویستییەتی بۆ ئەوەی توانای ژیانی دەرەوەی منداڵدانی هەبێت بریتییە لە (٦) مانگ، پێش هەفتەی (٢٢) کە ئەم قۆناغەی لێوە دەست پێدەکات ئەگەر کۆرپەلەکە بێتە دەرەوە ئەوا لەبارچووە لە زوربەی حاڵەتەکاندا.

**باری گۆشگرتن و بەخێو کردنی ناو منداڵدان (طور الحضانة الرحمية):**

کاتێك دروست بوونی مرۆڤ تەواو دەبێت و ئامادە دەبێت بۆ ژیان لە دەرەوەی منداڵدان لە دوای مانگی شەشەمەوە، ئیتر لێرەوە کۆرپەلەکە دەچێتە ماوەیەکی گۆشگرتنەوە لەناو منداڵداندا، لێرەدا ئەندام و سیستمی نوێ پەیدا نابن چونکە هەموویان پەیدا بوون و ئامادە بوون بۆ کارکردن، منداڵدانیش هەڵدەستێت بە دەستەبەر کردنی خۆراك و ژینگەیەکی گونجاو بۆ گەشەی کۆرپەلەکە، کەواتە ئەم ماوەیە ماوەیەکی گۆشگرتنە کە لەناو منداڵداندا روودەدات و بەردەوام دەبێت تا باری ژان بۆهاتن و منداڵبوون.

**باری لەدایك بوون:**

ئەم قۆناغە دوای تێپەڕینی (٩) مانگی هەیڤی دەست پێدەکات و بە لەدایك بوونی کۆرپەلەکە تەواو دەبێت، کاتێك باری پێشوو بریتی‌یە لە بارێکی پاراستن و گۆشگرتن بۆ کۆرپەلەکە، ئەم بارە بە قۆناغی وازهێنان لە کۆرپەلەکە و دەرکردنی بۆ دەرەوەی لەش دادەنرێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ السَّبِيلَ يَسَّرَهُ﴾ (عبس:٢٠).

## دوا ووتە:

ئەو زاراوانەی لە قورئاندا هاتوون زۆر بە ووردی تەعبیر دەکەن لەو گۆڕانکاری‌یانەی کە روودەدەن لە قۆناغە جیاوازەکانی دروست بووندا، و وەسفی ئەو رووداوانە دەکەن بەپێی زنجیرەندی کاتەکانی روودانیان، هەروەها وەسفی ئەو گۆڕانکاری‌یانەش دەکەن کە لەسەر هەیئەت و شکڵی کۆرپەلەکە لەگەڵ دروستبوونی‌دا روودەدەن بە وەسفێکی وورد لە هەموو قۆناغێکدا.

وێنەیەکی کۆن، کە ئەو بۆچوونە روون دەکاتەوە گەشە کردنی کۆرپەلە تەنها بریتی‌یە لە زیاد بوون لە قەبارەدا.

**وێنەی** (**هـ/١٨**) **تا کۆتایی سەدەی هەژدەیەمیش کۆرپەلەزانان باوەڕیان وابووە کۆرپەلە لە سکی دایکدا تەنها لە قەبارەدا زیاد دەکات.**

لە توانای پێغەمبەردا (ﷺ) نەبووە کە ئەم راستی‌یانە دەربارەی دروست بوونی ئادەمیزاد لە سەدەی حەوتەمی زایینی‌دا بزانێت، لەبەرئەوەی کە زوربەیان تەنها لە سەدەی بیستەمدا دۆزراونەتەوە، شتێکی حەق و رەوایە کە

موسـولْمانان و غـەیری ئـەمانیش شـایەتی بـدەن ئـەم راسـتی‌یانە لەلایـەن پـەروەردگارەوە بـەهۆی وەحی‌یـەوە هـاتووە بـۆ پێغەمبـەر (ﷺ)، ئـەو پـەروەردگارەی کـە دروسـتکەرە و زانایـە بـە هـەموو شـتێکی قۆناغـەکانی دروست بوونمان، و بە هەموو کارێك و لایەنە جۆراوجۆرەکانی ژیانمان، و بە هـەموو شـتێکیش کـە لـە دەوروبەرماندایـە لـەم بوونـەوەرە فراوانـەدا، و هـەر ئەویشە کە ڕاگری ووردەکاری‌یەکانیانە.

# سەرچاوەکان

- قورئانی پیرۆز و تەفسیر:

١- قورئانی پیرۆز.

٢- تەفسیری ( جامع البيان في تفسير القرآن ) ناسراو بە تەفسیری ( الطبري )/ دانراوی: ( أبو جعفر محمد بن جرير الطبري )/ دار المعرفة- ١٩٨٦.

٣- تەفسیری ( تفسير القرآن العظيم ) ناسراو بە تەفسیری ( إبن كثير )/ دانراوی: أبي الفداء إسماعيل ابن كثير/ دار الكتاب العربي- ٢٠٠٤.

٤- تەفسیری ( الجامع لأحكام القرآن ) ناسراو بە تەفسیری ( القرطبي )/ دانراوی: ( أبو عبدالله محمد بن أحمد الأنصاري القرطبي )/ دار إحياء التراث العربي.

٥- تەفسیری ( فتح القدير الجامع بين فني الرواية والدراية من علم التفسير )/ دانراوی: محمد بن علي الشوكاني/ دار ابن كثير/ الطبعة الثانية- ١٩٩٨.

٦- تەفسیری ( الجلالين )/ دانراوی هەردوو زانا: ( جلال الدين السيوطي وجلال الدين المحلي )/ دار إحياء التراث العربي.

٧- مفردات ألفاظ القرآن/ الراغب الأصفهاني.

٨- مفردات القرآن ( تفسير وبيان ) مع أسباب النزول/ إعداد: د. محمد حسن الحمصي/ دار الرشيد.

٩- الموسوعة القرآنية الميسرة/ د.وهبة الزحيلي، د. محمد وهبي سليمان، محمد عدنان سالم، محمد بسام رشدي الزين/ دار الفكر – ٢٠٠٤.

١٠- تەفسیری ئاسان بۆ تێگەیشتنی قورئان/ م. بورهان محمد أمين / چاپی شەشەم– ٢٠٠٤.

١١- پوختەی تەفسیری قورئان ( موفرەداتی قورئان )/ مامۆستا محمد مەلا صالح بامۆکی/ چاپی یەکەم - ٢٠٠٥.

١٢- الصحيح المسند من أسباب النزول/ عصام بن عبدالمحسن الحميدان/ الطبعة الثانية- ٢٠٠٤.

- فەرموودە و ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ (السيرة النبوية):

١٣- فتح الباري شرح صحيح البخاري/ الإمام ابن حجر العسقلاني/ مكتبة دار السلام/ الطبعة الثالثة-٢٠٠٠.

١٤- صحيح مسلم بشرح الإمام النووي/ الإمام يحيى بن شرف النووي/ دار المعرفة/ الطبعة السادسة - ١٩٩٩.

١٥- سلسلة الأحاديث الصحيحة/ محمد ناصرالدين الألباني/ مكتبة المعارف- الرياض/ ٢٠٠٤.
١٦- مشكاة المصابيح/ محمد بن عبدالله الخطيب التبريزي/ بتحقيق: محمد ناصرالدين الألباني/ المكتب الإسلامي/ الطبعة الثالثة- ١٩٨٥.
١٧- صحيح السيرة النبوية/ إبراهيم العَلي/ الطبعة الثانية-١٩٩٦.
١٨- سيرة النبي (ﷺ) من القرآن الكريم والسنة الصحيحة/ عبدالحميد طهماز/ الطبعة الأولى- ٢٠٠٣.
١٩- الرحيق المختوم/ صفي الرحمن المباركفوري/ دار الأرقم.
٢٠- السيرة النبوية/ د.علي محمد الصَلابي/ دار المعرفة- الطبعة الأولى- ٢٠٠٤.

- فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبی:

٢١- معجم (لسان العرب)/لإبن منظور.
٢٢- معجم (القاموس المحيط)/ مجدالدين محمد بن يعقوب الفيروزآبادي/ دار الفكر/ الطبعة الأولى- ٢٠٠٣.
٢٣- المعجم الوسيط/ دار إحياء التراث الإسلامي.
٢٤- تاج العروس/ محب الدين أبي الفيض محمد مرتضى الحسيني الواسطي الزبيدي الحنفي.
٢٥- الصحاح/ لأبي نصر إسماعيل بن حماد الجوهري/ دار إحياء التراث العربي/ الطبعة الرابعة- ٢٠٠٥.

- کتێبەکانی ئیعجازی زانستی:

بە پلەی یەکەم سوودم لەم سەرچاوانە وەرگرتووە کە زۆربەی بابەتەکانی ئەم کتێبەی بەردەستت پێکدێنن:

٢٦- علم الأجنة في ضوء القرآن والسنة / الشيخ عبدالمجيد الزنداني، د. مصطفى أحمد، بمشاركة مجموعة من علماء الأجنة الغربيين المعروفين: ( Marshal E. Johnson, Gerald C. Goeringer, Joe Leigh Simpson, Keith L. Moore, T. V. N. Persaud )/ من أبحاث المؤتمر العالمي الأول للإعجاز العلمي في القرآن والسنة (إسلام آباد- باكستان)/ من إصدارات: (هيئة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة برابطة العالم الإسلامي- مكة المكرمة).
٢٧- إعجاز القرآن فيما تخفيه الأرحام/ كريم نجيب الأغرّ/ دار المعرفة- بيروت/ الطبعة الأولى- ٢٠٠٥.

٢٨- مطابقة علم الأجنة لما في القرآن والسنة/ د.ناطق محمد جواد النعيمي/ دار الكتب للطباعة والنشر- الموصل/ الطبعة الأولى- ١٩٩١.
٢٩- خلق الأنسان بين الطب والقرآن/ د. محمد علي البار/ الطبعة العاشرة - ١٩٩٥.
٣٠- الإعجاز الألهي في خلق الإنسان وتفنيد نظرية داروين/ تأليف: د. محمد نبيل النشواني/ دار القلم-٢٠٠١.
٣١- أسرارخلق الإنسان (العجائب في الصلب والترائب)/ د. داود سلمان السعدي/ دار الحرف العربي/ الطبعة الثالثة- ٢٠٠٥.
- هەروەها سوودم لەم سەرچاوانەش بۆ هەندێك بابەتی كتێبەكە وەرگرتووە:
٣٢- إبتداء الخلق في ضوء الحديث النبوي/ د. سعد المرصفي/ ذات السلاسل- ١٩٨٩.
٣٣- البرهان الكاشف عن إعجاز القرآن الكريم/ دانراوى: كمال الدين بن عبدالكريم الزملكاني/ مطبعة العاني- بغداد/ ١٩٧٤.
٣٤- آيات الله المبصرة/ أ. د. توفيق علوان/ دار بلنسية.
٣٥- إنه الحق/ هيئة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة برابطة العالم الإسلامي- مكة المكرمة / الطبعة الثالثة – ١٤٢٠هـ.
٣٦- الطب محراب للإيمان (الجزء الأول)/ تأليف: د.خالص جلبي كنجو/ مؤسسة الرسالة- دار النفائس- ١٩٧١.
٣٧- الطب محراب للإيمان (الجزء الثاني)/ تأليف: د.خالص جلبي كنجو/ دار الكتب العربية- ١٩٧٤.
٣٨- الطب في القرآن/ د. محمد جميل الحبال، د. وميض رمزي العمري/ دار النفائس/ الطبعة الثانية- ٢٠٠٤.
٣٩- مع الطب في القرآن الكريم/ د. عبدالحميد دياب- د. أحمد قرقوز/ مؤسسة علوم القرآن/ الطبعة السابعة- ١٤٠٤هـ.
٤٠- الإعجاز الطبي في القرآن/ تأليف: د. السيد الجميلي/ مكتبة التحرير- بغداد/ الطبعة الثالثة- ١٩٨٢.
٤١- الإعجاز الطبي في القرآن والسنة/ محمد داوود الجزائري/ دار ومكتبة الهلال- ٢٠٠٠.
٤٢- نفحات من الإعجاز الطبي في القرآن/ د. جليل علي لفتة.
٤٣- القرآن والطب/ أحمد محمد سليمان/ دار العودة- بيروت.

٤٤- دليل الأنفس بين القرآن الكريم والعلم الحديث/ د. محمد عزالدين توفيق/ دار السلام/ الطبعة الثالثة- ٢٠٠٤.
٤٥- الطب في ظلال القرآن والسنة / كلية الطب – جامعة الموصل/ ١٩٩٩.
٤٦- موسوعة الإعجاز العلمي في الحديث النبوي/ الجزء الثاني- خلق الإنسان/ أ.د. أحمد شوقي إبراهيم/ الطبعة الثانية- ٢٠٠٤.
٤٧- موسوعة الإعجاز العلمي في القرآن الكريم والسنّة المطهرة/ يوسف الحاج أحمد/ الطبعة الثانية-٢٠٠٣.
٤٨- الإعجاز العلمي في السنة النبوية (المجلدان ١-٢)/ د. صالح بن أحمد رضا/ مكتبة العبيكان/ الطبعة الأولى- ٢٠٠١.
٤٩- نظرة علمية للكتب السماوية (الجزء الأول) الإعجاز العلمي والطبي في القرآن المجيد/ د. فاروق الشيخ نجم العبدلي/ شركة الزاهر للطباعة- ٢٠٠٠.
٥٠- العلوم المعاصرة في خدمة الداعية الإسلامي/ د. محمد جميل الحبّال/ مكتبة دار المنهاج القويم/ الطبعة الأولى- ٢٠٠٦.
٥١- السَّماء في القرآن الكريم/ تأليف: د. زغلول راغب محمد النَّجّار/ دار المعرفة/ الطبعة الثالثة-٢٠٠٥.
٥٢- الحَيَوان في القرآن الكريم/ تأليف: د. زغلول راغب محمد النَّجّار/ دار المعرفة/ الطبعة الأولى-٢٠٠٦.
٥٣- ثمَّ أسلَمَت العلوم (الإكتشافات العلمية الحديثة ودلالاتها من القرآن والسنة)/ عادل زين العابدين محمد- ١٤٢٠هـ.
٥٤- موسوعة الطب النبوي/ الحافظ أبي نعيم الإصفهاني/ دراسة وتحقيق: د. مصطفى خضر دونمز/ الطبعة الأولى- ٢٠٠٦.
٥٥- تأصيل الإعجاز العلمي في القرآن والسنة/ من إصدارات (الهيئة العالمية للإعجاز العلمي في القرآن والسنة).
٥٦- طريق الإيمان- نحو الإيمان/ الشيخ عبدالمجيد الزنداني/ دار وحي القلم- ٢٠٠٣.
٥٧- كتيب (ملخصات البحوث للمؤتمر العالمي السابع للإعجاز العلمي في القرآن والسنة)/ (الهيئة العالمية للإعجاز العلمي في القرآن والسنة) بالتعاون مع (جائزة دبي الدولية للقرآن الكريم)/ المنعقد للفترة من ٢٢ لغاية ٢٤ مارس- ٢٠٠٤/ دبي- الإمارات العربية المتحدة.

٥٨- بەڵگە ئاشكراكان/ د. كاوە فەرەج سەعدون/ زنجیرە كتێبەكانی ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا- ژمارە (١)/ لە بڵاوكراوەكانی (ناوەندی كوردستان بۆ ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا)/ چاپی یەكەم- ٢٠٠٥.
٥٩- كۆپاسەكانی میحراب/ شەماڵ عبدالرحمن موفتی/ ئامادەكردنی (عادل شاسواری)/ بەرگی ١-٦/ ٢٠٠٢.

گۆڤارەكان:

٦٠- گۆڤاری (الإعجاز): ژمارە (١)ی صفری ١٤١٦ك- تەمموزی ١٩٩٥ز/ گۆڤارێكی وەرزییە دەردەچێت لە لایەن: (هيئة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة برابطة العالم الإسلامي)/ بابەتەكانی: (الإعجاز العلمي تأصيلاً وَمَنْهَجاً: الشيخ عبدالمجيد الزنداني)، (نظرة تأريخية في علم الأجنة: پرۆفیسۆر ج. س. جورنجر، عبدالمجيد الزنداني، د. مصطفى أحمد)، (وصف التخلق البشري ... مرحلة النطفة: پرۆفیسۆر مارشال جونسون، عبدالمجيد الزنداني، د. مصطفى أحمد)، (الإعجاز في عيونهم ...)، (الإعجاز الطبي في أحاديث الرسول عن عجب الذنب: د. محمد علي البار).
٦١- گۆڤاری (الإعجاز)/ ژمارە (٢): جەمادی یەكەمی ١٤١٧ك- ئەیلولی ١٩٩٦ز/ گۆڤاری: (هيئة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة)/ بابەتی: (وصف التخلق البشري ... مرحلة العلقة والمضغة: پرۆفیسۆر كيث ل. مور).
٦٢- گۆڤاری (الإعجاز): ژمارە (٣)/ رەبیعی دووەمی ١٤١٨ك/ بابەتی: (المدخل الإسلامي للهندسة الوراثية البشرية: د. سالم نجم).
٦٣- گۆڤاری (الإعجاز العلمي): ژمارە (٤)/ موحەڕڕەمی ١٤٢٠ك- مایسی ١٩٩٩ز/ یۆلیۆی ١٩٩٥/ بابەتی: (مواعيد علامات الحمل في القرآن الكريم: د. محمد دودح).
٦٤- گۆڤاری (الإعجاز العلمي): ژمارە (٥)/ رەمەزانی ١٤٢٠ك/ كانوونی یەكەمی ٢٠٠٠/ بابەتەكانی: (الإعجاز العلمي للقرآن والسنة في دلالة: غيض الأرحام: د. عبدالجواد الصاوي)، (التربويون في أمريكا يسقطون نظرية التطور: د. أحمد نبيل أبو خطوة)، (البصمة الوراثية: د. سفيان محمد العسولي).
٦٥- گۆڤاری (الإعجاز العلمي): ژمارە (٧)/ جەمادی یەكەمی ١٤٢١ك/ بابەتی: (وقفة مع النطفة: د. أحمد الحميدي).

٦٦- گۆڤاری ( الإعجاز العلمي ): ژماره ( ٨ )/ شەووالی ١٤٢١ك/ بابەتەکانی: ( أطوار الجنين ونفخ الروح: د. عبدالجواد الصاوي ) ، ( حروب الأرحام: د. محمد دودح ).
٦٧- گۆڤاری ( الإعجاز العلمي ): ژماره ( ١١ )/ شەووالی ١٤٢٢ك/ بابەتی: ( الخلايا الجذعية Stem Cells: د. صالح عبدالعزيز الكريّم، محمد يحيى الفيفي ).
٦٨- گۆڤاری ( الإعجاز العلمي ): ژماره ( ١٦ )/ رەجەبی ١٤٢٤ك- ٢٠٠٣ز/ دەرگراوی: ( الهيئة العالمية للإعجاز العلمي في القرآن والسنة )/ بابەتی: ( أنتم أعلم بأمر دنياكم/ نووسینی: د.عبدالبديع حمزة ).
٦٩- گۆڤاری ( هەیڤ )/ بڵاوکراوەی ( ناوەندی کوردستان بۆ ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا )/ ژماره ( ١ )ی ساڵی یەکەم- هاوینی ٢٠٠٢/ بابەتی: ( زانستی کۆرپەلەزانی لە قورئان و سوننەتدا ( بەشی یەکەم ): د. کاوە فەرەج سەعدون ).
٧٠- گۆڤاری ( هەیڤ )/ بڵاوکراوەی ( ناوەندی کوردستان بۆ ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا )/ ژماره ( ٢-٣ )ی ساڵی یەکەم- ٢٠٠٣/ بابەتی: ( زانستی کۆرپەلەزانی لە قورئان و سوننەتدا ( بەشی دووەم ): د. کاوە فەرەج سەعدون ).
٧١- گۆڤاری ( هەیڤ )/ ژماره ( ٤ )ی ساڵی یەکەم- ٢٠٠٣/ بابەتی: ( زانستی کۆرپەلەزانی لە قورئان و سوننەتدا ( بەشی سێیەم ): د. کاوە فەرەج سەعدون ).
٧٢- گۆڤاری ( هەیڤ )/ ژماره ( ٥ )ی ساڵی دووەم- پاییزی ٢٠٠٤/ بابەتی: ( زانستی کۆرپەلەزانی لە قورئان و سوننەتدا ( بەشی چوارەم ): د. کاوە فەرەج سەعدون ).
٧٣- گۆڤاری ( هەیڤ )/ ژماره ( ٦ )ی ساڵی دووەم- بەهاری ٢٠٠٥/ بابەتی: ( زانستی کۆرپەلەزانی لە قورئان و سوننەتدا ( بەشی پێنجەم و کۆتایی ): د. کاوە فەرەج سەعدون ).
٧٤- گۆڤاری ( هەیڤ )/ ژماره ( ٧-٨ )ی ساڵی دووەم- ٢٠٠٥/ بابەتی: {٢٤ کاتژمێر لە ژیانی پێغەمبەری ئیسلام محمد ( ﷺ ): د. کاوە فەرەج سەعدون}.

سایتی ئینتەرنێت:

٧٥- ( www.nooran.org ): کە بریتییە لە سایتی ( الهيئة العالمية للإعجاز العلمي في القرآن والسنة ) بە( رابطة العالم الإسلامي )/ مكة المكرمة.
٧٦- ( www.55a.net ): کە بریتییە لە سایتی: ( موسوعة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة ).
٧٧- ( www.islamicmedicine.org ): دەربارەی ( الطب الإسلامي والإعجاز الطبي في القرآن ).

٧٨- ( www.islampedia.com ): كه بريتىيه له ( الموسوعة الإسلامية المعاصرة ).

٧٩- ( www.tasabeeh.com ): بابەتـەكانى: ( آيـات الله في التخلـق البشـري )، ( المنجم العجيب )، ( ولد أم بنت؟ له نووسينى شێخ عبدالمجيد الزنداني ).

٨٠- ( www.balagh.com ): بابـەتى: ( آيـات الله في خلـق الإنسـان ): الشـيخ عبدالمجيد الزنداني، هەروەها بابەتى: {التفسير العلمي للآية الكريمة ﴿فَجَعَـلَ مِنْـهُ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْأُنثَىٰ﴾} : إدريس الخرشاف.

٨١- ( www.IslamOnline.net ): بابەتەكانى: ( الأجنة... بين العلم والقرآن ١-٢ )، ( ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ ): له نووسينى: ( د. شريف كـف الغـزال ) كه پزيشكه و يەكێكه لـه دامەزرێنەرانى كۆمەڵەى ئێودەوڵەتى مێژووى زانستى پزيشكى ئيسلامى.

٨٢- ( www.almuna.cjb.net ): سايتى ( أنس المنى )ى زانستى.

٨٣- ( www.geocities.com ).

٨٤- ( www.khayma.com ).

٨٥- ( www.islamtoday.com ).

٨٦- ( www.thetruereligion.org ).

٨٧- ( www.quranic-studies.com/miracles ).

شريت و (CD):

٨٨- شريط فيديو: محاضرة حول: علم الأجنة في ضوء القرآن والسـنة/ الشـيخ عبدالمجيـد الزنداني/ تسجيلات المسلم.

٨٩-المـؤتمر الطـبي الإسلامي الـدولي الأول عـن الإعجـاز الطـبي في القـرآن والسـنـة/ القاهرة- ٣ شرائط فيديو.

٩٠- شريط فيديو: إنَّهُ الحَق/ محاورة علمية مع ١٤ مـن رواد العلـوم الحديثـة حـول الإعجـاز العلمي في القرآن والسنة / الشيخ عبدالمجيد الزنداني.

٩١- شريط فيديو: براهين الإيمان/ الشيخ عبدالمجيد الزنداني.

٩٢- شـريتى ڤيـديۆى كـۆڕى ( ١٩٩٩/١/١ )/ دەربـارى: ئيعجـازى زانسـتى لـه قورئـان و سوننەتدا/ د. كاوه فەرەج سەعدون- خالد حسن على.

٩٣- شريتی ڤیدیۆی كۆڕی ( ٢٠٠٢/٦/٧ )/ دەربارەی: چەند نموونەیەك لە ئیعجازی زانستی لە سوننەتدا/ د. كاوە فەرەج سەعدون- خالـد حسـن علـی/ لـە چـالاكییەكانی: ناوەنـدی كوردسـتان بـۆ ئیعجـازی زانسـتی لـە قورئـان و سـوننەتدا، كـە پاشـان لـە كەناڵـەكانی ڕاگەیاندنەوە پەخش كرا.

٩٤- زنجـیرە بەرنامـەكانی ( بـەرەو دڵنیـایی )/ دەربـارەی كۆرپەلـەزانی لـە قورئـان و سـوننەتدا/ د. كـاوە فـەرەج سـەعدون/ ڕەمـەزانی ( ١٤٢٦ )ی كۆچـی/ لـە تەلـەفزیۆنی یەكگرتوو- كەناڵی سلێمانییەوە پەخش كرا.

٩٥- برنامج ( الشريعة والحياة ) لقنـاة الجزيـرة: مقابلـة مع الشيخ عبدالمجيـد الزنـداني بتأريخ: ٢٠٠٤/٢/٢٤.

٩٦- CD ڤیدیۆیی: مراحل تطور الجنين/ الشيخ عبدالمجيد الزنداني.

٩٧- CD ڤیدیۆیی: براهين الإيمان/ الشيخ عبدالمجيد الزنداني.

٩٨- CD ڤیدیۆیی: سلسلة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة/ الجزء الأول ( تكوين الإنسان ).

٩٩- CD ڤیدیۆیی: معجزات الله في خلقه.

١٠٠- CD كۆمپیوتەری: موسوعة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة ( www.55a.net )/ مدير الموقع: فراس نورالحق.

١٠١- CD كۆمپیوتەری: الإعجاز العلمي في القرآن والسنة- علـم الأجنـة/ جمع وترتيـب: عمار مصطفى بازرباشي.

١٠٢- CD كۆمپیوتەری: الإعجاز العلمي في القرآن الكريم/ Nile Soft.

١٠٣- CD كۆمپیوتەری: مجلات الإعجاز العلمي في القرآن والسنة ( ١-٦ )/ هيئـة الإعجـاز العلمي في القرآن والسنة- Advanced Computer Services.

١٠٤- CD كۆمپیوتەری: الإسلام في عصر العلم ( موسوعة الدكتور زغلـول النجـار )- عربـي وانكليزي/ شركة مكة للبرمجيات.

١٠٥- CD كۆمپیوتەری: خلق الإنسان/ إعداد: الهندسية لتطوير نظم الحاسبات ( RDI ).

١٠٦- CD كۆمپیوتەری: الأدلـة القـاطعـة ( سلسـلة الإعجـاز العلمـي في القـرآن والسـنة )/ إعداد: مجدي سيد عبدالباقي/ مجموعة خليفة للكومبيوتر.

**سەرچاوەی ئینگلیزی:**


**107- Human Development as Described in Qur'an & Sunnah (Correlation with Modern Embryology)\ Abdul-Majeed A. Zindani, Marshal E. Johnson, Gerald C. Goeringer, Joe Leigh Simpson, Keith L. Moore, T. V. N. Persaud \ (Commission on Scientific Signs in Qur'an & Sunnah\ 2000.**

**108-Developing Human–third edition \ (with Islamic additions)\ Keit.L.Moor, Abdul-Majeed A. Zindani.**
**109-Langman's Medical Embryology\ T.W.Sadler\ fifth edition-1985.**

**110-Human Embryology \ Patten \ 3rd Edition-1968.**

**111- Review of Medical Physiology\ William F. Ganong\ 18th Edition-1997.**

**112- Human Physiology\ Stuart Ira Fox\ 8th Edition-2004.**

**113- Textbook of Medical Physiology\ Guyton & Hall \ Eleventh Edition-2006.**

**114- Human Anatomy & Physiology in Health & Disease\ Shirely R. Burke\ Third Edition-1992.**

**115- Obstetrics by Ten Teachers\ T.L.T. Lewis & G.V.P. Chamberlain\ 15th Edition-1992.**

**116- The Practical Encyclopedia of (Pregnancy Baby care & Nutrition for Babies & Toddlers)\ Alison Mackonochie & Sara Lewis\ Hermes House-2004.**

**117- Bailey & Love's (Short Practice of Surgery)\ Charles V. Mann & R. C. G. Russell \ 21st Edition-1991.**

**118- New Guide to Women's Health\ Nora Williams & Hetty Einzig\ Quantum Books-UK \ 2003.**

**119- Family Guide to Children's Ailments\ Dr. Richard West\ Quantum Books-UK \ 2003.**

**120- Al-Eijaz Magazine\ No. 1-1995\ Human Development in the Quran & Sunnah and Modern Science: Keith L. Moor, Abdel-Majeed A. Zindani and Mustafa Ahmed.**

**121- Al-Eijaz Magazine\ No. 2-1996\ The Growth (Nash'ah) Stage: Keith L. Moor, in correlation with the Commission on Scientific Signs in Qur'an & Sunnah.**

**122- Encyclopaedia Britannica \ Ultimate Reference Suite DVD-2006.**

**123- Microsoft Encarta Reference Library\ Premium DVD Edition-2006.**

**- ئەمانە و چەندین سەرچاوەی تر بۆ ئەم لێکۆڵینەوەیە سوودیان لێوەرگیراوە کە لە کاتی باسەکاندا ئاماژەیان بۆ کراوە.**

## پێڕستی بابەتەکان

## ﴿٧﴾ باسی دروست بوونی کۆرپەلەی مرۆڤ لە قۆناغی گەشە کردن (النشأە)دا



## کورتەیەك دەربارەی نووسەر:

- ناوی سیانی: کاوە فەرەج سەعدون.

- لەدایك بووی:ساڵی ١٩٧٣ لە شاری سلێمانی.

- هەڵگری بڕوانامەی بەکالۆریۆسە لە پزیشکی و نەشتەرگەری گشتیدا (M. B. Ch. B) لە زانکۆی سلێمانی/ ساڵی ١٩٩٧-١٩٩٨.

- ماوەی ٨ ساڵە کاردەکات لە نەخۆشخانەکانی شاری سلێمانی و دەوروبەریدا.

- پزیشکی شارەزایە لە نەخۆشییەکانی سنگ و کۆئەندامی هەناسەداندا.

- لە (**کلینیکی راوێژکاریی نەخۆشییەکانی سنگ**) لە شاری سلێمانی کاردەکات.

- ماوەی ١٠ ساڵ زیاترە کاردەکات لە بواری ئیعجازی زانستی قورئان و سوننەتدا بە نووسین و وەرگێڕان و ووتاردان.

- ئەندامی دەستەی دامەزرێنەر و دەستەی باڵایە لە (ناوەندی کوردستان بۆ ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا).

- ئەندامی دەستەی راوێژکارانە لە گۆڤارەکانی (هەیڤ) و (ژینی نوێ).

- ئەندامی دەستەی بەڕێوەبردنە لە (کۆمەڵەی نەهێشتنی نەخۆشییەکانی سنگ و تەدەرون لە کوردستان).

## بەرهەمەکانی نووسەر:

١-خاوەنی چەندین بابەتی فیکری و زانستی و وەرگێڕدراو و بڵاوکراوەیە لە گۆڤار و رۆژنامەکانی کوردستاندا، لەوانە: گۆڤاری (پێنووس)، رۆژنامەی (راپەڕین)، رۆژنامەی (بێداری)، گۆڤاری (هەیڤ)، گۆڤاری (ژینی نوێ).

٢-ئەم کتێبانەی بە چاپ گەیاندووە:

- (**بەڵگە ئاشکراکان**): دەربارەی ئیعجازی پزیشکی لە قورئان و سوننوتدا.

- (**رۆژوو موعجیزەیەکی زانستییە**): راستییە زانستییەکان دەربارەی رۆژوو.

- (**ئاماژەکانی کۆرپەلەزانی لە قورئان و سوننەتدا**): ئەم کتێبەی بەردەستە.